نیسان
2005
ســــــــاڵی شەشەم

# سەردەم

38

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

کاری کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد ڕەفیق

ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardam.info

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

–ســەردەم گۆڤارێکــە بــە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانــی کــەلتووری بیــانی لــە بــواری فەلســەفە و فیکــر و ڕەخنــە و لێکۆڵینــەوە و داهێنــانی ئــەدەبی و هونەریدا.

–تکایــە ئــەو بەرهەمانــەی بــۆ سەردەمی دەنێـرن، نـاوی نووسـەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتـارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێـت، لەسـەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یـان کۆمپیوتــەر کرابێــت. پــەراوێز و ســـــەرنجەکانیش لـــــە کۆتـــــایی وتارەکـەدا هـەبن. ئەگـەر یـەکێك لـەو مەرجانـــە نەهاتنـــە دی دەســـتەی نووســەران مــافی بڵاونەکردنــەوەی هەیـە و پێشـەکی داوای لێبـوردن لـە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمــەکان بڵاوبکرێنـــەوە یـــان نەکرێنـــەوە نادرێنـــەوە بـــە خاوەنەکەی.

–هـــەموو پەیوەندییـــەك لـــە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك



## فایلی ژمارە

### گابریل گارسیا ماركیز



## وێستگەكانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# قوتابخانەی فرانكفۆرت و دەرونشیكاری

**مارتین جێی**

**لە فارسییەوە: حسەین قوربانی**



ئەدۆرنۆ

- **لەدەروون شیكاریدا هیچ شتێك هەقیقەتی نییە جگە لەزێدەبێژییەكان-تێئودۆر ئادۆرنۆ**
- **ئەگەر ترس و كاولكاری سەرچاوەی سەرەكی هەست و سۆز لەفاشیسمدا بن، ئیرووس لەبنەمادا هی دیمۆكراسییە**

"نووسەرانی كەسایەتی پاوانخواز"

(1)

**لە دەیەی 70ی سەدەی بیستەمدا زۆر ئەستەم بوو لە ورەو دلێری ئەو یەكەم بیرمەندانە بگەی كە پێوەندیدانی ناسروشتی بیروڕاكانی ماركس‌و فرۆیدیان پێشنیار دەكرد. بەپەرەسەندی هۆگری بەویلهێلم رایش لەم دواییانەداو هەروەها بەهۆی كاریگەری بەرینی كتێبی ئیرووس و شارستانییەتی ماركوزەوە گەلێك لەئەندامانی چەپ گەیشتنە ئەو بۆچوونە كە ئەم دوو بیرمەندە ئەگەرچی لەروانگەی جیاوازەوە بەلام باس لەكێشەی یەكسان دەكەن. لەروانگەی بەرەی پێشووەوە گاڵتەجاڕبوونی وەها پێوەندییەك، لەدوو سەری ئەتلانتیكەوە جێگەی مشت‌و مڕنەبوو. ئەگەرچی ترۆتێسكی هۆگری دەروونشیكاری بوو بەلام دەنگی ئەو پاش ساڵی 1923 لەنێو كۆڕە كۆمۆنیستە ئۆرتۆدۆكسەكاندا چیدی نەدەبیسترا، واتە ئەو كاتەی كە فرۆیدو لایەنگرانی بایكۆت كران‌و رەفتارگەری پاڤلۆڤی (وەكوو دەروونزانی گونجاو لەگەڵ ماركسیسم–لێنێنیسم) بەرەسمی وەرگیرا. لەنێو ئەندامانی بزاڤی دەروونشیكاریدا بیرمەندانێك وەكو**

زیگفریدبێرن فێڵدو ئۆتۆفێنیشل و پاوێڵ فێدێرن لایەنگرو هۆگری پێوەنددانی هەردوو دەزگای هزری مارکس‌و فرۆید بوون، بەڵام لەم بەستێنەدا سەرکەوتنێکی زۆر کەمیان بەدەست هێنا، ویلهێڵم رایش بانگەشەکەری پڕ هەراو هۆریای ئەم پێوەنددانە لەدواییەکانی دەیەی 20و (سەرەتاکانی) دەیەی 30دا، لەلایەن هەمووانەوە گاڵتەی پێکراو لەنێوەراستەکانی دەیەی 30دا بەبێ حورمەتییەوە لەحیزبی کۆمۆنیست و هەروەها لەبزاڤی دەروونشیکاری دەرکرا. هەم پارێزکارەکان‌و هەم رادیکاڵەکان لەگەڵ ئەو بابەتە کە گوایە رەشبینییە بنەماییەکانی ئەندێشەی فرۆید لەمەڕ ئەگەرەکانی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی. لەگەڵ ئارەزووە شۆڕشگێڕانەکانی لایەنگرانی راستەقینەی مارکسدا ناتەبایە، هاودەنگ بوون. دوایی لەساڵی 1959 دا فیلیپ ریف دەنووسێ: "لەروانگەی مارکسەوە رابوردوو ئاوس بەداهاتوویەو پرۆلێتاریا مامانی مێژووە، لەروانگەی فرۆیدەوە داهاتوو ئاوس بەرابوردووە کە تەنیا پزیشك و خۆش شانسی دەتوانێ ئێمە لەو دیاردەیە رزگاربکات.. تەنیا شۆڕش دەتوانێ نموونەی سەرەتایی یاخی بوون لەبەرانبەر باوکدا دووپات بکاتەوەو لەهەر حاڵدا ئاکامەکەی هەر وەکوو جاران بەناچاری سەرنەکەوتنە".

بۆیە هەوڵی "دەزگای توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان" بەمەبەستی تێکەڵکردنی دەروونشیکاری و تیۆری رەخنەگرانەی نوێی مارکسیستی هەنگاوێکی بوێرانەو نائاسایی بوو. ئەم هەوڵە هەروەها پیشاندەری ویستی ئەم دەزگایە بەمەبەستی دوورکەوتنەوە لەچوارچێوەی تەسکی مارکسیسمی کلاسیك بوو. لەراستیدا یەکێ لەگرینگترین خاڵەجیاوازەکانی نێوان بەرەی گرۆن بێرگ گرۆسمان و جێگرەکانیان بەڕێبەرایەتی هۆرکهایمەر کێشەی دەروونزانی بوو. هەر وەك دەبینین بێپڕوایی گشتی فرانتس نۆویمان لەمەڕ دەروونزانی یەکێ لەو هۆکارانە بوو کە بوو بەهۆی وەرنەگیرانی تەواوو یەکجارەکی ئەو لەلایەن ئەندامانی دەزگاکەوە. کاتێ کە نۆویمان بوو بەهۆگری فرۆید لەکۆتاییەکانی ژیانیدا بوو و ئیتر کاتی تێکەڵکردنی سەرکەوتووانەی ئەم دوو روانگەیەی نەمابوو. بەپێچەوانەی ئەوەوە هۆگری هۆرکهایمەر بۆ فرۆید دەگەڕایەوە بۆ دەیەی 20. لێئۆلۆوێنتاڵ لەبەرئەوەی کە لەلایەن فریدا فرۆم-راشیمانەوە لەنێوەراستەکانی دەیەی 20 دا دەروونشیکاری کرابوو لەسەر هۆرکهایمەر کاریگەری دانابوو. جگە لەمەش پێوەندی نێوان دەروونزانی و سۆسیالیسم لەو بابەتانە بوو کە لەو ساڵانەدا زۆرجار لەفرانکفۆرت باسی لەسەردەکرا. هێنریك دۆمەن سۆسیالیستی بێلژیکی لەو کەسانە بوو کە لە کۆڕە ئاکادیمییە چەپەکانی پاش ساڵی 1929 دا لەهەندێ رووەوە کاریگەری هەبوو. دۆمەن لەکتێبی لەبارەی دەروونزانی مارکسیسمەوە (1927) هەوڵیدا پراگماتیسم، کە لەسەر ئایدیالیزمێکی پتر دامەزرابوو، بگاتە جێگری دێتێرمێنیسمی ئابووری. دۆمەن هەروەها هێرشی کردە سەر دەروونزانی قازانجخوازانەکە دەیداتە پاڵ مارکس‌و لەبەرانبەردا لەسەر رەگە نائەقڵانییەکانی کردەوەی رادیکاڵ جەختی دەکرد. لەو کاتانەدا ئەو دەنگۆیە هەبوو کە دۆمەن وەکو مامۆستای دەروونزانی کۆمەڵایەتی هێنراوەتە کۆلیژی فرانکفۆرت هەتاکوو لەبەرانبەر رەوتی مارکسیسمی ئۆرتۆدۆکسی نێو ئەو دەزگایەدا هاوسەنگی دروست بکات. هۆی ئەو هێنانە هەرچی بووبێت نەیتوانی هۆرکهایمەرو ئەوانی تر بۆ ئەو هەڵوێستە نائەقڵانییە رابکێشێ، چونکە ئەو هەڵوێستە بەئاشکرا لەگەڵ تیۆری رەخنەگرانەدا ناتەبا بوو، رەنگە دانووستان و دەمەتەقێی دۆمەن لەگەڵ فاشیسمدا ئەو بێ بڕواییەی ئەوانی

سەلماندبێت. ئاواتی سەرترچوون لەو قازانجخوازییە ئامێرانەیە کە مارکسیسمی پۆپۆلیستی تووشی بوو بوو خاڵی هاودەنگی دۆمەنو ئەندامانی قوتابخانە بوو.

هەتاکوو پێش ساڵی 1927 ئادۆرنۆ لەنوسراوەیەکی درێژدا کە بەهاندانی هۆرکهایمەر نووسیبووی دەروونشیکاری و دیاردەناسی بان ئەزموونی کۆرنلیۆسی پێکەوە پێوەنددا. ئەو لەو نوسراوەیەدا ئاماژەی کردە جەختی هاوبەشی ئەو دوانە لەسەر پێکهاتەی لێکبەستراو و لەباری هێماییەوە پێوەند دراوی نەستو هەروەها هەوڵی هاوبەشی ئەو دوانە بەمەبەستی دەست پێکردنی کار لەئەزموونەکانی سەردەمەوە بۆ گەیشتن بەئەزموونەکانی رابوردوو. پاش ساڵێك هۆرکهایمەر کە بۆ خۆی ببووە هۆگری دەروونشیکاری، بریاریدا دەروونشیکاری بکرێ و بۆ ئەم مەبەستە قوتابییەکی فرۆید، کارل لان داوئێری هەڵبژارد. دوای ساڵێك کێشەی هۆرکهایمەر، واتە بێ توانایی لەپەیڤین بەبێ دەقێکی ئامادە، چارەسەرکراو رەوتی دەروونشیکاری کەزۆرتر فێرکاری بوو تا دەرمانکردن کۆتایی هات. لان داوئێر هاندرا کە دەزگای دەروونشیکاری فرانکفۆرت وەکوو لقێك لەگرووپی لێکۆڵینەوەی دەروونشیکاری باشووری رۆژئاوای ئەڵمانیا پێك بهێنێ. ئەم گرووپە پێشتر لەهایدێلبێرگ پێکهاتبوو. دەزگای دەروونشیکاری فرانکفۆرت کە لەشازدەی فێڤریەی 1929 دا کرایەوە بوو بەیەکەمین رێکخراوی تەواو فرۆیدی کە، ئەگەرچی ناراستەوخۆ، بەلاّم پەیوەست بوو بە زانکۆیەکی ئەڵمانییەوە. هەروەها ئەم رێکخراوەیە پێوەندییەکی دووری لەگەڵ هۆرکهایمەرو هاوکارەکانیدا راگرت، ئەوان لەوەرگرتنی رەزامەندی کۆلیژدا بۆ دامەزراندنی ئەو دەزگا نوێیە کە بە "دامەزراوەی میوان" ناسرا بوو بەشداربوون. فرۆید بۆ خۆی لەدوو نامەدا کە بۆ هۆرکهایمەری نوسیبوو سپاسی هەوڵەکانی ئەوانی کردبوو.

هێنریش مێنگ و ئێریش فرۆم و هاوسەرەکەی فریدا فرۆم- رایشمان وەکو ئەندامی هەمیشەیی پێوەست بوونە لان داوئێرەوە. لەیەکەمین مانگەکانی پێکهێنانی دەزگای دەروونشیکاری دا، پەیڤین و سێمیناری گشتی لە لایەن ئەندامانی هەڵکەوتووی بزاڤەکەوە، کەسانێك وەکو هانس زاخسو زیگفرێد بێرن فێڵدو ئانا فرۆیدو پاوێڵ فێدێرن، بەرێوەچوو. گییۆرگ گرۆدێکیش زۆرجار هاتوچۆی ئەوێی دەکرد. لەنێوان چوار ئەندامی هەمیشەییدا، ئێرش فرۆم کەپتر لەدەیەیەك دۆستی لۆوێنتاڵ بوو و هەر لەلایەن ئەوەوە بەو دەزگاییە ناسێنرابوو بەخێرایی بوو بەناسراوترین و بەرچاوترین ئەندام. پاش گواستنەوەی دەزگای توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەمەریکا، تەنیا فرۆم بوو کە دیسانەوە پێوەندی گرتەوە بەو دەزگایەوە. لەئەمەریکا فرۆم وەکو هەڵکەوتووترین ئەندامی بەناو رێڤیزیۆنیستی نیوفرۆیدی پایەیەکی بەرزی بەدەست هێنا. هاوسەرەکەشی هاتە ئەمەریکا بەلاّم پێوەندییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەو دەزگایەدا نەبوو. لان داوئێر سەفەری کرد بۆ ئامێستێردامو ئەوەندە لەوێ مایەوە کەچی دی گوێی بەداواکاری هاورێیانی بۆ گەرانەوە لەئەوروویا نەدەگرت. ئەو هاوکات لەگەڵ شەردا لەبێلسێن کۆچی کرد. مێنگ خۆشبەخت تر بوو. ئەو فرانکفۆرتی بەجێهێشت و وەکو پسپۆری خاوێنی دەروون لەبازێل ناوبانگێکی بەدەست هێنا. بۆیە لەراستیدا بەهۆی بەرهەمەکانی فرۆمەوە بوو کە ئەو دەزگایە بۆ یەکەمجار هەوڵی ئاشتی دانی روانگەکانی فرۆیدو مارکسیدا.

فرۆم کە لەدایکبووی ساڵی 1900ی فرانکفۆرت بوو لەفەزایەکی زۆر ئایینیدا گەورەبوو. لەسەردەمی تازەلاوێتیدا زۆرحەزی لەبنەما

بەڵێندەرانەکانی بیری یەهوودی دەکرد. فرۆم دوایی نووسی: "پتر لەهەموو شتیٚ نوسراوە پێغەمبەرانەکانی ئەشعیاو عامووس‌و هووشەع گۆڕانکاری لەبیری مندا دروست کرد. ئەوەندە وە دوای هەڕەشەو پێشوێژییەکانی کارەساتەکان نەکەوتم، بەڵکو پتر کەوتمە ژێر کاریگەری بەڵێنی "کۆتایی مێژوو"... وێنەی ئاشتی جیهانی‌و سازانی نێوان نەتەوەکان لەتەمەنی دوازدە سێزدەساڵیدا کاریگەری قووڵی لەسەر دانام". فرۆم هاوڕیٚ لەگەڵ لۆوێنتاڵدا لەسەرەتاکانی دەیەی 30ی ژیانی خۆیدا چووە نێو ئاڵقەی خاخامی نۆبڵەوە.

ئەگەرچی فرۆم پاش ئەوەی کە بۆیەکەمجار لەساڵی 1926 دا لەشاری مۆنیخ دەروونشیکاری کرا بەکردەوە دەستی لە دەستوورە ئاینییەکان هەڵگرت، بەڵام رەنگ و بۆی جۆرێك پاشخانی ئاینی تەنانەت لەدوایین بەرهەمەکانیدا بەدی دەکرێت.

ئەو شتەی کەفرۆم لەپێشینیانی یەهوودیی خۆی وەرگرتبوو گەلێك جیاوازبوو لەو شتانەی کە هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ لەپێشینانی خۆیان وەرگرتبوو. فرۆم بەجێی جەختکردن لەسەر تایبەتمەندی رەنگنەدراوانەی هەقیقەت و نەبوونی ئەگەری پێناسەکردنی سروشتی مرۆڤ، جەختی لەسەر بۆچوونێك لەئینسان ناسی فەلسەفی دەکرد. فرۆم هەر وەکوو مارتین بووبێر و ئەندامانی تری ئەڵقەی *lir house* چییەتی ئینسان بەو شتە دەزانیٚ کە بەهۆی پێوەندی ئینسان لەگەڵ جیهان و دانووستاندن لەگەڵ کەسانی دەورووبەر دەخولٚقیٚ. ئەم بابەتە زۆر ئاشکرا لەدواین بەرهەمەکانیدا، ئەو کاتەی کە دەزگاکەی بەجێهێشت، بەدی دەکرا. بەڵام فرۆم بەردەوام جەختی لەسەر واقیعی زاتی ئینسان دەکرد. مەبەستی ئەو لەو چییەتییە چەمکێکی قەتیس ماو وەکوو *Natura*ی رۆحی نەبوو، بەڵکو پتر چەمکێك بوو کە لەسەر پتانسێلی زاتی مرۆڤ دامەزرابوو واتە شتێك وەکو *physis* ی یۆنانی. هەر بەم پێیە فرۆم لەسەر گەلێك لە هێما ئینسان ناسییەکانی "دەست نووسە ئابووری و فەلسەفییەکانی مارکس جەخت دەکات. لەم بارەیەوە فرۆم لەگەڵ مارکوزەدا نێزیکتر بوو-لای خواروو تا ئەو کاتەی کە مارکوزە هێشتا سەرقاڵی کاروباری دەزگاکە بوو- تا هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ. لەنێو ئەو کەسانەی کە لەگەڵ قوتابخانەی فرانکفۆرتدا هاوکارییان دەکرد فرۆم پتر لەهەموویان چەمکی نامۆیی مارکسی بەکاردەهێنا، بەتایبەت لەو بەرهەمانەی دا کەپاش هاتنەدەرەوە لەدەزگانوسی. ئەو هەوڵی دەدا تاکوو تایبەتمەندی زاتی ئینسان بکاتە بنەمای رۆشنبینیەکانی خۆی لەبارەی مرۆڤی گەشەکردووەوە، بۆیە بەشوێن نیشانەگەلێك لەو بابەتە لەبەرهەمەکانی بیرمەندانێك وەکوو سپینۆزاو دیویی دا دەگەڕا، لەدەیەی 40دا هەوڵی دا بچێتە هەرێمی سەرووی دەروونزانییەوەو بەرەو ئاستی دەزگایەکی ئەخلاقی بڕوات کە ئەویش لەسەر سروشتی ئینسانی دامەزرابێت. لەو دیوی رواڵەتی زانستی ئەخلاقی ئەودا- کە بەشێوەیەکی زۆر تەواو لەکتێبی ئینسان بۆ خۆیدا (1947) باسکراوە-سروشتگەری وەبەرچاو دەکەویٚ کە هەندیٚ لە رەخنەگران پێداگرتن لەسەری بەدژوار دەزانن.

لەدەیەی 40دا فرۆم نەتەنیا دەزگاکە بەڵکوو فرۆیدگەری ئۆرتۆدۆکسی وەلانا. هەڵبەت ئەمە بەو مانایە نییە کە فرۆم تێکڕای رەهەندەکانی هەڵوێستی پێشووی خۆی وەلانا ئەو پاشان نووسی: من هەرگیز فرۆیدگەریم وەلانەناوە مەگەر ئەوەی کە ئەندێشەی فرۆیدو تیۆری لیبیدۆ بەیەك شت بزانریٚ.. لەلای من دەسکەوتی سەرەکی فرۆید چەمکی نەست‌و رەنگدانەوەکانی لەدەروون ژاکاوی (دەروون لاوازی)دا و خەونەکان‌و هەروەها "رووبەڕووبوونەوە" (راوەستان) و بۆچوونی

گەشەمەندانە لەکەسایەتییە. تێکڕای ئەم چەمکانە لەبەرهەمەکانی مندا زۆر گرنگن و ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ چونکە من تیۆری لیبیدۆی فرۆیدم وەلاناوە، فرۆیدگەریم وەلاناوە بۆچوونێکی هەڵەیە کە لەروانگەی فرۆیدگەری ئۆرتۆدۆکسەوە سەیری ئەو دیاردەیە دەکات. لەهەرحاڵدا من دەروونشیکاریم وەلانەناوەو قەت هەوڵی دامەزراندنی قوتابخانەیەکی تایبەتم نەداوە. ئەگەرچی ئەنجوومەنی نێونەتەوەیی دەروونشیکاری منی دەرکردووە بەڵام هێشتا (1971) ئەندامی ئەنجوومەنی دەروونشیکاری واشەنگتۆنم کە ئەنجومەنێکی فرۆیدییە. من بەردەوام لەفرۆیدگەری ئۆرتۆدۆکس و شێوە برۆکراتێکەکانی رێکخراوە فرۆیدییە نێونەتەوەییەکان رەخنەم گرتووە بەڵام تێکڕای کاری تیۆریکی من لەسەر گرنگترین کەشفەکانی فرۆید داڕێژراوە جگە لە چەمکە بان دەروونناسانەکانی ئەو نەبێ.

لەروانگەی خاوەن رایانی ترەوە، دەست هەڵگرتنی فرۆم لەتیۆری لیبدۆو توخمە سەرەکییەکانی تری ئەندێشەی فرۆید، وەکو گرێی ئۆدیب، بەواتای دوورکەوتنەوەیەکی بەرینە لەئەندێشەی ئۆرتۆدۆکسی، بۆیە بەو پێیە دەتوانین بڵێین فرۆم رێڤیزیۆنیستێکی تەواوە. فرۆم بەجیاوازی دانان لەنێوان کەشفە کلێنیکییەکانی فرۆیدو بان دەروونزانییەکانی ئەو کە مەبەستی فرۆم نەتەنیا رەوت و روانگە کێشە خوڵقێنە ناسراوەکانی فرۆید لەمەڕ غەریزەکانی ژیان و مەرگ دەگرێتەوە بەڵکو تیۆری بڕواپێکراوی لیبیدۆشی لەبەردەگرت- دەبووە هۆی تووڕەییەکی زۆر لەلایەن ئەو کەسانەوە کە پێوەندییەکی نێزیکیان لەنێوان ئەو دووانەدا دەدیت یەکێک لەو کەسانە هاوڕێی نێزیکی خۆی لەو دەزگایەدا بوو. ئەگەر چی هیچکات فرۆم لە هەوڵدان بۆ تێکەڵکردنی دەروونشیکاری و مارکسیسم پاشگەز نەبووەوە بەڵام دوایین هەوڵەکانی ئەو لەسەر شێوەگەلێکی دیاریکراو لەکاری فرۆید داکۆکی نەدەکرد بەڵکو بەشێوازێکی روو لەگەشە ئەو هەوڵانە لەسەر ئەو رۆشنبینییە دەروونناسانە دەرۆیشت کە لەلایەن مارکسەوە پێش بینی کرابوو. کاتێ کە فرۆم لەساڵی 1963 دا خەریکی نوسینی ژیاننامەی هزری خۆی بوو، مارکسی وەك بیرمەندێکی مەزنترو کاریگەرتر لەپرۆسەی ئاڵوگۆڕی هزری خۆیدا زانی. "مارکس کەسایەتییەکە کە گرنگییەکی مێژوویی-جیهانی هەیە بۆیە لەم رووەوە تەنانەت ناکرێ کە فرۆیدو ئەو پێکەوە هەڵسەنگێندرێن، ئەمە پێویستی بەوتنیش نییە". چەمکی پێغەمبەر ئاسای ئاشتی جیهانی کە هەر لە سەردەمی لاوێتییەوە لەزەینی فرۆمدا رۆچوو بوو بوو بەهۆی ئەوەی کە ئەو سەرەنجی روانگەکانی مارکس لەو بارەیەوە بدات و بەدڵ ئاوەڵاییەوە بۆچوونە هاوشێوەکانی مارکس لەو بارەیەوە وەرگرێ و چاوپۆشی لەهێما کەمتر پۆزەتیڤەکانی فرۆید بکات، هەرچەن کە فرۆم بەگەلێك لەچەمکە فرۆیدییەکان ئەمەکدار مایەوە.

بەهەرحاڵ 30 ساڵ پێش، کاتێ کە فرۆم بوو بەئەندامی ئەو دەزگایە بیروڕایەکی تەواو جیاوازی لەبارەی فرۆیدەوە هەبوو. ئەو پاش تەواوکردنی خوێندن لە زانکۆوەکانی هایدێلبێرگ و فرانکفۆرت و مۆنیخ، لەدەزگای دەروونشیکاری بێرلیندا فێری دەروونشیکاری بوو. ئەو لەلایەن هانس زاخسەوە دەروونشیکاری کراو فرۆیدگەرا گەلێکی بەناوبانگیش، وەکو تیۆدۆریك، کاری فێرکاری ئەویان لەئەستۆ بوو. فرۆم لەساڵی 1936 دا کاری دەرمانکردنی کلێنیکی دەستپێکرد، ئەگەرچی فرۆم وەکو زاخس و زۆربەی دەروونشیکارە سەرەتاییەکانی تر دەورەی پزیشکی نەخوێندبوو. فرۆم پێیوابوو کاری بەکردەوە لەگەڵ نەخۆشەکان بەردەوام بزوێنەرێکی پڕ بایەخ بۆ بەرهەمە

تیۆرییەکانی ئەون، ئەزموونێك کە ئەندامانی تری دەزگا بەدەستیان نەهێنا. نوسراوە سەرەتاییەکانی فرۆم پاش ماوەیەکی کورت لە گۆڤارە دەروونشیکارییە ئۆرتۆدۆکسەکاندا، وەکو نامەی بارهێنانی دەروونشیکاری کە ئا. ج. شتورفێر ئێدیتی دەکردو هەروەها ئۆرگانی فرۆم بەناوی *Imago*، وە دەرکەوتن.

ئەگەرچی زۆربەی ئەو بابەتانەی کە فرۆم هەڵیدەبژاردن پشتخانێکی ئایینیان هەبوو (بۆ نموونە خوێندنەوەی سەبت) بەڵام فرۆم هۆگری سەرەتایی خۆشی لەمەڕ گۆڕانکاری لەدەروونزانی کۆمەڵایەتیدا پیشان دەدا. ئەو وتارەی کە لەساڵی 1931دا لە *psychoanalytische Bewegong* دا بڵاویکردەوەو "دەروونشیکاری و سیاسەت"ی ناو بوو مشتومڕی زۆری لەکۆڕو کۆمەڵە دەروونشیکارییەکاندا لێکەوتەوە. توێژینەوەی بەردەوام و سەرەتایی فرۆم لەژێر ناوی ئاڵوگۆڕ لەبنەماکانی مەسیحدا، کەتوێژینەوەکەی رایك لەبارەی هەمان کێشەوە بزوێنەری فرۆم لەو کارەی دابوو، پیشاندەری ویستی فرۆم لەمەڕ دەوڵەمەندکردنی فرۆیدگەری بەیارمەتی رۆشنبینییە مارکسییەکان بوو. فرۆم دەڵێ بۆچوونی رایك لەمەڕ بەیەکسان زانینی مەسیحییە سەرەتاییەکان، واتە پێناسەکردنی ئەوان بەگرووپێکی دیاریکراو کە خاوەنی واقیعێکی دەروونی وەکویەکن، هەڵەیە لەم بوارەدا رایك لەکەسانێ وەکوو هارناك دەچێ: "ئەو شتەی کە رایك لە بیری دەباتەوە ئەوەیە کە بابەتی دەروونناسانە لێرەدا تاکێکی دیاریکراو یان تەنانەت گرووپێك کە بەشێوەی رێژەیی خاوەنی پێکهاتەیەکی دیاریکراو نەگۆڕی دەروونی بێت نییە بەڵکوو بابەتەکە بریتییە لەگرووپگەلێکی جیاواز کە خاوەنی هۆگری دەروونیو کۆمەڵایەتی جیاوازن". گۆڕانی بنەڕەتی لەبنەماکانی مەسیحدا لەروانگەی فرۆمەوە- هەر لەئیدەی ئاداپتاسیۆنی سەدە سەرەتاییەکانەوە کە تێیدا ئینسان دەبێتە خودا تا بۆچوونی هۆمۆسینی لەمەڕ بەئینسان بوونی خودا-بەرهەمی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانە. تیۆری یەکەم پیشاندەری دوژمنی و سەربزێوی مەسیحییە سەرەتاییەکان لەبەرانبەر دەسەڵاتی باوکدایە.

بەڵام وەرگرتنی تیۆری دووهەم بەواتای قبوڵکردنی دەسەڵاتی خوداو رێنوێنیکردنی دووبارەی رقو قینە بۆ ناخی ئینسانەکان، واتە بۆ ناخی مەسیحییەکان. فرۆم دەڵێ: "هۆکاری ئەم گۆڕانکارییە، گۆڕانەکانی دۆخی ئابووری- کۆمەڵایەتی یان پاشەکشەکردنی هێزە ئابوورییەکان و ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی ئەوانەیە. ئیدئۆلۆگەکانی چینە باڵا دەستەکان بە پیشاندانی دۆخە هێماییەکان بەخەڵك و رێنوێنی توندوتیژی و نارەزایەتی ئەوان بۆ ئەو کاناڵانەی کەلەباری کۆمەڵایەتییەوە خەساریان لێناکەوێتەوە، ئەم گۆڕانکارییەیان بەهێزو خێراکرد".

فرۆم بەجەخت کردن لەسەر وردبوونەوە لەجیاوازییەکانی نێوان تاقمە کۆمەڵایەتییەکان تا پێوەندانی بەرینی فێرکارییە ئیدئۆلۆژیکەکان و پێویستییە دەروونییە گشتییەکان پێکەوە، جەخت لەسەر هەمان بابەت لەرەهەندی دەروونناسانەوە دەکات کە هۆرکهایمەرو مارکوزە-پاش جیابوونەوەی لەهایدگەر-لەمەڕ چەمکی تاك رەهەندی "مێژوویيگەری" (*Historicity*) دەیکەن. فرۆم لەو شوێنانەدا لەتوخمە تایبەتەکانی ئەندێشەی فرۆید کەڵك وەردەگرێ کە مێکانیسمە دەروونشیکارانەکان وەکو چەمکی نێوەنجی نێوان تاكو کۆمەڵگا بەکاردەبات، بۆ نموونە کاتێ کەدوژمنی لەگەڵ دەسەڵاتدا بە هۆی چەمکەکانی رقو قینی ئۆدیپی لەبەرانبەر باوکدا دەردەبڕێ، دەزگا هەر بەو شێوەیە گەلێك لەچەمکە

فرۆیدییەکانی بەکارهێنا، بۆورکنا لەیەکەمین ژمارەی *zeitschrift* پێی سپێردرا کە لەبارەی گۆڕانکاری لە بنەماکانی مەسیحدا ڕەخنەیەك بنووسێ‌و ئەو ئەم وتارەی وەکو یەکەمین نموونەی کۆنکرێتی تێکەڵکردنی ئەندێشەکانی مارکس و فرۆید زانی.

هەر لەو ژمارەیەی گۆڤارەکەدا فرۆم هەوڵی دا یاسا بنەماییەکانی دەروونزانی کۆمەڵایەتی شرۆڤە بکات. ئەو لەو وتارەیدا ڕەخنەی لەو بۆچوونە دەگرت کە دەروونزانی تەنیا کاری بەتاکەوەیەو بەمەبەستی ڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوەی ئەم ڕوانگەیە بەرهەمە سەرەتاییەکانی ڕایشی بەنموونە هێنایەوە. ئەگەرچی فرۆم هێرشی دەکردە سەر چەمکی ڕۆحی کۆیی‌و جەماوەری بەڵام لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە تاك بەتەواوی لەهەل‌و مەرجی کۆمەڵایەتی جوداناکرێتەوە. فرۆم ئەرکی ڕاستەقینەی خۆی لەساغکردنەوەو دەوڵەمەندکردنی بنەماکانی مارکسیسم دەزانی و بێ ئەملاولا ئەو ئەرکەی قبووڵ کردبوو. بەڕای فرۆم مارکسیسم بەهەڵە تاوانبار کراوە کە بڕوای بەو دەروونزانییە ساویلکانەیە هەیە کە لەسەر بنەمای بەرچاوتەنگی و فراوانخوازی مرۆڤ دامەزراوە. فرۆم ڕەخنە لەبێرتراند ڕاسل‌و هندریك دۆمەن دەگرێ و ئەوان بەوە تاوانبار دەکات کە بەهەڵە نکوڵی گەری ئابووری پاڵدەدەنە مارکسەوەو بنەمای تێگەیشتنی مارکس لەمرۆڤ لەو خاڵەدا پێناسە دەکەن. فرۆم دەڵێ خاڵە دەروونناسانەکانی مارکس کەمن– کەمتر لەوەی کەفرۆم دوایی پێداگری لەسەر دەکات. لەڕوانگەی مارکسەوە ئینسان خاوەنی پاڵنەری بنەمایی دیاریکراوە. (برسێتی، خۆشەویستی و هتد) کە هەوڵ بۆ وەدیهاتن دەدات. فراوانخوازی تەنها بەرهەمی دۆخە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکانە. بەهەرحاڵ مارکسیسم پێویستی بەرۆشنبینی دەروونشیکاریە، کەسانێك وەکوو کائۆتێسکی و بێرنشتاین بەهۆی بۆچوونی ئیدەئالیستی ساکار لەمەڕ غەریزە ئەخلاقییە زاتییەکان نەیانتوانی لەدانانی پێشەکییەك بۆ ئەو کارە سەرکەون. دەروونشیکاری دەتوانێت ئاڵقەی ونبووی نێوان سەرخانی ئیدئۆلۆژیك‌و ژێرخانی ئابووری– کۆمەڵایەتی ئامادەبکات. بەکورتی دەروونشیکاری دەتوانێت بۆچوونی ماتێریالیستی لە زات‌و چییەتی مرۆڤ دەوڵەمەندبکات.

بەهەرحاڵ فرۆم خاوەنی ئیدەیەکی ڕوون بوو بۆ کەڵك وەرگرتن لەپڕسەمەرترین ڕەهەندەکانی دەروونشیکاری لەدەروونزانی کۆمەڵایەتیدا. ئەو لەسەرەتای وتارەکەی خۆیدا ڕوونی دەکاتەوە کەتیۆری غەریزەکانی مەرگ‌و ژیانی فرۆید بەهۆی تێکەڵکردنی نائەقڵانی ژینەوەرناسی و دەروونزانییەوە ڕەت دەکاتەوە. بەڵام فرۆم ئەو دابەشکارییە سەرەتاییەی فرۆید واتە هاندەرە ئۆرۆتیکەکان‌و پاراستنی نەفس قبووڵ دەکات. لایەنی دووهەمی ئەو دابەشکارییە واتە پاراستنی نەفس دەکرێ بەهۆی خولیاگەری و جێگۆڕکێ و هەڵدانەوەوە قەرەبوو بکرێتەوە (بۆ نموونە، دەکرێ سادیسم بەهۆی هەندێ لەشێوە پەسەندکراوە کۆمەڵایەتییەکانەوە قەرەبوو بکرێتەوە) بەڵام لایەنی یەکەمی ئەو دابەشکارییە، واتە لەهاندەرە ئۆرۆتیکەکاندا، وەها دیاردەیەك قەت ڕوو نادات (برسێتی تەنها بەهۆی نانەوە دادەمرکێتەوە)، هەڵبەت سێکسواڵیتە لەگەڵ دۆخە کۆمەڵایەتییەکاندا هاوئاهەنگییەکی پتری هەیە. دەروونناسی کۆمەڵایەتی شرۆڤەکەر ئەرکی ئەوەیە کە، ئەو ڕەفتارەی کە بەهۆی نەستەوە هەڵخڕێنراوە بەپێی کاریگەرییەکانی ژێرخانی ئابووری– کۆمەڵایەتی لەسەرهاندەرە سەرەکییە دەروونییەکان دەرك بکات. فرۆم دەڵێ ئەزموونەکانی سەردەمی منداڵی بەتایبەت گرنگی هەیە چوونکە بنەماڵە هۆکارێکی کۆمەڵایەتییە. (جەختکردنی فرۆم لەسەر

بنەماڵە لەماوەی سەرقاڵبوونیدا بەردەوام بوو ئەگەرچی فرۆم دوایی دەڵێ: "نابێ دەروونشیکار تەنیا ئەزموونەکانی سەردەمی منداڵی لەبەرچاو بگرێ بەڵکوو دەبێ سەرنج بداتە ئەو ڕەوتە نەستانەی کە ئێستا لەئارادایە"، بۆیە فرۆم بەو وتەیە جەختی خۆی لەسەر سەردەمی منداڵی هێور دەکاتەوە. ئەمە لەحاڵێکدایە کە ئەو لەسەرەتاکانی دەیەی 30دا بەهۆی بڕوای پتەو بە دەروونشیکاری ئۆرتۆدۆکسەوە جەختی زۆری لەسەر سەردەمی منداڵی دەکرد).

پاشان فرۆم دەڵێ هەر کۆمەڵگایەك خاوەنی پێکهاتەی لیبیدیناڵی تایبەت بەخۆیەتی کەبریتییە لەلێکدراوی هاندەرە سەرەکییە ئینسانییەکان و هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان. ئەرکی دەروونزانێکی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە بزانێ ئەم پێکهاتە لیبیدیناڵە چۆن وەکو پێوەنددەری کۆمەڵگا کاردەکات و چۆن لەسەر دەسەڵاتداریێتی سیاسی کاریگەر دەبێ. لێرەدا دەبێ ئەوەش زێدەبکرێ کە ڕوانگەکانی فرۆم لەسەر ئەزموونە کردەوەییەکان دامەزراوە. پرۆژەی توێژینەوەی نموونەکانی دەسەڵاتی کرێکاران کەبڕیاری بەڕێوەچوونی لەپەیڤین کاتی کرانەوەی هۆرکهایمەردا ڕاگەیەندرابوو، لەگەڕدا بوو و فرۆم زۆرتر کارە ئەزموونییەکانی سەرپەرەشتی دەکرد. هەر بەو جۆرەی کە ئەو لە وتارەکەیدا ڕوونی کردەوە پێش گریمانەی ئەم توێژینەوەیە وەلانانی ئەو نۆرمە بۆرژواییانە بوو کە لەلایەن زۆربەی دەروونزانەکانەوە بە ڕەها وەرگیرابوون. ئەو دەڵێ کە گشتاندنی ئەزموونی کۆمەڵگای ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ گشتاندنی گرێی ئۆدیپ بەسەر تەواوی گۆڕانکارییە مرۆڤییەکاندا. بەڵام لەڕاستیدا ئەم گرێیە تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگا "باوکسالار"ەکان. دەبێ دەروونزانی کۆمەڵایەتی بەو ڕاستییە بگات کە لەکاتی گۆڕانی ژێرخانی ئابووری-کۆمەڵایەتی هەر کۆمەڵگایەکدا، کارکردی کۆمەڵایەتی پێکهاتەی لیبیدیناڵی ئەو کۆمەڵگایەش گۆڕانی بەسەردا دێت. فرۆم دەڵێ لەکاتی هەڵچوون و داچوونی نێوان ئەو دووانەدا ئەگەری هاتنەئارای دۆخێکی مەترسیدار زۆرە. فرۆم دواتر لەدەیەکانی پاشتردا لەکتێبی هەڵاتن لەسەربەستیدا ئەو پرسەی سەرەوەی تا ڕادەیەکی زۆر بەربڵاوتر کردەوە.

پاشان فرۆم بەمەبەستی ئامادەکاری بۆ گشتاندنی تیۆرییەکانی، لەیەکەمین وتاری لە *zeitschrift* دا، سەرنج دەداتە پرسی دابەشکردنی کەسایەتییەکان. لێرەشدا فرۆم فرۆیدی دەمێنێتەوە. ئەو لەزۆر بواردا بۆچوونی دەروونشیکارانەی کەسایەتی وەکو شێوازبەندی پەرچەکردارانەیان هەڵدانەوەی هاندەرە بنەماییەکانی لیبیدیناڵ قبووڵ کرد. فرۆم بەپێی ڕوانگەکانی کارل ئابراهام و ئێرنێست جۆنز دەستی دایە داڕشتنی جۆرەکانی کەسایەتی ئۆراڵی و ئاناڵی و جێنتاڵی. فرۆم لەنێوان ئەو سێ جۆرە لەکەسایەتیدا، جەختی لەسەر کەسایەتی جێنتاڵی دەکردو ئەو جۆرە کەسایەتییەی لەگەڵ سەربەخۆیی و ئازادیو هاوڕێیەتیدا بەتەبا دەزانی. ئەو لەگەڵ کەسایەتی ناجێنتاڵیدا دوژمنی دەکرد. ئەو ڕوانگەیە، لەتایبەتمەندییە بەرچاوەکانی دوایین بەرهەمەکانی ئەو بوو، ئەو بۆچوونە ئەوی لەمارکوزە جودا دەکردەوە، مارکوزە ڕوانگەیەکی زۆر جیاوازی لەبارەی "بێ سەرەو بەرەیی چەند شێوەیی". (*perversity polymorphous*) پێش جێنتاڵی هەبوو. لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ کە ئەو ڕوانگەیەی فرۆم لەگەڵ ڕوانگەی ڕایش دا، کە لەو کاتەدا بۆ خۆی خەریکی دابەشکردنی جۆرەکانی کەسایەتی بوو، نێزیکتر بوو. ئەو دووانە هەروەها لەبارەی دەرەنجامە ڕزگاری دەرانەکانی پێوەندی جنسی جێنتاڵی سەرکوتنەکراووە هاودەنگ بوون، ئەگەرچی فرۆم ئەو بابەتەی بەتەواوکەر نەدەزانی. لەساڵەکانی دواتردا گومان و

دوودڵی فرۆم لەمەڕ روانگەکانی رایش پتر بۆوە چونکە فرۆم گەیشتە ئەو بڕوایە کە نازییەکان دەریان خستوە کە ئازادی جنسی رەنگە نەبێتە هۆی ئازادی سیاسی.

فرۆم پاش جەخت کردن لەسەر گرینگی بنەما سەرەکییە لیبیدیناڵەکان لەجۆرەکانی کەسایەتیدا هەنگاوێکی تر چووە پێشەوەو بۆ جارێکی تر جەختی لەسەر کاریگەری ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانەکرد کە بەرهەمی یاساو رێساکانی بنەماڵەیە. بۆ نموونە ئەو باسی کاریگەری خرووخدەی زۆر سەرکوتکەرانەی جنسی دەکرد کە رەنگە ببێتە هۆی بەربەست لەبەرانبەر ئاڵوگۆڕی رێکوپێکی سێکسواڵیەتی جێنتاڵیداو بەو پێیە جۆرەکانی کەسایەتی پێش جێنتاڵی بەهێزبکرێن.

فرۆم (لەم نووسراوەیەدا) کەم تا زۆر فرویدیستێکی ئۆرتۆدۆکسە: "لەبەرئەوەی کە بنەمای نیشانەکانی کەسایەتی لەپێکهاتەی لیبدیناڵ دایە، ئەم نیشانانە بەشێوەیەکی رێژەیی خاوەنی سەقامگیرین" لەکۆتایی وتارەکەی فرۆم سەرنجێکی هەمەلایەنەی پێوەندی نێوان "رۆحی سەرمایەداری" و ئانالی بوون دەدات. ئەو بەکەڵك وەرگرتن لەبەڵگەهێنانەوەی نویٚ، ئەقلاٚنییەتی پاوان خوازانەو خاوێنگەرانەی بۆرژوایی پێوەند دەداتە دیسیپلین و سەرکوتگەری ئانالییەوە. ئەو دەڵیٚ رەنگدانەوەی ئەو تایبەتمەندییە بۆرژواییانە، بەهۆی کەلێنی نێوان ئایدۆلۆژی (بەمانای بەرینی وشەکە جۆرەکانی کەسایەتیش دەگرێتەوە) و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی–ئابوورییەکان، سەدەی بیستەم و کۆڕو کۆمەڵە پرۆلیتارییەکانیشی گرتۆتەوە. پێوەندی نێوان ئەو دوو دیاردەیە پێوەندییەك بوو کە فرۆم لەدوایین توێژینەوەی لەمەڕ چاکسازی دینی، کە لە کتێبی هەڵاتن لەسەربەستیدا هاتووە، گەڕاوەتەوە سەری. بەڵام تا ئەو کاتە روانگەی ئەو لەبارەی ئانالی بوونو تیۆری لیبیدۆی فرۆید بەگشتی ئاڵوگۆڕی گەورەی بەخۆوە دیبوو. ئەگەرچی وەسف کردنی کلینیکی لەکەسایەتی جۆری ئانالی لەم دوایین بەرهەمەیدا نەگۆڕابوو بەڵام شرۆڤەکردنی فرۆم بەتەواوی رەنگێکی تری بەخۆوە گرتبوو.

هەر بەو جۆرەی کەپێشتر ئاماژەی پێکرا هۆکاری ئەو گۆڕانە وردبوونەوە کلێنیکییەکانی ئەوبوون. بەڵام سەرچاوەیەکی هزریش بوونی هەبوو کەیارمەتی ئەو بدات بۆ داڕشتنی روانگەی نوێی خۆی. لەناوەڕاستەکانی دەیەی بیستدا فرۆم بۆ یەکەمجار لەگەڵ بەرهەمەکانی تیۆری داڕێژو ئینسانناسی سویسری سەدەی نۆزدە، یۆوهان یاکوب باخۆفن، ناسیاری پەیدا کرد. توێژینەوەکانی باخۆفن لەبارەی فەرهەنگی دایکسالارییەوە کە بۆیەکەمجار لەدەیەی شەستی سەدەی نۆزدەهەمدا بڵاوکرایەوە دوو دەیە پاش مەرگی لەساڵی 1887 دا وردە وردە لەبیرچۆوە. بۆ نموونە، ڕامانە دەروونناسانەکانی فرۆید لە بنەڕەتدا لەتوێژینەوەکانی سێرجیمزفریزر لەمەڕ تووتێمیسمەوە سەرچاوەی گرتبوو، بەڵام باخۆفنو تیۆری داڕێژەرانی تری دایکسالاری، وەکوو لوییس مۆرگان، پێش ئەوەی لەبیربرێنەوە لەکۆڕو کۆمەڵە سۆسیالیستییەکاندا ناسراوییان بە دەستهێنا. بۆ نموونە کتێبی ئەنگڵس بەناوی سەرچاوەی بنەماڵە (1884) و کتێبی بێبل بەناوی ژنو سۆسیالیسم (1883) زۆر قەرزداری ئەوانەیە.

لەدەیەی بیستی سەدەی بیستەمدا تیۆری دایکسالاری شەوقو جمو جۆڵێکی نوێی خستەنێو کۆڕو کۆمەڵە جۆر بەجۆرەکانەوە. رەخنەگرە دژ بەمۆدێرنیستەکانی کۆمەڵگای بۆرژوایی، کەسانێك وەکوو ئالفرێد بۆوملرو لوودویك گلاکز، بەهۆی هێما رۆمانتیك و سروشت گەرانەو دژی هزرییەکانی ئەو تیۆرییە روویان لێکرد. هەندیٚ لە قوتابیانو شوێن کەوتووانی گێئۆرگە (شاعیر) بیری

دژ بەژنی مامۆستاکەیان وەلاناو ئاڵقەی گێئۆرگەیان بە مەبەستی دۆزینەوەی ژنێتی هەمیشەیی بەجێهێشت. هەر بەو جۆرەی کە ی. م. باتلێر ئاماژەی پێکردووە ئەو رووداوە دووپاتبوونەوەی گەڕانی شوێنکەوتووانی سەن سیمۆنی فەرەنسی بوو بەشوێن "دایکی-عیرفانی" لەحەفتاساڵ پێشدا. لەو ئاڵقەئینسان ناسانەی بریتانیادا کە ئۆرتۆدۆکستربوون لە توێژینەوەکانی برۆنسیلاو مالینۆفسکی لەمەڕ فەرهەنگی دایك سالار، کتێبی سێکس‌و سەرکوتکەری لەکۆمەڵگای وەحشیدا، (1927) کەڵك وەردەگیرا تا بەو جۆرە گشگیربوونی گرێی ئۆدیپی فرۆید رەتبکرێتەوە. هەر لەو کاتەدا کتێبی رابێرت بریفۆ بەناوی دایکان: توێژینەوەیەك لەمەڕ بنەماکانی هەستەکان و دامەزراوەکان (1927) هۆگرییەکی زۆری لێکەوتەوە.

هەروەها لەکۆڕو کۆمەڵە دەروون شیکارییەکانیشدا تیۆری دایك مەزنی لەبەرتیشکێکی نوێدا کەوتە بەر سەرنج. ویلهێڵم رایش لەو یەکەم کەسانە بوو کە سەرەنجی ئەو بابەتەی دا، ئەو لەساڵی 1933 لەکتێبی دەروونزانی جەماوەری فاشیسمدا نووسی دایك مەزنی تەنیا جۆری راستەقینەی بنەماڵەیە لە "کۆمەڵگای سروشتی"دا. فرۆمیش یەکێ لەهەڵسووڕاوترین لایەنگرانی دایك مەزنی بوو. ئەو ساڵی 1932 لەتوێژینەوەیەکی درێژدا کتێبی دایکانی لە *zeitschrift* دا بەئەڵمانییەکان ناساند. پاشان وتاری بریفۆ بۆخۆی بەناوی "هەستە بنەماڵەییەکان" بەزمانی ئینگلیسی لەچاپدرا. فرۆم بەتایبەت ئەو تیۆرییەی بریفۆی وەرگرتبوو کە پێیوایە تێکڕای خۆشەویستییەکان و هەستە بەرانبەر خوازانەکان لەبنەڕەتدا لەخۆشەویستی دایکانەوە هاتوون کەئەوەش بۆ خۆی بەرهەمی سەردەمی درێژخایەنی زگپڕی و چاوەدێریێ پاش زایینە. کەوابوو بەپێچەوانەی روانگەکانی فرۆیدەوە خۆشەویستی بەرهەمی سێکسوالیتەنییە. لەراستی سێکس زۆرتر پێوەندی بەرق‌و لەنێوبردن-ەوە هەیە. فرۆم هەروەها رێز لەسەرنجدانی بریفۆ بۆ هۆکارە کۆمەلأیەتییەکان دەگرێ. پیاوێتی و ژنێتی بەپێچەوانەی بۆچوونی رۆمانتیکەکان پیشاندەری جیاوازییەکی "زاتی" جنسی نییە، ئەوانە لەجیاوازی لەکارکردەکانی ژیانەوە پێکهاتوون، ئەو کارکردانە بەهۆی کۆمەڵگاوە دیاریکراون. کەوابوو لەباری ئابوورییەوە مەڕداری تاك هاوسەریی بەهێز کردووە، ئەوکارە بەهۆی بزاڤو سەرپەرەشتیاری شوانی پیاوەوە بەرێوەدەچێت. فرۆم دەگاتە ئەو ئاکامەی کەبریفۆ لەتێبینییە ئەتنیکییەکان سەرتر دەچێت و دەچێتە بەستێنی ماتێریالیسمی مێژووییەوەو ئەو راستییە لەوتاری ئەو لە *zietschrift* دا دیارە، لەو وتارەدا جەخت لەسەر گرنگی هۆکارە ئابوورییەکان لە گۆڕانکاری بنەماڵەدا کراوە.

فرۆم لەژمارەی دواتری *zietschrift* دا راستەوخۆ سەرنجی ئەندێشەکانی باخۆفن دەدات. ئەو سەرەتا بەوردی باسی جیاوازییەکانی نێوان ئەو توخمە جۆربەجۆرانە دەکات کە لەتیۆری دایکسالاریدا بوونیان هەیەو بۆ رەخنەگرانی راست‌و چەپی کۆمەڵگای بۆرژوایی جێگای سەرنجن. نۆستالۆژیای ئاڵۆزی باخۆفن لەمەڕ رابوردوو و روانگەی رۆمانسیانەی ئەو بۆ سروشت سەرنجی راستەکان رادەکێشێ. کەوا بوو ئینسان دەبێ وەك منداڵێك کەخۆی دەداتە دەستی دایکەوە خۆی بداتە دەست سروشتەوە. باخۆفن وەکوو رۆمانتیکەکان بەلأم بەپێچەوانەی بریفۆوە جیاوازییە مەعنەوییەکانی نێوان ژن‌و پیاو دەکاتە دیاردەیەکی رەها (بەرای فرۆم ئەو بۆچوونە پیشاندەری ناڕەزایەتی دەربڕینە بەدژی ئازادکردنی ژنان لەلایەن رۆشنگەرییەو دژایەتییە لەمەڕ گەیشتنی ئەوان بەپلەوپایەی پیاوانی بۆرژوا).

بۆوملرو كلاگزو تیۆری داریێژەرانی گەلی (*vokisch*) تەنیا لە بەرانبەر مەتافیزیكی سروشتگەرانەی باخۆفندا وە جوولەكەوتن و ئەو دیاردەیەیان بەرەو لای گیرایی هەڵقولاوی (*schwamerei*) عیرفانی پاڵپێوەنا. ئەو شتەی كە ئەوانە لێی ئاگادار نەبوون رۆشنبینییە دەروونناسانەكانی باخۆفن بوو.

لەلایەكی ترەوە ئەو رۆشنبینییانەی باخۆفن سەرچاوەی گیرایی ئەو بۆ چەپەكان بوو. كۆمەڵگای دایك سالار لەسەر هاوپشتی و بەختیاری مرۆڤ جەخت دەكات. بەها سەرەكییەكانی ئەو كۆمەڵگایە لێبوردن و خۆشەویستین نەك ترس و شوێنكەوتوویی. خاوەندارێتی تایبەت و سێكسواڵیتەی سەركوتكراو لەو كۆمەڵگایەدا بوونیان نییە. هەر بەو جۆرەی كە ئەنگڵسو بێبل دەڵێن كۆمەڵگای باوكسالار پێوەندی بەچینایەتی بوونی كۆمەڵگاوە هەیە. ئەو دوو نوسەرە جەختیان لەسەر ئەو راستییە كردووە كە لە كۆمەڵگای باوكسالاردا ئەرك و دەسەڵاتدارێتی بەسەر خۆشەویستی و بەدیهاتنی پێویستییەكاندا زاڵن. ئەگەر لە گۆشەنیگایەكی تایبەتەوە بڕوانین دەبینین فەلسەفەی مێژووی باخۆفن لەفەلسەفەی مێژووی هێگڵ دەچێ. دەركەوتنی كۆمەڵگای باوكسالار لەگەڵ پێكهاتنی كەلێن لەنێوان رۆحو سروشت و سەركەوتنی رۆم بەسەر رۆژهەڵاتدا هاوئاهەنگی هەیە.

هەر بەو جۆرەی كە چاوەڕوان دەكرێ بەڕای فرۆم تێگەیشتنی سۆسیالیستی لەبەرهەمەكانی باخۆفن باشترو دروست ترە. ئەو دەڵێ گرنگی توێژینەوەی كۆمەڵگای دایك سالار بەهۆی گرنگی مێژوویی ئەو دیاردەیە نییە–لەراستیدا سەلماندنی بوونی ئەو جۆرە كۆمەڵگایانە لەرابوردوودا ئەستەمە– بەڵكو گرنگی ئەو توێژینەوەیە لەوەدایە كە ئالترناتیڤێكی راستەقینە دیاردەخات. فرۆم هەر وەكوو مالینۆفسكی لەتیۆری دایك مەزنی كەڵك وەردەگرێ تا گشتی بوونی گرێی ئۆدیپ رەتبكاتەوە. ئەو دەڵێ گرینگی ئەو گرێیە لەكۆمەڵگای باوكسالاردا دەگەڕێتەوە بۆ دەوری كوڕ لەو كۆمەڵگایەدا وەكوو میراتگری سەروەت و سامانی باوك و پاراستنی باوك لەسەردەمی پیریدا. كەوایە بارهێنانی كوڕ لەسەرەتادا بەمەبەستی قازانجی ئابوورییە نەك بەدەستهێنانی بەختیاری. دەكرێ خۆشەویستی نێوان باوك و كوڕ بەهۆی ترسی كوڕ لەسەرنەكەوتن و بەزین ببێتە هۆی قینێكی هەمەلایەنە. بۆیە وەها خۆشەویستییەكی كاتیو لەرزۆك دەتوانێ ببێتە هۆی لەدەستچوونی تەناهی مەعنەوی و زاڵبوونی ئەرك وەكوو ناوەندی هەبوون.

لەلایەكی ترەوە خۆشەویستی دایكانە بێ ئەم لاو ئەولایەو كەمتر زەختە كۆمەڵایەتییەكان لەسەری كاریگەر دەبن. بە هەرحاڵ لەكۆمەڵگای ئێستادا هێزی راستەقینەی دایك زۆر لاواز بووە، چیدی دایك وەكوو پشتیوان چاوی لێ ناكرێ بەڵكوو پتر وەكو كەسێ چاوی لێدەكرێ كە پێویستی بەپشتیوانی هەیە. فرۆم دەڵێ ئەو دیاردەیە لەبارەی جێگرەكانی دایك وەكوو وڵات یان خەڵكیشەوە راستە. گوناهی باوكانەو سەركوتكەری ئانالی و ئەخلاقی دەسەڵاتخوازانە بوونەتە جێگری بڕواپێكراوی و هاودڵی دایكانە. سەرهەڵدانی پرۆتێستانیسم، دەستڕۆیشتوویی باوكی پتر كردووەو هاوكات تەناهی كاتۆلیسیسمی لەسەدەی نێوەڕاستیی هاوڕێی لەگەڵ كڵێسەیەك كە وەكوو منداڵدانی دایك و ئایینی دایكی پیرۆز بوو كاریگەری خۆیان لەدەستدا. بنەما دەروونییەكانی سەرمایەداری باوك سالارانەیە ئەگەرچی سەماریەداری بەشێوەیەكی پارادۆكسی دۆخەكانی گەڕانەوە بۆ فەرهەنگی دایكسالاری راستەقینەی خوڵقاندووە. هۆی ئەم دیاردەیەش زۆربوونی ئەو كاڵاو خزمەتگوزارییانەیە كە سەرمایەداری پێكی

هێناون. ئەو راستییەش وەها دۆخێك دەخوڵقێنێ كە كەمتر روو بەقازانجخوازی بڕوات، فرۆم دەگاتە ئەو ئاكامە كە سۆسیالیزم دەبێ باوەشی ئاوەڵا بۆ ئەو گەڕانەوەیە بكاتەوە.

لەگەڵ زیادبوونی هۆگری فرۆم بۆ روانگەكانی باخۆفن هۆگری ئەو لەمەڕ فرۆیدگەری ئۆرتۆدوكس كەم دەبێتەوە. ئەو لە ساڵی 1935 لە *zeitschrift* دا سەرچاوەو هۆكارەكانی دووركەوتنەوە لە فرۆیدگەری ئۆرتۆدۆكس باس دەكات. ئەو دەڵێ فرۆید لەچوارچێوەی ئەخلاقی بۆرژوایی و بەهاكانی كۆمەڵگای باوكسالاردا زیندانییە. ئەو لەدرێژەدا دەڵێ بەرهەمی جەخت كردن لەسەر چاخی منداڵی ئەوەیە كە سەرنج نادرێتە دەروونشیكار ئەگەر دەروونشیكار بەشێوەیەكی ناڕەخنەگرانە چاو لەبەها كۆمەڵایەتییەكان بكات و ئاوات و ویستەكانی نەخۆش لەگەڵ ئەو بەها كۆمەڵایەتییانەدا یەكنەگرنەوە، ئەگەری ئەوەی كە دەروونشیكار رووبەڕووبوونەوە (راوەستان)ی نەخۆش هەڵفڕێنێت زۆرە. ئەگەرچی دەروونشیكار دەبێ بێ لایەنی خۆی بپارێزی و بە ئاسانگیرییەوە لەگەڵ نەخۆش بجولێتەوە. بەڵام فرۆم دەڵێ ئاسانگیری لەراستیدا لەباری مێژووییەوە خاوەنی دووسیمایە.

روانگەی فرۆم لەبارەی ئاسانگیرییەوە شیاوی شرۆڤەكردنێكی پترە، چونكە ئەو روانگەیە پیشاندەری بۆچوونێكە كە ئەندامانی تری دەزگاتێیدا بەشداربوونە، بۆچوونێك كە پاشان لە یەكێ لە كێشە خوڵقێنترین و كاریگەرترین وتارەكانی ماركوزەدا دووپات كرایەوە. بەرای فرۆم ئامانجی خەباتی بۆرژوایی بۆ دابینكردنی ئاسانگیری لەسەرەتادا بەمەبەستی لابردنی سەركوتی كۆمەڵایەتی بوو، بەڵام كاتێ كەچینی نێوەنجی لەباری كۆمەڵایەتییەوە سەركەوت، ئاسانگیری بوو بەدەمامكێك بەمەبەستی بێ سەرەو بەرەیی ئەخلاقی. ئەو جۆرە ئاسانگیرییە قەت تا ئەو رادەیە نەچووە پێشێ كە هەڕەشە لە دێسیپلینی كۆمەڵایەتی دامەزراو بكات. هەر بەو جۆرەی كە لەبەرهەمەكانی كانتدا دیارە، ئاسانگیری بۆ ئەندێشەو پەیڤینە نەك كردەوە. ئاسانگیری بۆرژوایی بەردەوام خۆی رەتدەكاتەوە: وشیارانە رێژەگەرو بێ لایەنە بەڵام لەراستیداو بەشێوەیەكی ناوشیارانە بەمەبەستی پاراستنی دۆخی ئێستا دارێژاوە. بەڕای فرۆم دەروونشیكاری خاوەنی دوو سیمابوونی ئەو جۆرە ئاسانگیرییەیە. رواڵەتی بێ لایەن زۆرجار پەردەیەكە بۆ ئەو شتەی كەفرۆم سادیسمی شاراوەی پزیشكی پێ دەگوت.

بەهەرحاڵ فرۆم هەنگاوی دواتری هەڵنەگرت، دوایی ماركوزە هەنگاوێكی تر چووە پیشەوە. (ماركوزە لەساڵی 1965 دا نووسی: "ئاسانگیری رزگاری دەر بریتییە لەئاسانگیری نەكردن لەبەرانبەر بزاڤە كۆنەپارێزەكان و ئاسانگیری كردن لەبەرانبەر بزاڤە چەپەكاندا.") فرۆم بەجێگەی ئەو كارە دەستی دایە ئاشكراكردنی رەهەندەكانی تری باوكسالاری لەتیۆری فرۆیددا. فرۆم لەو بارەوە دەڵێ ئامانجی دەروونشیكاری ئۆرتۆدۆكس بریتییە لەتوانایی و لێهاتوویی بۆ كاركردن. زاوزێی كردن‌و چێژ وەرگرتن. فرۆید پتر لەسەر دوو بابەتی یەكەم جەختی دەكرد، و بەبۆچوونی ئەو ناتەباییەكی ئاشتی هەڵنەگر لەنێوان شارستانیەت‌و بەدیهاتنی مەیلەكاندا لەئارادایە. بۆچوونی ئەو لەبەرانبەر رادیكاڵە سیاسییەكاندا كە دەیانویست كۆمەڵگایەك دروست بكەن كە تێیدا ئەگەری بەدیهاتنی پتری ویستەكان بێتە ئاراوە، بەتەواوی دوژمنكارانەبوو. بەرای فرۆید تێكڕای ئەو كارانەی كە ئەو كەسانە ئەنجامی دەدەن بریتییە لەپیشاندان و دەرخستنی بەگژداچوونی ئۆدیپی خۆیان لەئاست باوەكانیاندا. لەروانگەی فرۆیدەوە دەروونژاكاوی (دەروونلاوازی) بریتییە لەبێ توانایی تاك لە قبوڵكردن و وەرگرتنی

نۆرمە بۆرژواییەکان. دیاردەیەکی تر کەپێشاندەری بێ توانایی فرۆید بۆ سەرتر چوون لەپشتخانی (بۆرژوایی) خۆیە، پێداگری کردنیەتی لەسەر وەرگرتنی نەختێ هەقدەست دەرمانکردن. دواییەکەشی فرۆم کەسایەتی فرۆید لەجۆری کەسایەتی باوکسالاری کلاسیک دەزانێ کەبەشێوەیەکی بالأدەستانە لەگەڵ نەخۆشەکانی دەجوولێتەوە.

بەڕای فرۆم کەسانێك وەکوو گیئۆرگ گرۆدێك و ساندۆر فرەنچی ئالترناتیڤگەلێکی باشترین بۆ فرۆید. ئەو دیاردەیەی کە ئەوان دەخاتە دۆخێکی باشترەوە تازەگەریی ئەوانە لە دەرمانکردندا. ئەو دوو کەسە دەروونشیکارو نەخۆش لەبەرانبەر یەکترەوە دادەنێن کە ئەو کارە دەبێتە هۆی پێوەندییەکی دوو لایەنەو بەرابەر. دەست هەڵگرتنی فرۆم لەگرێی ئۆدیپ بەو واتایە بوو کە دەوری "گواستنەوە" (*transference*) لەوتێکنیکەی دا کە فرۆم لەمەوبەدوا کەڵکی لێوەردەگرێت کەم دەبێتەوە. گرۆدێك و فرەنچی لەسەر وەرگرتنی هەقدەست زۆر زەختیان نەدەهێناو هەندێ جار لەهەقدەست چاوپۆشیشیان دەکرد. بەپێچەوانەی "ئاسانگیرێتی" باوك سەنتەرو دەسەلأتگەرو بێ هەست و سۆزی فرۆید ئەوان پێشنیاری جۆرە دەرمانێکیان دەکرد کە گەلێك لەئامانجە کورتبینانەکانی سازان لەگەڵ دڵڕەقییە ئەخلاقییەکانی سەردەم سەرتر دەچوو. فرۆم مەرگی ناوەختی فرەنچی بەزەبرێکی قورس بۆ دەروونشیکاری دەزانێ و گەلێك بەداخ دەبێ. فرۆم لەساڵەکانی دواتردا هەوڵیدا ئەو قسەیەی ئێرنێست جۆنز (زاوای فرۆید) رەتبکاتەوە کە دەیگوت فرەنچی لە دوایین ساڵەکانی تەمەنیدا تووشی نەخۆشی دەروون شڵەژاوی (دەروون پشێوی) بووە. فرۆم و هاوسەرەکەی سەرەڕای ساویلکەیی سیاسی گرۆدێك هاوڕێیەتی خۆیان لەگەڵی راگرت –گرۆدێك بۆ ماوەیەك بەهیوا بوو کە لەهیتلێر کەدژی یەهوودبوونی ئەوی بەراست نەدەزانی– داوای یارمەتی ماڵی بکات بۆ بەڕێوەبردنی هەندێ لەکارەکانی بەلأم کاتێ هیتلێر گەیشتە دەسەلأت ئەو ون بوو.

بەگەشەکردنی نارەزایەتی فرۆم لەهەندێ رەهەندی ئەندێشەی فرۆید، مەودایەکی پتر کەوتە نێوان ئەو و ئەندامانی تری دەزگاکەوە. لەپاش نوسینی بەشی پێوەندیدار بەراڤەکردنی دەروونناسانەی دەسەلأت لەو گەلأڵە هاوبەشەدا کەئەندامانی دەزگا ساڵی 1936 لەچاپیانداو ناوی توێژینەوەیەك لەمەڕ دەسەلأت و بنەماڵە بوو، فرۆم تەنها وتارێکی دیکەی بۆ *zeitschrift* نووسی: "توێژینەوەیەك لەبارەی هەستی نەزۆکی لەکۆمەڵگای مۆدێرندا". ساڵی 1939 پێوەندی ئەو لەگەڵ دەزگا پچڕاو پتر بەکاری پزیشکییەوە خەریك بوو و بەشێوەیەکی روو لەزیادبوون بنەما نافرۆیدییەکانی ئەندێشەی خۆی پەرەپێدا. دووساڵ دواتر کتێبی هەلأتن لەسەربەستی کە رەنگە پڕ خوێنەرترین کتێبی ئەوبێ لەچاپدرا. ئەو کتێبە وەکو کتێبی شرۆڤەکردنی دەسەلأتخوازی کەبڕیار بوو ئەمەریکا لەشەڕدا بەرهەڵستی بێتەوە سەرنجێکی زۆری بۆ لای خۆی راکێشاو لەسەردەمی خۆیدا بوو بەکتێبێکی کلاسیك لەبواری خۆیدا. لەبەرئەوەی کە کەسانی تر لەمەڕ ئەو کتێبە باسی زۆریان کردووە لێرەدا وەکو نموونەیەك کەپیشاندەری دووربوونەوەی فرۆم لەفرۆیدو دەزگایە ئاماژەی پێکرا.

فرۆم وەکو ئەو نوسراوە سەرەتاییانە کە لە *zeitschrift* دا لەچاپدراوە، (لەم کتێبەشدا) بەتاوانبارکردنی فرۆید بەکورتبینی فەرهەنگی دەستپێدەکات: "لەروانگەی فرۆیدەوە بەستێنی پێوەندی ئینسانەکان لە بازاڕ دەچێ– کە بریتییە لە دانووستاندنی وەدیهێنانی پێویستییە

بیۆلۆژیکەکان، لەو گۆڕانەوەیەدا پێوەندی لەگەڵ تاکێکدا ئامانج نییە بەڵکوو ئامرازێکە بۆ گەیشتن بەئامانج". ئەو (لە کتێبی هەڵاتن لە سەربەستیدا) توندتر لەهەمیشە ڕەشبینی فرۆید بەڕوانگە ئەو لەمەڕ غەریزەی مەرگ ڕەتدەکاتەوە.

لێرەدا فرۆم غەریزەی مەرگ و نیاز بەتێکدان بەیەك شت دەزانێ، دواتر مارکوزە ئەو جۆرە شرۆڤەکردنە بەهەڵە دەزانێ و بەرەنگاری دەبێتەوە. فرۆم بە وەها بۆچوونێك لەبارەی غەریزەی مەرگەوە دەنووسی: "ئەگەر گریمانەکانی فرۆید دروست بن ئێمە دەبێ وایدابنێین کەرادەی کاولکاری و تێکدەری، چ ئەوکاتەی کەدژ بەتاکبێ و چ ئەو کاتەی کە دژ بەلایەنی بەرانبەربێ، دەبێ کەمتازۆر نەگۆڕبێت. بەڵام وردبوونەوەکانی ئێمە پێچەوانەی ئەمە پیشان دەدەن. نە تەنیا کێشی کاولکاری لە نێوان تاکەکانی فەرهەنگی ئێمەدا زۆر جیاوازە بەڵکو لەنێوان گرووپە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانیشدا کاولکاری ڕادەیەکی نایەکسانی هەیە".

ئەگەرچی فرۆم وەسفە کلینیکییەکانی فرۆیدی بەکاردەهێنا بەڵام درێژەی دەدایە ڕەتکردنەوەی تیۆری لیبیدۆی ئەو. ئەو بەم کارەی بەشی شرۆڤەیی کتێبەکەی خۆی، (بنەماکانی مەسیح)، وەلاناو هەروەها بەئاشکرا دابەشکردنی جۆرەکانی کەسایەتی بەپێی لیبیدۆ، کە ساڵی 1932 لە *zeitschrift* دا بەرگری لێکردبوو، ڕەتکردەوە. باسی فرۆم لەبارەی مازۆفیسم–سادیسم، کە لە گرنگترین چەمکەکانی تیۆری ئەو لەمەڕ دەسەلاتی نائەقلانی بوو، ئامانجی ئەوە بوو کە هەر تیۆرییەك کەباسی توخمە ئۆرۆتیکەکان دەکات وەلابنێت. ئەو لە کتێبی دواتری خۆیدا، ئینسان بۆ خۆی، دابەشکاری خۆی بەپێی بنەما گەلێکی تەواو جیاواز شرۆڤە کرد.

ئەو بۆ یەکەمجار لەنووسراوەکانی خۆیدا دان بەوەدا دەنێت کە لەنێوان ئەندێشەکانی خۆی و کارێن هۆرنای و هەری سك سالیڤان دا هاوسانی هەیە، ئەو کەسانە لەرەهەندێکی هاوسانەوە ریڤێزیۆنیست بوون. فرۆم بۆ جارێکی تر باسی کاریگەری ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانەی کرد کە لەسەر یاسای پتەوی هاندەرەکانی پاراستنی نەفس دامەزرابن، ئەو لەپەراوێزدا، چەمکی "کەسایەتی کۆمەڵایەتی" باسکرد کە پێشتر لەبەرهەمە سەرەتاییەکانیدا ئاماژەی پێکردبوو. چەمکێك کە بەڕای خۆی "گرینگترین یارمەتی ئەوە.. بۆ بواری دەروونزانی کۆمەڵایەتی". ئەو دەنووسێ: "کەسایەتی کۆمەڵایەتی تەنیا بریتییە لەبژاردەیەك لەتایبەتمەندییەکان، کاکڵی سەرەکی پێکهاتەی کەسایەتی زۆربەی ئەندامانی گرووپێك کە بەهۆی ئەزموونە بنەڕەتییەکان و شێوەی ژیانی هاوبەشەوە، ئاڵو گۆڕی بەسەرداهاتووە (جەخت کردنەکە لەفرۆمە)."

فرۆم لەتێکڕای ئەو هەوڵانەیدا لە هەرێمێکی ئاشنادا هەنگاو دەنێ، هەرێمێك کە فرۆم لەنووسراوە سەرەتاییەکانیدا بەشێوەی جۆربەجۆر تێیدا پیاسەی کردووە. ئەو شتەی کە لەکتێبی هەڵاتن لەئازادیدا بەبابەتێکی نوێ دەژمێردرێ هۆگرییەکی گشتی ترە بەو شتەی کە دەکرێ بەدۆخی "سروشتی" مرۆڤ ناوزەد بکرێ. بەڕای فرۆم "نێوەڕۆکی سەرەکی ئەو کتێبە بریتییە لەوەی کە مرۆڤ تا دەکرێ ئازادی پتر بەدەست بێنێ واتە لەو یەکبوونە سەرەتاییەی نێوان ئەو سروشت بپچڕێ و بەشێوەیەکی روو لەزیاد تاکێتی خۆی بەدەست بێنێ، بۆیە ناچار دەبێ یان بەهۆی خۆشەویستی و کاری بەرهەمهێنەرەوە خۆی لەگەڵ جیهان ڕێکبخات یان، بەچێ کردنی جۆرە پێوەندییەك لەگەڵ جیهان کە سەربەستی و یەکپارچەیی تاکێتی ئەو تێکدەدات، بەشوێن

جۆرێك تەناهییەوە بێت" چەمكی نامۆیی كە فرۆم لەنووسراوەكانی ماركسدا بەشێوەیەكی بەڵگەمەند دیبووی، بوو بە سەرچاوەیەكی رووناك لەبۆچوونی نوێی دا. ئێستا ئیدی تەرك بوونەوەو لێكبەستراویی ببوونە دوو جەمسەری بیری ئەو. دەروون ژاكاوی (دەروون لاوازی) بەپێی شێوە تایبەتەكانی پێوەندی نێوان كەسەكان پێناسە دەكرا، بۆ نموونە مازۆخیسم و سادیسم چیدی وەكو دوو دیارە كە بەرهەمی بابەتە جنسییەكان بن چاویان لێنەدەكرا بەڵكوو وەكوو هەوڵدانی تاك بۆ دەربازبوون لەهەستی تاقەت پڕوكێنی تەنیایی و بێ توانایی چاویان لێدەكرا. ئامانجی راستەقینە بریتیی بوو لە "هاورەنگ بوون" لەگەڵ دەورووبەردا، كە ئەمە بەواتای شێوانی یەكپارچەیی و تۆكمەیی نەفس‌و تاكێتی و هەروەها توانەوەیە لەنێو لایەنی بەرانبەردا.

لەكتێبی هەڵاتن لەسەربەستیدا فرۆم لەنێوان دوو بابەت دا جیاوازی دەبینێ، ئەتۆمیزەبوونی تەریكبووی "ئازادی لە"ی سەلبی‌و (هەڵسووڕانی خۆڕسكی كەسایەتی یەكپارچەی "ئازادی بۆ"ی) پۆزەتیڤ.

ئەگەرچی ئەو هەوڵی زۆر دەدات كە ئەو گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتی- ئابووریانەی كە بۆ كۆتاییهێنان بەنامۆبوونی "ئازادی لە"و گەیشتن بە "ئازادی بۆ"ی پۆزەتیڤ پێویستن وە بیربهێنێتەوە، بەڵام جەختی پێویست لەسەر دژوارییەكانی ئەو گۆڕانكارییانە ناكات. لای فرۆم پرسی گۆڕان بەشێوەیەكی گەشبینانەو تەنانەت بەپێی نێوەڕۆكی ئەخلاقییەوە وێنادەكرێ. ئەگەر هاندەرە زاتییەكانی تێكدان نەبووایە، خەونی پێغەمبەرەكانی یەهوود واتە "بۆچوونی ئاشتی گشتی و یەكپارچەیی نەتەوەكان" كە فرۆمی لاو گەلێك لەژێر كاریگەرییدا بوو بەدیدەهات. ئەو لەنووسراوەكانی دواتری خۆیدا جەختی لەسەر بەستراوەیی و پێوەندی نێوان ئەخلاق و دەروونزانی دەكرد. ئەو لەكتێبی ئینسان بۆ خۆی دا دەڵێ: "هەر جۆرە دەروون شڵەژاوییەك پیشاندەری كێشەیەكی ئەخلاقییە، هەر جۆرە بەزین‌و سەرنەكەوتنێك لە هەڵدان و یەكپارچەكردنی كەسایەتیدا كێشەیەكی ئەخلاقییە.." فرۆم لە ساڵەكانی دواتردا ستایشی دەرسە مەعنەوییەكانی رۆژهەڵات بەتایبەت مامۆستایانی زن بوو دایسم- و خۆرئاوا دەكات.

ئەگەر بەشێوەیەكی دادگەرانە باسی فرۆم بكەین دەبێ دان بەو راستییەدا بنێین كە ئەو گۆڕانە لەئەندێشەكانی ئەودا، بریتییە لەجەخت كردن‌و گرینگی دان بەبەشێك لەبابەتەكان نەك گۆڕانێكی رەهاو هەمەلایەنە لەهەڵوێستەكانی ئەودا. فرۆم بەتووڕەییەوە لەبەرانبەر ئەو كەسانەدا كە بەگەشبینییەكی ساویكانە تاوانباری دەكەن دەڵێ: "من بەردەوام لەسەر ئەو راستییە جەختم كردووە كە لێهاتوویی وشیاری مرۆڤ بۆ ئازادی و خۆشەویستی و.. بەتەواوی بەستراوەتەوە بەدۆخە دیاریكراوە كۆمەڵایەتی- ئابوورییەكانەوەو هەر بەو جۆرەی كە لەكتێبی هونەری خۆشویستندا ئاماژەم پێكردووە، تەنیا لەحاڵەتێكی دەگمەندا دەكرێ خۆشەویستی لەكۆمەڵگایەكدا بدۆزرێتەوە كە لەسەر بنەمای دژ بەخۆشەویستی دامەزرابێت". بەهەرحاڵ زۆر ئەستەمە پاش خوێندنەوەی دواییین بەرهەمەكانی فرۆم بەو ئاكامە نەگەین كە ئەو لەچاو هۆركهایمەر و ئەندامانی تری ئەڵقەی ناوەندی دەزگا-كە هیوا كاتییەكەی دەیەكانی 20و 30ی خۆیان وەلانابوو -روانگەیەی گەشبینانە- تری هەیە.

هۆركهایمەرو ئەندامانی تری دەزگا بەگشتی لەگەڵ وتارە سەرەتاییەكانی فرۆم كە لە *zeitschrift* دا لەچاپ درا هاودەنگ بوون، تەنانەت رەخنە سەرەتاییەكانی ئەو لەفرۆیدیان بەدڵ بوو. لەراستیدا فرۆم دوایی ئەو بابەتەی وەبیرهێنایەوە

که کارن هۆرنای و هۆرکهایمەر لەسەرەتای ئەو ساڵانەدا کە لەنیۆیۆرکدا کۆچبەر بوون، پێوەندییەکی نێزیکیان پێکەوە هەبوو. جگە لەمەش دەزگا بەباوەشێکی ئاوەڵاوە ئارەزووەکانی فرۆمی لەمەڕ تێکەڵکردنی دەروونشیکاری و مارکسیسم وەردەگرێت. هۆرکهایمەر لەوتارێکدا بەناوی "مێژوو و دەروونزانی" کە لەیەکەمین ژمارەی گۆڤاری نوێی دەزگاکەدا لە چاپدرا، دانی بە هەنووکەیی بوونی زێدەکردنی رەهەندێکی دەروونناسانە بەتیۆری مارکسیسم دانا. ئەو هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە دەبێ لەکۆمەڵگای ئێستادا بزوێنەرە ئینسانییەکان هەم بەشێوەیەکی، بەوتەی مارکس، "ئیدئۆلۆژیك" و هەم بەشێوەیەکی دەروونناسانە دەرك بکرێن، هەرچی کۆمەڵگا بەرەو ئەقڵانییەت هەنگاو بنێ، بێ گومان ئەو دوو بۆچوونە مانایە کەمتر پێویستن بۆ بەدەستەوەدانی مانایەك لە راستییە کۆمەڵایەتییەکان. بەڵام ئێستا کە روونکردنەوەو شرۆڤەکردنی دەروونناسانە پێویستە بەمەبەستی تێگەیشتن لەهێزی راوەستاوی فۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، پاش لەناوچوونی پێویستی بەرهەستی ئەو هێزانە. هۆرکهایمەر لەگەڵ فرۆمدا هاودەنگە کە دەبێ ئەم دەروونزانییە، دەروونزانییەکی تاکگەربێ. لەهەقیقەت دا هیچ جۆرە رۆحێکی جەماوەری یا وشیاری کۆیی بوونی نییە، ئەگەرچی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر پێکهاتنی دەروونزانی تاك کاریگەرن: "نە تەنیا نێوەڕۆك بەڵکوو پتانسێلی هەڵچوونی دەزگا دەروونییەکان بەهۆی دۆخی ئابوورییەوە بەربەست کراونەتەوە".

لەسەرەتاکانی ساڵەکانی کۆچبەری دا، هۆرکهایمەر وەکوو فرۆم لەقبوڵکردنی غەریزەی مەرگ خۆی دەبوارد. هەتاکوو ساڵی 1936 هۆرکهایمەر، بەتایبەت لە وتاری "خۆویستی و بزاڤ بۆ سەربەستی" دا، هێرش دەکاتە سەرتیۆری غەریزەی مەرگ و بەهۆکاری پاسیڤ بوونی مرۆڤی دەزانێ. ئەو دەڵێ بەرهەمە سەرەتاییەکانی فرۆید پتر لایەنی دیالێکتیکی یان هەیەو بەرهەمە دواییەکانی ئەو پتر ژینەوەرناسانەو پۆزیتیڤیستین، روانگەی فرۆید لەبارەی هاندەرە تێکدەرانەکانەوە پتر وەبیرهێنەرەوەی بڕوای سەدەی نێوەراستییە لەمەڕ شەیتانی ئوستوورەییەوە. فرۆید لەمێژوو مەندبوونی سەرکوت نائاگایەو دۆخی ئێستا بەرەها دەزانێ و بەرەو ئەو روانگەیە پاشەکشە دەکات کە گوایە پێویستە بەردەوام ئێلیتەکان رێگای جەماوەری تێکدەر بەربەست بکەن. لەدواییەکانی دەیەی 30دا فرۆمو ئەندامانی تری دەزگا هەرکامەیان رەوتی گرتنە پێشی رێگای تایبەت بەخۆیان دەستپیکرد. ئەندامانی تر قەت بەشێوەیەکی هەمەلایەنەو تەواو جیاوازی نێوان دایکسالاری‌و باوکسالارییان وەرنەگرت، ئەو شتەی کە فرۆم جەختی لەسەر کردبوو. تەنیا والیێتر بێنیامین کە قەت فرۆمی نەدیتبوو ئەندامی ئاڵقەی ناوەندی دەزگاش نەبوو هۆگرییەکی زۆری لەمەڕ بەرهەمەکانی باخۆفن پیشاندا. ئەندامانی تر لەقبووڵکردنی روانگەی فرۆم کە فرۆیدی وەکو نوێنەری ئەندێشەی باوکسالاری وەلا نابوو، سڵیان دەکرد. فرۆم هۆی جیابوونەوەی خۆی لەدەزگا بەوە دەزانێ کە هۆرکهایمەر "فرۆیدێکی شۆڕشگێڕتر"ی کەشف کرد. لەبەرئەوەی کە فرۆید قسە لەسێکسوالیتە دەکات، هۆرکهایمەر لایوایە کە روانگەکانی فرۆید پتر لەفرۆم لەگەڵ ماتێریالیزمی راستەقینەدا تەبایە. لەلایەکی ترەوە لەروانگەی لۆوێنتاڵەوە هۆی ئەم جوداییە ئەوەیە کە بۆچوونی فرۆم گۆڕابوو و هێمای ئەو گۆڕانە، دوو بەشی جیاوازی هەڵاتن لەسەربەستی واتە بابەتی کۆمەڵایەتی و "بابەتی سروشتی"یە. جگە لەمەش ئەگەری جیاوازییە شەخسییەکان دەکرێ ئەگەرێکی زۆر کاریگەربێ لەو لێکپچڕانەدا. تەنانەت ئەگەر

بەتەنیا سەیری نوسراوەکانی فرۆم بکەین، دەردەکەوێ کە ئەو زۆر کەمتر لەئەندامانی تری ئالقەی ناوەندی دەزگا خاوەنی هەستیاری کینایەیی بوو. روانگەی ئەو لەمەڕ ژیان کەمتر لەروانگەی هاوبەشی هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ لەژێر کاریگەری وردبینیە جوانیناسانەکاندا بوو. خۆخەریك کردنی یەکسەری ئادۆرنۆ لەکاروباری دەزگادا رێك لەکاتێکدا کە فرۆم لەحاڵی بەجێهێشتنی ئەوێدا بوو، پیشاندەری گۆڕانێکی گرینگە لەوتاری بەرهەمەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا.

هۆکاری پچڕانی فرۆم هەرچی بووبێت دەبێ باسی ئەو راستییە بکرێ کە بەرهەمەکانی ئەو لەدەیەی 40دا رقی دۆستانو هەڤاڵانی پێشووی هەستاند. پاش جودابوونەوەی فرۆم دەزگا لەبلاوکراوەکانی خۆیدا کاتی ئەوتۆی بۆ باسی تییۆرك لەمەڕ پرسەکانی دەروونشیکاری تەرخان نەکرد. لەساڵی 1939 دا هۆرکهایمەر لەوتارێکدا فرۆیدو دیلتایی پێکەوە هەڵسەنگاندو فرۆیدی پێ باشتر بوو بەلاّم هۆیەکانی بەسەرتر زانینی فرۆیدی بەشێوەیەکی بەربلاّو باس نەکرد. ئەگەرچی لەدرێژەی شەڕوپاش شەڕیشدا لەزۆربەی بەرهەمەکانی دەزگادا چەمکە دەروونشیکارییەکان بەکارهێنرا، بەلاّم بەباشی دیارە کە هۆرکهایمەرو ئەندامانی تری دەزگا قەت سڵیمان لەئاشکراکردنی کێشەی خۆیان لەگەڵ تیۆرییە فرۆیدییەکاندا نەدەکرد. لەئۆکتۆبەری ساڵی 1943 دا ئێرنێست کریس کە یەکی لەهۆگرانی هەڵکەوتووی قوتابخانەی "دەروونزانی من" (*psychology ego*) بوو، لەبارەی رای دەزگا لەمەڕ روانگەکانی فرۆیدەوە پرسیاری لە لۆوێنتاڵ کرد. ئەویش لەنامەیەکدا کە بۆ هۆرکهایمەری نووسی داوای رێنوێنی لەو کرد بۆ وەلاّمدانەوە. هۆرکهایمەر کە لەو کاتەدا لە کالیفۆرنیا دەژیا زۆر بەڕوونی وەلاّمی نامەکەی لۆوێنتاڵی دایەوە. وەلاّمەکەی هۆرکهایمەر شیاوی ئەوەیە تا رادەیەك بەدرێژی بخرێتەڕوو:

بەرای من وەلاّمی تۆ زۆر بەئاسانی دەبێ پۆزەتیڤ بێت. ئێمە بەراستی قەرزداری روانگە قووڵەکانی فرۆیدو هاوکارە سەرەتاییەکانی ئەوین. ئەندێشەی ئەو یەکێ لەو بنەما پتەوانەیە کە بەبێ بوونی فەلسەفەی ئێمە، قەت بەو جۆرەی کەئێستا هەیە وانەدەبوو. من لەو هەفتانەی دواییدا بۆ جارێکی تر لەگەورەیی ئەو گەیشتم. وەك تۆش دەزانیو لەبیرتە زۆر کەس دەڵێن کە میتۆدی سەرەکی ئەو بەتایبەت لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی چینی نێوەنجی وردبینو ئاڵۆزی ڤییەنی دادەگونجێ. هەڵبەت ئەو بۆچوونە وەکوو بۆچوونێکی گشتیگر بەتەواوی هەڵەیە. بەلاّم هەندێ هەقیقەتی تێدایە کە بەڕای من ئەوە هیچ لەگرنگی بەرهەمەکانی فرۆید کەم ناکاتەوە. بەرهەمێك هەرچی مەزنتربێت، پتر رەگ و ریشەی لەنێو بارودۆخی مێژوویی-گشت رەهەندیدایە. بەلاّم ئەگەر بەشێوەیەکی ورد چاو لەپێوەندی نێوان ڤییەنی ئازادیخوازو میتۆدی سەرەکی فرۆیدبکەی دەبینی کەفرۆید چ بیرمەندێکی مەزنە. بەکزبوونی ژیانی بنەماڵەیی چینی نێوەنجی تیۆری ئەو دەگاتە قۆناغێکی نوێ کە لەوتاری "لەسەرووی یاسای چێژ وەرگرتنەوە" و نووسراوەکانی دواتریدا رەنگی داوەتەوە. ئەو وەرچەرخانە لەفەلسەفەی ئەودا دەیسەلمێنێ کەفرۆید لەو بەرهەمە تایبەتەی خۆیدا لەهەندێ لەو گۆرانکارییانە گەیشتووە کە لەبەشی پێوەندار بەچەمکی ئەقڵدا (رەنگە ئاماژەیەك بێ بەشێ لەنووسراوەی هۆرکهایمەر بۆ خۆی بەناوی "هزرو پاراستنی نەفس") بۆ کزبوونی بنەماڵەو تاك تەرخان کراوە. دەروونزانی بەبێ لیبیدۆ بەهیچ شێوەیەك دەروونزانی نییەو فرۆید ئەوەندە مەزنە کە لەچوارچێوەی کاری خۆیدا دەروونزانی وەلا دەنێ. دەروونزانی لەمانای راستەقینەی خۆیدا

هەمیشە دەروونزانی تاکە، ئێمە دەبێ لەکاتی پێویستدا بەشێوەیەکی ئۆرتۆدۆکسی لەبەرهەمە سەرەتاییەکانی فرۆید کەڵك وەربگرین. ئەو زنجیرە چەمکانەی کە پێوەندییان بەغەریزەی مەرگەوە هەیە، وتەزاگەلێکی ئینسان ناسانەن (بەواتای ئەڵمانی وشە). تەنانەت ئەو کاتەی کە ئێمە لەگەڵ راڤەکردنەکانی فرۆیدو کەڵك وەرگرتنی ئەو لەو راڤەکردنانە هاودەنگ نەبین ئامانجە بەرهەستەکانیان زۆر بەدروست دەزانین و تێدەگەین کە ئەوانە بیرتیژی فرۆید لە دەرککردنی هەلومەرجدا دەردەخەن. گۆڕانکاری لەئەندێشەی فرۆیددا ئەوی گەیاندە هەندێ دەرەنجام کە لەو دەرەنجامانەی کەبیرمەندی گەورەی ئەو کاتە واتە بێرگسۆن پێیگەیشتبوو دوورنەبوون. فرۆید بەشێوەیەکی بەرهەست دەستی لەدەروونشیکاری هەڵگرت. بەڵام فرۆمو هۆرنای گەڕانەوە بۆ دەروونزانی پۆپۆلیستی و تەنانەت بەشێوەیەکی دەروونناسانە چاویان لەکۆمەڵگاو فەرهەنگ دەکرد.

نێوەڕۆکی ئەو نامەیە هەڵگری چەن جیاوازییەکی بنەڕەتییە لەنێوان روانگەکانی هۆرکهایمەرو فرۆمدا. یەکەم، هۆرکهایمەر ئەوە رەتدەکاتەوە کە ئەو توخمە بۆرژواییانەی کە لەئەندێشەی فرۆیددان، بەئاشکرا دزێون. ئەو پێشتر لەوتاری "تیۆری نەریتیو رەخنەگرانە"دا وتبووی کە هیچ بیرمەندێك ناتوانێ بەتەواوی لەسەرچاو کۆمەڵایەتییەکانی خۆی جودا بێتەوە. ئەو بۆ لۆوێنتاڵ نووسی "هەرچی بەرهەمێك مەزنتربێت، پتر لەدۆخی مێژوویی- گشت رەهەندیدا رەگو ریشەی هەیە." بۆیە تێگەیشتنی فرۆید لەغەریزەی مەرگ خاوەنی "ئامانجێکی بەرهەست"ە کە "بەقووڵی دروست"ە. دروستییەکەی لەوەدا نییە کە لەگەڵ بابەتە گشتییە بیۆلۆژیکەکاندا هاوئاهەنگی هەیە بەڵکو بەو هۆیەوە دروستەکە پیشاندەری قووڵبوون و جیددی بوونی بزوێنەرە تێکدەرانەکانی ئینسانی مۆدێرنە. دووهەم، لەبەرچاو نەگرتنی رۆڵی بنەماڵە وەکو هۆکاری کۆمەڵایەتی لەلایەن فرۆیدەوە-کە فرۆم جەختی زۆری لەسەردەکاتو لەبەرهەمە سەرەتاییەکانی دەزگادا زۆر باسی دەسەڵاتی بنەماڵەکراوە- لەراستیدا رەنگدانەوەی هەستیاربوونی فرۆید لەمەڕ داڕزینی بنەماڵە لەکۆمەڵگای مۆدێرن دایە. ئەم گۆڕانە هەر ئەو گۆڕانەیە کە هۆرکهایمەر بەشێوەیەکی بەرینتر لەبەرهەمە دواییەکانی خۆیدا باسی لێدەکات. و لەئەنجامدا، فرۆید گەیشتە ئەو ئاکامەی کە دەروونزانی بەناچار کاری بەتاکەوە هەیە. بۆیە لیبیدۆ کە هەڵگری توێژێك لەبوونی ئینسانییە کە بەتەواوی لەچوارچێوەی کۆنترۆڵی هەمەلایەنەی کۆمەڵایەتی بەدوورە، چەمکێکی زۆر گرنگ و سەرەکییە. بەو هۆیە کۆمەڵناسانە کردنی تاك هەڵەیە. بۆیە رێڤیزیۆنیستەکان (فرۆم و دەروونناسانی من "*ego*" لەئەمەریکادا) کە هەوڵ دەدەن "بەشێوەیەکی دەروونناسانە چاو لەکۆمەڵگاو فەرهەنگ بکەن" بەهەڵەدا دەڕۆن. لەروانگەی هۆرکهایمەرەوە هۆی سەرەکی ناپەسەند بوونی تێکەڵکردنی دەروونزانی لەنێو کۆمەڵناسیدا یان بەپێچەوانەوە جەخت کردن لەسەر بابەتی نەك هەرهەمانە (*nonidentity*). ئەو چەمکە یەکێ لەتەوەرە گرینگەکانی تیۆری رەخنەگرانەیە. تا ئەو کاتەی کە ناکۆکییەکان لەباری کۆمەڵایەتییەوە چارەسەر نەکرابن، ناکرێ ئەوانە لەباری میتۆدۆلۆژییەوە لەگەڵ یەکدا ئاشتبدرێنەوە. ئەو نرخاندنە هەمان بابەتە کە ئادۆرنۆ پێشتر لەوتاری خۆیدا "کۆمەڵناسی و دەروونزانی" باسی لێکردبوو.

لەراستیدا ئەوە ئادۆرنۆ بوو کە بۆیەکەمجار بەئاشکرا جیاوازی نێوان بیروڕای ئەندامانی دەزگاو ئەندامانی رێڤیزیۆنیستی پێشووی شرۆڤەکرد. ئەو 36ی ئاڤریلی ساڵی 1946 لەلۆس ئانجلێس دا

وتارێکی لەژێر ناوی "زانستە کۆمەڵایەتییەکان و مەیلە کۆمەڵناسانەکان لەدەروونشیکاریدا" بڵاوکردەوە. ئەو وتارە لەدوو لایەنەوە جێگای سەرنجە. یەکەم بەهۆی ئەو شتەوە کە ئادۆرنۆ لەبارەی دڵگیربوونی فرۆید بۆ قوتابخانەی فرانکفۆرت دەیڵێ و دووهەمین رەهەندی جێگای سەرەنج دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ئەو وتارە کە وەکوو تۆوێك لەروانگەکانی مارکوزەدا شین دەبێ و دەبێتە هۆی رەخنەی توندی مارکوزە لەرێڤیزیۆنیستەکان لەکتێبی ئیرووس‌و شارستانییەتدا. ئادۆرنۆ بەشێوەیەکی تایبەت کتێبەکەی کارن هۆرنای، شێوە نوێیەکان لەدەروونشیکاریدا، وتارەکەی فرۆم بەناوی "بەربەستە کۆمەڵایەتییەکانی دەرمانی دەروونشیکاری" کە ئەو وتارە یازدە ساڵ پێش لە *zeitschrift* دا لەچاپ درابوو– دایە بەر توێژینەوە. وتارەکەی ئادۆرنۆ کە ماوەیەکی زۆر کورت دوای شەڕ نووسراوە زمانێکی تاڵ‌و ژەهراوی هەیەو ئەو شێوە نووسینە لەبەرهەمە پێشووەکانی دەزگادا نابینرێ.

ئادۆرنۆ بەتوێژینەوەی هێرشی رێڤێزیۆنیستەکان بۆ سەر تیۆری غەریزەکانی فرۆید دەست پێدەکات. ئەو دەڵێ غەریزەگەری دەتوانێ یا بەمانای دابەشکردنی مێکانیکی رۆحی ئینسانی بەغەریزە نەگۆڕەکان بێ یا بەمانای جۆرێك هەڵێنجانی بگۆڕی دەروون لەو هەوڵانەبێ کە بەمەبەستی چێژ وەرگرتن و پاراستنی نەفس دەدرێن، کەخۆی دەتوانێ زۆر شێوەی جۆربەجۆرو لەرادەبەدەری بێت. مەبەستی فرۆید لەغەریزە واتای دووهەمە. کەوایە رێڤێزیۆنیستەکان کە دەڵێن فرۆید مێکانیکی جووڵاوەتەوە بەهەڵەدا دەڕۆن. ئەوە لە حاڵێکدایە کە دابەشکاری قەتیسماوو نەگۆڕی جۆرەکانی کەسایەتی لەلایەن خۆیانەوە شیاوی لۆمەکردنە. سەرەڕای جەخت کردنی ئەوان لەسەر کاریگەری بابەتی مێژوویی کەمتر لەفرۆید لەگەڵ "مێژوویی ناوەکی" لیبیدۆدا دەسازان. ئەوان هەروەها بەجەخت کردنی لەرادەبەدەر لەسەر گرنگی "*ego*" لە دانووستاندنی گەشەمەندانەی *ego* لەگەڵ *Id* دا بێئاگا مانەوە: "رەتکردنەوەی بەوتەی ئەوان غەریزەگەری فرۆید زۆر بەروونی بەواتای رەتکردنەوەی ئە راستییەیە کە فەرهەنگ بەدروستکردنی لەمپەڕ لەبەرانبەر لیبیدۆ بەتایبەت هاندەرە تێکدەرەکاندا، هۆکاری هاتنەئارای سەرکوتکەری و هەستی گوناه و پێویستی سزادانی خۆوە".

جگە لەوەش رێڤیزیۆنیستەکان بەکەمڕەنگ کردنەوەی لەرادەبەدەری ئەزموونەکانی سەردەمی منداڵی (*erlebnisse*= ئەزموونە زیندووەکان، کە لەگەڵ *erfahrungen*= ئەزموونەکان یەك شت نین) بەتایبەت ئەو خەسارانەی کە کاریگەرییەکی زۆر لەسەر گۆڕانکاری لەکەسایەتیدا دادەنێن، تیۆرییەکی تۆخیان لەبارەی کەسایەتییەوە ئاراستەکرد. هەستیاربوونی فرۆید لەمەڕ دەوری شۆکە خەسارهێنەرەکان لەپێکهاتنی کەسایەتی لێکپچڕاوی مۆدێرندا لە بەرهەمەکانی ریڤیزیۆنیستەکاندا بزربۆتەوە. ئادۆرنۆ دەنووسێ "جەختکردن لە سەرگشتێتی، نەك لە سەرهاندەرە دەگمەنە تاکی و لێکپچڕاوەکان، هەمیشە دابینکەری بیروڕایەکی گونجاو لەگەڵ شتێکە کە دەکرێ بە یەکبوونی کەسایەتی ناوزەد بکرێ، یەکبوونێك کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا قەت بەدەست نایە. یەکێ لە گەورەترین لێوەشاوییەکانی فرۆید ئەوە بوو کە ئوستوورەی ئەو یەکبوونەی ریسوا کرد". ریزبەندی جۆرەکانی کەسایەتی بەو چەشنەی کە فرۆم دەیکات قبووڵکردنی کەسایەتی یەکپارچەیە کە ئەمەش شتێك نییە جگە لە "کێشانی پەردەیەکی ئیدئۆلۆژیك بە سەر دۆخی ئێستای دەروونزانی هەر تاکێکدا".

بابەتێکی گشتی تر کە دەبێ باسی بکرێ ئەوەیە کە ساغکردنەوەی هەڵەکانی فرۆید کە ڕیڤیزیۆنیستەکان شانازی زۆری پێدەکەن لە ڕاستیدا جگە لە شاردنەوەی ناتەباییە کۆمەڵایەتییەکان شتێکی تر نییە. ئەو کەسانە بە بڕینی ڕەگ و ریشە بیۆلۆژیکەکانی دەروونشیکاری، دەروونشیکارییان کردە چەشنێك لە زانستە مرۆڤییەکان (*Geisteswissen schaften*) و هەروەهاش کردیانە ئامێری خاوێنراگرتنی کۆمەڵایەتی. لابردنی کێشە سێکسەکان لەلایەن ئەوانەوە لە ڕاستیدا بەشێکە لە حاشاکردنی ناتەبایی نێوان زات و هێما و ڕەتکردنەوەی کەلێنی نێوان بەدیهاتنی هەقیقی نیازەکان و بەختیاری قەڵب و درۆینەی شارستانییەتی سەردەم. ئادۆرنۆ دەڵێ فرۆم بە ڕەتکردنەوەی بنەمای سێکسی سادیسم کارێکی هەڵە دەکات ئەویش لە حاڵێکدا کە نازییەکان بە شێوەیەکی دزێو ئەو ڕاستییەیان سەلماند. هێماکانی بەرهەمی ڕیڤیزیۆنیستەکان، ئەگەرچی حاشای لێدەکەن، لە ڕاستیدا جۆرێك سازانە، ئەم دیاردەیە بەتایبەت لە ئەخلاقگەری ئەواندا دیارە. ئادۆرنۆ بە تووڕەییەوە دەڵێ هیچ بیانوویەك بۆ بەرەها زانینی نۆرمە ئەخلاقییەکان دروست نییە، ئەویش لەسەردەمێکدا کە لە دوای ڕەخنەی نیچە لە بنەما دەروونناسانەکانی ئەو نۆرمانە، هەموویان کەوتوونەتە بەر تەوژمی شك و گومانەوە.

ئادۆرنۆ لە درێژەدا دەڵێ ڕیڤیزیۆنیستەکان لە هەوڵەکانیاندا بۆ ڕوونکردنەوەی سەرچاوەکانی نەبوونی دیسیپلینی کۆمەیەتی تووشی ساویلکەیی هاتوون. ئەو بۆچوونەی ئەوان کە دەڵێ ململانێ هۆکاری سەرەکی ناتەبایی و کێشە لە کۆمەڵگای بۆرژواییدایە، گەمژانەیە، بە تایبەت بەسەرنجدان بەو ڕاستییەی کە لە هەڵاتن لەسەربەستیدا دەکرێ بوترێ تاکی خۆرسك لە نێوچووە. لە ڕاستیدا "کۆمەڵگای پێگرتوو لە سەر چینی نێوەنجی قەت بە گوێرەی یاسای ململانێ نەجووڵاوەتەوە". پێوەندی ڕاستەقینە لە کۆمەڵگای بۆرژواییدا هەمیشە لەسەر هەڕەشەی بەکارهێنانی توندوتیژی جەستەیی دامەزراوە. دیاردەیەك کە فرۆید زۆربە ڕوونی باسی کردووە: "لەسەردەمی ئوردووگاکانی بێگاریدا خەساندن پتر دەربڕی واقیعی کۆمەڵایەتییە نەك ململانێ". ئادۆرنۆ دەڵێ فرۆید سەر بە سوننەتی هابزی تیۆری داڕێژەرانی بۆرژوایە، ئەوانە ئەگەرچی بەشێوەیەکی ڕەشبینانە شەڕ بە دیاردەیەکی ڕەها لە زاتی مرۆڤدا دەزانن بەڵام ئەو ڕوانگەی ئەوانە زۆر باشتر ڕاستییە زاڵەکان نیشان دەدەن نەك ئەو گەشبینییە پۆزەتیڤەی ڕیڤیزیۆنیستەکان. فرۆید بەهۆی بەیکزانینی شارستانییەت لەگەڵ سەقامگرتوویی (*fixation*) و دووپاتبوونەوە (*repetition*)دا لە شۆپێنهاوێر دەچێ. بۆ جارێکی تر ڕیڤیزیۆنیستەکان بەهۆی ڕوانگەی خۆیان لەمەڕ پێچڕانی زنجیرەی دووبارەبوونەوە (دووپاتبوونەوە) لە ڕۆژئاوادا لە ڕێگەی گۆڕانی ڕاستەقینەوە تووشی گەشبینییەکی بێهودە دەبن.

لە ئاکامدا ئادۆرنۆ نارەزایەتی خۆی لەبەرانبەر ئەو جەختەی کە لە بەرهەمی ڕیڤیزیۆنیستەکاندا لەسەر خۆشەویستی هەیە دەردەبڕێ. فرۆم بەهۆی نەبوونی هاودڵییەوە هێرش دەکاتە سەر ئەندێشەی فرۆید. بەڵام شۆڕشگێڕانی ڕاستەقینە، زۆر جار سارد و مۆن و تووشن. ناکرێ قەیران و کێشە ئاڵۆزە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگەی حەز و ئارەزووکردنەوە چارەسەر بکرێ. ئەو دیاردانە دەبێ (لە پرۆسەی ساغبوونەوەدا) کۆتاییان پێ بێت و ئەمەش بەناچار بە مانای ئازار چێشتنی هەمووانە: "دەکرێ بڵێین کۆمەڵگای ئێمە تووشی زێدەڕۆییەکی ئەوتۆ بووە کە تێیدا خۆشەویستی دەتوانێ تەنها بەهۆی ڕق و قین لە تێکڕای شتەکان

بەیان بکرێ و هەر جۆرە نیشانەیەکی راستەوخۆی خۆشەویستی تەنها بۆ سەلماندنی ئەو دۆخانە باشە کە بۆ خۆیان خولقێنەری رق و قینن". ئادۆرنۆ بە رستەیەك وتارەکەی خۆی تەواو دەکات کە وەبیرهێنەرەوەی وتەی ئێجگار بەکاربراوی بنیامینە لە وتاری "وێچوونە هەڵبژێردراوەکانی نووسراوەی گوتە"دا: "تەنها بەهۆی هیوابڕاوەکانە کە ئێمە خاوەنی هیواین". ئادۆرنۆ دەنووسێ: "بەرای من سووکایەتیکردنی فرۆید بە ئینسان جگە لە هێمای ئەو خۆشەویستییە ناهومێدانەیەی کە تەنها دەتوانێ پیشاندەری هیوایەك بێ کە هێشتا شیاوی ئێمەیە مەبەستێکی تری نییە".

رای دەزگا لە بارەی فرۆید و فرۆمەوە لە دەیەی 40دا بەو جۆرە بوو کە ئاماژەی پێکرا. لە خۆڕانەبوو کە رەشبینی روو لە زیادبوون سەبارەت بە ئەگەری روودانی شۆڕش شان بە شانی ستایشی روو لە گەشە لە فرۆید دەچووە پێشێ. لە نێو کۆمەڵگایەکدا کە ناتەبایە کۆمەڵایەتییەکان چارە هەڵنەگر دەهاتنە پێش چاوو جگە لەمەش ئەو ناتەباییانە بەشێوەیەکی پارادۆکسی ئاڵۆز و رەشتر دەیاننواند، روانگەکانی فرۆید وەکوو حەشارگەو بەرەیەکی پێویست لە بەرانبەر گەشبینییە ئاڵۆزەکانی رێڤیزیۆنیستەکاندا بەکاردەبران، بۆیە زێدەرۆیانەترین و مەترسیدارترین لایەنەکانی ئەندێشەی فرۆید وەکوو بەقازانجترین ئەوانە بەکاردەهێنران. ئادۆرنۆ لە کتێبی ئەخلاقی بچووکدا لە دژ کردەوەیەك لە بەرانبەر ئەو دۆخەدا و لە وتەیەکی هەرە بەناوبانگیدا دەڵێ: "لە دەروونشیکاریدا هیچ شتێك هەقیقەتی نییە جگە لە زێدە بێژییەکان".

لە زۆربەی بەرهەمەکانی دەزگا لە دەیەی 40دا کەسایەتی پاوانخواز و دیالێکتیکی رۆشنگەری و پێغەمبەرانی فریو نووسراوەی لۆوێنتاڵ — کاریگەری وشیاریدەرانەی روانگەکانی فرۆید بە تەواوی ئاشکرایە. پاش گێڕانەوەی دەزگا بۆ ئەڵمانیا ئەو رەوتە درێژەی کێشاو کاریگەری دیاریکەری لە بەرهەمە تیۆری و توێژینەوە ئەزموونییەکاندا بەجێهێشت. دەزگا لە ساڵی 1956دا لە یادی سەدەمین ساڵی لە دایکبوونی فرۆیددا، بەرگێك لە کۆمەڵە کتێبی ئەو دەزگایە بە ناوی (*frankfurter Beitrage zur soziologei*)ی بە فرۆید تەرخانداو رێزی لێگرت. بە هەرحاڵ هەوڵی دووبارە بۆ تێکەڵکردنی روانگەکانی فرۆید مارکس بەشێوەیەکی گەشبینانە ئەم جارەیان خرایە ئەستۆی یەکێ لە ئەندامانی ئاڵقەی ناوەندی دەزگاکە ئاشناییەکی زۆری لە بارەی رامانە دەروونناسانەکانی ئەمەریکادا نەبوو: هێربێرت مارکوزە. مارکوزە لە کتێبی ئێرووس و شارستانییەتدا هەوڵیدا "فرۆیدی شۆڕشگێڕ" ڕزگار بکات کە لە لایەن فرۆمەوە وەکوو ئوستوورەیەك وەلانرابوو و هۆرکهایمەر روئادۆرنۆش ئەویان کردبووە پێغەمبەری تاریکییەکان. ئێرووس و شارستانییەت درێژەپێدەری ئەو هۆگرییە سەرەتاییەیە کە تیۆری رەخنەگرانە لە بارەی فرۆیدەوە هەیبوو و ئەو بەرهەمە لە خۆیدا هەڵگری وەها بایەخێکە کە لێرەدا راڤەیەکی کورتی لەسەر بکەین.

(2)

بە پێچەوانەی ئەندامە سەرەکییەکانی تری دەزگا مارکوزە کاتێ کە چووە ئەمەریکا هۆگرییەکی جیددی بۆ دەروونشیکاری نەبوو. رەنگە مارکوزەی لاو تا ئەو ڕادەیە ئەقڵخواز بووبێت کە دڵگیرییەکی ئەوتۆی لە دونیای ئاڵۆز و مژاوی نەستدا نەدیبێ. مارکوزە کە جەختی لەسەر پتانسێیلی سازانی سوژە و ئوبژە دەکرد —هۆرکهایمەر و ئادۆرنۆ کە پتر سەرنجیان بۆ وتەزای نەك هەر هەمانی راکێشرابوو، قەت جەختیان لەسەر ئەو سازانە

نەدەكرد– بەبەراورد لەگەڵ گشتێتی كۆمەڵایەتیدا هۆگرییەكی كەمتری بە دەروونزانی هەبوو.

ماركوزە لە وتارێكداكە لە توێژینەوە سەرەتایی و هاوبەشەكەی دەزگا لەمەڕ دەسەڵاتدا نووسی، لە قبووڵكردنی رۆڵی بنەماڵە وەكوو هۆكاری كۆمەڵایەتی خۆی دەبوارد، دیاردەیەك كە فرۆم جەختی زۆری لەسەر دەكرد بەڵام بۆ ئەندامانی تری دەزگا هێشتا وەكوو كێشەی لێنەهاتبوو.

بەڵام سەرەڕای ئەمانە، هەر بەو جۆرەی كە پۆل رابینسۆن بە بەڵگەوە دەڵێ، ماركوزە لەگەڵێك لەو بەرهەمانەیدا كە لە دەیەی 30دا بلاویكردۆتەوە هێماگەلێكی بچووك و ورد كە پیشاندەری هۆگریی دواجاری ئەو بەفرۆیدەوە بەرچاودەكەوێ. بۆ نموونە ماركوزە بە رەوا زانینی دەرفەت قۆستنەوە بۆ چێژ وەرگرتن (*hedonistic*) لە گشتێتی دیالێكتیكی ئەقڵ (هزر) و بەختیاریدا نارەزایەتی خۆی لە هەمبەر دەمپارێزگەری ئیدەئالیستیدا دەردەبڕێت. بەگشتی سەركوتكاری جنسی (سێكس) لە هەرێمی رەخنەگرتنی ئەو لە چەوسانەوەدا جێی كرابۆوە و جگەلە رەهەندە دەروونناسانەكانی ئەو سەركوتكارییە، گرنگییەكی سیاسیشی پێدرابوو. جگە لەمەش ماركوزە رەخنەی لە ئایدۆلۆژیای خۆشەویستی بۆرژوایی گرتبوو لەبەرئەوەی كە ئەرك و ئەمەكداری سەرتر لە چێژوەرگرتن دەزانێ. ئەو هەروەها هێرشی كردبووە سەر چەمكی ئیدەئالیستی "كەسایەتی"، كە ئەو هێرش و رەخنەیە پێشەكی و پشتخانێك بوو بۆ بۆچوونە دواییەكانی ئادۆرنۆ كە دواتر ئەندێشەی رێڤیزیۆنیستەكان رەتبكاتەوە. ئەو زۆر پێشتر لە ساڵی 1937دا ئاماژەی دابووە توخمە هەستی و جەستەییە شاراوەكان لە بەختیاری راستەقینەدا و لە زێدەڕۆیانەترین شێوازی شت ئاسابوونەوەی لەشدا "بیرەوەری پێشوێژانە"ی چێژوەرگرتنی رەسەنی دیبوو و لە ئاكامدا لە وتاری خۆی لە بارەی دەرفەتگەری بۆ چێژوەرگرتندا، پێوەندی نێوان سێكسواڵیتەی سەركوتكراو و بەگژا چوونی ناسیبۆوە، پێوەندییەك كە دەبوایە پاشتر لە كتێبی ئیرووس و شارستانییەتدا دەورێكی گرنگیی هەبێ.

بەهەرحاڵ باش دەرەنجامە مەترسیهێنەرەكانی شەڕی نێوخۆی ئیسپانیاو دادگاییە پاككرەوەكانی مۆسكۆ بوو كە ماركوزە بەشێوەیەكی جیددی دەستیدایە خوێندنەوەی بەرهەمەكانی فرۆید. نارەزایەتی زیاد لە ماركسیسم تەنانەت لە شێوە هێگێلییەكەیدا ماركوزەی بەرەو ئەو رەهەندە پاڵپێوەنا –هەر بەو جۆرەی كە هۆركهایمەر و ئادۆرنۆشی هاندابوو– كە لەمپەرە دەروون ناسانەكانی سەر رێگەی گۆرانكارییە كۆمەڵایەتییە بەرچاوەكان بداتە بەر توێژینەوە. لە حاڵێكدا كە ئەو توێژینەوەیە بوو بەهۆی پتربوونی رەشبینی لە روانگەكانی هۆركهایمەر و ئادۆرنۆداو بوو بەهۆی خێراتر پاشگەزبوونەوەی ئەوان لە بواری پراتیكی سیاسیدا، بەڵام ماركوزەی گەیاندە ئەو ئاكامە كە جەختی دووبارە بكات لەسەر رەهەندی یۆتۆپیایی لە روانگەكانیدا.

كاتێ كە لە ساڵی 1955دا ئیروس و شارستانییەت، كە بەرهەمی ماوەیەكی دووروودرێژ وردبوونەوە و رامان بوو، بلاوكرایەوە هەوڵەكانی ماركوزە بۆ تێكەڵكردنی روانگەكانی ماركس و فرۆید گەلێك لە هەوڵە سەرەتاییەكانی تیۆری رەخنەگرانە سەرترچوو بوو. بە پێچەوانەی هۆركهایمەر و ئادۆرنۆ كە دەیانویست لە رۆشبینییەكانی فرۆید لەمەڕ ناتەباییە قووڵەكانی ئینسانی مۆدێرن بە مەبەستی پتەوكردنەوەی روانگەكانی خۆیان لە بارەی نەك هەر هەمانییەوە كەڵك وەربگرن، ماركوزە گەیشتە ئەو دەرەنجامە كە فرۆید بە تایبەت ئەو كاتەی كە دەچێتە سەر باسی

باندەروونزانی، پەیامهێنەری هەر هەمانی و سازانە. بە پێچەوانەی فرۆم کە بە تەواوی فرۆیدی ئۆرتۆدۆکسی وەکوو دوژمنی واقیعی نویێ وەلانابوو، مارکوزە هەوڵیدەدا کە جەخت لەسەر ئەو توخمانە لە دەروونشیکاریدا بکات کە چاو لە سەرووی نەزمی ئێستا دەکات.

نامانەویێ لێرەدا ئاور لە کتێبی ئیرووس شارستانییەت بدەینەوە، کتێبێك کە ئاڵۆز و دەوڵەمەندە، بەڵام دەکریێ لێرەدا چەن خاڵێك لەمەڕ پێوەندی ئەو بەرهەمە لەگەڵ بەرهەمە پێشووەکانی دەزگادا باسبکریێ. بەشی یەکەمی ئەو کتێبە – کە لە هاوینی ساڵی 1955دا لە گۆڤاری *Dissent* بە جیا لە چاپدرا وا دیارە هێرشێك بێت بۆ سەر ریڤیزیۆنیستەکان. لێرەدا مارکوزە ئەو بابەتەی کە ئادۆرنۆ دەیەیەك پێشتر هێنابوویە ئاراوە درێژە پێدەدات.

ئەو سەرەتا دان بەوەدا دەنیێ کە بەرهەمەکانی رایش پشتخان و پێشەکییەك بوون بۆ رامانەکانی ئەو بەڵام خێرا باسی کەموکوڕییەکانی ئەندێشەی رایش دەکات. بەرای مارکوزە بیێ توانایی رایش لە جیاوازی دانان لە نێوان جۆرەکانی سەرکوتدا بوو بە هۆی ئەوەی کە نەتوانیێ "هەڵسووڕاویی و دەوری مێژوویی غەریزە سێکسیەکان و پێوەندی ئەو غەریزانە لەگەڵ پاڵنەرە تێکدەرەکان"دا ببینیێ. لە ئاکامدا رایش بەرەو ئەو ئاراستە رۆیشت کە لە ئازادی سێکس وەکوو ئامانجێك لە خۆیدا بەرگرییەکی ساویلکانە بکات، کە ئەو بابەتە لە ئاکامدا بوو بە هۆی وەهمە بەراییەکانی دوایین ساڵەکانی ژیانی.

دوای ئەوەی کە مارکوزە بە کورتی و خێرایی یوونگ و دەروونشیکاری "دەستە راستی" رەتدەکاتەوە، سەرنج دەداتە نیێۆ –فرۆیدییەکان. مارکوزە روانگەی خۆی لە بارەی بەرهەمەکانی ئەوانەوە سەرەتا بە ستایش و رێزگرتن لە رۆشنبینییەکانی وتارە سەرەتاییەکانی فرۆم لە *Zeitschrift* دا دەستپێدەکات. مارکوزە هاودەنگبوونی خۆی بۆ دژایەتی فرۆم لەگەڵ کۆمەڵگای باوکسالاردا دەردەبڕیێ (ئەو لە وشەی "باوك سەنتەری – بەرچاوتەنگانە" ( *Acquisitive-patricentric*) کەڵك وەردەگرێت، هەر ئەو ووشەیە کە فرۆم لەو دواییانەدا بۆ روونکردنەوەی هەمان دیاردە قەڵبی کردبوو) و ئەو بابەتە لەگەڵ هێرشی خۆی بۆ "یاسای کردەوە" ( *performance-principle*) بەراورد دەکات. مەبەستی ئەو لەو وتەزایە، چەشنێك لە واقیعی کۆمەڵگای سەردەمەکە بەپێی یاساکانی ئەو واقیعە "کۆمەڵگا بەپێی ململانێی کردەوە ئابوورییەکانی ئەندامانی توێژبەندی دەکریێ". مارکوزە دەڵێت کەمێك پێشتر لە جیابوونەوەی فرۆم لە دەزگا، رەهەندی رەخنەگرانەکە لەبەرهەمە سەرەتاییەکانیدا دەبینرا کەم رەنگ ببۆوە. گۆڕانکارییە قووڵەکانی ئەندێشەی فرۆم بەسەرقاڵبوونی پتری ئەو بەدەرمانە کلێنیکییەکانەوە روویدا، ئەو کارەی کە فرۆم زۆربەی کاتەکان ستایشی دەکرد و بەرزدەینرخاند. فرۆم بە بانگەشەکردنی جۆرێك دەرمانی پێڕەوکەری بەختیاری کەفرەنچی و گرۆدێك پەرەیان پێدابوو، ئەو ئایدۆلۆژییەی قبوڵکرد کە گوایە بەختیاری راستەقینە لە کۆمەڵگای ئێستادا بەدی دێت. بەڵام مارکوزە جەخت لەو دەکات کە "لە کۆمەڵگای سەرکوتگەردا بەختیاری تاك و گۆڕانکاری بەرهەمهێنەر (لەگەڵ موناسەباتی کۆمەڵگادا) ناتەبایە و ئەگەر ئەوانە وەکوو بەهاگەلێك کە دەبیێ لەم کۆمەڵگایەدا بەدی بێن پێناسە بکرێن، خۆیان دەبنە هۆکاری سەرکوت".

بیروڕاکانی مارکوزە لەبارەی تیۆری و دەرمانکردنی دەروونشیکارانەوە وێکچوونێکی

زۆری لەگەڵ ئەو روانگەیانە هەیە کە خۆی و ئەندامانی تری دەزگا لە بارەی تیۆری و پراکسیسەوە (*praxis*) گوتوویانە. لە قۆناغی ئێستای شارستانیەتی رۆژئاوادا، بە تەواوی ناکرێ ئەو دوو بابەتە لەگەڵ یەکدا ئاشتبدرێنەوە ئەگەرچی بەتەواوی لەیەکتر جودانین. تواندنەوەی تەواوی تیۆری لە پراکسیس یان "دەرمانکردن"دا بە مانای لەنێوبردنی نێوەرۆکی نێگەتیڤ و رەخنەگرانەی تیۆرییە. رێڤیزیۆنیستەکان بە وەرگرتنی تێڕامانی خولیایی لە کاری دەرمانگەرانەدا، زۆر لە پراگماتیست و پۆزەتیڤیستەکان دەچن، کەسانێ کە تیۆری داڕێژەرانی رەخنەگری قەت خۆشیان ناوێن. ئەو کارەی کە رێڤیزیۆنیستەکان دەیکەن هەر هەمان کارە کە جێگرانی هێگێل لەگەڵ ئەویان کردووە، کارێ کە مارکوزە لە بەشی دووهەمی عەقڵ و شۆڕشدا باسی کردووە. ئەوانە پرۆسەی وەرگرتن لە دوو بەرەدا ئەنجام دەدەن. یەکەم ئەوانە بە نێوەرۆکترین و بوێرانەترین گریمانەکانی فرۆید رەتدەکەنەوە: غەریزەی مەرگ، خێڵی سەرەتایی، کوشتنی باوکی سەرەتایی. مارکوزە لە دەقی سەرچاوەی ئیرووس و شارستانییەتدا نووسی ئەو میراتە کەونارەی کە رێڤیزیۆنیستەکان گاڵتەی پێدەکەن، بەهۆی "بەها هێماییەکەیەوە مانادارە، رووداوە کەونارەکان کە بەهۆی گریمانەی فرۆیدەوە خراونەتە روو، رەنگە بۆ هەمیشە لە هەرێمی پەسەندکراویی ئینسان ناسانەدا سەرتر بمێننەوە. ئەو دەرەنجامانەی کە پێوەندییان بەم رووداوانەوە هەیە بابەتی راستەقینەی مێژووین.. ئەگەر ئەم تیۆرییە ململانێ لەگەڵ عەقڵی تەواودا دەکات (هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەم گریمانەیە) لە رەوتی ململانێگەری خۆیدا بانگەشەی هەقیقەتێك دەکات کە عەقڵی تەواو بەجۆرێك راهێنراوە کە لە بیری بباتەوە." دووهەم، هەر بەو جۆرەی کە ئادۆرنۆ لە

ساڵی 1946دا دەڵێ، رێڤیزیۆنیستەکان ناکۆکی نێوان تاك و کۆمەڵگا و نێوان وشیاری و ویستە غەریزییەکان پاساو دەکەن و هەوڵدەدەن بیسڕنەوە. ئەوان بە گەڕانەوە بۆ دەروونزانی وشیاری پێش فرۆیدی بەبێ ئەوەی بیانەوێ سەریان لە سازانەوە دەرهێناوە.

مارکوزە هەروەها وەکوو ئادۆرنۆ هێرشی کردە سەر بۆچوونی رێڤیزیۆنیستەکان لە کەسایەتی یەکپارچە. ئەو دەڵێ کە لە کۆمەڵگای سەردەمدا ئەگەری پێکهاتنی تاکگەریی رەسەن لە کردەوەدا هیچە: "هەلومەرجە تاکییەکان پاژگەلێك لە چارەنووسی گشتین و هەر بەو جۆرەی کە فرۆید پیشانیداوە کلیلی چارەنووسی تاك لە دەستی ئەو چارەنووسە گشتییەدایە". دیاردەیەك کە لەگەڵ ئەو بابەتەدا پێوەندی هەیە کەموکوڕی ئەخلاقگەری رێڤیزیۆنیستەکانە: "فرۆید وەهمە ئەخلاقییە ئیدەئالیستییەکانی لەنێوبردوە: "کەسایەتی" شتێك نییە جگە لە تاکێکی "تێکشکاو" کە سەرکوت و بەگژداچوونی لە ناخی خۆیدا جێگیرکردووە و بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە بەکاریان دەبات". مارکوزە بە توندی هێرش دەکاتە سەر لەتوپەتکردنی تیۆری غەریزەکانی فرۆید لە لایەن ریڤیزیۆنیستەکانەوە. ئەو دەڵێ تیۆری غەریزەکانی فرۆید بەشێوەیەکی زاتی لە وشیارییەوە بۆ نەست و لە کەسایەتی پێگەیشتووە بۆ ئەزموونەکانی کاتی منداڵی و لە *ego* وە بۆ *Id* و لە تاکەوە بۆ کۆی جۆرەکان سەیر دەکات. فرۆید بە جەخت کردن لەسەر لیبیدۆ بۆچوونێکی ماتێریالیستی لە بەدیهاتنی مەیلەکان بەدەستەوەدا کە لەگەڵ روانگە مەعنەوی و دواجار سەرکوتگەرەکەی رێڤیزیۆنیستەکاندا ناتەبایە. مارکوزە بە گەڕانەوە بۆ بنەما جنسییەکانی تیۆری فرۆید بۆ جارێکی تر سەرنجدەداتە گرێی ئۆدیپ، ئەو شتەی کە فرۆم هەر لە یەکەم رۆژەکانی

هاتنه ناوەوەی دەزگاکەوە رەخنەی لێگرتبوو. مارکوزە لە کتێبی ئیرووس و شارستانییەتدا زۆر کەم باسی گرێی ئۆدیپ دەکات و ئەوەندە باسی گرنگ بوونی ناکات. بەڵام لەو نووسراوەیدا کە لە *Dissent*دا لە چاپدراو پاشەکی ئەو (لەسەر کتێبی ئیرووس و شارستانییەت) بوو، ڕوانگەیەکی تەواو جیاواز دەردەبڕێت. هەوڵدانی فرۆم بە مەبەستی "هەڵگەڕاندنەوەی گرێی ئۆدێپ لە هەرێمی جنسییەوە بۆ هەرێمی پێوەندییە دوو قۆڵییەکان" ئاوەژووکردنەوەی خاڵی رەخنەگرانەی سەرەکی ئەندێشەی فرۆیدە. لە ڕوانگەی فرۆیدەوە ئارەزووی ئۆدیپ، بە پێچەوانەی رای فرۆم، تەنیا ناڕەزایەتی دەربڕین لەمەڕ جودایی لەدایك و ئازادییەکی ژاناوی و نامۆییهێنەر نییە. ئەو ئارەزووە هەروەها دەربڕی حەزێکی قووڵە بۆ وەدیهاتنی مەیلە سێکسەکان، بۆ دەربازبوون لە داخوازی کردن، بۆ دایك وەکوو ژن و نەك تەنیا وەك پشتیوان. مارکوزە لە راستیدا دەڵێ: "لەسەرەتادا "حەز و تاسەی جنسی" بۆ دایك – ژنەکە هەڕەشە لە بنەمای دەروونی شارستانییەت دەکات. "حەز و تاسەی جنسی"ە کەململانێی ئۆدیپ دەکاتە نمونەی یەکەمین ململانێیە غەریزییەکانی نێوان تاك و کۆمەڵگا". لە بیر بردنەوەی بنەما لیبیدیناڵەکانی گرێی ئۆدیپ چ ئەو کاتەی کە گشتی بن یان ئەوەی کە بەس بە رەنگدانەوەی هێمایی قووڵترین کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایە بن، بنەمای پاساوکردنی ئەو دژایەتییە قووڵانەیە کەئەو گرێیە باسیان دەکات.

بەڵام ئەو شتەی کە لە روانگەکانی مارکوزەدا سەرەکیترە، ناڕەزایەتی دەربڕینەتی لە بەرانبەر وەلانانی غەریزەکەی دیکەی سەردەمی بان دەروونناسی فرۆید لەلایەن رێڤیزیۆنیستەکانەوە: تاناتووس (*thanatos*) یان غەریزەی مەرگ. لێرەدایە کە مارکوزە لە ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر سەرتر دەچێت و بۆ جارێکی تر هەوڵی تێکەڵکردنی یۆتۆپیایی روانگەکانی فرۆید و مارکس دەدات. بەڕای ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر غەریزەی مەرگ رەنگدانەوەی هێمایی هەستیاربوونی فرۆیدە لەمەڕ قووڵایی هاندەرە تێکدەرانەکانی ئینسانی مۆدێرندا. مارکوزە ئەم شرۆڤەیە پەسەند دەکات و ئاماژە دەکاتە درێژەکێشان و تەنانەت بەهێزبوونی هەڵسوڕانی تێکدەرانە لە نێو شارستانییەتدا، ئەو راستییەی کە رێڤیزیۆنیستەکان هەوڵدەدەن زۆر لاواز پیشانی بدەن. غەریزەی مەرگی فرۆید زۆر رۆشنبینانە تر لەو بڕوا کوێرانەیەی کە رێڤیزیۆنیستەکان لەمەڕ پێشکەوتن هەیانە، زاتی ئاڵۆز و تەماوی مرۆڤی مۆدێرن دەرك دەکات.

مارکوزە بە پێچەوانەی ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەرەوە باسەکەی خۆی بەرەشبینییەوە تەواو ناکات. بەرای ئەو غەریزەی مەرگ بە پێچەوانەی ئەو گومانەی کە زۆر جار دێتە ئاراوە بە مانای هاندەرێکی ناوەکی بۆ بەگژاچوون نییە. فرۆید لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئامانجی ئێمە لە ژیاندا کاولکارییە، غەریزەی کاولکاری یا دژی غەریزەی ژیان کار دەکات یا لە خزمەتی ژیاندایە، جگە لەمەش ئامانجی زاتی غەریزەی مەرگ کاولکاری نییە بەڵکو لەنێوبردنی پێویستی کاولکارییە".

مارکوزە لە کتێبی ئیرووس و شارستانییەتدا تێگەیشتنی خۆی لە زاتی راستەقینەی تاناتووس شرۆڤە دەکات. ئامانجی راستەقینەی غەریزەی مەرگ بەگژاچوون و توندوتیژی نییە بەڵکو کۆتایی هێنانە بەو کێشە و قەیرانەی کە ژیانی ناوە. گۆڕەپانی ئەو غەیزەیە، ئەو "نیروانا"یەیە کە حەزو مەیلە بۆ گەیشتن بە وەستانی سروشتی بێگیان. بەهۆی ئەم حەزەوە لە غەریزەی مەرگدا، ئەو غەریزەیە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە غەریزەی ژیان دەچێ: هەردووشتەکە بە شوێن رەزامەندێتی و کۆتاییهێنانی حەز و ئارەزووەوەن.

ئەگەر ئامانجی غەریزەی مەرگ کەمکردنەوەی کێشە و قەیران بێت، ئەو کاتەی کە کێشە و قەیرانی ژیان کەمبۆوە، ئەو غەریزەیەیش لە رەوتی بەهێزبوون دەکەوێ. ئەم گریمانەیە، گریمانەیەکی سەرەکییە کە بوار بە مارکوزە دەدات تا دەرەنجامە بەرواڵەت رەشبینانەکانی فرۆید بە ئاستێکی یۆتۆپیاییدا بەرێت. هەر بەو جۆرەی کە ئەو لە کاتی کۆبەندی روانگەکانی خۆیدا دەڵێت: "ئەگەر ئامانجی سەرەکی ئەو غەریزەیە نەك لە نێوبردنی ژیان بەڵکوو لەنێوبدنی ژان –نەبوونی قەیران–بێت، ئەو کات بە شێوەیەکی پارادۆکسی هەرچی رەزامەندێتی پتر لە ژیان بەدی بێت دوژمنی نێوان ژیان و مەرگ بەو رێژەیە کەمدەبێتەوە. بۆیە چێژ وەرگرتن و نیروانا پێکدەگەن". زۆربەی شوێن کەوتوانی ئۆرتۆدۆکسی فرۆید بەسەرنجدان بەو شتانەی کە مارکوزە دەیڵێت لەگەڵ یەك هاودەنگ دەبن کە مارکوزەش بەرادەی فرۆم و هۆرنای رێڤیزیۆنیستە ئەگەرچی لە رەهەندێکی دیکەوە.

بۆیە مارکوزە تێدەکۆشێ کە تاناتووس بەپێی باشترین نەریتی تیۆری رەخنەگرانە، بکاتە دیاردەیەکی مێژوویی. ئەگەر ژیان بەهۆی دووبارە – ئۆرۆتیزەبوونی ناسەرکوتکارانەی پێوەندی ئینسان لەگەڵ سروشتدا ئازادبکرێ پێویستییەك بە دەسەڵاتی مەرگ نامێنێ. مارکوزە دەڵێ بەدیهاتنی ئەو ڕاستییە پێویستی بە لە نێوبردنی سەرەڕۆیی جنسی جێنتاڵی و گەڕانەوە بۆ "بێ سەرەو بەرەیی چەند شێوازی" منداڵییە. ئەو لێرەدا، تەنانەت ئەگەر باسی سێ هاوکارەکەی لە دەزگادا نەکەین، بەشێوەیەکی تایبەت بەخۆی لە فرۆید ورایش سەرتر دەچێت. مارکوزە دەڵێت تەنیا ئەو کاتەی کە تێکڕای جەستە دووبارە – ئۆروتیزە دەبێتەوە دەکرێ بەسەرکاری نامۆ بوودا، کە بنەماکەی شت ئاسابوونی بەشە ناجێنتاڵییەکانی جەستەیە، زاڵبین. کۆمەڵگای گۆڕاو – کەچیدی لەسەر "یاسای کردەوەیی" سەرکوتکەر و لە نێوبەر دانەمەزراوە – "زێدە سەرکوتکەری" کە بنەمایەکی مێژوویی هەیە لە نێودەبات و بەم جۆرە تاکی لەکار نامۆکراوی کێشە خوڵقێن رزگار دەکات. یاری جوانیناسانەکراو جێگەی ژان و رەنج دەگرێتەوە، نیروانا و کاولکارییەك کە بەهۆی لەمپەردانان لە بەرامبەریدا پێکدێت لە دەسەڵاتداری بەسەر ئینساندا دەکەوێ. دەرەنجامی ئەم دیاردەیە "ئارامگرتنی هەبوون"ە کە بۆ خۆی شتێك نییە جگە لە رەهەندی دەروونناسانەی تیۆری هەر هەمانی کە بنەمای فەلسەفەی مارکوزەیە.

هەر بەو جۆرەی چاوەڕوان دەکرا هەوڵی بوێرانەی مارکوزە بە مەبەستی پیشاندانی فرۆید وەکوو یۆتۆپیاگەرێکی شۆرشگێڕ لەلایەن هاوکارانییەوە زۆر جێگای پەسەند نەبوونە. ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر ژیرانە بێدەنگ مانەوە بەڵام فرۆم لە ژمارەی داهاتووی *Dissent* دا هەوڵیدا ئەو روانگەیە رەتبکاتەوە. ئەو لە دوو لایەنەوە هێرشی کردە سەر ئەو ڕوانگەیە. سەرەتا هەوڵیدا وا پیشان بدات کە مارکوزە، بە باشی لە فرۆید نەگەیشتووە و هەروەها خاوەنی هیچ جۆرە ئەزموونێکی بەکردەوە لە بواری دەروونشیکاریدا نییە. فرۆم وەك جارانی پێشتر گوتی کە فرۆید پتر زیندانییەکی ماتریالیسمی نادیالێکتیکی بۆرژوایی سەدەی نۆزدەهەمە نەك تاکێکی سەربزێوی دژ بە ئەو بیرۆکەیە. فرۆم هەروەها هەوڵیدا کە ئەو شرۆڤەیەی کە مارکوزە لە روانگەکانی رێڤیزیۆنیستەکان دەیکات و رێڤیزیۆنیستەکان بەیەك جۆر دەزانێ و جیاوازییە سەرەکییەکانی ئەوانە لەبەرچاو ناگرێ، رەتبکاتەوە. فرۆم دەڵێ کە، بۆ نموونە، بۆچوونی ئەو لە مەڕ "کەسایەتی بەرهەمهێنەر" گەلێك پتر لەوەی کە مارکوزە دانی پێدادەنێ لەگەڵ کۆمەڵگای سەردەمدا خەبات دەکات. جگە لەمە فرۆم مارکوزە بە هۆی پێداگری نادیالێکتیکیانە لە مەڕ نەبوونی ئەگەری پێکهاتنی هیچ جۆرە کەسایەتییەکی یەکپارچە لە دۆخی ئێستادا لۆمە دەکات.

ڕەهەندی دووەمی هێرشەکەی فرۆم گرینگترە. لێرەدا فرۆم هەوڵدەدات دژایەتی حاشا هەڵنەگری نێوان ڕەزامەندێتی جنسی و شارستانییەت، کە فرۆید بۆ خۆی ئەوەندە بە زۆری و بەردەوامی پێداگری لەسەرکردبوو، زیندوو بکاتەوە. بەرای فرۆم زۆر نادروستە کە وا بزانین هەندێ لە بێ سەرەو بەرەییە جنسییەکان، کە بەرگری مارکوزە لە "بێ سەرەو بەرەیی چەند شێوازێ" دەیانگرێتەوە، بتوانن لەگەڵ هەر شارستانییەتێکدا وە سازان بکەون. ئەگەر بە تەنیا دوو بابەتی سادیسم و پیسایی خوازی لەبەرچاو بگرین، تێدەگەین کە ئەو دووانە لە هەر هەلومەرجێکدا بێزارکەرن. وە دیهاتن و ڕەزامەندێتی تەواو و خێرا لە مەیلەکاندا کە ئامانجی مارکوزەیە دەتوانێ تاك بکاتە بەشێك لە سیستەمی ئەو بزوێنەر و حەزانەی کە بە ئاسانی دەستکاری دەکرێن، هەر بەو جۆرەی کە لە کتێبی دونیای بوێریی نوێ نووسراوەی ئالدۆس هاکسلێدا ڕوویداوە. بە پێچەوانەی ڕوانگەکانی مارکوزە و (ئادۆرنۆ) خۆشەویستیی جودا لە سێکسواڵیتە، تەنیا بابەتێکی ئیدئۆلۆژیك نییە، ئەگەر چی دەکرێ جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە بکرێ کە ڕوودانی ئەو دیاردەیە لە کۆمەڵگای ئێستادا زۆر دەگمەنە. ئاماژە نێگەتیڤەکانی ئەندێشەی مارکوزە ناگاتە هیچ ئاکامێك جگە لە ڕەتکردنەوەی نێهێلیستیانەی جیهان.

هەر بەو جۆرەی کە لە ڕەوتی مشتومڕە هزرییەکانی نێوان هاوڕێیان و هاوکارانی پێشوودا باوە، ئەو باسە لە چوارچێوەی کۆمەڵێك ڕەتکردنەوە و دژکردەوە لە بەرامبەر ئەو ڕەتکردنەوانەدا درێژەی کێشا. و هەر بەو جۆرەی کە چاوەڕوان دەکرا، جیاوازی بیروڕا لە شتە لاوەکییەکاندا گەلێك پتر لە ڕوانگە هاوبەشەکان زەق دەکرانەوە. مارکوزە تاوانی نێهێلیستبوون قبووڵ دەکات و دەڵێ نێهێلیسمی "ڕوووەرگێڕانی گەورە" (*refusal great*) ڕەنگە تاقانە ئۆمانیسمێکی ڕاستەقینە بێت کە لە چاخی ئێستادا دروستە. ئەم وتەیە بۆ جارێکی تر مارکوزەی لەگەڵ ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر نێزیك کردەوە. بەڵام تەوەرەی سەرەکی لە ئێرووس و شارستانییەتدا لەبەستێنێك دایە کە لە ئاکامدا دەبێتە هۆی پەسەندکردن. شرۆڤەی مارکوزە لە نیروانا زۆر لەو ڕەنگ و بۆی ئەو شتانە دەچێ کە فرۆم پێشتر لە کتێبی هەلاتن لەسەربەستیدا باسیکردووە، لەو شوێنەدا کە نووسیبووی: "بزوێنەرەکانی ژیان و کاولکاری هۆکارگەلێکی سەربەخۆنیین کە پێوەندییان بە یەکترەوە نەبێ بەڵکوو بەشێوەیەکی پێچەوانە پێوەندییان پێکەوە هەیە. هەرچی پتر بەر بە بزوێنەری ژین بگیردرێ، بزوێنەری کاولکاری بەهێزتر دەبێ، هەرچی ژیان پتر وەگەڕ بکەوێ و بگەشێتەوە، هێزی کاولکاری هێورتر و کەمتر دەبێتەوە. کردەوەی تێکدەرانە دەرەنجامی ژیانی تووش و درۆینەیە". مارکوزە لەسەر ئەو ڕوانگەیە بوو کە ئەو دوو غەریزەیە دەکرێ لە ئاکامدا ببنە غەریزەیەك، فرۆم پتر وەکوو دووانەگەرێکی پارێزکار مایەوە. بەڵام بەمەشەوە لە دووانەگەرییەکەی ئەودا غەریزەی مەرگ یان تێکدان تەنها وەك بەرهەمی لێنەهاتوویی و تووشمانی غەریزەی ژیانە. دواتر فرۆم لە کتێبی دڵی ئینساندا ڕوانگەی خۆی بەم جۆرە دەردەبڕێ:

ئەم دووانەگەرییە.. لە جۆری دوو غەریزەی زاتی و بیۆلۆژیك نییە کە بە شێوەیەکی ڕێژەیی نەگۆڕبن و بەردەوام و هەمیشە تا سەرکەوتنی یەکجارەکی غەریزەی مەرگ لەگەڵ یەکدا بەشەڕ بێن، بەڵکوو دووانەگەرییە لە نێوان سەرەتاییترین و بنەماییترین حەز بۆ ژیان — بۆ پاراستنی ژیان — و دژایەتیکردنی ئەو حەزە، ئەو دژایەتییە کاتێ پێکدێت کە ئینسان لەو ئامانجەیدا (حەز بە ژیان) سەرنەکەوێ.

بۆیە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو دوو کەسە پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە گوایە هەڵوێستەکانیان زۆر لەیەك دوورن، وا دیارە لە بارەی توانایی و درێژەکێشانی غەریزەی مەرگدا هاوڕان. یۆتۆپیاییترین کتێبی مارکوزە بە

وەبیرهێنانەوەیەك كە ڕەنگ و بۆ قبوولْكەرانەی تێدایە كۆتایی پێدێت، بەلاّم بە كەلّك وەرگرتن لەو ڕوانگانەی كە هۆركهایمەر پێشتر هێنابوویە ئاراوە، ڕوانگەیەك لە بارەی بێ توانایی لە قەرەبووكردنەوەی ئازارەكانی ئەو كەسانەی كە پێشتر مردوون. جگە لەمەش، كتێبی ماركوزە پیشاندەری بڕوایەكی گەشبینانەیە كە گەلێك دوورە لە كێنایە تاریكەكانی مامۆستایانی تری تیۆری ڕەخنەگرانە.

## سەرنج

–ئەم وتارە وەرگێڕدراوی بەشی سێهەمی كتێبی ( *Martin jay (1976), the Dialectical Imagination London: Heinemann*).

## سەرچاوە

ارعنون/33/ پاییز 1382

# بنیاتنانی کۆمەڵگەی شارستانی:

## ڕۆڵی هۆکارە ناوەکیو دەرەکییەکان

بورهان غلیون

لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵا



بورهان غليون

### یەکەم

#### دەستنیشانکردنی واتای کۆمەڵگەی شارستانی

پێموایە یەکێك لە ئاستەنگە گەورەکان لەبەردەم گەیشتنە هەڵوێستی هاوبەش سەبارەت بە بابەتی کۆمەڵگەی شارستانی (مەدەنی)، وەك گەلێك بابەتی سیاسیو کۆمەڵایەتی دیکەی تایبەت بە نیشتیمانەکەمان، دەگەڕێتەوە بۆ دەستنیشان نەکردنی وردبینانەی ئەو زاراوانەی بەکاریاندێنین، دواجاریش نەبوونی مانایەکی جێگیرو ئاخاوتن دەربارەی بابەتی جیاوازو بڕوابوون بەوەی باسی هەمان مەسەلە دەکەین. نەبوونی دەسنیشانکردنەکەش لێرەدا بۆ سێ مەسەلەی سەرەکی دەگەڕێتەوە: 1/نوێی بەکارهێنانی ئەو زاراوانەی لە کولتووری سیاسیی دیکەوە گوێزراونەتەوە، بەو پێیەش دەستەوستانی بەکارهێنەرانی ئەو زاراوانە لەئاست زانینی هەموو ئەو ماناو ڕەوتانەی پەیوەندییان بە زاراوەکانەوە هەیەو کورتکردنەوەیان بۆ تاقە مانایەکی بەرتەسك کە وەڵامدەرەوەی پێداویستیی کتوپڕی

بەکارهێنانیانە، 2/ئاڵوگۆڕی خێرا لە ناوەڕۆکی تیۆریی زاراوەکەدا، ئەنجامی گۆڕانی خێرای ئەزموونی پراکتیکی کۆمەڵگەکانمان، 3/ئەو ڕەوتە نوێیەی زاراوەکەی تێدا بەکاردەهێنرێت و لە کۆمەڵگەکانی ئێستاماندا پەیوەندییەکی گەورەی بە مشتومڕی سیاسیی بڕواخوازانەو پراکتیکانەوە هەیە.

ئەوەی لە گەشەکردنی بەکارهێنانی چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی لە فیکری سیاسیی هاوچەرخماندا ڕابمێنێت، بێگومان هەرسێ سەرچاوەکەی تێکەڵکردن و دەستنیشان نەکردن بەدیدەکات. بۆیە بەبێ قوتارکردنی لە سێ تێکەڵی، ناکرێت بەشێوەیەکی پراکتیکی بەکاربهێنرێت و بۆ شیکردنەوەی تیۆریی کۆمەڵگەکەمان سوودی لێ وەربگیرێت: **تێکەڵکردنی یەکەم** ئەوەی لە گفتوگۆکانی ئیمڕودا دەرکەتوەو کۆمەڵگەی شارستانی بە پشتیوانەی بەهاکانی ئازادی و ڕزگاری دەزانێت و لە شوێنگەی ناکۆك بە دەسەڵات و دەوڵەت دادیدەنێت کە بێگومان بەهاکانی زۆرداری لەخۆدەگرن. لەم بارەدا نازانین جیاوازیی کۆمەڵگەی شارستانی لەگەڵ کۆمەڵگەی سیاسیدا چییە، تەنیا ئەوە نەبێت کە جۆرێکی "پێشکەوتووتر"ی سیاسەت یان کۆمەڵگەی سیاسییە، ئەویش کۆمەڵگەی دیموکراتیانە یان دەوڵەتی دیموکراتیە. ئەمە وێڕای ئەوەی هەڵەیەکی گەورەیە لەو بڕوایەدابین ئازادیی سیاسی– بەواتا هاوچەرخەکەی– بەری گەشەکردنی کۆمەڵگەی شارستانیە نەك دەوڵەت. ئەم بەکارهێنانەش هیچ پەیوەندییەکی بە مانای یەکەم و بنەڕەتیی چەمکەکەوە نییە، لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی شارستانی لە فەلسەفەی سیاسیی شارستانیانەدا نەبۆتە چەمکێکی زانستی، چونکە لەسەر بناغەی دیاریکردنی پانتاییەکی جیاکارەی پراکتیکی کۆمەڵایەتی و دەستنیشانکردنی جۆرێك چالاکی جیاواز لە سیاسەت دامەزراوە، بەو پێیەش بۆتە چەمکێکی کارڕاییەکی (ئیجرائی) سوودبەخش. **تێکەڵکردنی دووەم** لە هاوجووتکردنی چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی و چەمکی کاروباری تایبەتیەوە سەرچاوەدەگرێت کە پەیوەندی بە تاك و ژیانی کەسێتییەوە هەیە، لە بەرامبەر کاروباری گشتی و دەوڵەت کە بایەخ بە مەسەلە نیشتیمانیەکان دەدات. لەم ڕوانگەیەدا ئازادی و پێشکەوتن ڕوەو دیموکراسی، گرێدراوی گەڕانەوەن بۆ تاکخوازی و باڵادەستیی بەرژەوەندیی تاکەکەسی. **تێکەڵکردنی سێیەمیش** لە هەوڵدانێکی نوێوە سەرچاوەدەگرێت کە دەیەوێت کۆمەڵگەی شارستانی لەبەرامبەر کۆمەڵگەی ئەهلی ڕابگرێت. سەرچاوەی ئەم هەوڵدانەش خستنەگەڕی سیاسیانەی چەمکەکەیە دژی ئەو ئاقار یان بزووتنەوانەی وەك هەڵگری بەها تەقلیدییەکان سەیردەکرێن. لەم بارەدا کۆمەڵگەی شارستانی هاوجووتی ڕێکخراوو پێکهاتە نوێکانی وەك حیزبەکان و سەندیکاکان و ڕێکخراوەکانی ژنان دەبێت، لەم ڕەوتەشدا وەك ئامێری جەنگ دژی بنەما کۆنە ئایینی یان تیرەگەری یاخود لایەنگرخوازەکان بەکاردەبرێت.

گوتاری کۆمەڵگەی شارستانی لە فیکری سیاسیی ئیمڕۆماندا، ئەو بڕواخوازییەی نوێکاری تازەدەکاتەوە کە ئەنجامی تێکشکانی پڕۆژە چەپخوازییەکان و بەهاکانی سۆسیالیزم بەگشتی زۆربەی ڕەوایەتی و ڕاستبێژیی خۆی لەدەستداوە، چونکە گشت ئەو ئاوێتانە مەیلی ئەوەیان هەیە چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی بکەنە هەڵگری بڕواخوازییەکی کۆمەڵایەتی دژ بە بڕواخوازیی ئیسلامی و هاوپەیمانێتیەکی نوێ دامەزرێنن لەنێوان ئەو دەستەبژێرانەی لە بارودۆخی سیاسیی خۆیان و شوێنگەیان لەنێوان دەوڵەت و دەسەڵاتی سەرتاپاگیر یا مۆنۆپۆڵکار دەترسن و لێرەشدا وەك

زامنكەری بنچینەیی بۆ بەردەوامبوونی بزووتنەوەی نوێكردنەوەو بەئەقلانیكردنی كۆمەڵایەتی تێیدەڕوانن.

لەواقیعدا گرێدانەوەی چەمكی كۆمەڵگەی شارستانی بە دیموكراسییەوە یەك فرمانی هەیە، ئەویش بەخشینی جۆرێك لە ڕەوایەتیی سیاسییە بەو پڕۆژەی نوێكارییەی دەوڵەت نوێنەرایەتیدەكات. واتە پڕۆژەی گۆڕانكاریی بیروكراتیانەی شارستانی یان سەربازیی كۆمەڵگەكانمان، ئەو گۆڕانكارییەی ماوەیەكە ئامانجە ڕوونو بڕواهێنەكانی خۆی لەدەستداوە. كەواتە بەكارهێنانی فراوانی چەمكەكە لە ئیمڕۆدا هیچ ناوەڕۆكێكی زانستی نییە، هەرگیزیش مەبەست قوڵكردنەوەی تێگەیشتنی میكانیزمی گۆڕانكاریی كۆمەڵگەكانمانو ڕۆڵی توخمگەلو بنەماگەلی شارستانیو سیاسی نییە، بەڵكو هەوڵدانە بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی بڕواخوازیی نوێكاریی دەستەبژێرە پاشەكشەكردوەكان لەسەر چەند بنچینەیەك كە گونجاون لەگەڵ كەشی ئەو سەردەمەی تیایدا دەژینو تەبایە لەگەڵ ئەوەی دەسەلاتی ئیمڕۆ هیچ پڕۆژەیەكی كۆمەڵایەتی ڕاستەقینەی نییە، جگە لە بەرپەرچدانەوەی ئەوەی پێیدەڵێت بزووتنەوەی ڕابردووخواز یان گەڕانەوە بۆ دواوە. واتە بەرانگاربوونەوەو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ئاقارانەی دەوڵەت ڕەتدەكەنەوەو لەناویدەبەن، مەبەست ئەو ئاقارانەیە كە ئیسلام دەكەنە سەرچاوەی بڕواخوازیی خۆیانو دەشێت لە قۆناغی دیكەدا سوود لە سەرچاوەگەلی جیاوازی دیكەش وەربگرن.

چاكسازیكردن بۆ كاركردن بەم چەمكەو سەرلەنوێ كردنەوەی بە چەمكێكی كارڕایی زانستی، نەك تەوەرێك بۆ نوێكردنەوەی بڕواخوازییەكی سیاسیو دروشمێك لە جەنگی بڕواخوازیو سیاسیی ئیمڕۆی كۆمەڵگەكانماندا، لەلایەكەوە پێویستی بە ڕوونكردنەوەی ناوەڕۆكی زانستی ئەم چەمكە هەیە، لەلایەكی دیكەشەوە خستنەڕووی ئەو سوودە پراكتیكیەی گەرەكە كە ئەنجامی بەكارهێنانی لە شیكردنەوەی گۆڕانكاریی كۆمەڵایەتی سیاسیو شارستانی لە كۆمەڵگە هاوچەرخەكانماندا بەدەستدێت.

یەكەمین توخمی ئەو چاكسازییە، جەغتكردنەوەیە لەسەر ئەوەی، كۆمەڵگەی شارستانی چەمكێكی تیۆریی ڕووتە نەك واقعێكی بەكردەوەی ئەزموونگەریی دامەزراو بەخودی خۆی یان شتێكی ئامادەكراوە. كۆمەڵگەی شارستانی ئامێرێكی تیۆرییە– ئامیری تیۆریش وەك نەشتەری پزیشكی نەشتەركار وایەو ناكرێت لەگەڵ ئەو جەستەیەدا تێكەڵ بكرێت كە نەشتەرگەری دەكرێت– ئامانجی یارمەتیدانە بۆ جیاكردنەوەی بازنەكانی جەمسەرگیریی ڕوویەكی بنەمای كۆمەڵایەتی سیاسی لەگەڵ ڕووەكانی دیكەداو ئەو ڕۆڵ یان ئەركەی لە چوارچێوەی بنەمای هەمەلایەنو كامڵدا (كە وەك تەنێكی یەكگرتوو نەبێت كار ناكات) پێیهەڵدەستێت. ئەمەش مانای ئەوەیە كۆمەڵگەی شارستانی یان ئەو چالاكییە كۆمەڵایەتیەی دەمانەوێت جلەویبكەین یاخود بە بەكارهێنانی زاراوەی كۆمەڵگەی شارستانی جیایبكەینەوە، ناكرێت بە دابڕین لە دەوڵەت یان گەشەكردنی جۆری پەیوەندیی سیاسی بەگشتی، وەك ڕاستییەكی ئەزموونگەری– واتە لەواقیعدا– تێیبگەین. كۆمەڵگەی شارستانی هەوڵدەدات یەكێك لەو ئاستانەی خوارەوەی (واتە قوڵتری) ڕێكخستنی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئاشكرابكات كە سیاسەت، وەك چالاكییەكی ڕەسمی تەواو ڕێكخراوو دەستنیشانكراوە، ناتوانێت بیهێنێتەدیو ناشتوانێت بەبێ ئەو یان لە دەرەوەی ئەو دامەزرێت، چونكە ڕێكخراوی شارستانیانەی كۆمەڵگە بناغەیە یان ئەو چینە نێوەندكارەیە كە

هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی ڕێکخراو لێی بێبەش نییەو ناکرێت لێی بێبەش بێت و نەبوونی مانای چوونە ناو دڕندایەتییە، بەڵام ئەوە وەك ڕێکخراو بەس نییە بۆ ڕاپەڕاندنی هەموو ئەو ئەرکانە کە بەڕێوەچوونی شارستانیەتی ئیمڕۆ گەرەکییەتی. دەوڵەتیش، وەك ناوەندی ڕێکخستنگەلی خاوەن چۆنایەتی نوێ، بەتواناترە بۆ چڕکردنەوەی کۆششی مرۆڤانەو لە پشتییەوە سیاسەت، وەك بەرهەمهێن و ئاڕاستەکاری ئەو چڕکردنەوەیە، دەسەڵات و پراکتیکێکی ڕۆژانەیە، دۆزینەوەی ئاستێکی بەرزتری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییە کە گەشەکردنی ژیواری و تەکنیکی پێویستیکردوە. بۆیە ئەو کۆمەڵگە مرۆڤایەتیانەی گوێزانەوەیان لە ئاستی ڕێکخستنی یەکەمی شارستانیانەوە بۆ ئاستی ڕێکخستنی سیاسی و پێکهێنانی دەسەڵاتی ناوەندی بەخۆوە نەدیوە، ناچاربوون لەگەڵ کۆمەڵگەکانی دیکە تێکەڵ بن یان لەئاستێکی نزمی پەرەسەندنی ژیواریدا (حضاری) بمێننەوە. بێگومان سەرهەڵدانی ئاستێکی نوێی ڕێکخستنی کۆششە مرۆڤایەتیەکان لەناو کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا، مانای ئەوە نەبوەو نییە کە شێوازەکانی ڕێکخستنی شارستانیی پێشوو ڕۆڵ و پێگەی خۆیان لە مێژوو و کۆمەڵگەدا لەدەستداوە، چونکە گەشەکردن مانای ئاڵوگۆڕکردنی بونیادێك نییە بە یەکێکی دیکە، بەڵکو مانای خونچەکردنی چەندین توانای نوێیە لە بونیادێکی دامەزراودا، سەرەنجامیش کرانەوەی چەندین بواری نوێیە بۆ پراکتیك و ڕێکخستن کە سروشتی ئۆرگانیکی کۆمەڵگە زیاتردەکەن و چەندین هاوسەنگیی هەمەڕەنگ و قوڵی وەها دەخوڵقێنن، کە ڕێگەی پێدەدەن ستراتیژ هەمەجۆر پێڕەوبکەن و پراکتیکی بەکۆمەڵی مەزنتر ئەنجامبدەن. بۆ نموونە دۆزینەوەی چەمکی سوپای نیشتیمانی لە کۆمەڵگە نوێکاندا نەبۆتە هۆی ڕەتکردنەوەی ئاستی کردارو ڕێکخستنی سەربازیی سەرەتایی و هۆزگەری و میلیشیایی، بەڵام ئاسۆی فراوانتری بۆ ستراتیژیا کردۆتەوە، چونکە دەرفەتی بۆ پێکهاتنی سوپای مەزنتر، لە ڕووی ژمارەو چەکەوە، ڕەخساندوە.

سەبارەت بەو کۆمەڵگە مرۆڤایەتیانەی توانیویانە هەنگاوێکی زیاتر لەسەر ڕێگەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بچنە پێشەوە، گەشەپێدانی بونیادێکی سیاسیی نوێی لە دەرەوەی دامودەزگای دەوڵەت و دەسەڵاتەکەی، مانای لەناوبردنی بنەمای شارستانیانەی پێشوو نەبوە، واتە شێوازەکانی ڕێکخستنی ئایینی، هۆزگەری، عەشیرەتگەری و خێزانی کە گشت کۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکانی پێش لەدایکبوونی دەوڵەت بەخۆیانەوە دیوە، بەڵکو ڕێگەی بۆ فراوانبوونی بازنەی نیشتەجێبوون و پێکەوەژیانی مرۆڤانە کردۆتەوە، واتە خوڵقاندنی چوارچێوەی چالاکتر بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگە سیاسیی گەورەتر کە توانای دابینکردنی کەڵەکەکردنی پێویستیان هەیە بۆ پەرەپێدانی ژیواری، ئەگەرچی دەوڵەت و سیاسەت هەر بەردەوامبوون لەسەر پشتبەستن بە ڕێکخراوە شارستانیەکانی پێشوو. لێرەدا سەرهەڵدانی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی یەکەم، بەبێ بوونی بونیادە کۆمەڵایەتیە شارستانیەکان کە ئیسلام بۆ بنیاتنانی دەسەڵاتێکی ناوەندیی نوێ و لەسەر بنچینەی بڕوای خۆی سوودی لێ وەرگرتوە، شتێکی وێنانەکراوە، مەبەست لەو بونیادانە، هۆزو سیستەمی بەها ئەخلاقییەکانیەتی: تاقمخوازی و هاوکاری، ئەگەرچی هەوڵیداوە بەپێی توانا بیانکاتە هاوکاریی هەمەلایەنتر: هاوکاریی ئایینی. سیاسەت بۆ دامەزران، پێویستی بە ڕەتکردنەوەی بنەما شارستانیەکانی پێش سیاسەت نەبوە، بەڵکو لەڕێی خستنەڕووی چەندین پرنسیپی پایەدارترو دامەزراوی کارامەترەوە دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ یەکخستنی ئەو بونیادە شارستانیانەو

کۆکردنـەوەیان لـە ژێـر ئـاڵای خۆیـدا. لێرەشـدا سیاســەت وەك سیاســەت، واتــە بــارودۆخێکی هەمەلایەنتر، بەڕادەی چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی دامــەزراوە شارســتانیەکان و کــارکردن بــۆ بەئەقڵانیکردنیان و دانانیـان لـە سیاق و لـۆژیکێکی نوێـدا، ئـەویش لـۆژیکی نیشـتیمانی هەمەلایەنـە، گەشەدەکات. بۆیە سیاسەت هیچ مانایەکی نابێت، لـەو بـارەدا نـەبێت کـە بـە دوو واتـە: وەرگـرتن و بەخشین، پەیوەندیی لەگەڵ کۆمەڵگەی شارستانیدا دەبێت. ناشمێنێتەوە، ئەگەر کۆمەڵگەی شارستانی بەردەوام نەبێت لەسەر خوڵقاندنی تاقمگەرییەکان و بەهاو بنەماگەلە ناسیاسییە سەرەتاییەکان: خێزان، تـاك، بـڕواو نەریتەکان..هتـد. ئـەو کۆمەڵگەیـەش ناتوانێت هاوسەنگیی خۆی بپارێزێت و لە قوناغی پێشــکەوتووتردا خــۆی ڕێکبخاتــەوە، لــەکاتی بــەردەوامبوونی دەوڵــەت و ســەرکەوتنی لــە چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکیانەدا نەبێت کە بەری ململانێ سروشتییەکانی ئەون.

یــەکێك لــە خەســڵەتەکانی کۆمەڵگــەی شارسـتانی هەمــەڕەنگی و فرەییــە. فرەیـی مانـای هــەڵوەرین، لێــك دوورکەوتنــەوە، نــاکۆکی و پێکدادانــەو لەســەر یەککــەوتنی بەشــەکان دادەمەزرێت و یەکێکە لە سەرچاوە هەرە گەورەکانی پەرەسەندنی سیاسەت و مەرجی بوونی بریتییە لە دەرفەتڕەخسـاندن بـۆ تێپەڕانـدنی ئـەو هـەڵوەرین و فرەیی و ناکۆکییەو کارکردن بۆ ئەوەی ئەو گرووپە لێك دوورانە وەك جەستەیەکی یـەکگرتوو کاربکەن و تاقە ویستێك بەرهـەمبێنن، ئەگەرچی ئـەم فرەیـی و لێکدوورییـــــــە سەرچــــــاوەی ســــــامان و دەوڕڵەمەندبوونیشە، بەڵکو ئەو پێکهاتەیەی پتەوەو هیچ جیاوازییەکی تێدانییە، پێکهاتەیـەکی مردوە، گرنگیـی کۆمەڵگـەی شارسـتانیش، بـە نـاکۆکی و فرەییـــەوە، کتومــت جلــەوکردنی پێکهــاتنی دینامیکیەتی داهێنان و خوڵقاندن و گۆڕانکارییە لە کۆمەڵگەکانـدا، چـونکە ئەگـەر سیاسـەت بیـەوێت شوێنی کۆمەڵگەی شارستانی بگرێتەوەو بەشێوەی ئەو تاقە شێوازەی ڕێکخستن ڕەفتاریکرد کە هەموو ژیـان و چـالاکییەکان لـەخۆدەگرێت، ئـەوا کۆمەڵگـە دەکوژێـت و لەناویـدەبات. ئەمـەش ئـەو شـتەیە لـە گـەلێك لـە وڵاتـەکانمان ژیـانی لەگـەڵ بەسـەردەبەین. شـێوازی ڕێکخسـتنی سیاسـی تـەنیا ئـەو کاتــە داهێنەرانـە دەبێـت کـە چالاکیگەلی وەهـا ڕێکبخـات پەیوەندییان بە یەکخستن و چڕکردنەوەی کۆششی مـادی و تیـۆریی مرۆڤانـەوە هـەبێت، کـە کۆششـێکی داهێنەرانەیە. هەرکاتێکیش خواستی ئەوەی هەبوو جێگەی کۆمەڵگەی شارستانی هەمەڕەنگ بگرێتەوە، کە دەرفەتی خوڵقاندن و داهێنان دەڕەخسێنن، ئـەوا بـــەکاربوونی سیاســـی و شارســـتانی پێکـــەوە لەدەســـتدەدات. ئامــانجی سیاســەت هەڵکشــان و تێپەڕاندنــە لــەپێناو یــەکگرتنێکی هەمەلایــەنتردا، لەکاتێکدا ئامانجی کۆمەڵگەی شارستانی پاراستنی جیاوازییـــەکان و مســـۆگەرکردنی تایبەتمەنـــدی و یەککەوتنی بەشە زیندوو و پێویستەکانە.

بەکورتی، کۆمەڵگـەی شارستانی بەوە لـە سیاســـەت جیاناکرێتـــەوە کـــە سیاســـەتێکی دیموکراتیانـەی دیکەیـە، بـەڵکو بـەوەی شـێوازێکی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی تایبەتە بە پەیوەندییـەکانی نێــوان تاکــەکان، ئەمــەش نــەك وەك هــاووڵاتی و ئەنـدامی نیشـتمانێك، واتـە نـەك وەك خوڵقانـدنی پەیوەندییـــەکی نیشـــتمانپەروەرانەی هەمەلایـــەن (نەتەوەو دەوڵەت)، بەڵکو وەك بەرهەمهێنەری ژیانی مـادی، بـڕوا، بیروبـاوەڕ، پـیرۆزی و سمبولـەکانیان. هـیچ یـەکێك لەوانـەش ئـەرکی سەرشـانی سیاسـەت نییـە بـەو واتـا بەرتەسکەی ئیمڕۆ بەکاردەهێنرێت، سیاسەتیش بەبێ مۆمیاکردنی بەرهەمهێنان و بڕواو پیرۆزییـەکان و گۆڕینیـان بـە بتێـك، ناتوانێـت ئـەو ئەرکــە جێبــەجێبکات. بــەم واتایــە، نازنــاوی شارستانی دەبەخشرێتە ئەو ڕێکخراوو بونیادانەو

ئەو یەککەوتنانەی لێشیان دەکەونەو تایبەتمەندن بــە بەرهــەمهێنانی ژیــانی ئــابووریو ئــەخلاقیو خێزانیـــــی مرۆڤاکـــــانو ملکەچـــــی هــــیچ ڕێکخســـتنێکی ڕەسمیـــی هەمەلایـــەنو گشـــتی دەسەلاتی ناوەندی نین.

ئەمەش مانای ئەوەیە، بەبێ تێگەیشتن لە سروشتی دەسەلاتو سیاسەت، سەختە سنوورێکی جیاکـــەرەوە لـــەنێوان کۆمەڵگـــەی شارســـتانیو کۆمەڵگــەی سیاســیدا دابنرێــت، چــونکە ســنووری کۆمەڵگـــەی شارســـتانی، بـــەگۆڕانی سیســـتەمە کۆمەلایەتیـەکان، گــۆڕانی بەســەردا دێــتو ئــەوەی ڕۆژگارێـك بـە یـەکێك لـە کاروبارەکـانی کۆمەڵگـەی شارســـتانی دادەنــرا، دەشــێت ببێتــە یــەکێك لــە کاروبارەکـانی کۆمەڵگـەی سیاسـی، پێچـەوانەکەش ڕاسـتە. لـە دەوڵـەتی عـەرەبیی ئیسلامی مێژوویـیدا ئـــایین سەرچـــاوەیەکی پێکهـــاتنی دەســـەلاتی ناوەنـدیو یـەکێك لـە کۆڵەکـەکانی بـووو دەکەوتـە بازنـەی کۆمەڵگــەی سیاسـییەوە، بـەڵکو تـەوەری ســەرەکی ئــەو کۆمەڵگەیــە بــوو، کەچــی ئــایین لــە دەوڵەتو سیستەمی سیاسیی نوێی ئەورووپای پاش شۆڕشـی سیاسـی، بۆتـە یـەکێك لـە کاروبارەکـانی کۆمەڵگـەی شارسـتانیو بەسـەر ئـەو کۆمەڵگەیـەدا ســـەپێنراوە. ڕێکخـــراوە ئابوورییـــەکانیش، واتـــە ئەوانـەی تایبـەتن بـە دیـاریکردنی پەیوەندییـەکانی کـــارو بەرهـــەمهێنان لەئاســـتی بژێوییـــدا، وەك: بازرگــانی، پیشەســازی، پیشــەگەریو کشــتوکاڵ، کاروبـــارێکی تایبـــەتی بـــوون، بـــەلام کاتێـــك پێداویسـتیی ژیـواری، دەسـتێوەردانی دەوڵـەت لـە ژیــانی ئــابووری ســەپاند، ئاســتێکی سیاســیان لەخۆگرت. لێرەوە ئابووریزانیـەکی نـوێ سـەریهەڵدا کە نـاوی ئـابووریی سیاسـی بـوو. هۆکـاری ئـەوەش ئــەوە بــوو، چــیدی نــەدەکرا ڕێکخســتنی ژیــانی بەرهـــەمهێنانی کۆمەڵگـــەکان كـــە ئـــاڵۆزتربووو، جێبهێڵرێــت بــۆ یاســا یــان لــۆژیکی یەککــەوتنی

خۆڕســکانەو ئــەخلاقی گشــتیی جوامێرانــە یــان خۆپەرســـتانە، بـــەڵکو ڕێکخســـتنی ئەقلانیانـــەی ئــابووری پێویســتی بــە تێڕوانینێکــی گشــتیو سیاسیو نیشتیمانپەروەرانە هەبوو.

لەبەرامبەردا، کۆمەڵگەی شارستانی، وەك چۆن سەرچاوەی بەهاکانی ئازادیو پێشکەوتنە، ئاوەهـاش دەشێت سەرچاوەی بەها موحافـەزەکارو کۆنەپەرســـتەکان بێـــت. ئـــەوەی ڕێکخـــراوە شارســتانیەکان لــە سیاســەت جیادەکاتــەوە، دوو توخمە:

1/ڕێکخراوە سیاسییەکان ناوەنـدیخوازن، واتـە تایبـەتن بـە پێکهێنـانو پاراسـتنی دەسـەلاتی ناوەنـدی، کەچـی ڕێکخـراوە شارسـتانیەکان لەسـەر بنچـینەی تایبەتمەنـدبوونو سـەربەخۆیی خـۆییو پەرەپێدانی یەککەوتنی بەشەکان دادەمـەزرێن، واتـە بایـەخ بـەو چالاکیانە دەدەن کـە دەوڵـەتی ناوەنـدی دەستوەرناداتە ڕێکخستنی ڕاستەوخۆیان.

2/ڕێکخـــراوە سیاســـییەکان ڕەسمـــینو پەیوەندییـــەکان تیایانـــدا بـــەپێی یاســـای جـــێگیرو گشـتیو ڕووتو بابـەتی بنیاتـدەنرێن، لـە کاتێکـدا ڕێکخـــراوە شارســـتانیەکان ملکەچـــی ڕێســـاگەلی نـــاڕەسمینو بەشـــێوەیەکی گـــەورەتر گرێـــدراوی گـۆڕانی تـەرازووی هێزەکـان، دابونـەریت، ئـەخلاق یـــاخود بەرژەوەنـــدین. ئەمـــەش مانـــای ئەوەنییـــە ڕێکخراوە شارستانیەکان زۆربۆهێنانو جڵەوکردنی وردکارانــە بــۆ ئاڕاســتەکردنی ڕەفتــاری تاکــەکان بەکارنابەن، بەڵکو شێوازی پێکهاتنو کارپێکردنی دەسەلاتی ناوەکی تیایاندا جیاوازە لەگەڵ کاروباری سیاســی، چــونکە ئەوانــە بەپێچــەوانەی ئــەوەی لــە دەوڵـــەتو پێکهێنـــانی دەســـەلاتی ناوەندیـــدا ڕوودەدات، ئەو دامەزراوانـەی تـەعبیر لـەوان دەکـەن، ملکەچــی هــەمان ئــەو ڕێســایانە نــین کــە لەلایــەن دەســـەلاتی ناوەندییـــەوە داڕێـــژراونو بەســـەر هەموولایەکـدا جێبـەجێ نـاکرێن یـان بەپێویسـت

بەهەمان ڕادە لەناو دامەزراوی شارستانیدا جێبەجێ ناکرێت. کاروباری تایبەتی لێرەدا کاروباری تاکەکەسی ناگەیەنێت، چونکە ئایین کاروبارێکی تایبەتی نییە، بەڵکو کاروبارێکی گشتییە، بەوپێیەی پەیوەندییەك ڕێکدەخات کە گرووپێکی گەورە دەگرێتەوە. تایبەتی لێرەدا مانای ئەوەیە دەوڵەت دەست ناخانە ناو ڕێکخستنی پەیوەندییە ناوەکیەکانیانەوە، ئەوەی لە زمانی کلاسیکیدا پێی دەوترێت گۆڕەپانی ئەو شتانەی دەستکاری ناکرێن و سەرپێچیکردنی ئەو پرنسیپە، هەڕەشەدەبێت بۆ سەر ئاشتیی گشتی و سنووربەزاندنی دەسەڵاتەکانە لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە.

بەپێی ئەم بنچینەیە، شارستانیبوونی گشت ڕێکخراوە ئابووری یان کولتووری یاخود ئایینیەکان، کە گۆڕەپانی چالاکیی ئازادانەیان تەنیوەتەوە، بە یەك سیستەمی گشتی لەلایەن دەسەڵاتەوە ڕێك نەخراون و ڕێگە بەوە دراوە چاکییەکانیان پەرەبستێنن و پێشبڕکێ بکەن و نوێبنەوە و داهێنان بێننەئاراوە. ئازادی لێرەدا مانای ئەوەنییە جگە لەخۆی کەس دەسەڵاتی بەسەریدا ناشکێتەوە، بەڵکو هێماکردنە بۆ شێوازێکی جیاوازی دەسەڵات و کارپێکردنی دەسەڵات و ئامرازی جیاوازی سزادان، بەبەراورد لەگەڵ شێوازی سیاسیی دەسەڵات. هەروەها مانای ئەوەنییە ڕێکخراوە شارستانییەکان یاسایەکی گشتی جێبەجێ ناکەن و ملکەچی ڕێساو یاسای تایبەتی نین، بەڵکو مانای ئەوەیە وەك یاساکانی دەوڵەت ڕواڵەتکارو داڕێژراو نین.

ڕێکخراوی شارستانی، وەك هەر ڕێکخراوێکی مرۆڤانە، چەندین توخمی دەسەڵاتی ناوخۆیی لەخۆدەگرێت کە بریتین لە بەکارهێنانی هەردوو ئامرازی سەرکوتکردن و باوەڕپێهێنان بۆ جڵەوکردنی چالاکی و ڕەفتاری ئەو تاکانەی لە ڕیزەکانیدان، بەڵام لە هەموو ئەوانەدا چالاکیی دەسەڵات لە ڕێکخراوە شارستانیەکاندا نەرمونیانترو فرەلایەنترە و گرێدراوی چەندین هۆکاری لەگۆڕانهاتوە، وەك ئەو هەلومەرجەی تیایدا بەکاردەهێنرێت و نرخاندنی کەسێتی سەرکردەکان و هێزی پەیوەندییە تاکەکەسیەکان و سەرنجراکێشیی بەرژەوەندییە مادییەکان. واتە ڕێکخراوی زۆر نەرمونیانن و توانایەکی چاکتریان هەیە بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ هەلومەرج و بارودۆخی لەگۆڕانهاتووی کات و شوێن، بۆیە دەکرێت وەلاوەبنرێن، کەچی دەبینین نەگۆڕی، بێلایەنی، گشتگیری و جیاوازی نەکردن لە جێبەجێکردندا مەرجی پێناسەیی دەسەڵاتی سیاسین.

سوودی ئەم پێناسەیە ئەوەیە، بەتەواوەتی سنووری ئاستێکی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیمان بۆ دیاریدەکات کە لەم سەردەمەدا پێیدەڵێین کۆمەڵگەی شارستانی، چونکە کۆمەڵەکان، سەندیکاکان، پێکهاتە عەشایەری، تایەفەگەری، هۆزگەری و خێزانیەکان و کولتوورو ئەخلاق و دابونەریتەکان، گشت ئەوانە دەکەونە بواری کۆمەڵگەی شارستانییەوە. بەم مانایەش هیچ بوارو بایەخێکی نییە جیاوازی لەنێوان کۆمەڵگەی شارستانی و کۆمەڵگەی ئەهلیدا بکرێت. ئەوەی هەندێك کۆششدەکەن لە ڕێگەیەوە بەشێك لە چالاکیی شارستانی تاوانباربکەن و بەشەکەی دیکەش خۆشەویست بکەن، چونکە ئەگەرچی ئەو جیاوازیکردنە ئامرازی ڕەتکردنەوەی ڕەوایەتیبوونی پێکهاتەو دابونەریت و بەها هۆزگەرو تایەفەگەرییەکان دەداتە دەستەوە، بەڵام ڕێگەش لە تێگەیشتنی سروشتی ئەو هێزە بەکردەوانە دەگرێت کە کۆمەڵگەیەکی وەك کۆمەڵگەی شارستانی دەبزوێنن، بەوپێیەش ڕێگە لە بینینی ئەو ئەرکانە دەگرن کە پێویستە سیاسەت لە کۆمەڵگەکانماندا تاوتوێیان بکات و چارەسەریان بۆ

بدۆزێتـــەوە. لەبەرئـــەوەی وەك وتمـــان ئامـــانجی بەهانـــەی بـــوونی سیاســـەت ئەوەیـــە یارمـــەتی کۆمەڵگـــەی شارســـتانی بـــدات لـــە پرشـــوبڵاویو ناکۆکییـەکانی ڕزگـاری بێـت، نـەك ئینکـاری بـەهاو ڕێکخراوەکـــانی بکـــات یـــان مۆدێـــلو شـــێوازی حازربەدەست بسەپێنێت بەسەریدا کە نازانێت لە کوێو چۆن شوێنو بواریـان لـە بونیادەکانیـدا بـۆ بدۆزێتـــەوە. هـــاوردنی شـــێوازگەلی نـــوێ بـــۆ کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو، گرێدراوی سەرکەوتنە لە تـــاوتوێکردنی بونیـــادە دامـــەزراوەکانو دەرفـــەت ڕەخساندن یان خوڵقاندنی مەرجەکانی پێگەیشتنی ئـەو شـێوازانەیە، لـەپێش هەموویانـــەوە شـێوازە سیاسییە نوێکان.

شـــتی گـــرنگ لـــە هـــەموو ئەوانـــەدا، دەرککردنـە بـە ڕاسـتییەکی جەوهـەری، ئـەویش ئەوەیـە کـە دەوڵـەتو کۆمەڵگـەی شارسـتانی دوو مەسـەلەی لێك سـەربەخۆنین، بـەڵکو تـەواو پێکـەوە گرێـدراون. هـەر دەوڵـەتو سیسـتەمێکی سیاسـی خـــاوەنی کۆمەڵگەیـــەکی شارســـتانیی گونجـــاوە لەگەڵیدا، بـەڵکو کۆمەڵگـەی شارستانی بەشێکە لە سیاسـەت بـەواتا فـراوانو قووڵەکـەی، واتـە بـەبێ تێگەیشـــتن لـــە گەشـــەکردنی دەوڵـــەتی نـــوێو پەیوەندیی بە کۆمەڵگەوە، مەحاڵە لە چارەنووسی کۆمەڵگـــەی شارســـتانی لـــە کۆمەڵگەکەمانـــداو کاریگـەریی هۆکـارە نـاوخۆییو دەرەکیـەکان تیایـدا تێبگـــەین، چـــونکە کۆمەڵگـــەی شارســـتانی، وەك سیاسەت، پەیوەندییەکە دەسەڵاتێکی مەعنەوی یان سیاسـی دەیچەسـپێنێت کـە جڵـەوی ڕەفتـاری تـاكو گرووپـەکان دەکـات. بـۆ نموونـە، دەوڵـەتی ئـایینی وەڵامدانـەوەی سیاسـی بـوو بـۆ کێشـەی تاقمگـەریی هۆزخوازانـەو ناکۆکیـەکانیو بنەچـەی ڕەتکـردنو دۆزینـــەوەی چارەســـەری گونجـــاویش لـــە ڕێگـــەی برایەتی هەمەلایەنەوە کە گرووپی پـەیمانخواز لـەبری برایـــەتی خـــوێن (ئـــەوەی تاقمگـــەریی هۆزخوازانـــە لەسەری ڕاوەستاوە) پەرەی پێدەدا. سیستەمەکانی نوێنەرایـــەتیکردنو لیبرالیســـتانەش وەڵامدانـــەوە بـــوون بـــۆ ئـــاڵۆزبوونی دابەشـــکردنی چـــینایەتی مەتریالیستانە کە سەرمایەداریو سیستەمی کرێو قـــازانج خســـتبوویانەوەو دۆزینـــەوەی چارەســـەری گونجـــاو بـــۆی لەڕێگـــەی چـــەمکی نەتـــەوەو هاوڵاتیبوونەوە.

## دووەم

### تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵگەی شارستانی نوێمان

### کۆمەڵگەی جیهانی کراوەو دەوڵەتی داخراو

بەشێوەیەکی گشتی ناکرێت دەوڵـەت لای هـــیچ میللـــەتێك لـــە دەرەوەو دژی کۆمەڵگـــەی شارســـتانی ســـەرهەڵبدات، لـــە چـــەند بـــارێکی دیـاریکراودا نـەبێت: 1/ هەرەسـهێنانی ڕێکخـراوە کۆمەڵایەتیـە شارسـتانیە بەناوبانگـە ئـابووری یـان بڕواخوازییـەکان لەبـەر ئـەم یـان ئـەو هـۆ، وەك ئـەو تەنگوچەڵەمە مێژووییە قوڵانـەی دەشێت دووچاری کۆمەڵگـــەکان بـــبن، 2/داگیرکـــاریی دەرەکـــی کـــە شـێوازگەلی ڕێکخسـتنی وەهـا بەسـەر کۆمەڵگـەدا دەســـەپێنێت هـــیچ پەیوەندییـــەکیان بـــە بـــەهاو ڕێکخـراوە شارسـتانیەکانیانەوە نییـەو مەبەسـتیان تێکشـــکاندنی بنـــەماکانو پرشـــوبڵاوکردنەوەی هێزەکانیـەتی بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی، 3/کاتێك دەوڵـەتو دەسـەڵاتی ناوەنـدی ئـەخلاقو بڕواکـانی خۆیان لە ئاقاری تیۆریو سیاسیی دەرەکی وەهاوە بەدەستدێنن کە هیچ پەیوەندییەکیان بە کۆمەڵگەی بنەڕەتیەوە نییە.

ئـەو نوێکردنـەوە ئـابووریو تـەکنیکیو زانســـتیانەی لەپێشـــدا کۆمەڵگـــە ئەوروپاییـــەکان بەخۆیانـەوە دیـوەو دواتـر بـەم یـان بـەو شـێوەیە لەڕێگـەی سـەرمایەداریو داگیرکـاریی هەمەلایـەنی سـەربازیو ئینجـا کۆمەڵایـەتیو ئابوورییـەوە بـە

ناوچەکانی دیکەی جیهاندا گشتگیرکراون، گۆڕانکارییەکی سیاسیی شارستانیانەیان هێنایەئاراوە، بەتایبەتی لە سروشتی پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگەی شارستانی و سیاسیدا. بونیادەکانی کۆمەڵگەی شارستانیی نویٚ شتێك نین جگە لەو سەرمایەدارییەو ئەو شێوازانەی بەکاربردن، ئاڵوگۆڕکردن، هاوکاریکردن و تاقمگەرییە ناسیونالیستانەی لە ئەوروپا ئەنجامی ئەو سەریانهەڵداوە. بەپێی ئەم شێوازە نوێیانە، دەوڵەتی نویٚ وەك یەکێك لە شێوەکانی ڕێکخستن و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی کۆمەڵگەی شارستانیی تازەپێگەیشتوو و شێوازێکی سەرکەوتوو بۆ ئاڕاستەکردنی چالاکی و سەرکردایەتیکردنی دامەزرا. دیاردەی کۆڵۆنیالیزمیش، کە سەدەی ڕابردوو جیهان بەخۆوەی دی، یەکێکە لە ئامڕازەکانی ئەو چارەسەرکردنەی کۆمەڵگەی شارستانیی سەرمایەدارانەی نویٚ و ڕەتکردنەوەی لە ڕێگەی فراوانکردنی بازنەی چەوساندنەوەی دەرەکی و یەکخستنی گرووپە نیشتیمانیەکان لە پڕۆژەیەکی ناسیونالیستانەدا کە مەیلی فراوانکردنی بازنەی سوودو بەرژەوەندییە بەدەستهاتووەکانی کۆڵۆنیالیزم و داگیرکاری هەبوو.

لەوانەیە دیاردەی مەزنتر کە کۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکان لە سەردەمی نویٚ و لەگەڵ پەرەسەندنی سەرمایەداری و تەشەنەکردنی کۆڵۆنیالیزمدا بەخۆیانەوە دی، هێنانی شێوازگەلی بەرهەمهێنان و بیرکردنەوەو بەکاربردن و ئاڵوگۆڕکردنی نوێی سەرمایەدارییانەو نیمچە سەرمایەدارییانەو لقە کومپرادۆری و مشەخۆری و تێکەڵەکانی بووبێت لە هەموو وڵاتەکاندا. ئەنجامی ئەوەش بەگشتیکردنی ئەم شێوازە نوێیەی پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، واتە کۆمەڵگەی شارستانی، وێرانکردنی دەوڵەتە تەقلیدییەکان بوو کە لەو وڵاتانەدا دامەزرابوون، هەروەها هەرەسهێنانی تێکڕای سیستەمی سیاسی بوو. ئەم هەرەسهێنانەش بوە هۆی تێکشانی ئەو دەوڵەتانە، لەڕوانگەی ئەو بەهایانەوە کە دەیانبزواندن و ئەو ئامڕازانەی بەدەستیانەوە بوو بۆ جڵەوکردنی ئەم ئاقارە گۆڕانکاریخوازە بەردەوامە لە بنەمای کۆمەڵگەی شارستانیداو سەرهەڵدانی ئەو هێزە نویٚ ئابووری و کۆمەڵایەتیانەی نەیانزانی چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن و ئاڵۆزبوونی ناکۆکییە هەرە گەورەکان کە توانای جڵەوکردنی بەکردەوەیان نەبوو. هەتاکو ئێستاش بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگەکانی جیهان کە دووچاری ئەم گۆڕانکارییە مێژووییە مەزنە بوون، دەستەوستانن لەئاست خەملاندنی سیستەمێکی سیاسیدا، واتە دەوڵەتێك کە توانای کۆنترۆڵکردنی میکانیزمەکانی گۆڕانکاریی تەکنیکی و ئابووری و کولتووریی جیهانیان هەبێت. ئەمەش هۆی ئەو نائارامی و وەرچەرخانە بەردەوامانەیە کە ژیانیان لەگەڵدا دەبەنەسەر.

ئەوەی پەککەوتەیی ئەو کۆمەڵگەیانە لەئاست کۆنترۆڵکردنی ئاقارەکانی گۆڕانکاریی جیهانیدا زیاتردەکات، پێشکەوتنی بەردەوامی ئەو شۆڕشە ژیوارییەو بەدوای یەکهاتنی دۆزینەوەو کرانەوە زانستی و تەکنیکییە نوێکانە، ئەوانەی ئیمڕۆ مژدەی شۆڕشێکی زانیاریئامێزی نوێمان دەدەنیٚ کە تەوەری چالاکی و پەرەسەندنیان لەسەر ئاستی گشت جیهانە، ئەویش کۆمۆنیکاسیۆن و بەکارهێنانی بەرفراوانی ئەو بیرۆکە، زانیاری، بەها، واتا و سمبولانەیە کە لە ئەنجامی ئەو دێنەئاراوە. ئەمەش مانانی کرانەوەی دەرفەتە لەبەردەم یەکخستنی پانتایی جیهانیدا، بەبیٚ ئەوەی ئەمە مانای یەکخستنی تواناکانی مامەڵەکردن بێت بەو کەرەستە شۆڕشگێڕییە نوێیە لە گشت وڵاتەکاندا، بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە یەکخستنی چارەنووسی

جیهان ڕیشەکێشانە ناکۆکە لەگەڵ جیاوازیی توانای مامەڵەکردن بە شۆڕشی تەکنیکی زانستیو سوودوەرگرتن لێی. ئەمەش مانای پاشەکشەکردنی بەردەوامو برەوسەندوی توانای سیستەمە سیاسییەکان یان دەوڵەتە دامەزراوەکانی وڵاتە وابەستەو لاوازەکانە بۆ هاوڕێکردن لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگەی شارستانیو کۆنترۆڵکردنیان، یان وردتر بڵێین توانای هاوکاریو هاوجووتیو هارمۆنیی نێوان بنەماکانی کۆمەڵگەی شارستانیو کۆمەڵگەی سیاسی. لەراستیدا ئەوەی لە چوارچێوەی کۆمەڵگەکەمان لە سەدەی دواییدا ڕوویدا، وەرچەرخانێکی هەمەلایەن بوو لە تێکڕای بنەمای کۆمەڵگەی شارستانیدا: لە سیستەمی بەرهەمهێنان، بەکاربردن، هاوکاری، هاریکاری، پەیوەندییە خێزانیو هۆزگەریو شارییەکانداو لە شێوازی دەربڕینو سیستەمی ئەخلاقو خواستو خەونەکاندا.

لەسەر ئاستی بەرهەمهێنان، پیشەسازیی پیشەیی لە کۆتایی سەدەی پێشووەوە هەرەسهێنانێکی هەمەلایەنی بەخۆوە دیو وردەوردە کەناڵەکانی بازرگانی دەرەکی، بەتایبەتی لەگەڵ دەوڵەتە پیشەسازییە خۆرئاواییەکاندا، جێگەیانگرتەوەو دواتریش بوە هۆی دامەزراندنی هەندێك پیشەسازیی گۆڕانکاریئامێزو بەرخۆری. لەو وڵاتانەشدا چەندین چینی کۆمەڵایەتی نوێ سەریانهەڵداو چینە پیشەگەرە کۆنەکان هەڵوەشانەوەو بەپەیوەندیی لەگەڵ ئەوەدا چەندین ڕێکخستنی نوێ هاتنەئاراوە کە ئیمڕۆ جڵەوی کارو بەرهەمهێنان دەکەن (واتە سەندیکاکان)و جیگەی فۆرمو گرووپە پیشەگەرییە تەقلیدییەکانیان گرتەوە. هەروەها چەندین ئاراستەی گشتیی نوێ لەدایکبوون کە وڵاتە خۆرئاواییەکانیان کردە جەمسەرێکی ڕاکێشانی فیکریو ئابووری، پاش ئەوەی تورکیاو خۆرهەلات بەگشتی لە سەدەی پێشوودا ناوەند بوون. هەروەها بنەمای کۆمەڵگە شاریو گوندییەکان، واتە ڕێکخستنی شاریو شارستانی، گۆڕانیان بەسەردا هاتو ڕۆڵو قەبارەی شارەکان زۆربوونو ڕۆڵی گوند بەجۆرێك پاشەکشەیکرد کە لەوەوپێش ڕوی نەدابوو و بەشێوەیەکی سمبولی یان سیاسی یاخود مادی گرێدرایەوە بە شارەوە. پەیوەندییەکانی نێوان گرووپەکانی ناو شارەکانو نێوان خۆیان گۆڕانیان بەسەردا هاتو گەڕەکە جیاوازەکان، کە پێشتر جیهانی سەربەخۆو لێك دابڕاوو دژ بەیەكو بەربەریکاری یەکبوون، بەڕووی یەکتردا کرانەوەو قەبارەی ئالوگۆڕکردنو پەیوەندیی نێوان گشت دانیشتوانو ڕۆڵەکانی کۆمەڵگەو تێکەڵبوونیان بەیەکتر زۆرتربوو و پلەی تێوەچوونو یەکترناسینی نێوان گشت بەشەکانی وڵاتێك یاخود ناوچەیەك برەویسەند. بەو جۆرەش شیاوبوو دەوڵەتێکی نیمچە نیشتیمانی، واتە گرێدراو تا ئەم یان ئەو ڕادەیە بە خواستەکانو ویستی کۆمەڵگەوە، دابمەزرێت یاخود ڕاستتر بنەمایەکی شارستانی هاتەئاراوە کە دەرفەتی بۆ سەرهەڵدانی ئەو جۆرە دەوڵەتەو ئەو بنەما نیشتیمانیەی دەسەلات ڕەخساند، ئەگەرچی ئەوە لە ڕووی پراکتیکیەوە لە هەموو شوێنێك نەهاتەدی.

هەموو ئەوانە گۆڕانیان بەسەر وێناکردنی خەڵك بۆ خۆیانو دیاریکردنی چوارچێوەی بەکۆمەڵیاندا هێنا، چونکە بە هەرەسهێنانی جۆرەکانو زۆربوونی ئالوگۆڕکردنی سمبولیو مادیی نێوان تاکەکان، ئینتیمای تایەفەگەری کە بەدرێژایی چەندین سەدە شێوازی ڕێکخستنی ڕەسمیو یەککەوتنی گرووپە گەورەکان بوو لە سەردەمی عوسمانیدا بە سیستەمی میللەل ناسرابوو، لاوازبوو. ئەگەرچی هەستی تایەفەگەری یەکجارەکی لەناونەچوو، بەلام شێوازەکانی وەلائی بەکۆمەڵی نەتەوەیی خۆی سەپاندو بالادەست بووو

دەربڕینی تاقمخوازیی تایەفەگەرانە، وەك خۆبەستنەوە بە تاقمخوازییە خێزانیو عەشایەریو لایەنخوازەکان بوە بەهایەکی نێگەتیڤانەو تاکەکان وەك پەیوەندییەکی ناڕەوا لەگەڵیدا هەڵیاندەکرد کە دەبوایە ڕەتییبکەنەوەو بەسەریدا سەرکەون. جا ئەگەر ئایین وەك سەرچاوەیەکی وێناکردنی هەرەمەزن بۆ دنیاو گەردوون هێشتا ئامادەو بەکاربووبێت، ئەوا بێگومان شێوازەکانی ئاییندارێتی گۆڕانی زۆریان بەسەردا هات، هەروەها شوێنگەو ڕۆڵی ئایین لە بنیاتنانو خۆراکدانە تێڕوانینی مرۆڤی ئێمە (وەك تاكو گرووپ) بۆ خۆیو گەردوون گۆڕانیان بەسەردا هات. هاوشانی وێناکردنە تەقلیدییەکان، چەندین وێناکردنی بنچینەیی هەڵقوڵاوی لێکدانەوە ئەقڵانیو مرۆڤایەتیە نوێکان بۆ مانا ئایینیەکان، لەڕێگەی شیکردنەوە زانستیەکانەوە یان پێشکەوتن لە تیۆری مێژوویدا، هاتنەئاراوە. تەنانەت لەسەر ئاستی پێکهاتنی ویژدانی تاکەکەسیو ئەخلاقی، چیدی ئایین تاقە سەرچاوە نەمایەوە بۆ بەها هاندەرو بزوێنەرەکان. بێجگە لەوانە، ڕەوتی جەغتکردنەوە لەسەر دەسەڵاتی یاساو چەسپاندنی بیرۆکەی مافەکانی مرۆڤ ،وەك بنچینەیەك بۆ یەککەوتنی کۆمەلایەتی، جێگەی بەهاکانی جوامێریو بەخشندەییو برایەتیی گرتەوە. گۆڕانکاریش لە شێوازەکانی بەرهەمهێنانو ئاڵوگۆڕکردنی مادیدا، بوە هۆی گۆڕینی بەهاکانو شێوازەکانی بەکاربردنی کۆمەڵایەتی، ئەمەش بوە هۆی پێکهێنانەوەی بەها کۆمەڵایەتیەکانو پێگەو سامانەکان. بەو جۆرە لەماوەی کەمتر لە سەدەیەکدا دنیای کۆمەڵگەی شارستانی هەمەلایەنانە هەژاو ژێراوژوور بوو، ئەنجامی ئەم هەژانەش تەنگوچەڵەمەکانی سیاسەتو کۆمەڵگەو ئابووریو ناسنامە پێکەوەو بێ گەیشتنە هیچ چارەسەرێکی شیاو تەقینەوە.

ئەو گوڕانکارییەی باسمانکرد، مانای ئەوە نییە کۆمەڵگەی شارستانی ئێمە ئەگەرچی نوێیە، بۆتە کۆمەڵگەیەکی سەردەمیانە، واتە کۆمەڵگەیەك کە بەهاکانی سەردەم بەرهەمدێنێو لەسەریان ڕادەوەستێو دەیانهێنێتەدی، چونکە نوێبوون سەردەمیبوون ناگەیەنێت، بەڵکو سەرهەڵدانی شێوازگەلی وەهایە کە لە ڕووخساردا بە شێوازە سەردەمیەکانی ئابووریو کولتوورو کۆمەڵگە دەچن، بەڵام هەمان ئەو بەهایانە بەرهەم ناهێنێتو بەوانیش نابزوێت. ئەمەش مانای ئەوە نییە نوێکاری هیچ بایەخێکی نییەو وەك هەندێك دەڵێن بنەمایەکی تەقلیدی حەشاردەدات کە هێشتا لە پشتیەوە خۆی دەسەپێنێتو لەناخدا کۆنترۆڵی ڕەفتارو فیکری ئێمە دەکات. هەروەها بەو مانایە نییە ئەوەی ڕوویداوە، سەرهەڵدانی بنەمایەکی دووفاقیە تیایدا تەرزو شێوازە کۆنو نوێکانی بەرهەمهێنانو ڕێکخستنو بیرکردنەوە پێکەوە دەژینو لە ململانێدان، بەبێ ئەوەی یەکێکیان کار لەوی تریان بکات. هەندێك شیکەرەوەش بڕوایان وایە ئەوەی ڕوویداوە، هەرەسهێنانی هەمەلایەنی لۆژیکی کارکردنو چالاکیی شێوازی شارستانی کۆنو گەندەڵکردنی قووڵی میکانیزمەکانی کارکردنو ڕێکردنی شێوازی شارستانیی سەردەمیانە. لەم هەرەسهێنانو گەندەڵکردنەوە بنەمای نوێی شارستانیو سیاسیی کۆمەڵگەکەمان دامەزرا، بنەمایەك کە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵگە پیشەسازییە خۆرئاواییەکان بەخۆیانەوە دیوەو تەواو جیاواز لەگەڵ ئەو بنەما تەقلیدییەی کۆمەڵگەکانمان لە ڕابردوودا بەخۆیانەوە دیوە. جیاوازیش لەنێوان بنەما نوێو سەردەمیەکەو بنەمای نوێی کۆمەڵگەی شارستانیی ئێمەدا ئەوەیە کە توخمەکان هەمان ئەرك جێبەجێ ناکەنو بەهەمان سەرەنجامیش ناگەن. سەرمایەداری، وەك پەیوەندییەکی کۆنترۆڵکاری ڕێکخستنی هێزە

مرۆیی و مادییەکانی بەرهەمهێنان، کە بزوێنەری کەڵەکەبوون و پێشکەوتنی تەکنیکی و پراکتیکی سەرەکی بوو لە ئابوورییەکانی خۆرئاوادا، لە ئابووریی وابەستەدا– کە خەسڵەتێکی جەوهەیی بونیادی نوێیە) بوە ئامرازێك بۆ شەکەتکردن و لێك جیاکردنەوەی کارو ئامرازەکانی کارکردن (کە لە ڕۆژگاری ئیمڕۆدا تەکنیکە) و گوێزانەوەی سامان لە کەنارەوە بۆ ناوەند. تاقمگەرێتی تایەفەگەرانەش کە ئامرازی سەرەکی بوو بۆ ڕێکخستنی بەشداریکردنی گشتی، واتە قوڵکردنەوەی پێکگەیشتنی گشت لایەنەکانی کۆمەڵگەی پپکهاتوو لە چەندین گرووپی ناوچەیی لێك دابڕاو لەگەڵ دەسەڵات، دواتریش دابەشکردنی ئەو دەسەڵاتە، لە سیستەمی نوێدا بوە ئامرازێك بۆ قۆرخکردنی دەسەڵات و گرتنەدەستی دەسەڵاتی دەوڵەت لە ناوەوەڕاو لەلایەن تاقە گرووپێکەوەو تێکدانی پێکهاتەکەی وەك دەسەڵاتێکی نیشتیمانی. ئایینیش کە لانەی بڕوایەکی کۆکەرەوەخواز بوو و دەوڵەت و نەتەوە لە چواردەوری و بەهۆیەوە دامەزران، بوە چوارچێوەیەك بۆ بنیاتنانی چەندین بڕواو چەمکی مافی نوێ کە بەهاکانی خێرکردن و چاکەکردن و دەستەبەریکردنیان لەناوبرد یان خەریکە لەناویدەبەن، چاوەڕوانیشکرا جەغتی لەسەر بەهاکانی بەخشندەیی و یەکسانی و سەروەری و ئازدایی لەنێوان تاکەکاندا بکردایەتەوە، کەچی ڕۆژانە خراپترین پەیوەندییەکانی خۆپەرستی، چاوبرسێتی، خۆخۆی، هەلپەرست و جیاوازیکردنی نیمچە ڕەگەزپەرستانەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ناکۆکی و دەستدرێژدەکردنی گرووپێکی فەرمانڕاوەیان بۆ سەر مافەکانی تاکەکان و شکۆمەندییان بەرهەمدەهێناو بەرهەمدێنن، ئەوەی لەناو جەماوەری گشتیدا هەیە.

کەواتە بونیادی نوێ نە بونیادێکی سەردەمیانەو نە بونیادێکی کۆن، بەڵکو دووڕەگی سەربەخۆیەو شێوازی کۆمەڵگە سەر پەڕیوەکانە، واتە ئەوانەی توخمی هاوسەنگی و ژیری و هارمۆنیی ناوەکی و ڕەوتی پێشکەوتن و گۆڕانی تایبەتیان لەدەستداوەو بزووتنیان گرێدراوی بزووتنەوەی ئەوانی دیکەیە. جا ئەگەر هەندێك خەسڵەتی هەرە گەورە هەبن بتوانین بەهۆیانەوە شێوازی نوێی کۆمەڵگەی شارستانی هەڵقولاوی ئەو قۆناغی گۆڕانکارییە نوێیەیان پێ وەسفبکەین، ئەوا دەشێت هێما بۆ نائارامی و هەڵبەزودابەزی خێراو بەردەوام و پیواری کۆڵەکە خۆییەکان و هارمۆنی ناوەکی و نەبوونی دەرفەت و میکانیزمی هێنانەدیی هاوسەنگییە هەرە گەورەکان بکەین، جا مادی بن وەك بەرهەمهێنان و بەکاربردن و داواکاری و خستنەڕوو یاخود مەعنەوی کە ئاوات و خواست و پێداویستییە جۆراوجۆرە ناکۆکەکانی گرووپەکانی دانیشتوان تەعبیریان لێدەکەن، چونکە ئەوەی ئێمە باسیدەکەین بونیادێکی سەردەمیانە نییە، ئەگەرچی هەموو ڕواڵەتەکانی نوێکاری تێدابێت، سیستەمێکی کۆنیش نییە، ئەگەرچی تیایدا گشت ڕواڵەتەکانی ڕێکخستنە کۆنەکان پێك بگەن. ئەمەش هیچ لە توانای جیاکردنەوەی دوو دنیای جیاواز ناگۆڕێت، چونکە بەکردەوە هەردووکیان هەن، بەڵام کەرتبوونی کەسێتی دەربڕی پێکەوە ژیانی دوو کەسایەتی و پێکگەیشتنیان لە هەمان شوێن و بەرەنجامی کۆکردنەوەیان نییە، بەڵکو نەخۆشی و تێکچوونی تێڕوانینی ئەقڵییە کە تەعبیر لە هەرەسهێنانی هاوسەنگیی ناوەکی تاکە کەسێك دەکات. جۆرێکە لە لێکبوونەوەو هەڵوەشانەوەو لەدەستدانی توانای پێکەوەبەستن و کۆبوونەوە بەدەوری خودو سەربەخۆییدا، دوایش نەبوونی توانای هێنانەئارای لایەنی کەمی ڕێکەوتنی گشتی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی بزووتنەوەیەکی کارامەو

هۆشمەندییەکی خۆیی بەکۆمەڵ. نیشانەی یەکەمی ئەم کۆمەڵگە شارستانیە، گرەوکردنە. گرەوکردن مانای ئەوەیە بونیادی شارستانی هەنوکەیی بەرجەستەکاری ئەو کەرتبوونە مێژووییەیە کە لە نەبوونی جڵەوکردنی بەسەر چارەنووس‌و خۆکۆنترۆڵکردنەوە سەرچاوەدەگرێت. ئەو شیزۆفرینیایەی کۆمەڵگەی شارستانی ژیانی لەگەڵدا دەباتەسەر، واتە نەبوونی هاوسەنگیی ناوەکی‌و لەدەستدانی هۆشمەندیی دروست‌و هاوجووت لەگەڵ خودو واقعی بابەتیدا، ئەو بناغەیەیە کە کەرتبوونی مێژوویی دەوڵەت‌و خودی کۆمەڵگەی شارستانی لەسەر ڕادەوەستێت.

سەرەنجامی یەکەم کە لەو شیکردنەوەیە دەستگیرماندەبێت، ئەم شێوازە ڕیزپەڕەی کۆمەڵگە شارستانیەکان خاوەنی لایەنی کەمی سەربەخۆیی خۆیی‌و توانای بزووتنەوەی سەربەخۆیانە نییە کە دەفەتی بۆ دەرەخسێنن خۆی‌و لە خودی خۆیەوە توخمەکانی ڕێکخستنی فراوان‌و هەمەلایەنتری خۆی بخاتەڕوو، مەبەست سیاسەت‌و دەسەڵاتی ناوەندی یان دەوڵەتە. ناسازیی توخمە هەمەجۆرەکان کە لە سەرچاوەو ئەزموون‌و سیستەمگەلی ژیواری‌و مێژوویی زۆرو جیاوازەوە هەڵدەقوڵێن، مێژووییبوونی تایبەتیی لەدەستدەدات‌و سەختیدەکات بتوانێت لەخودی خۆیەوە توخمەکانی هارمۆنی‌و ڕێکخستن‌و تەبایی خۆی دەرهاوێژێت. تێکەڵکردنی ئەو توخمانەو یەکگرتنیان، پێویستی بە جیاکردنەوەیان لە مێژووی تایبەتیان هەیە، هەروەها هۆشیارییەکی نوێی گەرەکە کە توانای ڕەتکردنی هەموویان‌و توانەوەیانی هەبێت لە پێکهاتەیەکی نوێی فیکری‌و مادیدا. ئەمەش بەبێ تێپەڕبوون بە ئەزموونی مێژوویی سەختی هاوبەش‌و بە ململانێی گەڕان بەدوای هارمۆنیی خۆیی‌و هاوسەنگیی ناوەکی مەیسەرنابێت.

لە چاوەڕوانیی ئەوەدا، کۆمەڵگەی شارستانی بەردەوامدەبێت لەسەر بەربەرەکانێکردنی توخمەکانی لێکترازان‌و شڵەژانی هەمیشەیی‌و زیاتر ڕوودەکاتە ئەوەی دەبڕی کۆمەڵێك بیرۆکەو بەهاو تاك‌و سیستەم‌و پێکهاتەو بونیادی دژ بەیەك بێت، نەك وەك کیانێکی لەناوەوەڕا یەکگرتوو ڕەفتاربکات. واتە مانەوەی بەیەکگرتوویی بەبێ یارمەتی هێزێکی دەرەکی مسۆگەرناکرێت. ئەو هێزە دەرەکییەش لە نیشتمانەکەمان تەنیا دەوڵەتێکە ئەو دامودەزگا بەڕێوەبەرییانەی بەمیرات بۆ ماوەتەوە کە داگیرکەری کۆن جێیهێشتون‌وپاش دەرچوونی ئەو توێژ یان توخمە کۆمەڵایەتیانە چەسپاندویانە کە دەستیان بەسەردا گرتوەو هەتاکو ئێستاش بەکاریدەهێنێت بۆ چاککردنی پێگەی خۆیان لە سیستەمی کۆمەڵایەتی گشتیدا. لەواقیعدا پەیوەندیی ئەو دەوڵەتە بە کۆمەڵگەی شارستانیەوە، جا جۆری ئەو پەیوەندییە چینایەتی یان کۆمەڵایەتیە کاتیەی نوێنەرایەتیان دەکات هەرچۆنێك بێت، پەیوەندیی مەنجەڵە بە شۆرباوە، چونکە ئەو کۆمەڵگەی شارستانیی دژ بەیەك‌و خاوخلیچك دەپارێزێت، وەك چون مەنجەڵ شۆربا دەپارێزێت تا نەڕژێت، ئەمەش لەبەرامبەر ئەو مۆدێلەی دەوڵەت، شێوازی بنیاتنانی ئەو بناغە تیۆری، یاسایی یان ئەخلاقیە پێکدێنێت کە جڵەوی ڕەفتاری تاکەکان‌و گرووپەکان دەکات‌و ڕێکخستنی ڕەفتاریان لەناوەوەڕا ڕێکدەخات‌و خۆیشی لە چوارچێوەبەندیی کۆمەڵگەی شارستانیەوە هەڵدەقوڵێت. بۆیە دەوڵەت لە دۆخی یەکەمدا ناچارە سەرکوتکەرانە بێت‌و ئەوەی مانەوەشی لێکدەداتەوە، هەستکردنی گشت توخمە ناکۆك‌و دژبەیەکەکانی کۆمەڵگەیە بەوەی نەمان، واتە لەناوچوون‌و گۆڕانی دەوڵەت لە دەسەڵاتی سەرکوتکەرانەوە بۆ دەسەڵاتی تاوتوێکردن، مانای

لێکترازانی خودی یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی و هەڵوەشانەوەی توخمەکانی بونیادی "نەتەوەیی" و پرشوبڵاوبوونەوەیەتی بە هەموو شوێنێکدا. ئیمڕۆ کۆمەڵگەی شارستانی ئێمە هێزێکی ئامادەی تەقینەوەیە، بەڵام هێشتا لە خودی خۆیدا خاوەنی پرنسیپی ئاڕاستەکردنی خۆیی و جڵەوکردنی خۆیی ئەو هێزە نییە.

ئەمەش ئەو پەیوەندییە لێکدەداتەوە کە لە نیشتیمانەکەمان لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەدا سەریهەڵداوەو گەشەیکردوە. لێرەشدا سروشتی بوو ئەو توێژ یان دەستەبژێرە لیبرالیانەی سەرەتا، کە دامودەزگاکانی دەوڵەتیان گرتە دەستەوە، کۆششبکەن بۆ بەکاربردنی ناکۆکیەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و خاڵە زۆر لاوازەکانی لەپێناو نەمرکردنی باڵادەستیی خۆیان و نوێکردنەوەی فەرمانڕەوایی خۆیان. لەکاتی نائامادەیی خەملینی ویستێکی خۆیی ئەم کۆمەڵگەیەدا، خەیاڵپلاوی بوو وێنای ئەوە بکرێت توێژە فەرمانڕەواکان بە دەستپێشکەریی تایبەتی کاربکەن بۆ گۆڕینی دەوڵەت لە دامودەزگایەکی سەرکوتکەرانەو کۆکردنەوەی زۆرەملیانەوە بۆ ئامرازێکی چەسپاندنی یەکگرتوویی و تواندنەوەی توخمە دژ بەیەکەکان. لەواقیعدا ئەو توانەوەیە ناوەڕۆکی مەسەلەی پێکهاتنی نەتەوەیە لە گشت کۆمەڵگە وابەستەکاندا. ئیمڕۆش گۆڕانی توێژە فەرمانڕەواکان بۆ کۆسپێکی بنچینەیی لەبەردەم گەشەپێدانی دامودەزگاکانی دەوڵەتداو کارپێکردنی دەسەڵات بەشێوەیەك کە ڕێگە بەو توانەوەیە بدات، هۆی سەرهەڵدانی شەڕی دیموکراسییەوە بۆ ڕزگارکردنی دەوڵەت لە چنگی چینی ڕابەرو گەندەڵ و دواتر ئەنجامدانی چاکسازی و هاوجوتکردنی هەردوو ئامانجی ململانێی نەتەوەیی و دیموکراتیانە.

دەستەبژێرەکانی نەوەی دوەم، کە لەڕێگەی کودەتا یان شۆڕشەوە دەوڵەتیان بەمیرات بۆ مابوەوەو لە بنەچەدا سەر بە چینە پەراوێزکراوو نیمچە پەراوێزکراوەکانی ڕژێمی پێشوو بوون، هەوڵیاندا لە چوارچێوەی ململانێ دژی توێژە لیبرالیەکاندا پەرە بە گوتارێك بدەن کە جەغتی لەسەر بنیاتنانی نەتەوەو ناسیونالیزم دەکردەوەو سیاسەتێك بهێننەدی کە جیاوازبێت لەگەڵ سیاسەتی یەکەمداو دەوڵەت بکەنە ئامرازێك بۆ یەکخستنی گرووپە نیشتیمانیەکان یان خوڵقاندنیان لە هیچەوە. لەم بۆتەیەو لەپێناو ئەو ئامانجەدا، ئەو دەستەبژێرانە سیاسەتیان لە گەڕان بەدوای سازش و هاریکاریی نێوان لایەن و گرووپەکانی کۆمەڵگەوە، بۆ هێنانەدیی ئامانجی شیاوو واقیعی، گۆڕی بۆ شۆڕشێك لەسەر کۆمەڵگەو ویستێك بۆ گۆڕینی زۆرەملێیانەو بەزەبری هێز. لەواقیعدا، ئەوەی لەم ئەزموونەوە بەرهەمهێنرا، تەنانەت پێش ڕێکردن ڕوەوە داخزان و بۆگەنبوون و گەندەڵبوونێك کە مرۆڤیان کاسدەکرد، تەواو پێچەوانە چاوەڕوانیکردنەکانیان بوو، چونکە بەناوی دەوڵەت و نەتەوەوە تەواو دەستبەرداری سەربەخۆیی کۆمەڵگەی شارستانی بوون، بەڵکو گەیشتنە ئینکارکردنی مافی بوونی ئەو کۆمەڵگەیە. بەو جۆرە توێژی فەرمانڕەوای "ناسیونالیست" بڕوای وابوو کە ماف و ئەرکی سەرشانی دەوڵەتە دەستوەرداتە گشت وردو درشتێکی ژیانی فیکری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کۆمەڵگەوە، چونکە دەسەڵاتی ناوەندی ڕێگەی بەخوی دەدا، بێ هیچ چاودێری و بەربەستێك، سەرلەنوێ پەیوەندییەکانی خاوەنداریێتی لە ئابووریدا بەرهەمبهێنێتەوە، هەروەها ڕێگەی بەخۆی دەدا بڕیار لەسەر جۆری ئەو گوتارانە بدات کە ئیمامی مزگەوت پێویست بوو لە مزگەوت پێشکەشیان بکات و بڕیار لەسەر ئەو بڕواو لێکدانەوەو بیروڕایانە بدات کە هاوولاتی چاك

پێویست بوو بڕوای پێیان هەبێت و بەئاشکراو نهێنی مامەڵەیان پێ بکات. لەواقیعدا ڕەتکردنەوەی هەموو سەربەخۆییەکی کۆمەڵگەی شارستانی و گۆڕینی هەر پراکتیك و چالاکییەکی تاکەکەسی یان بەکۆمەڵی کولتووری یان کۆمەڵایەتی یاخود ئابووری بۆ چالاکییەکی خاوەن سروشتی سیاسی یان بەسیاسیکردنی تەواوەتیی کۆمەڵگەی شارستانی، تەنیا ئەو کۆمەڵگەیەی نەگۆڕیوە، بەڵکو دەوڵەتێکی سەرتاپاگیرو دەسەڵاتێکی ڕەهای خوڵقاند کە ئابووری و کولتوورو فیکریان بەرەو هەرەسهێنانی تەواوەتی برد، چونکە بەو ڕادەیەی دەوڵەت خواستی گۆڕانکاری هەبوو، واتە گۆڕینی واقیعی کۆمەڵگەی شارستانی دژ بەیەك، ڕوویدەکردە دانانی سیاسەت لە جێگەی کولتوورو ئابووری و کۆمەڵگەو سەرەنجام چەندین ئاستی بنچینەیی: ئاستەکانی ڕێکخستنی ئەزموون و پراکتیکی جەماوەری لەناودەبرد، ئەگەرچی تەنگوچەڵاماویش بوون. بە لەناوبردنی یاساکانی کاری ئابووری، کارلێککردنی کولتووری و فیکری، پلەداری و پێکگەیشتنی کۆمەڵایەتی و دانانی بیروکراسیەتی دەوڵەتی هاوشێوەو هاوجۆر لەشوێنی توخمە کاراکانی نێو گشت کونجەکانی کۆمەڵگە، مردن تەشەنەیکردوە بۆ هەموو شوێنێك و زۆری نەخایەند دەوڵەت خۆی لەناو بۆشاییەکی هەمەلایەندا دییەوە. بیروکراسی، وەك چۆن کوللە هێرشدەکاتە سەر کێڵگە سەوزەکان و کاولی دەکات، ئاوا ژیان و ئەو هێزە زیندوو و ململانێکارانەی کۆمەڵگەی شارستانی لەناوبرد کە خۆراکیان پێدەدا.

پێدەچێت گرنگترین پەندی ئەم ئەزموونە ئەوەبێت کە دەوڵەتی سەرتاپاگیری دەستڕۆیشتوو چارەسەر نەبوو بۆ ئەو گرفتانەی کۆمەڵگەی شارستانیی دووڕەگمان بەدەستیانەوە دەیناڵدو لەبری ئەوەی شێواندنی ڕێژەیی چارەسەربکات، سەرتاپای جەستەکەی لەناوبرد. لەوە مەترسیدارتر، وێڕای ئەو کاولکراییە بێشومارەی ڕوویدا، لەناوبردنی کۆمەڵگەی شارستانی لای ئێمەو بلۆکی ڕۆژهەڵات کە بەهەمان ئاقاردا تێپەڕی، نە یارمەتی پێشکەوتنی سیاسەتی داو نە بوە هۆی گەشەپێدانی لۆژیکی ناوەکیی و ئەقڵانیەتەکەی، بەڵکو هاوکات بوە هۆی داخزانی ئەو سیاسەتەو ملکەچبوونی بۆ لۆژیکی خودی کۆمەڵگەی شارستانی. بەو جۆرە دەوڵەت بوە دامەزراوێکی تایبەتی و دەسەڵاتی ڕەهای خۆی خستەگەڕو کنەیکردە ناو هەموو کونجەکانی کۆمەڵگەوە بۆ خزمەتکردنی توێژێکی فەرمانڕەوا نەك پایەدارکردنی بەرژەوەندییە گشتییەکان و وای لێهات هەر بزووتنەوە یان نووزە یاخود هێماکردنێك لە کۆمەڵگە شارستانیەوە بهاتایە بە ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی و ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت و هەڕەشەکردنی ڕاستەوخۆ بۆ سەر نەتەوەو ناسیونالیزم و شۆڕش سەیربکات. ئەمەش پاڵی پێوەنا زیاتر بچێتەوە خۆی و ڕووبکاتە پەرەپێدانی هێزەکانی بەرگریی خۆی، دواجاریش تەرخانکردنی بەشی هەرە زۆری داهاتەکانی دەوڵەت، نەك بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵگە، بەڵکو بۆ بەهێزکردنی ئامڕازەکانی لەناوبردنی. بەو جۆرە دەوڵەت لە دەوڵەتی هەژانی هەمەلایەنەوە بوە دەوڵەتی قەلاچۆکردنی هەمەلایەن و هونەرکار لە دۆزینەوە یان داهێنانی ئامڕازەکانی تۆقاندن و سەرکوتکردنی نوێ و چوونە ناو قولایی ناخی تاکەوەو ئەتککردنی تایبەتمەندیی دەروونی و تایبەتی (یاسای باری کەسێتی بەکردەوە) تاکەکان، وەك دەربڕی شڵەژانی ڕۆژانەو گشتیی دەسەڵاتدارە حوکمڕانەکان و ترسیان لە سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن. بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕواندەکرا، گرژبوونەکانی کۆمەڵگەی سەربڕاوو پەرچەکردارە توڕەکانی نەیانتوانی دەسەڵاتدارە دامەزراوەکان

ڕازیبکەن بە پێویستیی پاشەکشەکردن لەو سیاسەتە، بەڵکو هەتا دڵی بەرگری لێی بدایەو لەو بڕوایەدابوونایە کە دەستەوستانن لەئاست جڵەوکردنی کۆمەڵگەدا، زیاتر وایان لێدەهات سیاسەت بکەنە ستراتیژێکی تایبەت بۆ تۆڵەسەندنەوەو سزادان. بەهەرحاڵ، ئەوەی ئیمڕۆ سەرقاڵین، ڕووبەڕووبوونەوەی ڕێکخراوو هەمەلایەنی کۆمەڵگەیەکە کە ویستی یاخیبوونی هەمەلایەن لە دەوڵەت بەخێرایی تیایدا پێدەگات لەگەڵ دەوڵەتێکدا کە جگە لە گەڕان بەدوای باشترین ڕێگە بۆ دەمکوتکردنی کۆمەڵگەو تەنگهەڵچنین بە هەناسەدانیو ئامادەکردنی ئامڕازەکانی جەنگو قۆستنەوەی هەر دەرفەتێکی ناوەکی یان دەرەکی بۆ بەهێزکردنی ئۆردوگاکەی هیچ ئامانجێکی دیکەی نییە. سەرەنجام دەوڵەت ئەگەر بیەوێت بەردەوام بێت لەسەر سەردانەواندن بە کۆمەڵگە لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە، ئەوا جگە لە کاولکردنی گشتی کۆمەڵگە هیچ چارەسەرێکی دیکەی بۆ نەماوەتەوە. لێرەشدا قوتاربوون لەم دۆخە بە لەناوبردنو نەهێشتنی دەوڵەت مەیسەر نابێت، بەڵکو بە گۆڕینی ئەو ویستەی ئاڕاستەی دەکات، لە ویستێکی دەرەکیی گرێدراوی تاقمێك یان گرووپێکی چەتەگەرەوە بۆ ویستێکی ناوەکی هەڵقوڵاوی خودی کۆمەڵگەو وابەستەی کۆمەڵگە.

ئەم پەیوەندییە ڕیزپەڕەی نێوان دەوڵەتو کۆمەڵگەی شارستانی، ئەو تەنگۆچەڵەمەیە لێکدەداتەوە کە فیکری سیاسیی تەقلیدیمان ژیانی تێدا بەسەردەبات، هەروەها تەنگوچەڵەمەی پراکتیکی سیاسی بەگشتی لێکدەداتەوە، لەپێش هەموویانەوە سەرنەکەوتنی دامودەزگاو دامەزراوە شارستانیەکانو حیزبەکان لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو پەتا ڕاستەقینەیەی دەوڵەتی سەرکوتکەرانە. هەروەها ئەوەش ڕووندەکاتەوە چۆن لەسەدەی پێشوودا بەرەنگاربوونەوەی ئەم دەوڵەتە گرێدرایەوە بە بیرۆکەی بووژاندنەوەی کۆمەڵگەی شارستانیو دامەزراوە ناوچەییەکانەوە، چونکە دامەزراوە شارستانیەکانو دواتریش ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی لەنێوان تاکەکانو کۆمەڵگەدا بنیاتیدەنێن، ئەو خاکەیە کە تیایدا سیاسەت (وەك پەیوەندیی ڕەسمی ناوەندی) سەرهەڵدەداتو چالاکیو کارامەیی خۆی لێوە وەردەگرێت. ئەگەر ئەم پەیوەندییەم کوشت، واتە خاکەکەم ڕامالی (وەك لای خۆمان ڕوویداوە)، ئەوا هیچ فیکرو کۆمەڵناسیو ئابوورییەك نامێنێتەوە، بەوپێیەش سیاسەت بەهانەی بوونی خۆی لەدەستدەدات. بەکورتی ئەگەر مرۆڤی ناو مرۆڤمان کوشت، ئەوا لە بنەڕەتدا پێداویستیی دۆزینەوەی سیستەمێك بۆ ئاڕاستەکردنو بەڕێوەبردنو ڕاییکردنی ژیانو کۆششە مادیو مەعنەوییەکانی ئەو مرۆڤە لەئارادانامێنێت.

زۆر دەربارەی هۆکانی تەنگوچەڵەمەی ئۆپۆزسیۆنی خۆمانو ڕێکخراوە جۆربەجۆرەکانی وتراوەو گومانی تێدا نییە ئەو ڕێکخراوانە بێبەشن لە چەندین توخم کە پێویستن بۆ ئەنجامدانی هەر چالاکییەکی سیاسی یان شارستانیانەی کاریگەر، لەپێش هەموویانەوە هوشیاریو تێڕوانینی ڕاستی بابەتیانەو توانای ڕێکخستن. بێگومان ئەو بێبەشبوونە لە کەموکوڕییە خۆییەکانی تاك یان توێژە دەستپێشکەرەکانەوە سەرچاوەناگرێت، بەڵکو زیاتر گرێدراوی خودی سیستەمی سیاسیی دامەزراوە. واتە پەیوەندیی بە تێگەیشتنی باوی دەسەڵاتدارانو ڕۆشنبیرانو توخمە چالاکەکانی دەستەبژێرە کۆمەڵایەتیەکانەوە هەیە سەبارەت بە فرمانی سیاسەتو کۆمەڵگەی شارستانی بەیەکەوەو بیروڕایان دەربارەی دامەزراوەکانو سیستەمە میللییەکانو ڕۆڵیان.

لەوانەیە سەرەنجامی سەرەکیی کارپێکردنی ئەو تێگەیشتنەی سیستەمی سیاسی

کە زۆربەی دەوڵەتەکانمان بەجیاوازیی ئەزموون و پێکهاتنیانەوە بەخۆیانەوە دیوەو لەسەر بنچینەی ترس لە کۆمەڵگەی شارستانی دامەزراوە (لەبەر دژ بەیەکبوونی) و هەمووو ئامرازێکیان بۆ سەرکوتکردن و ڕێگەگرتن لە بزووتنەوەو پەرەسەندن و گەماڕۆدانی بەکارهێنابێت، یەکخستنی سەرتاپای دەسەڵاتی گشتیی کۆمەڵگەبێت وەك دەستپێکێك بۆ قۆرخکردنی ڕەهاخوازانەی لەلایەن توێژی فەرمانڕەواوە. مەبەست لە یەکخستن لێرەدا، یەکخستنی بونیادی خودی دەسەڵات و گۆڕینی تێکڕایەتی بۆ دەسەڵاتێکی سیاسی، دوایش بەپێویست دەسەڵاتێکی سیاسی-بیروکراتیانەو ڕێگەگرتن لەسەرهەڵدانی هەر شێوەیەکی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی کە لەسەر بنچینەی بەرهەمهێنان و تاوتوێ پێکردن و کێبڕکێکردنی دامەزراوە ئەهلی یان شارستانیەکانیان لەسەر دادەمەزرێن. لەواقیعدا کاولکردنی کۆمەڵگەی سیاسی تەنیا مانایەکی هەیە، ئەویش کاولکردنی ئەو دەسەڵاتە شارستانییە نێوانکارانەیەو ڕێگەگرتنە لە پێکهاتنیان و ڕەتکردنەوەی پرنسیپی بوونیانە، هەتا نەتوانن هەڵگری تۆوی بنیاتنانی دەسەڵاتێکی سیاسیی نوێی ئۆپۆزسیۆنخواز بن و سنوور بۆ دەسەڵاتی توێژی فەرمانڕەوا دابنێن یان هەڕەشە لە قۆرخکردنی ڕەهای دەسەڵاتی دەوڵەت بکەن. ئەم کاولکردنە ڕێگەی لەوە نەگرتوە ئەم یان ئەو ڕژێمی هەندێك دەوڵەت دەمامکێکی ڕواڵەتکارانەی ئۆپۆزسیۆن بهێڵێتەوە، چونکە ئامانج لە بوونی ئەو ئۆپۆزسیۆنە، پەردەپۆشکردنی نەبوونی دەسەڵاتی شارستانیانەو پیواری دەستپێشکەریی خۆیی کۆمەڵایەتی بوە.

بەوجۆرە هەر دامەزراوێك دەسەڵاتی نەبێت، ناکرێت هیچ گرەوێکی ڕاستەقینە لەناویدا بخوڵقێت و ناشێت هیچ ڕاکێشان و پێشبڕکێیەك بوروژێنێت. تێکشانی بنیاتنانی دامەزراوە ئەهلییەکان و حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆنی نوێ لەوەوە سەرچاوەدەگرێت کە ناکرێت لە چوارچێوەی تێگەیشتنی باودا سەبارەت بەسیاسەت، دەسەڵاتگەلی کۆمەڵایەتی بەشیی یان نیمچە سیاسی بنیاتبنرێت و پێکدادانی ڕاستەوخۆو هەمەلایەن لەگەڵ دەوڵەتی دامەزراودا ڕوونەدات. ئەمەش پرنسیپی کاری شارستانیانە لەبنچینەوە ڕەتدەکاتەوەو دەکرێتە پاشکۆی کاری سیاسی و دەوڵەت (وەك ڕوویدا). ئەوەبوو زاڵبوونی دەوڵەت بەسەر بوارەکانی کاری شارستانیدا بەشێك بوو لە جەغتکردنەوە لەسەر ڕەوایەتیبوونی خۆی وەك دەسەڵاتێکی کۆنترۆڵکاری هەمەلایەن، ئەمەش لە هەلومەرجی نەبوونی هیچ ڕەوایەتیەکی ئەخلاقی بۆ بوونیدا. بۆیە لە بیست ساڵی دواییدا هەر هێزگەلێك هاتبنەئاراوە، لەسەرەتاوە لە دەرەوەی بازنەی ڕەوایەتی دامەزراوو بەبێ ئەو ڕەوایەتیە دامەزراون، ئیمڕۆش کاتێك بوونەتە هێزگەلی کاریگەر، بەدەست یاساکانی خودی ڕژێمەکەوە دەناڵێنن، چونکە ئەو هێزانە یان دەبێت بچنە ژێر باڵی ڕەوایەتیەوە کە مانای خۆڕەتکردنەوەیە وەك هێزگەلی سەربەخۆ، یاخود پرنسیپی جەنگی هەمەلایەن و ڕاگەیەنراوی دەوڵەتی سەرکوتکەر قبوڵ بکەن.

هیچ دەسەڵاتێکی شارستانی ناتوانێت پەرەبستێنێ و بەردەوامبێت، ئەگەر لانی کەمی سەربەخۆی نەپارێزێت هەتا بەهۆیە بتوانێت چەندین گرەوی تایبەتی وەها بکات کە بەهۆیانەوە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی جیاکارە دادەمەزرێت. ئەگەر ڕژێمی دامەزراو ئەو گرەوکردنانەی بە نەشیاو و قبوڵ نەکراو دانا، چونکە مەترسیان بۆ یەکگرتوویی ویستی سیاسی یان مانەوەی دەوڵەت و سیستەمەکە هەیە، بەوپێیەش لەلانی کەمی ئەو سەربەخۆییە بێبەشیکرد کە بەهایەکی

خۆیی دەداتە دەسەڵاتەکەی، ئەوا ئەو دامەزراوانە ناچارن یەکێك لە دوان هەڵبژێرن: یان واز لە سروشتی خۆیان وەك چوارچێوەی ئازاد یان سەربەخۆیی ڕێژەیی بێنن بۆ خەملاندنی چالاکییەکان و دەسەڵاتە کۆمەڵایەتیە نێوانکارو شارستانیەکان، یاخود ئەگەر بیانەوێت بەهەر نرخێك بێت بوونی خۆیان بپارێزن، ئەوا ببنە پاشکۆی دەسەڵاتە دامەزراوە ڕاستەقینەکان و خۆیان بخەنە ژێر ڕەحمەتی پارێزگاریانەوەو ببنە یەکێك لە ئامرازەکانی دەسەڵاتی سیاسی، چونکە ئەو ڕێکخراوانە ناتوانن بەردەوامبن و ڕاستبێژیی خۆیان بەدەستبێنن، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە خۆیان هەڵدەواسن بە دەسەڵاتی خاوەن ڕاستبێژییەوە، واتە دەسەڵاتی خاوەن ناوەڕۆك و سوودبەخش، کە لێرەدا دەسەڵاتی دەوڵەت یان حیزبەیە کە بەشێك لە دەسەڵاتی دەوڵەتی بەدەستەوەیە.

سەرەنجام گۆڕان بەسەر ئامانجەکانی دامەزراوەکان و ئەو هاندەرانەدا دێت کە پاڵ بە تاکەکانەوە دەنێن بچنە ناویانەوەو کاریان تێدا بکەن. ئەزموونی مێژوویی ئەوەی دەرخستوە، ئەو دامەزراوە ئەهلیانەی هیچ ڕێگەیەکیان نەبووە جگە لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەت و کارکردن لە سێبەریدا، نەیانتوانیوە هیچ گرەوێکی ڕاستەقینە بکەن بۆ بەدەستهێنانی بەهایەك بۆ چالاکیی ڕاگەیەنراویان، بەڵکو بوونەتە چوارچێوەیەکی لاوەکی یان ڕێژەیی بۆ کێبڕکێکردن و ململانێی سیاسی کە تاقە شتێکە لەم سیستەمەدا ڕەسەن و سوودبەخش بێت. هاندەری سەرەکی کە وا لە تاکەکان دەکات بچنە ناو سەندیکا حکومیە سەرکوتکەرەکانەوە (بێگومان لێرەدا مەبەست چونی خۆویستانەیە) کۆششکردنە بۆ بەکاربردنی سەندیکا وەك ئامرازێك بۆ کنەکردنە ناو دەسەڵات و بەرزبوونەوەی خێرا لە پلەکارە سیاسییەکاندا. بۆیە بەبێ خوڵقاندنی گرەوی ڕێژەیی هاوتەریب کە لە بنچینەدا گرێدراوی دابەشکردنی دەستکەوتە مادییەکان یان بەکاربردنی نەخۆشییە دەروونیەکان و ناکۆکیە توندڕەوە تاکەکەسیەکانەو بەبێ کارکردن بۆ پەرەپێدانی بەها سوودخوازو خۆپەرست و چاوچنۆکیەکان، نەدەکرا ئەو ڕێکخراوانە بهێڵرێنەوە. ئەمە سەرچاوەی ئەو کاولکردن و گەندەڵکردنەیە کە ڕژێم و دەستەبژێرە نیشتیمانپەروەرەکان بەخۆیانەوە دیوەو ئەو بناغەیەیە کە بەگشتیکردنی گەندەڵی و وێرانکاری ئەخلاقی و سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێستا لێکدەداتەوە. ئەوەش بۆ ڕێکخراوە پیشەییەکان ڕاستەو بەسەر ئەو حیزب و ڕێکخراوە میللیانەدا جێبەجێدەکرێت کە لە زۆربەی کۆمەڵگەکانماندا هەبوون، هەروەها پەرەسەندنی نەگۆڕو بەکۆمەڵ و گشتیی بەهاکانی هەڵپەرستی و بەرژەوەندخوازی و خۆپەرستی لێکدەداتەوە کە تێکڕای چینی سیاسی و دەستەبژێری خۆمانی لە کەنداوەوە بۆ ئۆقیانووس تەنیوەتەوە. ئەم پەرەسەندنە تەنیا تەعبیر لە پەککەوتەییەکی ئەخلاقی ناکات لای هەر تاکێکی ئەندامی ئەو دەستەبژێرە، بەڵکو بەهۆی کاریگەریی گشتییەوە تاودەرەوەی لۆژیکی سیستەمی گشتی و بەکاربردنێتی بۆ گەندەڵی وەك میکانیزمێکی سیاسی و یەکێك لە بونیادەکانی سیستەمی شارستانی دامەزراو.

لە ڕاستیدا ڕەگوڕیشەی گەندەڵی لە هەموو کۆمەڵگەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و بەرژەوەندییەکانی خراونەتە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئەو دەستەبژێرانەی کێبڕکێ لەسەر دەسەڵات دەکەن، واتە کردنی کاری کۆمەڵایەتی بە ئامرازێك بۆ بەرزبوونەوە بۆ پلەکارەکانی سەرەوە، بەبێ ئەوەی سەرکەوتن بۆ پلەکارەکان و داگیرکردنی شەرعیانەیان ببێتە

سەرچاوەیەك بۆ خزمەتكردنی كۆمەڵگەی شارستانیو پەرەپێدانی ئابووریو كۆمەڵایەتیو كولتووری. بارەكەی ئیمڕۆ لەوەی چەندساڵێك لەمەوبەر جیاوازنییە، بەڵام مەسەلەی جیاواز ئەوەیە، كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی كە خۆراكدەداتە هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵگەی شارستانیی ئێمەو ڕێگەی خەملێنو توانەوەو هێنانەدیی هاوسەنگیی ناوەكی لێ دەگرێت، ئیمڕۆ ڕوو لە پەرەپێدانی ئامڕازگەلی نوێیە بۆ خۆهەڵقورتاندی سەربازیو سیاسیو كولتووری وەها كە لەوەوبەر بەدیمان نەكردوە، بۆ ئەوەی زیاتر جڵەوی كۆمەڵگەی شارستانیمان بكاتو لەناوەوەڕا كۆنترۆڵی بكات.

یەكێك لە شتە سەیروسەمەرەو جیاوازەكانی مێژوو ئەوەیە، هۆكاری شێواندنو كاولكردن بە هۆكاری بنیاتنان یان هاندەری بنیاتنان دابنرێت. ئاخاوتنی پەرەسەندوو لە دەوڵەتە خۆرئاواییەكاندا لەبارەی دیموكراسیو مافەكانی مرۆڤەوە یاخود فشارهێنانیان لەسەر ئەو مەسەلەیە، تەنیا بوونەتە هۆی قوڵبوونەوەی پەیوەندیی كۆمەڵگەی شارستانیی ناوچەیی بە دەرەوەو دواتریش جڵەوكردنی مادیو مەعنەوی ئەو كۆمەڵگەیە لە دەرەوەڕا. لەم بارەشدا مەحاڵە سیستەمێكی سیاسیی خاوەن لانی كەمی كارامەییو ڕاستبێژی وای دامەزرێت كە توانای چارەسەركردنی ناكۆكییە خۆییەكانی كۆمەڵگە هەبێت. هەروەها مەحاڵە سیستەمێكی شارستانی بەبێ بنیاتنانی دەوڵەت وەك چارەسەرێك، واتە بەبێ كارلێككردنی هەردووكیان، بنیات بنرێت، چونكە ئەوانە دوو چەمكی جیاكارەن، بەڵام دوو واقیعی پێكەوە گرێدراون. دەوڵەت بەبێ كۆمەڵگە شارستانیو لانی كەمی كۆنترۆڵكردنی لە ڕووی مادیو مەعنەوییەوە دانامەزرێت، چونكە بەهاكانو هێزەكانو سیاسەتەكانی خۆی لەوەوە بەدەستدێنێت. كۆمەڵگەی شارستانیش وەك كۆمەڵگەیەكی جیاكارە لە بازنەی جیهانیدا بەبێ پارێزگاریكردنی دەوڵەت بوونی نابێت. دیموكراسی بەرهەمی ڕاستەوخۆی كۆمەڵگەی شارستانیی نوێ یان كۆن نییە، بەڵكو بەری هاوجوتیو هارمۆنیی دیالەكتیكانەو دینامیكیانەی نێوان شێوازێكی كۆمەڵگەی شارستانیو داهێنانە سیاسییە ناوەندییەكانییەتی، واتە نێوان بونیادە سیاسییەكانی نوێنەرایەتیكردنو ئەو بونیادە شارستانیانەی لە هەڵوەشانەوەی تاقمگەرییە خێزانیو عەشایەرییەكانو چەسپاندنی بەها تاكخوازەكانو ئازادیی تاكەكەسییەوە سەرچاوەهەڵدەگرێت. دیكتاتۆریەت لە كۆمەڵگە نوێكاندا ڕوونادات، بەهۆی نەبوونی ئەو هاوجوتبوونو هارمۆنیەوە نەبێت، جا ئەوە بەهۆی پاشكەوتوویی سەرمایەدارییەوە بێت، كە دەبێتە سەرلەنوێ وەگەڕخستنەوەی تاقمگەرییە كۆنەكان لە هەلومەرجێكی سیاسیی نوێدا، یان لەبەر نەبوونی بونیادە بەكردەوەكانی نوێنەرایەتیكردن بێت، یاخود لەبەر كارلێك نەكردنی بونیادە شارستانیو سیاسییەكان بێت. لێرەشدا دەستێوەردانی دەرەكی هیچ ئاكامێكی نابێت، جگە لە فراوانكردنی كەلێنی نێوانیان، بەمەبەستی وابەستەكردنی دەوڵەتو كۆمەڵگە پێكەوەو گۆڕینیان بۆ ئامێرێك لەناو ستراتیژی جیهانی زلهێزەكاندا.

كەواتە دیكتاتۆرییەت گرێدراوی بنەما شارستانیە كۆنەكان نییەو هیچ پەیوەندییەكی لەگەڵ سیستەمە ئیستیبدادیەكانی پێشوودا نییە. دیكتاتۆرییەت تاودەرەوەی ئەو ناكۆكیو دابەشكردنانەیە كە سەرمایەدار كردنی نیوەناچڵ، واتە شێواو، لە كۆمەڵگەكانماندا خوڵقاندویەتیو بۆتە هۆی نەبوونی هیچ هارمۆنیو كارلێككردنو هاماهەنگییەك لەناو خودی دامەزراوەكانی كۆمەڵگەی

شارستانیدا. بەهەمان شێوە، دیموکراسی خۆرسکانە لە بنەما شارستانییە نوێکانەوە (سەندیکایی یان تاکەکەسی) هەڵناقوڵێت، بەڵکو ڕوون و ئاشکرایە ئەم بونیادە نوێیانە هاندەری چەسپاندنی دەسەڵاتی سەرکوتکەرانە بوون و دەبن، لەپێناو جەغتکردنەوەی خۆی دژی گشت شێوازەکانی ڕێکخستنی شارستانیی پێشوو یاخود گەڕان بەدوای پراکتیزەکردن و هێنانەدیی بەها خوییە لاوەکییەکان لە چوارچێوەی لەخۆگرتنی لەلایەن دەوڵەت و سیاسەتەوە. ئەمەش ئەوەیە کە لە نەبوونی سەربەخۆیی بەکردەوەی ئەو دامەزراوە شارستانیانە لە حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکاندا بەدیدەکەین، بەڵکو گەشەکردن و پێگەیشتنی ئەو دامەزراوانە گرێدراوی ئەو حیزبانەیە.

ئەزموونەکانی دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم و دەوڵەتە خۆرئاواییەکان، پێش ئەوەی ئەنجامی کۆنترۆڵکردنی دنیا بگەنە قۆناغی کامڵبوون و ئارامی، جەغت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە قۆناغەکانی هەژاندنی بنەما کۆمەڵایەتییەکان، گرێدراوی پەرەسەندنی زیادەڕۆیانەی مەیلی پێکهێنانی دەسەڵاتی ڕەها و ڕێکخستنی سیاسیی زۆرەملیانەی کۆمەڵگە بوە. دەوڵەتی نوێش ئەو چوارچێوەیە بوو کە دەسەڵاتی فاشیزم و نازیزم تیایدا پەرەیسەندوە، هەروەك چۆن چوارچێوە بوە بۆ پەرەسەندنی دەسەڵاتی دیموکراتیانە. زیادەڕۆیی نییە بڵێین، ئاخاوتنی زۆری ئیمڕۆ سەبارەت بە کۆمەڵگەی شارستانی، واتە دەربارەی ئەو ڕێکخراوە نوێیانەی کۆمەڵگەی شارستانی کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕێکخراوە شارستانیە کۆنەکان (ئایینی و خێزانی) دادەنرێن، ڕەوتێکی پاکتاوخوازی و دوورخستنەوەخوازی حەشاردراوە کە نابێت مەترسییەکانی کەم بایەخ بکرێن. ئەمە بەو مانایە نییە کە بونیادە کۆنەکان ڕەوتێکی دیموکراتیانەیان حەشارداوە، بەڵکو وەك ئاشکرایە، بەمەبەست جەغتکردنەوەیە لەسەر پەیوەندیی نێوان سیستەمی سیاسی و سیستەمی کۆمەڵایەتی شارستانیانە. هەر سیستەمێکی سیاسی نەتوانێت دەرفەتی ڕەتکردنی ناکۆکییەکانی کۆمەڵگەی شارستانی بخوڵقێنێ و کۆنترۆڵیان بکات، کە ئیمڕۆ لە وڵاتە هەژارەکاندا جیاوازیی تۆقێنەر لەنێوان چینەکاندا هەیە، ئەوا بێگومان ئەو کۆمەڵگەیە دەکەوێتە ژێر پێیەوەو خۆیشی بەپێویست دەگۆڕێت بۆ سیستەمێکی سەرکوتکەرانە. وەك باسمانکرد، گرفتەکە لە وڵاتەکانماندا لە بنچینەدا نەبوونی کۆمەڵگەیەکی شارستانیی هارمۆن و دابەشبوون و پرشوبڵاویی ئەو کۆمەڵگەیەیە لەنێوان دوو مەیلی ناکۆکدا، یەکێکیان بەرەوە تێوەچوون لەگەڵ دەرەوەدا ڕایدەکێشێت، ئەوەی دوەمیش وەك پەرچەکردار بەرامبەر دەرەوە بەرەو گەڕانەوەی هەمیشەیی بۆ ڕابردوو پاڵی پێوەدەنێت.

## سێیەم

### کەواتە چۆن کۆمەڵگەی شارستانیمان سەرلەنوێ بنیات بنێینەوە؟

ئەم پرسیارە بەرەو هۆکارە ناوخۆییەکانمان دەبات. لەم بوارەدا بەبێ بیرکردنەوە لەو ئەزموونە پراکتیکیەی دەساڵی دوایی هوشیارانەو کۆڵنەدەرانە ئەنجاممانداوە، ناتوانین لەسەر وێناکردنی تیۆری بەردەوام بین. لە کۆتایی هەشتاکانەوە ئەو بڕوایە لای هەندێك بەهێزبوو کە چیدی ناکرێت بە هەمان شێوازی کاری سیاسی ڕووبەڕووی دەسەڵاتی سەرکوتکەرانەی سەرتاپاگیری هەندێك لە وڵاتەکانمان ببینەوە، چونکە دەوڵەت بەکردەوە هەموو دەروازەیەکی کارکردنی سیاسیی گشتی داخستبوو، مەبەست ئەو کارەیە کە گۆڕین یان

دەستکاریکردنی دەسەڵاتی دەکردە خاڵی هەنگاوهەڵهێنان و کارپێکردن. بۆیە پێمانوابوو تاقە ڕێگەی خۆڕزگارکردن لەو گەمارۆدانە هەمەلایەنە کە دەسەڵاتی دامەزراو توانیبووی بیسەپێنێت بەسەر کۆمەڵگەو هەموو کارێکی سیاسیدا، گەڕانەوەبوو بۆ ژیاندنەوەو خستنەوەکاری بونیادە کۆمەڵایەتیە شارستانیەکانی ژێر دەسەڵاتی سیاسەت، وەك ئامرازێك بۆ بەخشینی خوێنی نوێ بە کۆمەڵگەو سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی ئەو هێزە زیندوانەی لەداهاتودا، ساتێك کات و دەرفەت ڕێگەدەدات، بەشداریدەکەن لە پرۆسەی سیاسیی گۆڕانکاریخوازدا. من بۆ خۆم هەوڵمدا ئەم بیرۆکەیە لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا پەرەپێبدەم و بۆ ئەوەش کتێبی "بەیاننامەیەك لەپێناو دیموکراسیدا" و "کۆمەڵگەی دەستەبژێر"م نووسی بۆ ڕەخنەگرتن لە ئایدیۆلۆژیای نوێکاریو بیرۆکەی کۆمەڵگەی شارستانی و لە ناوەندیبوون و تەوەرخوازی کاری نیشتیمانی لە دەوری دەوڵەت، لێرەشدا بانگهێشتکردن بۆ گەڕانەوە بۆ خودی کۆمەڵگە گرنگترین بابەتەکانی ئەو کتێبانە بوون. بڕوامان وابوو دەکرێت لەمەدا گرەو لەسەر ئەوە بکەین کە دەسەڵاتی ناوەندی هەست بە مەترسیی زۆر دەربارەی بارودۆخ و بوونی خۆی ناکات، کاتێك مەسەلەکە پەیوەندیی بە ژیاندنەوەی کێبڕکێ و ململانێ لەسەر دەسەڵاتە نا(ناوەندییەکان)ەوە هەیە، واتە دەسەڵاتی سەندیکایی، ئایینی، کۆمەڵایەتی یاخود کولتووری.

بەو جۆرە کۆمەڵگە پێشمانکەوت بۆ دۆزینەوەی ئەو توانایانەی گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگەی شارستانی حەشاریانداوە، لەپێش هەموویانەوە ئەو هێزانەی زۆرترین دڵەڕاوکەیان هەبوو و زیاتر بەدوای گۆڕانکاریدا دەگەڕان. لەکاتێکدا ڕۆشنبیرەکان زۆر دوودڵ بوون لەوەی لە گەمەی سیاسەت دووربکەونەوە، ئەگەرچی ئەو گەمەیە ببوە کارپێکردنێکی مازۆشیانەی زۆر نامرۆڤانە، نێوەندە میللی و نیمچە میللیەکان چالاکیی داهێنەرانەیان لە چوارچێوە ئایینیەکاندا لەخۆدەگرت، وەك مزگەوتەکان و کونج و ڕێبازەکانی عیبادەتکردن و یەککەوتنە برایانەو کۆمەڵایەتی و بڕواخوازییەکان، بۆ ئەوەی گەورەترین دیاردەی ژیاندنەوەی کۆمەڵگەی شارستانی پێ ئەنجامبدەن کە کۆمەڵگەکانمان لە نیو سەدەی دواییدا بەخۆیانەوە دیوە. کەچی هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان کە حیزب و ڕێکخراوە کۆنەکانیان (چەپڕەوو ناسیونالیستەکان) دەبزواند، پێویستیان بە کۆششێکی زۆر و کاتێکی زۆر هەبوو هەتا بڕوا بەوە بهێنن کە بنیاتنانی کۆمەڵەکانی مافی مرۆڤ یان دامەزراوەکانی کاری میللی شایانی کۆششکردن و کارێکی سیاسی کۆمەڵایەتی پێکدێنن، نەك بەشێك لە ژیاندنەوەی بڕوای بوارژوای لیبرالیستی کۆنەپەرستانە. لەکاتێکدا بزووتنەوە ئیسلامیەکان، کە بە ئەڵقەی فێرکردن و هاوکاری لە مزگەوتەکان و دوور لە چاوی دەسەڵات دەستیپێکردبوو، توانیان بەخێرایی و ئەنجامی قوڵبوونەوەی تەنگوچەڵەمەی دەسەڵاتی دامەزراو بگۆڕێن بۆ هێزگەلی سیاسیی مەزن، ئاقارە ناسیونالیست و چەپڕەوەکان بەگشتی سەرکەتوونەبوون لەوەی پێکهاتەو کۆمەڵە شارستانیەکان، گرنگترینیان کۆمەڵەکانی مافی مرۆڤ، بکەنە چوارچێوەی زیندوو بۆ خەملاندن و نوێکردنەوەی هێزەکانی کۆمەڵگەی شارستانی. ژمارەیەکی کەمی ئەو پێکهاتانە نەبێت کە توانیان لانی کەمی داکۆکیکردنی ڕۆشنبیران و هێزە سیاسیەکان بەدەستبهێن، وەك لە تونس پێش گۆڕانکاریو مەغریب بەشێوەیەکی ڕێژەیی و جەزائیر دوای گۆڕانکاری، زۆربەی ئەو پێکهاتانە گۆڕان بۆ بونیادی بیروکراتی بێ ڕۆح و چالاکیەکانیان هیچ بەهایەکیان نەبوو. لێرەشدا پەککەوتەییەکە ناگەڕێتەوە بۆ خودی ئەو

پێکهاتانە، بەڵکو بۆ نەبوونی جۆشوخرۆش‌و خواست‌و ئامادەیی بۆ گۆڕینی شێوازی بیرکردنەوەی کۆن‌و بەسەرچووو شێوازی کارکردن لای ئەو دەستەبژێرە نوێیەی گرەوی ئەوەی لەسەر دەکرا ئەو دامەزراوانە وەبەربهێنێت‌و کاریان تێدا بکات، چونکە بەلای ئەو دەستەبژێرەوە سەخت بوو دەستبەرداری گرەوکردنی ڕەهاو نەگۆڕ بێت (وەك لەوەو پێش دەیکرد) لەسەر دەوڵەت، جا بۆ پاراستنی دەستکەوت‌و بەرژەوەندییە دامەزراوەکان بێت یان بۆ داخستنی ڕێگەی نەیارە سیاسییە نوێکانیان بێت.

نە بزووتنەوە ئیسلامیەکان، کە توانیان هەندێك جار سەرکەوتوانە کۆمەڵگە لە ڕێگەی لەخۆگرتن‌و چالاککردنی چوارچێوە شارستانیەکانیەوە بەرنە ناو سیاسەتەوە- مەبەست تەنیا چوارچێوە بڕواخوازییەکان نییە، بەڵکو چوارچێوە هەرەوەزی‌و هاوکاریخوازو خێزانیەکان- توانیان پاشەکشەکردن بسەپێنن بەسەر دەسەڵاتی ناوەندیداو سیاسەتی شارستانی نوێبکەنەوە. نە بزووتنەوەکانی مافی مرۆڤ، کە هەندێك گرەویان لەسەر دەکرد، توانیان بەشدارییەکی ڕاستەقینە بکەن لە کردنەوەی ڕێگەی چاکسازی. زیادەڕۆیی نییە بڵێین دەساڵێك کارکردن بەو جۆرە ئێمەی گەیاندە ئاستەنگ‌و کوێرەڕێگەی نوێ. لایەنگیریکردنی فراوانی جەماوەرەکەمان بۆ پڕۆژەی سەربازیی عیراق کە بە تاقە هیوای سەپاندنی گۆڕانکاری‌و شڵەقاندنی بارودۆخە مەنگەکەی دەزانی، هەروەها پاشەکشەی خێرای ڕژێمە سیاسییەکان کە لە قۆناغی یەکەمدا وادەرکەوت هەستیان بە ئاستەنگ کردو کۆشش بۆ نوێکردنەوەی شێوازەکانی فەرمانڕەوایی ڕوەو دیموکراسی دەکەن، کەچی بەرەو جۆرێکی نوێی ڕژێمی فاشیست‌و عەسکەرتاری هەنگاویان نا، تەعبیر لەو ئاستەنگ‌و کوێرەڕێگەیە دەکەن. بەو جۆرە دەوڵەت‌و دەسەڵاتی ناوەندیی سەرکوتکەرانە بەرەنگاری هەموو ئەو هەوڵانەی گۆڕانکاری بوونەوە کە لەسەر بناغەی خستنەگەڕی سەرچاوەکانی هێز لە کۆمەڵگەی شارستانیدا دامەزرابوون. ئەمە بەو مانایە نییە ئەو دەوڵەت‌و دەسەڵاتە نەهەژاو هەرگیز ناهەژێن، بەڵکو فشاری بزووتنەوەی ئایینی بەشێوەیەکی بێوێنە تەنگوچەڵەمەکانی قوڵکردونەتەوەو بێگومان هەڵوەشاندنەوەیان زیاتردەکات. بەڵام پێشکەوتنی کاری نیشتیمانی بەبێ بیرکردنەوەو وێناکردنی قوڵ دەربارەی ئەزموونی پێشوو و خەملاندنی ستراتیژگەلی نوێی تەبا لەگەڵ بارودۆخە کتوپڕەکە کارێکی مەحاڵە. پێدەچێت هۆی سەرەکی سەرنەکەوتنمان لە پانزە ساڵی پێشوودا بۆ سەپاندنی گۆڕانکاریی دیموکراتیانە، بگەڕێتەوە بۆ ڕاڕایی چینی ناوەڕاست‌و ئەو هێزانەی پێوەی گرێدراون (وەك دەڵێن عەلمانیەکان) بۆ وەبەرهێنانی بەکردەوەی کۆمەڵگەی شارستانی‌و بەردەوامبوون لەسەر هێڵی دوژمنایەتیکردنی سیاسی‌و سووربوون لەسەر ستراتیژی بزووتنەوەی ناسیونالیست‌و چەپڕەوی تەقلیدی کە دەوڵەت دەپەرستێت‌و هیچ ئەڵتەرناتیڤێکی تر جگە لەو بۆ کارکردن‌و مامەڵەکردن لەگەڵیداو لەڕێگەیەوە بەدی ناکات.

ئەگەرچی هێشتا زووە پەندو وانەکانی ئەو ئەزموونانە پوختەبکەینەوە کە هێشتا نەگەیشتوونەتە کۆتایی، بەڵام بەلای کەمەوە دەشێت هێما بۆ دوو تێبینی بکەین: یەکەم بەهۆی بەدەوڵەتیکردنی جیهانیی سیستەمەکانی کۆمەڵگەی شارستانی‌و سیاسی پێکەوە، واتە بوونی خوودی دەوڵەت وەك جەنگی کەنداو نیشانیدا، چیدی ناکرێت وەك پێشوو گرەو لەسەر کۆمەڵگەی شارستانی بکەین. دەوڵەت لە چوارچێوەی ئە هاوپەیمانێتیە نێودەوڵەتیەدا کە ئیمڕۆ بەدەستیدێنێت، دەتوانێت ویستی هەر

کۆمەڵگەیـەکی شارسـتانی، هەرچـەند بـەهێزبێت، تێکبشـکێنێت و کۆیلەیـەتی و خۆبەدەسـتەوەدان بەسـەریدا بسـەپێنێت، ئـەنجامی ئـەوەش هەرەسـهێنانی ئـابووری و وێرانبـوونی گشـتییە، ئـەوەی ئیمـڕۆ لـە زۆربـەی کۆمەڵگەکانمانـدا ڕوودەدات. دەستەبژێرە فەرمانڕەواکان ئیمڕۆ هیچ هەستێکی نیشتیمانیان نەماوەو هیچ هەستێکیان نییە، جگـە لـە هەسـتی ئاسـایش و خۆپاراسـتن و پارێزگـاریکردنی بەرژەوەنـدی و بوونیـان لـە فەرمانڕەواییدا، نییە.

ئـەزموون ئـەوەی دەرخسـتوە کـە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی کۆن کاریگەری و کۆڵەکە خۆییـەکانی خۆیـان فەوتانـدوە، ئـەوەش لـە ڕەوتـی ڕووکردنە وەبەرهێنانی دەسەڵات لەلایەن بزووتنەوە ئیسـلامیەکان و گۆڕانیانـەوە بـۆ حیزبـی سیاسـی بەدەردەکـەوێت. لەبەرامبـەر ئەمـە دامـەزراوەکانی کۆمەڵگـەی شارسـتانی نـوێ هـیچ توانایـەکی وای نیشان نەداوە کە دەتوانێت سەربەخۆ لە دەوڵـەت و بێ پاراسـتن و کەفالـەتی ئـەو کاربکـەن. جا ئەگـەر هێشتا بەلای کۆمەڵگەی شارستانیمانەوەو بەهۆی پارچەپارچـەیی ئێسـتایەوە سـەخت بێـت بگاتـە بەرهەمهێنانی بزووتنەوەیەکی سەربەخۆی بەهێزی پشـت بەخۆبەسـتوو، لەبـەر نـەبوونی دەرفەتـەکانی یەکەندەنگیی شیاوو ڕێککەوتن، بەڵام گەڕانەوە بۆ ژیاندنەوەی کاری سیاسی لە ساڵەکانی داهاتووداو لـە هەلومـەرج و بـەپێی ئـەو پێوانانـەی دەوڵـەت و دەسـەڵاتی دامـەزراو لـە هـەر وڵات و ناوچـەیەك دەیسەپێنن شتێکی حاشاهەڵنەگرە. ئەمەش ڕێگـە لـە ڕێککـەوتنی دەسـتەبژێرە کۆمەڵایەتیـە جۆراوجۆرەکان ناگرێت، هەروەها ڕێگـە لە ئەگـەری پـەنابردنیان بـۆ ئـامرازی شـەڕی نـاوخۆ ناگرێـت. لێرەشـدا هـیچ دەرفـەتێك بـۆ خۆپاراسـتن لـە مەترسـییەکانی ئـەو جەنگـە لەئارادانییـە، ئەگـەر پێشوەخت و لە ساڵەکانی داهاتوودا نوێکردنەوەی بنەڕەتیانە دەربارەی چەمکی دەسەڵات و سیاسەت و نوێکردنـەوەی قـوڵ و ڕاسـتەقینەی دەوڵـەت نەیەتەئاراوە.

ئەمـە مانـای ئەوەیـە پرۆسـەکانی نوێکردنەوەی ڕیشەیی کۆمەڵگەی شارستانی، واتە لەسـەر ئاسـتی بـەهاکان و ئـەخلاقیات و کولتـوور، پێویسـتە ئیمـڕۆ هاوشـانی سـتراتیژی گرتبوونـەوە مەزنەکان بێت بۆ گۆڕینی دەسەڵات و نوێکردنەوەی بونیادو واتاکانی دەوڵەت و ئامرازەکانی کارکردنی. جـا ئەگـەر لـە دەیـان سـاڵی پێشـوودا بیرۆکـەی سیاسـەت دەوروخـولی پرۆسـەی دەسەڵاتگرتنەدەسـتی دابێـت، وەك ئـەوەی دەوڵـەت ئـەو قەڵایـە بێـت بـە کۆنترۆڵکردنی بشـێت سـەرجەم پرۆسـەی کۆمەڵایـەتی و قڵپکردنـەوەی گشـت پێوانەکان جڵەوبکرێت، کە یەکێکە لـە خەیاڵپڵاوییە هەرە گەورەکانی بیری شۆڕشگێڕانەی ڕابردوو، ئەوا ئیمـڕۆ مەحاڵـە دەسـتەبژێرە نوێکـانی خوازیـاری گۆڕانکـاری بـەبێ دەربڕینـی پرۆژەیـەکی لـۆژیکیی واقیعـی و پراکتیکیـی ئـەقڵانی بـۆ گۆڕانکـاری سیاسـی، پشـتگیریکردنی جـەماوەرو کۆمەڵگـەی شارسـتانی بەدەسـتبهێنێت، بـەڵام گرفتـی هـەرە گـەورە لێـرەدا دەربڕینـی ئـەو پرۆژەیەیـە، پـێش ئەوەش دیاریکردنی مانای کۆمەڵگەی شارستانی و کۆمەڵگەی سیاسی و سنوورەکانیانە.

دەبێت دەرك بەوە بکەین کە داکۆکیکردن لـە کۆمەڵگـەی شارسـتانی گرێـدراوی لـەناوبردنی دەوڵـەت و تەنانـەتیش بەپێویست لاوازکردنـی نییە وەك شوێنگەیەکی دەسەڵاتی ناوەندی. گرفتی هـەرە گـەورە تـەنیا لـە دەوڵەتـدا نییـە، بـەڵکو سـەرەتا لـە بونیـادی کۆمەڵگـەی شارستانیشـدایە. ڕەخنـەی سـەرەکی کـە دەشـێت ئاراسـتەی دەوڵـەتی ئیسـتیبدادی و سـەرتاپاگیر بکرێـت ئەوەیـە، ئـەو دەوڵەتـە هەمیشـە بەهانـەی بـۆ خـۆی و کۆمەڵگـەو ڕاگشـتی دەهێنایـەوە گوایـە بـەکارهێنانی زەبـر بـۆ

چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی کۆمەڵگەی شارستانی پێویستە، کەچی نەیتوانی پڕاوپڕ ئەو فرمانی چارەسەرکردنە بهێنێتەدی. دەستکەوتی سیاسیی سەرەکی هوشیاریی سیاسیمان، دەرککردنە بەوەی سەرکوتکردن و چەوساندنەوە دوو ئامرازی بەکەڵك نین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پێداویستیەکانی گەشەپێدان و ڕێکخستنی کۆمەڵگەی شارستانی.

بۆیەو لێرەوە پێویستە جیاوازی بکەین لەنێوان دروشمی داواکردنی ژیاندنەوەی کۆمەڵگەی شارستانی، ئەوەی سەرلەنوێ پێکهاتنەوەی ئەو هێزە کۆمەڵایەتی و فیکریانەی لەسەر ڕادەوەستێت کە پێویست بۆ کاری سیاسی، لەگەڵ دروشمی دیموکراسی کە پەیوەندیی بە بابەتی تاوتوێکردنی خودی دەوڵەتەوە هەیە، وەك ئامرازێکی پێویست بۆ دۆزینەوەی دەروازەی دروست بۆ ناکۆکیەکانی کۆمەڵگەی شارستانی. لەم ڕوانگەیەوە، دیموکراسی بەرجەستەکاری سروشتی ژیاندنەوەی و گێڕانەوەی بایەخ بۆ کۆمەڵگەی شارستانی نەبوەو نابێت، بەڵکو پێش ئەوەو گرنگتر لەوە دەرمانی سیاسییە بۆ گیروگرفتەکانی ئەو کۆمەڵگەیەو زاڵبوون بەسەریاندا، بەوپێیەش گیروگرفتەکانی کۆمەڵگەی شارستانی لەخۆوە چارەسەرنابن و پێویستیان بە دەوڵەتە. لێرەشدا داواکراو دیاریکردنی جۆری ئەو دەوڵەتەیە کە بەکردەوە دەتوانێت وەڵامی دروست و ڕێگەی جۆربەجۆری زامنکەری ڕزگارکردنی کۆمەڵگەی شارستانی لە ناکۆکیەکانی دەخاتەڕوو و ئەو وزەو توانایانە دەتەقێنێتەوە کە جگە لە وزەی مادی و فیکریی کۆمەڵگە شتێکی دیکە پێك ناهێنن. کەواتە چارەسەرەکە لە ڕەتکردنەوەی دەوڵەت و پێك ناکۆککردنی دەوڵەت و کۆمەڵگەی شارستانیدا نییە، بەڵکو لە کۆڕینی خودی خۆیدایە لەناوەوەڕا، واتە دەستکاریکردنی شێوازی ئەو ویستەی جڵەویدەکات و گۆڕینی لە ویستێکی دەرەکیی گرێدراوی تاقمێك یان گرووپێکەوە بۆ ویستێکی ناوەکیی هەڵقوڵاو لە خودی کۆمەڵگەوەو پاشکۆ بۆ هەمان کۆمەڵگە. ئەگەر لە تێگەیشتنی ئەم ئیشکالیەتە تایبەتە بە کۆمەڵگەو دەوڵەت تێ نەگەین، بەتایبەتی کێشەی ئەوەی بابەتەکە هاوکات پەیوەندیی بە کۆمەڵگەی شارستانی و دەوڵەتەوە هەیە، ئەوا سەیرنابێت فیکری سیاسیمان جارێکی دیکە دژی خۆی ڕاوەستێتەوەو جەغت لەسەر سروشتی حەتمی و پێویستی دەسەڵاتی سەرتاپاگیرو ئیستیبدادی بکاتەوە، کاتێك ئەوە بەدیدەکات کە سەختە لە چوارچێوەی بەردەوامبوونی شێوازی ئێستای کۆمەڵگەی شارستانیدا دیموکراسی بچەسپێنرێت. لەواقیعدا پێدەچێت ئەو دژی خۆوەستانەوەیە پێش هەنگاوهەڵهێنان ڕوەو دیموکراسی دەستپێبکات، چونکە پڕۆسەی دوورخستنەوەی هێزە کۆمەڵایەتیە ئیسلامییە نوێکان لە چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی، پاش تێکەڵکردنی ئەم چەمکە بەسیاسەت، ئامرازێکە دەستەبژێری فەرمانڕەوا یان باڵادەست کۆششدەکات بەهۆیەوە ڕەوایەتی ببەخشێتەوە بە سیاسەتی سەرکوتکردن و دوورخستنەوە، ئەمەش بەناوی پێویستیی پاراستنی کۆمەڵگەو یەکگرتوویی دەسەڵات و دەوڵەت، تەنانەت ئەگەر ئەو گوتارە ئیستیبدادیە نوێیە جلوبەرگی داکۆکیکردنی کۆمەڵگەش کرابێت بەبەریداو کۆمەڵگەی شارستانی یەکسان بکات بەو هێزە سیاسیانەی نوێنەرایەتیدەکەن یان پیشتگیریدەکەن و هاوجوتن لەگەڵ ئەو دەستەبژێرانەی لە دەوری دەوڵەت کۆبوونەتەوە.

تێبینی دوەم ئەوەیە، لە هەلومەرجی ئێستادا کە دنیای بەرهەمهێنانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سمبولی بەدەوڵەتیدەکرێت، ناکرێت لەسەر بنچینەی پرشوبڵاویی باوی هێزەکان و لە

ڕوانگەی کارکردنی ناوچەیی سنووردارو دەوڵەتی بچووکەوە ڕووبەڕووی گشت گۆڕانکارییەکان ببینەوە. شۆڕشی زانیارییەکان‌و پێکگەیشتن (ئینفۆرماسیۆن‌و کۆمۆنیکاسیۆن) بەسەر گشت گەلانیدا دەسەپێنن بەپێی پێوانە کیشوەرییە هەرە گەورەکان بیربکەنەوە نەك پێوانەی دەوڵەت‌و پێکهاتە ڕەسمییە ڕووتەکان. دەوڵەتە پیشەسازییە مەزنەکان– بەبێ هیچ ڕیزپەڕێك– بەپێوانەی کیشوەرەکان‌و شارستانیەتەکانی وەك شارستانیەتی ئەمریکی‌و یابانی‌و ئەورووپی بیردەکەنەوە، جا لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە بیگرە کە ئابووریی خۆی لەگەڵ کەنەداو مەکسیك یەکخستوە، تا دەگاتە یابان کە پڵنگە ئاسیاییە نوێکان لە دەوری گرتبوونەتەوەو ئەوروپا کە خۆی بۆ سەردەمی یەکخستنی ئابووریی هەمەلایەن ئامادەدەکات‌و یەکێتیی سۆڤییەت کە بەهەموو شێوازێك کار بۆ پاراستنی یەکگرتوویی هەڕەشەلێکراوی خۆی دەکات. جا ئەگەر خودی ئەم دەوڵاتانە کاری مەحاڵ بکەن بۆ هێشتنەوەی کارکردن لە دەوڵەتە بچووکەکان‌و لەچوارچێوەی سنووری نیشتیمانیی تەقلیدیدا، کە بەپێی پەرەپێدانی ژیواریانەی هەمەلایەن کارێکی بێکەڵکە، ئەوا ڕژێمە فەرمانڕەواکان بەهۆی سیاسەتەکانیانەوە لەو دوورتر دەچن‌و لەبەر ترسەکانی ئاسایش‌و بۆ تەسککردنەوەی خودی کاری نیشتیمانیانە میللەتەکان ناچاردەکەن دوورتر لە لۆژیکی بەرژەوەندی‌و پێداویستیە کەسێتی‌و لاوەکی‌و خێزانیەکان بیرنەکەنەوە.

دانانی شارستانیەت نەك دەوڵەت بە یەکەی بنچینەیی، بەشێکە لەو ستراتیژە جیهانیەی ئیمڕۆ لەسەر ئاستی جیهان دەخەملێت. بەو پێیەش ئەو وڵاتانەی سەرکەوتوودەبن لە ڕەتکردنی دابەشکردنی تەقلیدیی ڕابردووی دەوڵەتەکان‌و دەگەنە یەکخستنی بوار یان پانتایی کولتووری‌و ژیواری میللەتەکان کۆدەکاتەوەو لەوانی دیکەیان جیادەکاتەوە، پێگەی باشتر لە دابەشکردنی جیهانیی پەرەسەندودا بەدەستدێنن‌و بەپێی پێوانەکانی کێبڕکێی جیهانی چاکترین دەرفەت بۆ تەکاندان بە پڕۆسەی پەرەپێدانی ژیواری بەرچاو مسۆگەردەکەن.

گەشەپێدانی ئەم ستراتیژە مەزنانە، لە وێناکردنی فیکریی ڕووتەوە سەرچاوەناگرێت‌و بەری ویستی خۆیی نییە. بەدەوڵەتکردنی ئێستای پڕۆسەی ژیواری یاخود ئەوەی هەندێك بەجیهانیبوونی ئابووری‌و پەیوەندییە سیاسی‌و کولتوورییەکان بەگشتی ناویدەبەن، بێگومان دەبێتە هۆی هێنانەئارای دوو ئاقاری دژبەیەك: ئاقاری یەکەم ئەوەیە کە شۆڕشی زانیاری‌و پێکگەیشتن دەبێتە هۆی یەکخستنی بەکردەوەی ئەو پانتاییە هەرە گەورە کولتووریانەی ئامڕازە کۆنەکان دەستەوستان بوون لەئاستیدا. ئەوەی پەیوەندیی بە ئێمەوە هەیە، بێگومان ئەو شۆڕشە دەبێتە هۆی یەکخستنی بیرکردنەوەو هەستوسۆزمان، جا ئەوە لەلایەن خۆمانەوە بێت ئەنجامی بەکاربردنی تەکنیکە نوێکان، یاخود لەلایەن دەوڵەتە پیشەسازییە مەزنەکانەوە بێت کە شۆڕشی پێکگەیشتن بەکاردەبەن بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆیان‌و فراوانکردنی پایەداریی خۆیان لە پانتایی نیشتیمانەکەماندا. لە هەموو بارودۆخێکدا میللەتەکەمان زیاترو زیاتر دەکەوێتە ژێر کاریگەرییە یەکگرتوەکانەوە. لێرەشدا سروشتی ئەو کاریگەرییانە لەسەر دەستپێشکەریی خۆمان ڕادەوەستێت، واتە ناوەڕۆکی ئەو کاریگەریانە دەشێت ببێتە هۆی یەکخستنمان لەسەر بنچینەی پاشکۆیەتی‌و بەکاربردن لە ڕێگەی بەرنامەگەلی هاوردە یان دەرەکیی سەپێنراوو بڵاوکردنەوەی بەهاکانی خۆبەکەمزانین‌و دووبارەکردنەوەی پەککەوتەیی‌و ئاخەڵکێشان‌و هەڵوەشانەوەی

کەسایەتی کولتووریو نەتەوەییەوە یاخود یەکخستنی لەڕوانگەی هەستکردن بە شکۆمەندیی کولتووریو سەروەریو پێویستیی کولتووریو ژیوارییەوە.

ئاقاری دوەم لەوەی یەکەمەوە هەڵدەقوڵێتو لەسەر بنچینەی پێکگەیشتنی دەستەبژێرە فەرمانڕەواو نافەرمانڕەواکان لەگەڵ سیستەمی جیهانی باوو پێڕەوکردنی بەهاکانیو دابڕانی زیاتر لە میللەتەکانیان دادەمەزرێت، بەوپێیەش دەبنە ئامرازی جێبەجێکردنی سیاسەتە دەرەکیو بیانیەکان. لەپێناو ئەوەشدا دەوڵەتە ئەوروپاییەکان کۆششێکی جیاکارە دەکەن بۆ گۆڕینی ئەقڵیەتو ڕۆشنبیریی ئەو دەستەبژێرانەو ناچارکردنیان بەوەی شەرم لە ڕۆشنبیریی خۆیانو بەهاکانی میللەتەکانیان بکەن. لەم ڕەوتەدا ئێستا ستراتیژێکی هۆشمەندانەو نیمچە ڕەسمی گەشەپێدەدرێت بۆ لەناوبردنی دوو توخمو بەهای سەرەکی لە تێکڕای شارستانیەتی ئێمەدا، مەبەست چەمکی یەکگرتنو هاوکارییو پرنسیپی ژیاندنەوەی ڕۆشنبیریی خۆمانو ئینتیمابوونە بۆ ژیواری ئیسلامی. ئەو کۆششە چروپڕەی دامودەزگا ڕەسمیو ناڕەسمیەکان دەیکەن بۆ دەرخستنی ئیسلام وەك یەکەمین سەرچاوەی ئەو خەوشییو کەموکوڕیانەی سیستەمی سیاسیو ئابووریو ئەخلاقی ئێستای ئێمەو دەستبەرداربوونی ئیسلام وەك مەرجی شارستانیبوون یان مامەڵەکردنی ئاشتیانەو دروست لەگەڵ خۆرئاوا، بەشێکە لە ستراتیژی جەنگی ژیواریو ئەو ڕووبەڕووبوونەوە هەمەلایەنەی لەبەرچاومان دەخەملێتو پەرەدەستێنێتو دەرك بەوەدەكات بۆ جڵەوکردنی گروپە گەورەکان یان ڕێگەگرتن لە پێشکەوتنی هەڵوەشاندنەوەی کەسێتیان، هاندانیان بۆ دەستبەرداربوونی بەها ئەخلاقیو سمبولیەکانیان کە بەشێك لە پێکهاتەی قوڵیان لەخۆدەگرێت، کارێکی پێویستە. جا ئەگەر ئێمە ئەو دەرفەتانەی شۆڕشی پێکگەیشتن دەیانڕەخسێنن بەباشی بەکارنەبەین بۆ بنیاتنانی پانتایی سەربەخۆمان، کە ناوەڕۆکی کۆمەڵگەی شارستانیی هاوچەرخە، ئەوا بەرهەمی ئەو یەکخستنە دەکەوێتە دەستی زلهێزەکانو سەرکەوتودەبن لە پاشکۆکردنی پانتایی کولتووریی ئێمەدا. ئەم جارەو وەك سەدەی ڕابردوو، واتە سەردەمی کۆلۆنیالیزم، دابەشکردنەکە جوگرافی نابێت، بەڵکو کۆمەڵایەتیو کەرتخوازدەبێت، چونکە هەر زلهێزێك لایەنگیریی بەشێك لە ڕای گشتی یان یەکێك لە توێژە ناوچەییەکان بەدەستدێنێت. لەم بارەشدا دەگۆڕێت بۆ جەستەیەك کە چەندین سەری ناکۆكو دژ بەیەك دەیبەنەڕێوە.

پوختەی باسەکە، ستراتیژی بنیاتنانی کۆمەڵگەی شارستانی لە نیشتیمانەکەمان ماحاڵە لەسەر بنچینەی بنیاتنانی هەندێك کۆمەڵەی بچووك لێرەو لەوێ بێتەدی، چونکە پێداویستیەکانی ئەم بنیاتنانە ئەوەیان ڕەتکردوە کە ئەو کۆمەڵانە دەتوانن پێشکەشیبکەن، هەروەها بارودۆخە سیاسیەکانو ئەو تەنگوچەڵەمە قووڵەی دەوڵەتی نیشتیمانی تیایدا دەژی، ئامادەکاریی بۆ چەند ستاتیژێکی مەزنی وەها دەسەپێنن کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە سیاسەتەوە هەیە، ئەگەرچی لەم بوارەشدا ناکرێت لەڕێگەی سووربوون لەسەر دەوڵەتو سیاسەتی دەوڵەتەوە سیاسەت بپارێزرێت یاخود سەرکەوتن لە کاری سیاسیدا بەدەستبێتو ئامانجەکانی گۆڕانکاریی چاوەڕوانکراو بێنەدی، بەڵکو پێویستە سیاسەت لەودیوو لەسەروو دەوڵەتەوە ببینرێت، واتە پڕۆسەی یەکخستنو

ڕێکخستنی بوارو پانتایی گشتیی خودی شارستانیەتی خۆمان. لەواقیعدا یەکەمین جارە ژیان لەگەڵ نزیکبوونەوەی زۆری نێوان شارستانیو سیاسیو نەمانی جیاوازیی نێوانیان بەسەردەبەین، بەڵکو ڕەتکردنی هەردووکیان لە چەمکی ستراتیژیەتی هەمەلایەندا کە سەرەنجامی کۆکردنەوەو ڕێکخستنی توخمە شارستانیو سیاسیە جیاوازەکانی گرووپی هەرە گەورەیە بەمەبەستی بەرپاکردنی جەنگێکی ژیوارییانەو سەرکەوتن تیایدا، واتە جەنگی داهێنانو پەرەپێدانو سەرکەوتنی زانستیو تەکنیکی. لەڕوانگەی ئەو گەشەکردنەی ئیمڕۆوە دەوڵەتە بچووکەکان بەکردەوە بوونەتە یەکێك لە توخمەکانی کۆمەڵگەی شارستانیی جیهانیو ئاژانسێك یان بەڕێوەبەرایەتیەکی ناوچەیی بۆ ڕێکخستنی کاری کۆمپانیاو هێزە ئابوورییە بیانیەکان. لێرەشدا تا چ ڕادەیەك دەوڵەت کۆنترۆڵکردنی بەکردەوەی پرۆسەی ئابووریو کولتووری لەدەستبدات، بەو ڕادەیەش سەروەریی خۆی لەدەستدەداتو دەگۆڕێت بۆ بارەگای دەسەڵاتێکی لاوەکیی کۆمەڵایەتی کە مەرجەکانی بڕیاردانی تێدانابێت. بێگومان سەختە ئەو دەوڵەتەی دەبێتە پارچە سپێری سیستەمی نێودەوڵەتیی ئابووریی سەرمایەداری، ببێتە سەرچاوەی بەهاکانی سەروەریو یاسا کە بنیاتنانی نەتەوەیەك پێویستی پێیانەو بێ ئەوان ئازادی لەگۆڕێ نابێت.

ئەگەر ڕاست بێت بڵێین ئیمڕۆ هیچ کۆمەڵگەیەکی شارستانی بەبێ سیستەمێکی سیاسی وەها لەئارادانابێت کە توانای پاراستنی ئەو کۆمەڵگەیەی هەبێت لە وێرانکردنو لەخۆگرتنی دەرەکیی جیدیو بەکردەوە، ئەوا ڕاستتر ئەوەیە بڵێین ئیمڕۆ هیچ سیاسەتێك لە چوارچێوەی کێبڕکێی ئێستادا بەبێ ڕەتکردنی دەوڵەتو بیرکردنەوەی جیدی لەو فراکسیۆنە جیۆسیاسیانە، واتە پێکهاتنی چوارچێوەی بەکۆمەڵی فرە دەوڵەتو هەرێم مەیسەرنابێت. کەواتە ژیاندنەوەی کاری سیاسی نیشتیمانپەوەرانە پێویستی بە چڕکردنەوەی ئەو وەبەرهێنانانە هەیە لە کاری فیکریو ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندندا هەیە کە مەبەستیانە یەکگرتنێك لە بواری فیکرو بەرپەرچدانەوەی پێداویستیە بەرخۆرییە کولتووریو زانستیو هونەریو داهێنەرییەکان لەسەر ئاستی سەرتاپای شارستانیەتی عەرەب بێنێتەئاراوە. ئەمەش ئیمڕۆ گرنگترین کاری سیاسییەو پەرەپێدانی کاری ڕۆشنبیریو زانستیش پێویستی بە خوڵقاندنی ئەو کەرەستە سیاسیو کۆمەڵایەتیو شارستانیانە هەیە کە دەتوانن بەشداربن لە پێشکەشکردنی چوارچێوەیەکی کارا بۆ چالاکیی سەرو دەوڵەتی- ناوچەیی، ئەوەی هەتا دەوڵەت پەککەوتەتربێت لەئاست تێگەیشتنی داواکاریی پەرەسەندوی لەمەڕ هاوکاریو وەبەرهێنانە ژیوارییە مەزنەکانو بەرپەرچدانەوەی پۆزەتیڤانەیان، پێویستیی زیاتردەبێت. بنیاتنانی کۆمەڵگەی شارستانی لەنیشتیمانی ئێمەو لە هەر دەوڵەتێکدا ئیمڕۆ پێویستی بە بنیاتنانی سیاسەتێك هەیە کە لەسەروو سیاسەتی هەر دەوڵەتێکەوە بێتو بتوانێت هاوکات پێکەوەیان کۆبکاتەوەو ڕەتیانبکاتەوە. واتە بنیاتنانی خودی کۆمەڵی ئێمە وەك پەیوەندییەك کە تاکە هەمەجۆرەکان پێکەوە دەبەستێتو لەگەڵ دەرەوەو جیهان گرێیاندەداتەوە، دەربڕی تاقە خواستو خەونو بەرژەوەندییەك بێت. هەروەها مانای ئەوەیە ستراتیژەکانی توێژینەوەو کارپێکردنی خۆمان نوێبکەینەوەو بەکارهێنانی دەوڵەت وەك ئامڕازێك

لە پێکهاتەی گرووپی مەزنو پەرەپێدانی هۆشمەندیی خۆماندا ڕێکبخەین. کەواتە مەبەست ڕەتکردنەوەی کەس نییە، نە لەسەر ئاستی دەوڵەتەکانو نە لەسەر ئاستی فرەلایەنیی لە کۆمەڵگەکاندا، بەڵکو دۆزینەوەی بناغەیەکە بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە کاربکەنو بۆ ئامانجێک تێبکۆشن نەک تاقەتاقەیان دژی ئەوی دیکە کاربکاتو تواناو وزەکانی خۆی بۆ جەغتکردنەوە لەسەر بەشەکان لەسەر حسابی بوونو ڕاستیی گشتیان لەسەر ئاستی جیهان بەکاربەرێت. کێشەی بنچینەیی سیاسی یاخود شارستانی نییە بەتەنیا، بەڵکو جیۆ-سیاسیە، واتە بنیاتنانی ستراتیژی شارستانیانەی عەرەب وەک کۆئەنجامو کارلێککردنی میللەتو نەتەوەو دەوڵەتەکان لە بەرەنگاربوونەوەی ژیواریانەدا.

## سەرچاوە

المجتمع المدني في الوطن العربيو دوره في تحقيق الديموقراطية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، 1992ص733-755.

# گـرۆســیـۆس

(1645-1583)

د. موسا ئیبراهیم

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد



نەتەوە یەکگرتووەکان

**بەرایی:**

"گرۆسیۆس" ژیانی پڕی بووە لە کۆچ و سەفەر و گەلێك پۆستی گشتی گرنگی وەرگرتووە.. کەسێك بووە هەر لە منداڵیەوە جێگا سەرنجی چواردەوری بووە. لە تەمەنی چواردەساڵیدا بۆتە یەکێك لە ئەندامانی باڵیۆزخانەی هۆڵەندا لە فەرەنسا و لە تەمەنی شانزە ساڵیدا بڕوانامەی دکتۆرای لە یاسادا پێدراوە.. لەناوخۆ و دەرەوەی وڵاتدا نێوبانگی زۆری پەیداکردووە، لەبەر لێهاتوویی لە بوارەکانی هونەر و ئەدەب و زانست و شیعر و سیاسەتدا، "هنری چوارەم" نازناوی (بلیمەتی هۆڵەندا)ی لێنا.

لەتەمەنی بیست و چوار ساڵیدا کرایە پارێزەری گشتی خەزێنەی هۆڵەندا و وڵاتانی سەر کەناری دەریا. بەو پێیەی پارێزەری کۆمپانیای هندی خۆرهەڵاتی هۆڵەندی بوو، راسپێردرا بەوەی دادوەری کێشەیەکی دەریایی بکات، ئەمە وایلێکرد سەرنج لە بنەما گشتیەکانی یاساکانی جەنگ بدات.

بەهۆی هەڵوێستە سیاسیەکانیەوە، "گرۆسیۆس" دوچاری گرتن و ڕاوەدونان بۆتەوە، پاشان لە ساڵی 1621 دورخراوەتەوە بۆ فەرەنسا و لەو کاتەشەوە خۆی بۆ نوسین تەرخاندەکات. ساڵی 1625 لە پاریس کتێبێکی بەناوبانگ بە ناوی (دەربارەی یاسای جەنگ و ئاشتی) بە زمانی لاتینی بلأودەکاتەوە و پێشکەشی "لویسی سیازدەهەمی" دەکات، لەبەرئەوەی موچەیەکی زۆری بۆ بڕی بووەوە.

ئەم کتێبە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو بە یەکێك لە گرنگترین ئەو نوسینانە درایە قەڵەم، کە دەربارەی یاسای نێو دەوڵەتی نوسراون و چارەسەری پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکانی کردووە لەو قۆناغەدا، ئەو پەیوەندیانەی لەسەردەم و ڕۆژگاری ئەودا لە قەیرانێکی قوڵ و دژواردا بوو. بەهۆی شارەزایی زۆری لە بواری یاسا نێو دەوڵەتیەکاندا، سوید کردیە باڵیۆێزی خۆی لە وڵاتی فەرەنسا و تا مردنیشی لەو پۆستەدا مایەوە.

## بەگشتی:

ئەو دەمەی "گرۆسیۆس" بە گواستنەوە لەم پۆستی ئیداریەوە بۆ ئەو پۆست خەریك بوو یان سەرقاڵی هەڵهاتن بوو لە زیندان، جەنگی سی ساڵە لەوپەڕیدا بوو. هاوکات پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان زۆر نا هەموار بوو، واتە پێویستی بەسەر لە نوێ ڕێکخستنەوە هەبوو، بەتایبەت پاش هاتنە ئارای دەوڵەتی نەتەوە لە ئەوروپا و نەمانی هەیبەت و دەسەڵاتی کڵێسا.

بارودۆخی ئەوروپا ڕووەو نا ئارامی دەچوو، جەنگیش (ئیتر جەنگی ئەهلی بێت یان گشتی) تاوی سەندبوو. پادشاکان کە خاوەن دەسەڵاتێکی ڕەهابوون، لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا لە ژێر کاریگەری بۆچونەکانی "ماکیاڤیللی"دا بوون، ئەمەش وایکرد کە بۆ یەکلایکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تەنها پەنابەرنە بەر هێز.

هاوکات لەو قۆناغەدا خواستی پاوانخوازی و کۆلۆنیالی لای وڵاتانی ئەوروپی دروست بوو، چونکە زۆربەی ئەو وڵاتانەی لە دەریاوە نزیك بوون ئارەزووی هەرچی زوتری گەشەی ئابووری و بازرگانیانبوو، لەگەڵ دەستگرتن بەسەر ئەو زەوی وزارانەی تازە دۆزرابوونەوە، ئیترئەمە لە کیشوەری ئەمریکادا بێت یان لە ئاسیاو ئەفریقادا.

هەموو ئەم هەلومەرجە ناهەموارە، "گرۆسیۆس" یان ناچار کرد بڵێت: (مرۆڤایەتی بۆ ئەوەی بە ئاشتی بژی و لە خۆشگوزەرانی بەهرەمەند بێت، پێویستی بە بوونی یاساگەلێکە کە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان بە شێوەیەکی هەمەلایەن ڕێکبخات و ئاڕاستەی بکات. هاوکات پێویستە پەنانەبرێتە بەر جەنگ، وەکو ئامرازێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان دەوڵەتان). "گرۆسیۆس" بەیەکێك لەو بیریارە مادیيانە ئەژماردەکرێت، کە هەموو شتێك دەگێڕنەوە بۆ مادە و جوڵەی بەردەوامی مادە.

## یاسای سروشتی (یاسای نێو دەوڵەتی):

لە ئاکامی ئەو واقیعە تاڵەی ئەوروپا دەیگوزەراند، بەهۆی جەنگە بەردەوامەکانەوە و بەکارهێنانی توندوتیژی وەك تاکە ڕێگاچارەی یەکلایکردنەوەی کێشەکان لەو سەردەمەدا، "گرۆسیۆس" پێی وابوو خۆشگوزەرانی مرۆڤ پێویستی بە چارەسەرێکی هەمەلایەن و داڕشتنی یاساگەلێکی تۆکمە هەیە کە پەیوەندی نێوان وڵاتان ڕێکبخات، ئەمە وایلێکرد بیر لە یاسایەکی سەرەکی (یاخود یاسایەکی سروشتی) بکاتەوە، یاسایەك کە لە دەرەوەی یاسای مەدەنی هەر میللەتێك بێت و تەواوی میللەتان و کۆی هاوڵاتیان و فەرمانڕەوایان وەکو یەك پابەندبن پێیەوە[1].

"گرۆسیۆس" لەوێوە دەستی پێکرد کە مرۆڤ بە سروشتی خۆی بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، لەبەرئەوە بە شێوەیەکی خۆڕسك لەگەڵ کەسانی تردا ناچارن کار بۆ هێنانە ئارای کۆمەڵگایەکی دیسپلینکراو بکەن. پارێزگاری کردن لە کۆمەڵگە، گەورەترین دەسکەوتەکە بە هیچ دەسکەوت و قازانجێکی فەردی بەراورد ناکرێت. پاراستنی سستمی کۆمەڵایەتی لە دۆخی ئاشتی هەمیشەیدا، خێرو چاکەی راستەقینەیە و ئەو مەرجانەشی بۆ پاراستنی دۆخێکی وا پێویستە دەبێت هەموان جێبەجێی بکەن، وەك پاراستنی موڵکیەت و مامەڵەکردنی دادپەروەرانە کە لەسەر متمانەکردن بەیەکتر دامەزرابێت، مەرجگەلێکی واش بۆ پاراستنی کۆمەڵگە پێویستە[2].

بە بۆچونی "گرۆسیۆس" یاسای سروشتی ئەوەیە کە ئەقڵی تەندروست پێمانی دەڵێت و لەگەڵ پرانسیپەکانی ئەخلاقیشدا یەکدێتەوە. ئەو ئەقڵەیە وامان لێدەکات بزانین (کارێك ئەخلاقی و بێگەردە یان نا، ئەویش بەپێی گونجان و نەگونجانی لەگەڵ ئەقڵ و سیستمی کۆمەڵایەتیدا)[3].

کەواتە دوو خەسڵەتێك کە هاوشانی وتەزای سروشت بن، بریتین لە هەردوو وتەزای: (مەعقول و کۆمەڵایەتی). هاوکات یاسای سروشتی ئەو یاسایەیە کە خوای دروستکەری سروشت دایناوەو ئیرادەی ئەویش ناتوانێت بیگۆڕێت، لەبەرئەوەی خواخۆی ناتوانێت وا بکات کە دوو + دوو نەکاتە چوار.

ئەو هێزەی خراپە دەگۆڕێت و دەیکاتە چاکە، مەوقعیەتی لە هێزەوە دەگۆڕێت بە سستی و لاوازی. "گرۆسیۆس" پێچواندنێك دەکات لە نێوان (مەعریفەی ئەخلاقی) و (مەعریفەی ماتماتیکی) داو پێیوایە هەریەك لەم دوو مەعریفەیە، یەقینین و مرۆڤی ئاقڵ دەتوانێت بەشێویەکی سەربەخۆ و لە دەرەوەی دەسەلاّتی ئاییني درکیان پێبکات.

بەمجۆرە "گرۆسیۆس" میتۆدێکی نوێی دارشت کە خۆی لە تیۆلۆژیا قوتار کردبوو، خواستی لەو میتۆدە نوێیەش ئەوەبوو کە بواری پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بخاتە ژێر ڕکێفی ڕونی و بەڵگەنەویستی ماتماتیکی. ئەو دەیویست لە ڕێگای میتۆدێکی زانستی – ئەقلانیەوە، سەرکەوتنی پلانە گەورەکەی مسۆگەر بکات کە بریتی بوو لە (بانگەشەکردن بۆ هاریکاری نێو دەوڵەتی و هەروەها بۆ ئەوەی کۆی قەوارە سیاسیەکان، تەنانەت قەوارە سیاسیە بالاّ دەستەکانیش، بچنە ناو چوارچێوەی قەوارەیەکی سیاسی مرۆڤایەتی هاوبەشەوە)[4].

"گرۆسیۆس" پێی وایە یاسای سروشتی سەرچاوەی تایبەتی خۆی هەیە و لە سروشتی مرۆڤ خۆیەوە سەرچاوە دەگرێت و وەکو سروشت جێگیرەو ناگۆڕێت، هەروەها یاسایەکی یونیڤێرسالیەو بەسەر تەواوی میللەتانی دنیادا جێبەجێ دەبێت و بۆ هەموو سەردەم و زەمانێك دەگونجێت.

هەرچی پەیوەندی بە چوارچێوەی یاسای سروشتیشەوە هەیە، ئەوا بەبۆچونی ئەو ناوەکەی خۆی دیاری دەکات و هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هەیە و هەموو ئەو شتانەش کە ژیانێکی بەختەوەر و ئارام بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکەن.

ئەم یاسا تایبەتەش ناچارمان دەکات من ڕێزی موڵك و مالاّتی تۆ بگرم و تۆش بە هەمان شێوە، هاوکات ناچارمان دەکات ڕێزی بەڵێن و پەیمانەکان بگرین، هەروەها قەرەبووکردنەوەی ئەو زەرەرو زیانانەی کەسێك لە کەسێکی تری دەدات، لەگەڵ

سەپاندنی سزا بەسەر هەر کەسێکدا کە سەرپێچی ئەو یاسایە بکات.

### سەروەری:

ئەگەرچی "گرۆسیۆس" یەکەمین کەسە بنەماکانی یاسای نێو دەوڵەتی دارشتووە و بایەخێکی تایبەتی پێداوە، بەڵام لە بواری فیکری سیاسیدا شتێکی ئەوتۆی پێشکەش نەکردووە. بۆ نموونە کاتێك باسی لە یاسای سروشتی کردووە، کەمەکێك نەبێت گرنگیەکی ئەوتۆی بە بابەتی دەوڵەت و سەروەری نەداوە و وەکو "ئاڵتۆسیۆس" بۆچونەکانی ڕون و ئاشکرانین.

پاش ئەوەی "گرۆسیۆس" سەروەری وا پێناسە کرد کە دەسەڵاتێکە ناچێتە ژێر چاودێری یاساییەوە لەلایەن کەسێکی ترەوە، دەستی کرد بە جیاوازی کردن لە نێوان خاوەنی گشتی و خاوەنی تایبەتی دەسەڵاتدا، بەبۆچونی ئەو خاوەنی گشتی دەسەڵات هەمیشە دەوڵەتە، لە کاتێکدا خاوەنی تایبەتی ڕەنگە کەسێك یان چەند کەسێك بێت، ئەویش هەر دەوڵەتە و بەپێی دەستوری خۆی.

ڕەنگە سەروەری بۆ قەوارەیەکی سیاسی بێت واتە بۆ دەوڵەت بێت، وەك لای "ئاڵتۆسیۆس" هەیە.

یان ڕەنگە بۆ حکومەت بێت، لێرەدا مەسەلەکە ڕوون نییە، چونکە ڕەنگە ئەوەی خاوەنی ئەسڵی سەروەریە بەهۆی گرێبەندێکەوە دەستبەرداری بێت و بەو پێیەش ئەو دەسەڵاتە بداتە دەست میرێك یاخود گروپێك تا مومارەسەی بکەن. لەو کاتەدا میر دەبێتە خاوەنی ماف گەلێکی تایبەت و بەمەش دەتوانێت ئەو مافانە بەرامبەر بە میللەت بەکاربهێنێت، ئەمە "*J. Barbeyrac*" ی وەرگێری کتێبی (دەربارەی یاسای جەنگ و ئاشتی) بۆ سەر زمانی فەرەنسی لە ساڵی 1724دا ناچار دەکات بڵێت: (نوسەری ئەم کتێبە – واتە گرۆسیۆس – مافێکی زۆری بە دەسەڵاتی پادشاکان داوە).

"گرۆسیۆس" ئەوەشی بیرنەچووە کە لە یەکێك لە نەسکە درێژەکانی کتێبەکەیدا مەسەلەی جەنگی هاوڵاتیان دژ بە پادشا چارەسەر بکات، لەو نەسکەدا ئەو حاڵەتانە ئەژمار دەکات کە تیایدا بەگژاچونەوەی پادشا بەڕەوا دەزانێت. بەبێ درێژە پێدان و چونە ناو وردەکارییەوە، دەتوانین پرانسیپی گشتی ئەم بەرخورد و بەگژاچونەوەیە لەمەدا کورت بکەینەوە: (پادشا ئەو مافەی هەیە کە هاوڵاتیان گوێڕایەڵی بکەن، لەبەرئەوەی ئەو نوێنەرایەتی دەسەڵاتی دەوڵەت دەکات، بەڵام هەرکاتێك دەسەڵاتی پادشا سنوری خۆی بەزاند، ماڤ هاوڵاتیانە بەگژیدا بچنەو لێی ڕاپەڕن)(5).

کەواتە بەخشینی دەسەڵاتی زۆر بە پادشاکان لەلایەن "گرۆسیۆس"ەوە، مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو خوازیاری دەسەڵاتێکی ستەمکار بووە یاخود لایەنگری دەسەڵاتێکی دیسپۆتیزمی بووە.

### دەوڵەت یان کۆمەڵگەی گرێبەندی:

"گرۆسیۆس" پێی وابوو دەوڵەت فیدراسۆنێکی تەواوی نێوان کەسە ئازاد و سەربەخۆکانە بەمەبەستی بەهرەمەندبوون لە دەسەڵاتی یاسا و کارکردن بۆ دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی. هەروەها پێیوایە کە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی خۆڕسك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە و ئەم غەریزە خۆڕسکەش بە مەبەستی بەرژەوەندی هاوبەش هانی دەدات، لەگەڵ کەسانی تردا هاوکاری بکات. کەواتە دەوڵەت بەهۆی گرێبەستێکەوە دروست دەبێت کە ئامانجی بەرژەوەندی گشتی هاوڵاتیانە.

پابەندبوون بە برگە و بنەماکانی ئەو گرێبەستەوە، بە کۆڵەکەی سەرەکی دروستبوونی کۆمەڵگەی سیاسی یاخود دەوڵەت دادەنرێت. یاسای سروشتی لای خۆیەوە کەسەکان ناچار

دەكات پابەندبن بەو گرێبەستەوە، ئەویش لە پێناو پاراستنی و مانەوەی كۆمەڵگەی سیاسیدا. "گرۆسیۆس" پێیوایە وەك چۆن پابەندبوون بە گرێ بەستەوە لە هەموو یاسایەكی تایبەتیدا شتێكی پێویستە، ئەوا لە هەموو یاسایەكی گشتیشدا مەرجە پەیڕەو بكرێت.

لێرەوە تێدەگەین "گرۆسیۆس" ڕۆڵێكی بەرچاوی لەوەدا هەبووە كە بنەمای كۆمەڵگەی سیاسی یاخود مەدەنی بگێڕێتەوە بۆ ئەو ئایدیا گرێبەستیەی بنەماكەی تاكە كەسە. بە كورتیەكەی دەتوانین بڵێین ئەو كە بایەخی بە یاسای نێو دەوڵەتی و پەیوەندیە جیهانیەكان دەدا، خۆی لەوە بەدوور گرت بەشێوەیەكی قوڵ و دورو درێژ باس لە دەوڵەت و دەسەلآت بكات و پێیوابوو ئەو دوو بوارە دەچنە چوارچێوەی تیۆریا سیاسیەكانەوە. لە بەرامبەردا گرنگی ئەو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەربارەی یاسای سەرەكی نوسیویەتی، یاسایەك كە پەیوەندی نێوان دەوڵەتە خاوەن سەروەریەكان ڕێكدەخات، یاخود یاسایەكی سروشتی كە لە دەرەوەی یاسای مەدەنی هەر میللەتێكە و پێویستە تەواوی میللەتان و هاولآتیان و فەرمانڕەوایانیش وەكویەك پەیڕەوی بكەن، بەلآم دەربارەی مافی نێودەوڵەتی بۆچونەكانی كەموكوڕیان پێوە دیارە.

## پەراوێزەكان

*1-Marcel prelot et Georges Lescuyer: Histoire des Idees politique, ed. Dalloz. 1975. pp. 323-324.*

2-عمر عبدالحي: محاضرات في تأريخ الفكر السياسي في العصور الحديثة – مطبوعات كلية الحقوق، الجامعة اللبنانية 1976، ص 49.

3-جان جاك شوفالييه: تأريخ الفكر السياسي من المدنية الدولة الى الدولة القومية – ص 314.

4-جان جاك شوفالييه: المرجع السابق – ص 315.

5-المرجع السابق: ص 318.

## سەرچاوە

د. موسي ابراهيم: معالم الفكر السياسي الحديث و المعاصر – بيروت، الطبعة الاولى، 1994.

# داخوا قانوون پێویستە؟

لە عەرەبییەوە: ئاسۆ کەریم



ڕەنگە لە دەسپێکی ئەم باسەماندا، هێنانەگۆڕێی ئەم پرسیارە لەمەڕ کۆنسێپتی قانوون، کە داخوا بەڕاست قانوون پێویستە، یان نا سەرسوڕهێن بێت.

وەلێ، ڕاستییەکەی، ئەم پرسیارە گرنگییەکی مەزنی هەس. ناکرێ و نابێ ئێمە بە پرسێکی بەڵگەنەویستی دانێین، لێ نیگەرانی لە شك و گومانەوە، سەرچاوە دەگرێ. سەرسوڕمانیش تەنێ لەوەدا نییە کە داخوا دەکرێ دەسبەرداری قانوون ببینین؟ یان داخوا قانوون بۆ هێنانەئارای کۆمەڵێکی دادپەروەر، پێویستە یان نا؟ بەڵکە لەوانەشە قانوون خۆی لە خۆیدا بەد و نا پەسندو کۆسپێکی خەتەر بێت لەبەردەم وەدیهاتنی سروشتی کۆمەڵایەتیی مرۆڤدا. هەرچەند ئەم تێڕوانینە لە کن ئەوانەی لە کۆمەڵێکی دیموکراتی لەبارو تەکووزدا، دەژین سەرسوڕهێن بێتە بەرچاو – کەموکەسری ئەو کۆمەڵەو خەوشەکانی هەر چەندێك بن– لەگەڵ ئەوەشدا بێ مفا نییە کە لەوە بەئاگابین، بەرکاریی قانوون لە کۆمەڵگەیەکی کەم تەکووزتردا، کە لەوانەیە ڕواڵەت و بیچمێکی

لەبەردڵان نا شرینی هەبێ. هەروابێتەوە، هەست بەوە کردن کە قانوون هەر لەخۆوە پێویستە، یان دەبێ بۆ مرۆی کۆمەڵێکی تەکووزدا، پێویست بێت، لەلایان زۆرانەوە لە زنجیرەی دوورودرێژی فەیلەسووفە پێشەنگەکانی رۆژئاواوە، لە ( ئەفلاتوون Plato 427– 347ی پ. ز) ەوە بگرە تا (مارکس Karl Marx 1818 –1883) بەم یان بەو شێوەیە، قانوون رەتکراوەتەوە. هەروا دژایەتیکردنی قانوون لە چەند سیستەمێکی زلی ئاینی لە رۆژهەلات و رۆژئاوادا دەورێکی بەرچاوی گێڕاوەو توخمێکی یەکلاکەرەوە بووە لە ئایدیۆلۆجیای "کلێسای مەسیحی"لە قۆناخی گورانــدا. بێ لە مارکسیزم، تا ئێستەش، لایەنگرانێکی دڵگەرمی دۆکترینی ئانارشیزم وەکو چارەسەرێکی ئاریشە جڤاکی و کەسایەتییەکانی مرۆڤ لە مەیداندا هەن. لە هەموو سەردەماندا – بە سەردەمی ئێمەشەوە – تاک تاک و دەستەو کۆمەڵەش هەن بەگشتی ڕکیان لە هەموو دەسەلاتێك دەبێتەوە و بەرسڤ و باوەگۆی ئەم هەستی ڕك لێبوونەوەیە دەدەنەوە لە ڕێگەی خۆ– بەتاڵکردنەوەوە بە کاروکردەو خۆنیشاندانی دژبە هێزەکانی نیزام و قانوون. بێگومان، ئەم خەڵکانە لە دڵسۆزییان، وەدووی کۆنسێپتێکی لێل و نا ڕوون کەوتوون و پێیانوایە ئەو هێزی خۆنیشاندانە بە ڕێگەیەکی پەنامەکی، ژیانێکی خاستر بۆ توخمی ئادەمیزاد دێننە ئاراوە، وەلێ ئەم وەجۆش وخرۆش کەوتنە، بە گشتی کاریگەرییەکی گەلێ کەمی بەسەر رەوتی سەرەکیی بیرو هۆشی مرۆڤایەتی هەبووە. لەسەرینی ئەمەوە، دەبێ لەو دیو رواڵەتە دەرەکییەکانی پرتەو بۆڵەی کۆمەڵایەتی ورد ببینەوەو هەوڵ بدەین لە بنەمای ئایدیۆلۆجیی بێزاربوون لە ئایدیای قانوون خۆی، بگەین تا بزانین ژ بەر چی ئەو هەموو ژمارە زۆرەی خەڵك کە سەر بە شارستانەتیی جیا–جیان.. لە باری کولتووری و لێکدابڕاویی جوگرافییەوە، بە درێژایی قۆناخگەلی دیرۆکی مرۆڤایەتی، سەرلەبەر قانوون رەت بکەنەوە و لە باشترین گریمانەدا بە شەڕو بەلایەکی لە چارنەهاتووی دانێن کە تەنیا لە گەڵ کۆمەڵگەیەکی نوقستان لە هەموو ڕووێکەوە نەبێ، هەڵناکات.

لە جێگەیەکی دی ئەم کتێبەدا، گرنگی بە رۆلی قانوون وەکو دیاریدەیەکی جڤاکی، هەروابێتەوە بە ئەرکی قانوونیش دراوە، بەو پێیەی بەشێکە لە ئێسك و گۆشتی دیسپلینی کۆمەڵایەتی و پێوەندیی بە چەمك، یان هزرکردنی کۆمەڵێکی دادپەروەرانەوە هەیە. وەلێ ئێمە لێرانە، لە پێشدا وتوویژ لەسەر ئەم پرسانە ناکەین، بەڵکە جەخت لەسەر ئەو سەمتە فیکرییانە دەکەینەوە کە سۆنگەی رەتکردنەوەی رەهای پێویستبوونی قانوونن لە رەخێك، یان ئەو کۆنسێپتەی کە قانوون بە دەردو بەلایەك دادەنێ، کە ناکرێ بەری لێبگیرێ، مەگەر وەکو بیانوێکی کاتی، مادام مرۆ حەز دەکا، یان ناشێ کۆمەڵگەیەکی دادپەروەرانە دابمەزرێنێ لە لایەکی ترەوە.

## سروشتی مرۆڤ

هەرکە دبێژین ئەم کۆنسێپتە، یان چەمکە رواڵەتێکی ئایدیۆلۆجی هەس، مەبەستمان ئەوەیە ئەم چەمکە بەشێك لە پێوەندیی ئێمە بە دنیا و بە کۆمەڵگە بە هەموو رواڵەتە جیا –جیاکانیانەوە، پێکدێنێ. بێ دوودڵی، کۆنسێپتی قانوون، لەم شەقڵە ئایدیۆلۆجییە پشکی خۆی هەیە. لەبەرئەوە دیدی ئێمە بۆ کۆنسێپتی قانوون بێ سێ و دوو، رەنگ و ڕووی چەمکی گشتیی ئێمە لە مەڕ شوێنی مرۆڤ لە دنیا، لەمەڕ سروشتی مرۆڤ، یان ستاتۆی مرۆڤایەتی هەروەکو هەندێ لە نووسەرە هاوچەرخەکان، پێیان خۆشە وا ناوی بهێنن، وەردەگرێ. هەروا بەو ئارمانج و مەبەستانەی کە دەبێ مرۆڤ بەدیانبهێنێ، یان داوای بەدیهێنانیان

بکا. هەر کە پێ لەسەر ئەوە دادەگرین داخوا قانوون بۆ مرۆڤ پێویستە یان نا؟ تەنیا هەوڵ نادەین فاکتێکی سادەی فیزیکی، لەگوین مرۆڤ ناتوانێ بەبێ نان و ئاو هەڵبکاو بژی، باسبکەین، بەڵکە ئێمە لە بەرانبەر پرۆسەیەکی نرخ بۆ دانان داین. ئەوەی بەڕاست گەرەکمانە بێژین داخوا سروشتی مرۆڤ لەباریدا هەیە وا بکا بەبارێکی راستەقانیی مرۆڤانە لە مەڕ کۆنسێپتی بوون، یان نەبوونی قانوون، بگات. ئەمەش گریمانەیەکی پەنامەکی دەگرتە خۆ سەبارەت بە ئامانج و مەبەستی مرۆڤ، داخوا چ شتێك خێری بۆ ئەو هەیە، چیش شەڕو دەردو بەڵا، چیش پێویستە تا بەو ئامانجانە، بگات..

بێگومان مژولبوونی چڕوپڕو هەمیشەیی مرۆڤ بەو پرسانە، بیرمەندانی هەموو سەردەم و کۆمەڵگەیەکی، سەبارەت بە سیفەتی مۆرالی، یان شیمانەیی سروشتی مرۆڤ، خستووەتە ناو پیلەکەیەکی بێکۆتاییەوە. لە رۆژی ئەمڕۆماندا، هەندێك پێیانوایە ئەم پیلەکەیە نەك هەر نابڕێتەوە، بەڵکە بێ ماناشە. بەهەر حاڵ ئاکامی کارەکە هەرچۆن بکەوێتەوە، هەڵویستی وەرگیراو لەم پرسە، پێشەکییەکی مەنتیقییە بۆ ئەو دەرەنجامە کە داخوا قانوون بۆ مرۆڤ پێویستە یان نا؟ هەروا ئەم پێویستبوونەش تا کوێ بڕ دەکا؟. هەر ئەمەش وایکردووە وتووێژ لەمەڕ ئەو پرسە، شیانی نکوڵیلێکردن نەبێ. بەگوێرەی ئەوانەشەوە کە پێیانوایە مرۆڤ بەرجەستەبوونی دەردوبەڵایە، یان لە باشترین باردا تێکەڵەیەکە لە "پاڵنەر"ی خێر و شەڕ، ئەو دووانەش لە ململانەیەکی بەردەوامدان کە تیایدا سەرکەوتنی شەڕ بەسەر خێردا چەند پات دەبێتەوە. ئەوەی خویایە، پێویستە جڵەوی هێزە خەتەرە رەگداکووتاو و چێندراوەکانی تاریکی لەناو سروشتی مرۆڤدا، بێ ئەملاو ئەولا رابگیرێ، تا نیزامی جڤاکی دانەتەپێ، چونکە بێ ئەو نیزامە،

ژیانی مرۆڤ لە ژیانی ئاژەڵان پێشکەوتوتر نابێت. لەم تێڕوانینەوە، ناکرێ دەسبەرداری قانوونێکی جڵەگر، بۆ کۆنترۆلکردنی هێزەکانی شەڕ ببین، چونکە بشێوی و نەبوونی قانوون، هەڵەیەکی هەرە گەورەیە و دەبێ خۆ لەو هەڵەیە ببواردرێ. لە لایەکی دییەوە، ئەوانەی پێیانوایە مرۆڤ هەر بەسروشت، خێرخوازە، دەیانەوێ بن وبۆتکەی خولیاکانی شەڕ لە ناو مرۆڤدا بۆ کاودانی دەرەکی و دەوروبەر بگێڕنەوە. لەسەرینی ئەمەوە ئەوانە وەدوای بوونی خەوشێکی جەوهەری لە دەوروبەری کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دەگەڕێن بەو پێیەی سەرچاوەی ئەو دەردو بەڵایەیە کە مرۆڤ پێیانەوە کەسەردار بووە. هەڵبەت رەنگوڕووێکی هەرە دیاری ئەم دەوروبەرە خۆی لە حکوومەتی دەسەڵاتە حوکمڕانەکان و سیستەمی قانونیدا دەبینێتەوە کە لەسایەیدا دەسەڵاتی سیاسی خۆی پراکتیزە دەکا. هەرگیز جێی سەرسوڕمان نییە، کە رەخنە دەورو خولی ئەم رەنگ و ڕووانە بدا بەو پێیەی سەرچاوەی خەفەت ومەینەتیی مرۆڤایەتین.

لە سەردەمی چاکسازیی کۆمەڵایەتیدا، وەکو ئەم سەد ساڵەی دوایی رۆژئاوا، وێدەچێ رەخنەیەکی لەمجۆرە وای بە باش زانیبێ، تیری خۆی ئاراستەی چاکسازیی قانوونی لە ئارادابوو بکا لە جیاتی ئەوەی داوای هەڵوەشاندنەوەی قانوون بکا.. وەلێ دەبێ لەوەش بەئاگا بین کە دەردو بەلاکانی قانوون، لە کن رووناکبیران، لە باری فەلسەفی و ئاینیەوە، چ چارەو دەراوێکیان بۆ نییە، جێگرتنەوەی هەر سیستمێك بە سیستەمێکی دی کە لەسەر داپڵۆسینی شەرعیی دامەزرابێت، هەمان دەردو بەلاو تۆقاندنی لێدەکەوێتەوە. ئیدی لەسۆنگەی ئەمەوە، تاکە دەستئاوێژ بە بیروبۆچوونی ئەوان، لەڕیشەدەرێنانی جڵەوگریی قانوونیانەیە لە بن و بۆتکەوە.

## قانوون و هێزەکانی شەڕ

لە دوو چاوگەی جوداوە، ئەوانەی پێیانوایە قانوون دەستئاوێژێکە بۆ بەیەکەوەهەڵکردنی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی خەفەکردنی هەست و سۆزی شەڕانیی مرۆڤەوە، بنەوان هەڵدەگرن. لەسەرێکەوە هەندیك بیرمەند لەو گریمانەوە هەڵدەدەنێ کە گوایا مرۆڤ هەر بەسروشت، شەڕانی و بەدخوەو ناکرێ هیچ پێشکەوتنێکی جڤاکی بەبێ بوونی کۆدێکی سزای دەمکوتکار، بێتەدی.

لە ئالەکا دی، دەستەکەی تر لەو گریمانەیەوە دێنە گۆ کە گوایا مرۆڤ بەسروشت، خێرخوازە، وەلێ بەهۆی گوناه، یان گەندەڵی و بەدخویی، یان بەهۆی هەندێ لایەنی پەڕپووتی ناوەکیی مرۆڤ خۆی، مینا چاوچنۆکی، سروشتە ڕاستەقینەکەی مرۆڤ شێواوەو ئیدی لەسەرینی ئەمەوە بوونی سیستەمێکی قانوونیی جڵەوگر بۆ بەرزەفتکردنی ئەم سروشتەی مرۆڤایەتی بووە بە کارێکی پێویست. ئەوانەی بەلای ئەو گریمانە گەشبینەدا دەشکێننەوەو خۆ لە خەوشی مرۆڤایەتی دەدزنەوە، حەز بە گەڕانەوە بۆ دواوە، بۆ سەردەمی زێڕین، سەردەمی سادەیی و دڵپاکیی بەرایی دەکەن، ئەودەمەی خەڵکان ژیانێکی سادەی بەختیارو زۆر ڕێك و پێکیان ڕادەبارد و مرۆڤ هیچ پیویستی بە سیستەمێکی قانوونیی دەرەکی، یان لە دەمدەرەوە نەبوو بۆ ستۆپ پێگرتنی ئەو خولیاو ئارەزووانەی مرۆڤ کە لە بنەچەکەدا دروست و دووربوون لە خۆپەرستی و بۆ خێرو خۆشی گشتیی بەرەی مرۆڤ ئاراستە کرابوون. ئا ئەمە ئەو وێنە بەراییە نموونەییە بوو کە بیرمەندو نووسەرێکی زۆر، لە (*ستیکا* *Seneca* *4ی پ. ز – 65ی ز*)ەوە بگرە تا (*ڕۆسۆ* **Rousseau** *1712 – 1778*)، بەڵکە تا بە ڕۆژی ئەمڕۆش دەگات، کێشاویانە. ئەم تابلۆ پەمەییە، لەبارەی ڕابردووی هەرە دووری مرۆڤ، لە نوێنەرایەتیکردنی ئەو بزاڤەی بانگەشەی بۆ سروشت گەڕانەوە لە وێنەی مرۆڤی بەراییدا دەکرد، بترازێ، شتێکی دیکە نییە، کە هێشتا سروشتەکەی بە هۆی هۆکارەکانی گەندەڵییەوە نەگەچەراوەو نەگۆڕاوە. بەم شێوەیە ئاسۆی ئایندەیەکی کامەرانتر بۆ کۆمەڵگە کرایەوە، کە پاڵنەرە گڵاونەبووە سروشتکردەکان جێگەی سیستەمی قانوونیی لەدەمدەرەوە بگرنەوە.

دەکرێ نموونە لەسەر ئەم دوو بیرۆکە ئایدیۆلۆجیایە لەمەڕ سروشت و چارەنووسی مرۆڤ، لە چەندان سەرچاوەی پەرت و بڵاودا، کە بە چاکی دەزانین لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێکیان بکەین، هەڵبێنجین. لە چینی کۆندا، لەسەدەی سێی پێش زایین، قوتابخانەیەکی نامێ بە ناوی "قانووندانەر" هەبووە، بە پێی ئەم قوتابخانەیە، مرۆڤ لە بنەچەکەدا، سروشتێکی بەدو شەڕانی هەس.. ئەو ڕێگا خێرانەی مرۆڤ پێیاندا دەڕوا، هۆیەکەیان بەزۆری کاریگەریی دەوروبەری جڤاکی و بەتایبەتی فێربوونی ڕێورەسمی ئایینی و دیسپلینی کۆدی سزاکانە. لەو پرەنسیپە بڕیارلێدراوانەی کە ئەم قوتابخانەیە بڕوای پێیان هەبووە، ئەو پرەنسیپە بووە کە دەڵێ ((قانوونێك بە سزاگەلی توندەوە تا جێبەجێکردنی دەستەبەر بکا، لە هەموو وشەی داناو حەکیمان بۆ پاراستنی نیزام خاسترە)). هەر لەو سەردەمیدا، کتێبی ((**شاسترا** *Shastra* )) لە هیندستان جەختی لەسەر ئەوە کردیتەوە کە مرۆڤ بەسروشت، چاوچنۆك و سۆزەکییە، ئەگەر جڵەوی بۆ شل بکرێ، ئەوا دنیا دەبێ بە "فابریکەی ئیبلیس "و "لۆجیکی ماسی" باڵادەست دەبێ. واتە گەورە، بچووك دەخوات. هاوشێوەی ئەم بیروبۆچوونە، لە نووسراوەکانی ژمارەیەك نووسەری ئەورووپای ڕۆژئاوای مۆدێرندا دەبینینەوە. بە لای *بۆدان* *Bodin* —ەوە، باری ڕەسەنی مرۆڤ، ئاژاوەو زەبروزەنگ و هێز بووە. (*تۆماس هۆبز* *Thomas*

Hobbes 1679 -1588) ژیـانی مرۆڤـی بـەرایی، بـە دۆخـی شـەڕێکی بـەردەوام وەسـف کـردووەو گوایـا ژیـانی تاکـە کـەس، سـەخت و پـیس و کـورت بـووە. ئەمـەیان بـووە بـە وەسـفێکی کۆنبـاو. (داڤیـد هیـوم David Hume 1776 -1711)یش پێی وایە کۆمەڵگەی مرۆیـی بـەبێ قـانوون و حکوومـەت و داپڵۆسـین، بـوونی نـابێ. ئـا لێـرەوە قـانوون، پێویسـتییەکی سروشـتیی ئـادەمیزادە. (میکـافیلی Machiavelli 1469– 1527) ، وەها ئامۆژگاری شازادان دەکات: "بەڵێنان نەبەنەسەر، هەر کاتێ ئەو گفت و لفتانە لە گـەڵ بەرژەوەنـدە تایبەتـەکانی ئەوانـدا پێکنـاکۆك بـوون، چـونکە خـەڵك هـەر بەسروشـت، خـراپن و بـەوەفا نـین، بۆیـە دەبـێ شـازادەکان، ریـز لـە پەیمانەکانی وەفاداری بۆ ئەوان، نەگرن". گریمانەی (( سـەردەمی زێـڕین))ی بـەرایی، بـەم یـان بـەو شـێوەیە، دەورێکـی گرنگـی لـە مێـژووی ئایدیۆلۆجیای رۆژئاوایی گێڕاوەو چێترین شتێ کە لە بارەی ئەم گریمانەیە لە مێژووی کۆندا نووسرا بـێ لـە نووسـینەکانی ( ئۆڤیـد Ovid 43 پ. ز) و سـینکا بـووە. ئۆڤیـد لـە بـەرگی یەکـەمی کتێبـی گۆڕانکارییەکان Metamorphoses ئەمەی نووسیوە:

"لە دەسپێکدا سەردەمی زێڕین – ئەو دەمەی مـرۆڤ نـرت و نـوێ بـوو– نەیـدەزانی فـەرمانڕەوایی چـەس، بەڵکـە هـۆش و ئـاوەزی سـاغ و دروسـت هەمەچیزە بوو.

مرۆ هەر بەڕەمەکی بە ئاقاری خێردا هـەنگاوی هەڵدێنایەوە

نەیدەزانی سام لە سزا و ترس چییە

وشەکانی سادەو ساکارو دەروونیش راستگۆ

قـانوونی نووسـراوە پیویسـت نـەبوو، چـونکە چەوساوان نەبوون

قانوونی مرۆڤ، لە سنگی مرۆڤدا نووسرابوو

ئـاپورەی خـەڵك لـە بـەردەم دادوەردا کەڕەسیسەیان نەکردبوو

هێشتا دادگە دروست نەببوو، هێشتا وشەی دادخوازی نەبیسترابوو

هـەموو شـت، پـارێزراو بـوو، چـونکە ویـژدان خۆی پارێزوان بوو"

هەرچی سینیکا بوو، چونکە فەیلەسووف بوو، بەدرێـژتر چووەتە نـاو بابەتەکـەو نووسیویەو دەڵـێ ((لـە کۆمەڵگـەی بەراییـدا، خـەڵك بـە ئاشـتی و بـە خۆشی و بەهەڤرا ژیاون، سەرلەبەری شتەکان، مڵکی هـەمووان بـوو. ئـەودەم مڵکایـەتی تاکـە کەسـی لـە ئارادا نـەبوو. لەسـۆنگەی ئەمەشـەوە دەکـرێ بێـژین ئـەو دەمـە هـەم کۆیلـەتی بـوونی نـەبووە، هـەم حکوومەتی ئۆتوریتەش. سیستەم خاسترین شێوەی دڵخـوازی هـەبووە، چـونکە خـەڵك بـە شـێوەیەکی حـەتمی پێڕەوییـان لـە سروشـت کـردووە، کاربەدەسـتانی ئـەوان زۆر حـەکیم و دانـا بـوون و رێنوێنی خەڵکیان دەکردو رێگەی خێرو خۆشییان پێ نیشان دەدان. خەڵك بە رەزامەندیی خۆیانەوە، بـەرفرمانی حوکمڕانـان دەبـوون، چـونکە فەرمانـەکانیان حەکمیانـەو دادپەروەرانـە بـوون، بـە تێپەڕبوونی کات، ئەم بێوەییەو دڵسافییەی بەرایی وردە– وردە پووکایـەوەو نـەما، خـەڵك، چاوبرسـی و تـەماحکار بـوون و هـەر تـەنیا بـە لـەزەت وەرگرتنـی گشتی لە شتە جوانەکانی دنیا دانەدەکەوتن، بەڵکە حەزو ئارەزوویان لێ بووە شتەکانیش و بکەنە مڵکی خۆیان، چاوچنۆکی، کۆمەڵگە بەختیارەکەی هەلا– هەلا کرد، ملهوڕی جێگەی بە مەملەکەتی حەکیم و دانایان چۆلکرد و خەڵك ناچاربوون قانوونگەلێك کە حوکمڕانەکانی خۆیانی پێ ببەستنەوە، دابهێنن".

ویـڕای ئـەوەی کـە سـینیکا جـەختی لەسـەر دۆخـی دڵسـافیی بـەرایی دەکـردەوە، وەلێ ئـەم دڵپاکییـە ئـەنجامی نـەزانین بـوو نـەك بێـوەیی و پیاوخاسـی. سـینیکا، بـەدکاریی کۆمەڵایـەتیی لەوەدواتر و پێویستیی سازبوونی حوکمی قانوونی بـۆ گەنـدەڵیی سروشـتی بنیـادەم و نـەمانی دۆخـی

دڵسافی دەگێڕایەوە. هەروا جەختی لەسەر ئەوەش دەکردەوە کە هۆی گەندەڵی بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ نەهامەتیی چاوبرسێتی. بیرۆکەی رەزالەت و گەندەڵی، وەکو بناخەیەك بۆ چەندین سەدە، دامودەزگا داپڵۆسێنەکان لە فیکری ئەورووپی رۆژئاوایی پاڵیان پێوە دابوو، ئەم بیرۆکەیەشیان لە ئامۆژگارییەکانی ئایینی عیسایی و مووسایی لەمەڕ "داڕمانی مرۆ"وە، وەرگرتبوو. بیرۆکەی بەهەشت لە تەوراتدا، هاوشێوەی بیرۆکەی دۆخی دڵسافیی بەراییە لە کن مرۆڤی *سینیکا*، هەروا بناخەکانی پێویستیی قانوون و دامەزراوە هاوشێوەکانی قانوون وەکو دەوڵەت و مڵکایەتی تایبەت و کۆیلەتی لە سروشتی چەوت و چەوێلی مرۆڤ کە لەو " داڕووخانە" کەوتوونەتەوە، وەرگیراون. ئا ئاوا قانوون بۆ راگرتنی شوێنەوارە بەدەکانی گوناه، بووە پێویستییەکی سروشتکردی دوای "داڕووخان"، تەنانەت خێزانیش وەکو ئاکامێکی "داڕووخان" مامەڵەی لە تەکدا کراوە، چونکە خێزان کۆنترۆلی زۆرەملێی نێرینە وەکو ئەلتەناتیڤێك بۆ ئازادی و یەکسانی لە بەهەشتی سەرەتاییدا دەردەبڕێت. هەروا کۆیلەتیش بە ئاکامێکی حەتمیی "داڕووخان" بە ئەژمار دێت، چونکە مرۆڤ، وێڕای ئەوەی کە لە باری ناگەندەڵیدا بە سەربەست و هاوشانی مرۆڤێکی دی دادەنرا، لە ئاکامی گوناهکردندا بووە بابەتێکی لەباری کۆیلایەتی. بەم شێوەیە کۆیلەتی بووە دامەزراوێکی رەوا لە سەردەمی گەندەلیدا.

تیوری قانوون و حکوومەت لە نووسینەکانی (*ئۆگستین* **Saint Augustine** *354– 430* )دا، بە چلە پۆپەی خۆی گەیی، قانوونی دەوڵەت و داپڵۆسین هەرلە خۆیانەوە بەد نین، بەڵکە هەردووکیان بەشێکن لە سیستەمی خودایی وەکو دەستاوێژێك بۆ جڵەوگرتنی ئەو عەیب و خەوشانەی مرۆڤ کە لە گوناه دەکەونەوە. ئا لێرەوە، سەرلەبەری دامەزراوە لەئارادابووەکانی قانوونی و دەسەڵاتەکانی دەوڵەت رەوان و دەشێ بۆ بەهەند هەڵگرتنیان داپڵۆسین بەکاربهێندرێ. بەڕای *ئۆگستین* هیواو ئۆمێدی مرۆڤایەتی تەنیا لە چوارچێوەی ریفۆرمی کۆمەلایەتی و هێنانەئارای رژێمێکی دادپەروەرانەتر لەسەر رووی زەوی خۆی نابینێتەوە، بەڵکە بەوەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی تایبەت بە ((دەستبژێرانی خودا)) دێتە دی، ئەویش ئەو کۆمەڵگە ئەفسانەییە کە لەدواجاردا، ئەو کاتەی خودا خۆی حەز بکا، خێرو خۆشی گشتی بەسەر سیستەمی مەوجود کە سروشتی هەڵەکارانەی مرۆڤی بەسەردا زاڵە، جێگەی خۆی دەگرێ.

بۆ چەندین سەدە، تیوری *ئۆگستین* لەمەڕ قانوون بەو پێیەی پێویستییەکی سروشتکردە بۆ جڵەگرتنی سروشتی هەڵەکارانەی مرۆڤ، باڵادەست بوو. ئۆگستین لەکاتێکدا نووسینەکانی خۆی بڵاودەکردەوە کە سیستەمی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریای رۆمانی بەرەو داهێزران و داڕووخان دەچوو، بۆرە ئومێدێك هەبوو کە بەرەی مرۆڤ بە ویست و خواستی خۆیان سیستەمێکی رێکوپێك و دادپەروەرانە دابمەزرێنن. وەلێ ژیان وردە– وردە هێوری و بنەجێ بوو و ئومێدێك بە ئەگەری وەدیهێنانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی– ئابووری پەیدابوو. لەدەسپێکی سەدەی سێزدەمدا، بیروڕا فەلسەفی و زانستییەکانی چاخە کۆنەکان لەمەڕ باری کۆمەلایەتی مرۆڤ، بەتایبەتی بیروراکانی (*ئەرستۆ* **Aristotle** *384* پ.ز– *322* پ.ز)، خزانە ناو ئەورووپای رۆژئاواوە، کاتی ئەوە هات گۆڕان لە بیروڕا بڕواپێهینراوەکان رووبدا. چونکە دەشێ سروشتی مرۆڤ بەدکارانەو چەوت و چەوێڵ بێت، وەلێ هێشتا مرۆڤ فەزیلەیەکی سروشتکردی بەتواناى پەرەسەندنیشی هەس. (*ئەکوینی* **Thomas Aquinas** *1225 –1274*) بەپێچەقاندن لەسەر چەمکی *ئەرەستۆ* لەبارەی گەشەسەندنی

سروشـــتیی دەوڵـــەت لەســـۆنگەی پاڵنـــەرە کۆمەڵایەتییـەکانی مرۆڤـەوە، دووپـاتیکردەوە کـە بەناچاری دەوڵـەت بـەد نییـە، بەڵکـە دامەزراوەیـەکی سروشتکردە بۆ پەرەسەندنی خێرو خۆشی مرۆیـی. *تۆماس ئەکڤا ئەکوینـی* تێکۆشا، کە ئەم هەڵوێست و ئـەو هەڵوێسـت، لـە گـەڵ هەڵویسـتی بـاوی لاهـووتی لەسـەردەمی خۆیـدا بەیەکـەوە گرێبـدا، سـەرباری ئـەوەش تۆمـاس ئـەکوینی بناخەیـەکی گشـتی بـۆ چەمکی عەلمانیی قانوون کە دواتر بووە باڵادەست، دانا، کاتێك کە قانوونی نـەك هـەر تـەنیا بـە هێزێکـی بەسـوود بـۆ جڵـەوگرتنی خولیـا بـەدەکانی مـرۆڤ لەقەڵـــەم دا، بەڵکـــە هـــەروا قـــانوونی بـــۆ بەیەکەوەهـەڵکردنی کۆمەڵایـەتی و خێـرو خۆشـیش خســتەگەڕ. ئـا لێـرەوە چـی دی وەکـو هێزێکـی نەگـەتیڤی رووت بـۆ جڵـەوگرتنی شـەڕو بـەدگاری، سەیری قانوون نەدەکرا، بەڵکە وەکو ئامرازێکی کارا بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجـەکانی مـرۆڤ کـە پاڵنـەرە کۆمەڵایەتییـەکان، یـان خێرخوازەکـان بـەری مـرۆڤ دەدەنە ئەو ئامانجانە.

## ئایا مرۆڤ بەسروشت خێرخوازە؟ چەمکی ئانارشیستی

دیتمـان چـۆن کـە هـەوڵی دانـانی قـانوون وەکـو پێویسـتیەکی سروشـتکرد بـە ئاقـاری جڵـەوگرتنی غەریزە بەدەکانی مرۆڤ، وەکو تاکـە رێگایـەکی شیاو بۆ بە ئەقڵانی کردنی لایەنی کۆمەڵایەتیی سروشـتی مـــرۆڤ و ئاراســـتەکردنی، دەرفـــەتی لەبـــەردەم تێڕوانینێکـی نـوێ بـۆ قـانوون کـردەوە ، وێـڕای ئەوەش لە هەموو سەردەمێکدا بیرمەندی وەها پەیدا بـوون، چـەمکی داپڵۆسـێنانەی هێزەکـانی قـانوون و نیـزام رەتبکەنـەوە. بـەلای ئـەو بیرمەندانـەوە، مـرۆڤ هەر بەسروشت خێرخوازەو تا سـەریش وەکـو خـۆی دەمێنـێ، ئەوە دەوروبەری کۆمەڵایەتییە، کە بناخەی بەدکارییـەکانی دۆخـی مرۆییـە، بەتایبـەتی بـوونی سیستەمێکی قانوونی لەسەرەوە بەهێز داسەپاو.

ئەوەی کە پێی دەگوتری فیکری ئەنارشیستی هـەر لـە کۆنـەوە تـا سـەردەمی مـۆدێرن، تـا رادەیـەك بەوە جیا دەکرێتـەوە کـە جـۆرە حـەزو ئارەزوویـەکی بـە پەلـەی گەڕانـەوە بـۆ دۆخـی بـەرایی و سـۆزێك بـۆ ســەردەمی یەکــەمی زێــڕین هەیــە. بــۆ نموونــە، *ئـەفلاتوون* مـەیلێکی تونـدی بـەلای پریمیتیزمـدا هـــەبوو هـــەروەکو لـــەم ســـێودوونەکردنەیدا دەردەکـەوێت ((خـەڵك لەسـەدەکانی بـەرایی، هـەم لـە ئێمـە چـاتر و هـەم لـە خـوداش نـزیکتر بـوون)). وەلێ ئـەم روانگەیـە زۆر لـە خـۆکردنێکی تێدایـە و زێـتر پشـــتی بـــە رابردوویـــەکی خـــەیاڵئامێزی مـــرۆڤ بەستووە، تا پشتدان بە وزەی پەنامـەکیی مرۆڤ بۆ وەدیهێنـانی کۆمەڵگەیـەکی دادپـەروەری نموونـەیی. ســـەرباری ئـــەوەش، ئـــەم کۆمەڵگـــە نموونەییـــە، بـــەرفرمانی سیســـتەمێکی قـــانوونیی نموونـــەیی نـەبووە، بەڵکـە بـە پێچـەوانەوە کۆمەڵگەیـەکی بـێ بنـەماو رێسـاگەلی قـانوونی بـووە، کـە تیایـدا لـە ســـەرینی پاڵنـــەرە کۆمەڵایەتییـــەکان و هەســـتی چاکەخوازیی ئەندامەکانییـەوە، بەیەکـەوە گونجـانی کۆمەڵایەتی باڵادەست دەبێ.

*ئـــەفلاتوون* لـــە کۆمارەکەیـــدا *The Republic* روونی کردبووەوە کە وێنەی نموونەیی ئەم چەشـنە دەوڵەتـە بـێ قانوونـە، پێکەوەهـەڵکردنی نـاوەکیی خـۆی لـە ئـاوەزی مرۆڤـەوە هەڵـدێنجا کـە دەگاتـــە ئاســـتی هـــەرە ســـەرەوەی پەیـــژەکانی پەرەسەندن لە رێگەی یەك بەدوای یەکداهاتنی پاشا فەیلەسووفەکانەوە کـە بـە دانـایی و زانـایی خۆیـان دەستنیشـــان دەکـــران. ئـــەفلاتوون بـــڕوای بـــە سیستەمێکی خوێندن و فێرکردن هەبوو کە نەك هەر فەرمانڕەوای لێوەشاوە پێبگەیەنێ، بەڵکە هـاوولاتی دیـش وا بـار بهێنـێ کـە بـەرفرمان و دڵسـۆز بـن. تاقیکردنـەوەی مـۆدێرن ئـەو بڕوایـەی *ئـەفلاتوون*

پشتڕاست دەکاتەوە کە خوێندن و فێربوون، یان ((مێشك داشۆرین)) دەشێ خەڵکی لەسەر ملکەچبوون رابهێنێ، وەلێ هەر ئەو تاقیکردنەوانە هاودەنگ نین سەبارەت بەو بیرۆکەیەی کە داخوا چ سیستەمێکی فێرکردن دەشێ رێگە بۆ پاشایەتییەکی دانا خۆش بکا، یان داخوا رێگەیەکی دی هەیە کە لە هەڵبژرادندا، یان لە راهێنانی ئەو تاکانەی کە بەسروشت شیاون بۆ بەدەستەوەگرتنی جڵەوی حوکم، بەهەڵەدا ناچێ.

رەنگە بگوترێ ئەم مەیل و خولیایەی ئە*فلاتوون* هەندەی بەرەو ئەوەی ئەمرۆ توتالیتاریزمی پێ دەوترێ، یان بەرەو دەسەڵاتی هەمەچیزانەی دەوڵەت، دەخزی، هێندە بەرەو ئانارشیزم نەدەڕۆیی. ئەمەش بەپێی ئەو پێشنیارانەی کە لە کتێبی "قانوونەکان"ی ئەفلاتووندا لەمەڕ سیستەمێکی توندو یەکلاکەرەوەی قانوونی، هاتوون. وێڕای ئەوەی کە بۆنی هەندێ بیچم و چارەی ئانارشیزم لە مەسیحیەتی بەراییدا دەکرێ، وەلێ ئەمە زێتر بێزبوونەوە بووە لە قانوونی مرۆیی تا رەتکردنەوەی، راستییەکەی گوتەی ((چ هی قەیسەرە، بیدەن بە قەیسەر))بۆیەی شەرعیەت لە دەسەڵاتەکانی ئارا دەدا. لەهەمان کاتدا زۆر لە ناحەزانی مەسیحییەتی بەرایی پێیانوابوو کە پرەنسیپی ئاشتیخوازی و نا توندوتیژ هەڕەشەیە بۆ سەر دەسەڵاتی دەوڵەت و رێگەی بۆ پرەنسیپەکانی ئانارشیزم کردەوە کە هەندێ گەورە نووسەری هاوچەرخ لە بابەتی *باکۆنین و تۆلستۆی* دەیانگوتەوە.

سەردەمی مۆدێرن هەر لەدەسپێکی سەدەی نۆزدەمەوە، بەپێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیا لە سەردەمەکانی دی جیا دەکرێتەوە، هاوڕێ لەگەڵ ئەم بەخۆکەوتنەدا، ئایدیۆلۆجیای پێشکەوتنی مرۆییش گەشەی کرد. ئەم ئایدیۆلۆجیایە، تێڕوانینیکی دنیاخوازانەو بڕوای بە بیرۆکەی بەهەشتی بەرایی نییەو چاوی بڕیوەتە ئایندەیەکی رازاوەتر بۆ مرۆڤایەتی. ئەم پرەنسیپە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەم بیرۆکەیەی گرتە خۆ کە دەڵێ: دەشێ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ بۆ دەوری ئازادانەی ئەو هێزە ئابوورییانە جێبهێڵدرێ کە بۆ قازانجی بەیەکەوەگونجاندنێکی گەورەتری کۆمەڵایەتی کار دەکەن، ئەگەر ئەو هێزانە بەبێ دەستێوەردان بەرهەڵدا بکرێن. ئا ئەمە تیوری "ئازادیی کار"، یان مایەی خۆتێنەکردنی نامی بە" Laissez —faire " کە فەیلەسووفی ئابووریناس *(ئادەم سمیت* Adam Smith *1723 - 1790)* بەشێوەیەکی تایبەت بەسەر کاروباری ئابووریدا پراکتیزەی کرد، وێڕای ئەوەی کە ئەم تیورییە لە ناوەخنی خۆیدا، دۆکترینێکی فرەتری بەخۆوە گرتووە کە دەڵێ ((لەڕووی پرەنسیپەوە، هەر حکوومەت و قانوونێك تا ئەو مەودایە بەدو ناحەزە کە پەرەسەندنی سروشتیی ئابووری و کۆمەڵگە کۆت و بەند بکا، یان بشێوێنێ)). بەلام ئەم تیورییە لەو رووەوە پێچەوانەی ئانارشیزمە کە پێی باش بوو قانوونی داپڵۆسێنانە بۆ پاراستنی مڵکایەتیی تایبەت کە چاکەیەکی دەست لێنەبووەوەی بازاڕی ئازادە، بەتوندی بەکار بێت.

ئەم بۆچوونە لە سەدەی نۆزدەدا گەیشتە چلەپۆپە لە کتێبی ئەنارشیستەکان، بەئاگا لە بیروڕای مۆدێرن، هەرچەند کتێبی نامێی "دادپەروەریی سیاسی" ی *(ویلیەم* ***جودوین*** Godwin *1756 - 1836)* بۆ یەکەمجار ساڵی 1793 هاتەوەشاندن. *جودون* پێیوایە بەدکارییەکانی کۆمەڵگە لە سروشتیی هەڵەکارانەو گەندەڵانەی مرۆڤەوە هەڵنەقوڵیون، بەڵکە لە شوێنەوارە خراپەکانی دامودەزگای داپڵۆسینەوە سەرچاوەیان گرتووە. مرۆڤ توانایەکی بێ سنووری بۆ پێشکەوتن هەیە، تەنیاو تەنیا

دامودەزگاكانی داپڵۆسین و نەزانین ڕێگە لەم پێشكەوتنە دەگرن.

*جودوین*، متمانەی ڕەهای بە ئەقڵ و ئاوەزی مرۆیی و توانای كامڵبوونی هەبوو و جەختی لەسەر ئەوە كردووە كە لە توانادا هەیە لەڕێگەی بارهێنان و هاریكارییەوە، قانوون هەڵبوەشێندرێتەوە. ئەم ڕێساگەلە مۆراڵی و كۆمەڵایەتییانە بۆ پاراستنی سیستەمی كۆمەڵایەتی و پێشكەوتن بە پێویست دەزاندرێن و كاراو بەركار دەبن، چونكە پێخوستكردنیان، لۆمەو بێزاریی تاكە ئازادیخوازەكانی كۆمەڵگەیان لێدەكەوێتەوە. هەردوو پێشەوای قوتابخانەی ئەنارشیستی ڕووسی: *باكۆنین* Bakunin و *كرۆپتكین* Kropotkin داكۆكیان لەم چەمكە فەلسەفییە كرد و پێیانوابوو دەوڵەت و قانوون و داپڵۆسین و مڵكایەتیی تایبەت دژمنانی كامەرانیی مرۆڤایەتی و خێرو خۆشی گشتین. ئەم دوو نووسەرە پێیان لەسەر بەكەڵكیی هاریكاری لە دیرۆكی مرۆییدا داگرتووە، ڕایانگەیاند كە ڕەوەندی پەرەسەندنی حەتمی بەو سەمتە دەچتە پێشەوە كە پرەنسیپی هاریكاریكردنی یەكتر جێگەی كۆمەڵگەی داپڵۆسێنەر دەگرتەوە. لەسەرڕێكی دییەوە *تۆلستۆی* بانگەشەی بۆ شێوەیەكی ئانارشیزم كرد كە پاڵی بەو هزرەی خۆی دەدا لەمەڕ ژیانێكی ساكارانەی فەلانەی ئیلهامگر لە خوا كە كۆمەڵگە بەراییەكانی فەلان تیایدا دەژیان. لایەنگرە دڵگەرم و تاوگرتووەكانی *تۆلستۆی* هەوڵیاندا "كامپگەلی تۆلستۆی" لەسەر ئەو بنەمایانە لە چەندین جێگەی دنیادا دروست بكەن، وەلێ ڕەنج بەخەسار بوون. *مەرموود* Aylmer Maude لە كتێبەكەی خۆیدا "ژیانی تۆلستۆی"، هەندێ ڕێگەی گالتەجاڕانەو نامۆ و سەیرو سەمەرە دەگێڕێتەوە كە بوون بە مایەی داڕووخانی خێرای ئەم كامپانە. لە یەكێ لەم كامپانە، بۆ نموونە، منداڵێك، "بەروانكە" یەكی لە هاوڕێیەك دزی، ئەم منداڵە پێشتر، وا تەڵقین درابوو كە مڵكایەتی تاكە كەسی حەرام و ناڕەوایەو پۆلیس و دادگە وەك بەشێك لە سیستەمێكی داپڵۆسێنەرانەی بێ ڕەوشت بەولاوە شتێكی تر نین. كاتێ كە داوا لەو منداڵە كرا "بەروانكە"كە بداتەوە، منداڵەكە قایل نەبوو بەروانكەكە بداتەوە چونكە باش لە دەرسەكە حاڵی ببوو. پرسی: ئەگەر مڵكایەتی هەڵەیە، بۆ دەبێ بۆ ئەو چەوت و چەوێڵ تر بێ لە پیاوەكە؟ منداڵەكە گوتی ئەویش هەندەی ئەو پیاوە پێویستیی بە بەروانكەكە هەیەو، حەزی لێیە ئەم پرسە وتووێژی لەسەر بكرێ و سوور بوو لەسەر بۆچوونی خۆی كە هەقی وییە بەروانكەكەی لەلا بێ و لێساندنەوەی هەڵەیەكی مەزنە.

كامپێكی دی هەمان چارەنووسی بەخەم و كەسەری تووش بوو. كەلوپەلەكانی كامپەكە بەناوی ئەندامێكی كامپەكەوە كرا تا بۆ بەرژەوەندی هاوڕێیەكانی خۆی بەكاریان بهێنێ. ڕۆژێكیان، پیاوێكی لایدە هاتە ناو كامپەكەو پاش گفتوگۆ لە گەڵ ئەندامانی كامپەكە لەپڕ ڕاوەستاو پێی گوتن: ئاغایان دەمەوێ لەو ساتەوە پێتان بڵێم هیچ كام لە ئێوە نە ماڵ، یان زەویتان لەم كامپەدا نییە، ها بۆ وا مات و مەندەهۆش بوون؟ ئەم مەزراو بەراوو خانووبەرەو ڕەزانە، سەرلەبەریان، ئێستا مڵكی منن. من سێ ڕۆژ دەرفەتتان دەدەمێ تا لێرە باربكەن و بڕۆن. دانیشتوان سامگرتوو بوون، وەلێ بەرەنگارییان نەكردو كامپەكەیان چۆلكرد، دوای دوو ڕۆژ ئەم مڵكدارە شەرعییە، مڵكەكەی بە حكوومەتی خۆجێی كۆمیون دا.

ئەوەی لە خەڵك بەدگومان بێ سەبارەت بە بڕوابوون بە دڵسافیی سروشتكردی مرۆڤ، لەبەرەخۆی پێدەكەنێ ، وەلێ دەرەنجامی ئەم پراكتیكە ئەنارشیستە ساویلكانەیە ئاماژە بۆ ئەو تەنگژەیە دەكا كە هەر دەبێ ڕووبەرووی ئەوانەی بڕوایان بەوە هەیە كە دەشێ كۆمەڵگە دوور لە

بیرۆکەی قانوونی بەخورتی دەرەکی رەوتار و کار بکا، ببتەوە. *مود* دەڵێ: قانوون هەڵوەشێننەوەو خەڵکی بڕوا پێ بێنن کە نابێ قانوون، یان هۆڵی دادگە هەبێ، ئەو دەمە دەبینن تەنیا ئەو کەسانە دەشێن بژین کە لە شێوە ژیانی کلاسیکی گوندەکی راهاتوون لە بابەتی جۆتکارانی بەر لە شۆرشی رووسیا. بناخەی بەدکارانەی تۆلستۆیزم ئەوەیە کە تۆلستۆیزم بەرەنجامی ئەو شارەزاییە ریسواو مەحکوم دەکا کە باووباپیرانمان وەدەستیان هێناون، ئەوانەی سیستەمێکیان داناوە وێڕای ئەو خەوشانەی رێگە لەو سیستەمە دەگرن، تا خەڵکی بکارن هاریکاری یەکدی بکەن و ئیشوکاری خۆیان بە کەمترین رووگرژی و پێکهەڵپڕژان، جێبەجێ بکەن.

رەنگە گەورەترین تێز لەرووی کاریگەرییەوە، ئەو تێزە بێ کە ئەنارشیستی هاودەم *"کارل مارکس"* نووسیویە، مارکس هزری دەکرد کۆمەڵگەی سەرمایەداری بە شۆرشی بەزەبروزەنگی پرۆلیتاریای چەوساوە سەراوبن بکرێ. *مارکس* قانوونی بەتەنیا بە سیستەمێکی داپڵۆسێنانە بۆ پاراستنی ئیمتیازی چینی مڵکدار دادەناو شۆرشیش، کۆمەڵگەیەکی نا چینایەتی لێدەکەوێتەوە. ئیدی قانوون و دەوڵەت هەڵدەوەشێنەوە، چونکە هیچ پێویستییەك بۆ پشتەوانیکردنی سیستەمێکی داپڵۆسێنەرانە نامێنێ. بابای مارکسیست سەیری بەردەمی خۆی دەکا و ئاوڕ لەدواوە ناداتەوە، ئەو چاوی لە سەردەمێکی زێرینە کە بەیەکەوەگونجاوی کۆمەڵایەتی تێدا باڵادەست بێ بە هۆی دڵسافیی رەسەنی سروشتی مرۆڤ کە دامەزراوەی مڵکایەتی تایبەت کرمێی نەکردووە. ئەم بەهەشتە کۆمەڵایەتیە بەشەوو رۆژێك نایەتەدی، چار نییە دەبێ ماوەیەکی گواستنەوە هەبێ – هەڵبەت ماوەکەی دیار نەکراوە– کە تیایدا دەوڵەت چالاکییەکانی خۆی بە پشتئەستوری هەموو دەستاوێژەکانی داپڵۆسین کە ئەنارشیستەکان بێزیان لێ دەبێتەوە پراکتیزە دەکا. لە فەسڵەکانی دادێ لە بارەی تیوری مارکسیستی لەمەڕ قانوون زێتر دەدوێین و بەوە وازدێنین کە سۆسیالیزمی مارکسیستی زێتر بۆ بەرفرەکردنی قانوون و داپڵۆسین لە جیاتی هەڵوەشاندنەوەیان کاری کردووە.

## دڵسافیی رەمەکی و نرخی شارستانێتی

وێڕای تاقیکردنەوەی سەرنەگرتوو، هێشتا بیرمەندی هەڵکەوتووی وا هەن کە بانگەشە بۆ ئەو بیرۆکەیە دەکەن کە گوایا مرۆڤی بەرایی هەر بەخۆڕسك خاس بووەو ئەوە رێکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ژیانی شارستانێتیە کە تۆوی زەبروزەنگ و ئاژاوەی ناوەتەوە و لە ئاکامدا سیستەمگەلێکی داپڵۆسێنەرانەی قانوونی لێکەوتیتەوە. یەکێ لەم بیروڕا سەرەکییانەی کە لە کتێبی "مێژووی مرۆڤایەتی " ( *ئەلیۆت سمیت* **Eliot Smith** *1888– 1965*) دا کە بۆ یەکەم جار لەساڵی 1930دا بڵاوبووەوە ئەوەیە کە توخمی مرۆیی هەر لەبنەچەدا خاس و ئاشتیدۆستە و لەمبارەوە دەڵێ ((ساغکردنەوەی ئەمە روون و دیارو فرەیە بە شێوەیەك کە وتووێژ لەبارەی نکوڵیکردنی هەندێ خەڵك لە رەمەکیی دڵسافیی مرۆڤ و خولیای رەمەکیانەی بەیەکەوەژیانی بەئاشتی، مەسەلەیەکی دەروونییە. هەر تاکێ لە ئێمە بە تاقیکردنەوەی تایبەتی خۆی دەزانێ کە هاوەڵەکانی بە گشتی چەند ناسك و خۆش مەشرەبن. زۆربەی بەیەکهەڵشاخان و ناتەباییەکان لە ژیانی ئێمەدا ئاکامی ئەو ململانەیەن کە شارستانێتی خۆی دروستیان دەکا. ئیرەیی و کینەو بەدگۆیی و هەموو شێوە جیا–جیاکانی زەبروزەنگ، ئامانجێکی دەسکرد دەردەبڕن و مرۆڤی بەرایی لێیان بەرییە.

کەمینەیەك نكوڵی لەوە دەكەن كە زۆر لەو نەساغییانەی بەدەستیانەوە دەناڵێنن ئاكامێكی راستەوخۆی ئەو گرژی و ماندوبوون و ململانانەن كە شێوەی بوونی شارستانێتی ئاڵۆزیان پێ جیا دەكرێتەوە. خویایە كە ئەو بەراوردەی ئەلیوت لە نێوان مرۆڤی بەرایی و مرۆڤی شارستانی كردووە، بەراوردێكی تا سەر ئێسقان سادەو تاك لایەنەیە. خوێنەرانی كتێبی "فرنكشتاین *Frankenstein*" ی *ماری شیلی Mary Shelley* بەبیریان دێتەوە كە چۆن فرنكشتاین درندەیەك لەشێوەی مرۆڤ دروست دەكا كە هەموو هەستێكی مرۆڤانەی هەبووە، وەلێ دوایی لە رووی ئافەریدەكەی هەڵدەگەڕێتەوە و دەیكوژێ. ئەم رۆمانە ئاماژەیە بۆ دوالیزمی خوی مرۆیی. رەنگە مرۆڤ خولیای رەمەكی بەرەو چاكە هەبێ واتە ئەو پێوەندییانەی كە لە سۆزو هاریكاری دەكەونەوە و بەبێ ئەوان ژیانی كۆمەڵایەتی ئاستەم دەبێ. وەلێ رووێكی دینامیكیش لە سروشتی مرۆییدا هەیە كە دەكرێ بۆ مەبەستی داهێنەرانە، یان كاولكارانە ئاراستە بكرێ.

فەیلەسووفی ئەنارشیستی روونـاكبین، تەنانەت كاتێ كە گرنگیەكی زۆریش بە پاڵنەرە خولقێنەرەكان دەدا، هەوڵ دەدا خۆی لە رووە تاریكەكەی سروشتی مرۆڤ نەبان بكا، یان بیشارێتەوە. بۆ نموونە *هربرت رید Herbert Read* *دەڵی:* ((كۆڕو كۆمەڵەی مرۆیان بە شێوەیەكی رەمەكی لێكدی خڕدەبوونەوە تا هاریكاری یەكدی بكەن و پێداویستییەكانیان دابین بكەن و ئا ئاوا دەیانتوانی بە كەیف و ماشای خۆیان پشت بە یەكتری ببەستن تا ئابوورییەكی بەكۆمەڵ كە ئاتاجی خۆیانی پێ دابین بكەن، رێكبخەن)). هەروا دەڵێ: ((بابای ئەنارشیست پێی وایە كۆمەڵگە بریتییە لە لەنگەرڕاگرتن، یان بەیەكەوەهەڵكردنی كۆڕو كۆمەڵەكان. تاكە زەحمەت و دژوارییەك ئەوەیە كە چۆن پێكەوەهەڵكردن لە پێوەندییەكانی ناوەكیدا دروست دەبێ)). وەلێ داخوا پەرەپێدانی ئەم بەیەكەوەهەڵكردنە ئەرك و فەرمانێك نییە كە دەبێ وەپاڵ جۆرێك لە رێكخستنی دەوڵەت بدرێ ؟.

وەلامی *هربرت رید* دووی رووی هەیە: یەكەم ئەو پێیوایە ئەم ئەرك و فەرمانە تا رادەیەكی زۆر بەدوورخستنەوەی هاندانی ئابووری لە كۆمەڵگەدا نامێنێ. بۆ نموونە تاوان تا رادەیەكی مەزن، كاردانەوەیەكە لەهەمبەر دامەزراوەی مڵكایەتیی تایبەت. دووەم: دەڵێ ((بارهێنانی منداڵ و ئاكارو رەوشتی گشتی، پرسگەلێكن پێوەندییان بە تێگەیشتن و درك پێكردنەوە هەیەو دەبێ بە گەڕانەوە بۆ ویستی چاكەخوازانەی رەسەن لەكن كۆڕو كۆمەڵەكان چارەسەری بكەین، هەروا دەكرێ هەر ناتەباییەك لە چوارچێوەیەكی خۆجێی چارەسەر بكرێ كاتێ كە دەسەڵات لە باری جیهانییەوە دەبێ بە نا– سەنترال و ژیان سادەو ساكاری لێ دێو " قەوارە نامرۆییەكان"ی وەكو شارو بازێری مۆدێرن، دەپوكێنەوە. كۆڕوكۆمەڵەی خۆجێی دەتوانن دادگەی تایبەت بە خۆیان هەبێ، ئەم دادگانە بەسن بۆ جێبەجێكردنی قانوونی گشتی پشتئەستوور بە دركپێكردن و تێگەیشتن.))

وەكو تێبینی دەكرێ *رید* لە گەڵ ئەنارشیستەكانی دی جیاوازیەكی هەیە لەو رووەوە كە ددان بە پێویستیی جۆرێك لە قانوونی گشتی دەنێ و تەنیا سوورە لەسەر رەتكردنەوەی سەرلەبەری دامودەزگا داپڵۆسێنەكانی دەسەڵاتی ناوەند. رید روونی دەكاتەوە كە "ئەنارشیزم" واتە كۆمەڵگەیەكی بێ حوكمڕان، نەك كۆمەڵگەیەكی بێ قانوون و هەروابێتەوە كۆمەڵگەیەكی بێ نیزام. بابای ئەنارشیست كۆنتراكتی كۆمەڵایەتی لا پەسندە، وەلێ بە شێوەیەكی تایبەتی لێكیدەداتەوە و پێیوایە ئەو رێگە هەرە خاسەیە كە ئەقڵ و ئاوەز پەسندی دەكا.

دانانـــان بـــەوە کـــە سیســـتەمێك لـــە ڕێســـاو قانوونگەل تەنانەت لە سادەترین شێوەی کۆمەڵگەدا پێویستە، کارێکە ئەملاو ئەولای پێ ناوێ. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، سـەرەتایی بـێ، یـان پەرەسـەندوو، پێویستە ڕێساو قانوونگەلێك هەبن تا ئەو مەرجانە دیاری بکەن کە ژنان و پیاوان بتوانن ژن ومێردایەتی خۆیـان بکـەن و لەسایەیدا بـژین. قانوونگـەلی وەسـا هـــەن کـــە پێوەندییـــەکانی خێـــزان ڕێکدەخـــەن، قانوونگـــــەلی دی چـــــالاکییە ئابوورییـــــەکان و کۆکردنەوەی خواردن، یـان ڕاوو شـکار ، قانوونگـەلی واش هـــەن کـــە ئـــەو کاروکردانـــەی زیـــان بـــە بەرژەوەنـــدیی خێـــزان، یـــان تـــیرەو هـــۆزو کـــۆڕو کۆمەڵەکـە بـە گشـتی دەگەیـەنن حـەرام دەکـەن. سـەرباری ئـــەوەش تەنانـــەت لـــە کۆمەڵگـــەی شارستانیی ئاڵۆزیشدا، تەنانەت ئەگەر بە پلەیەکی واش ســـادە بکرێتـــەوە کـــە لەســـەر دڵـــی بابـــای ئەنارشیسـت خـۆش بـێ مینـا *ریـد*، دەزگایـەکی قانوونی وا هـەر دەمێنـێ کـە ژیـانی خێزان و ژیـانی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری ڕێکبخـات. ئـەو بیرۆکەیـەی دەڵێت: کە کۆمەڵگەی مرۆیی، جا لـە هـەر ئاستێکدا بێـت، دەشـێ لەسـەر بناخەیـەك دابمـەزرێ کـە هـەر مرۆییەك بتوانێت ئەو کارە بکات کە خۆی بەراستی دەزانێـت، بیرۆکەیـەکی خەیاڵییـەو شـایانی هـیچ بایەخپێـدانێك نییـە. چـونکە کۆمەڵگەیـەکی لـەم بابەتە، هەرگیز هەروەکو *ریـد* دەڵـێ (( کۆمەڵگەیـەکی بـێ نیـزام)) نابێـت ، بەڵکـە دەبێتـە نـەمان و ڕەدکردنەوەی هەمان کۆمەڵگە.

ئا لێرەوە وتووێژ سەبارەت بە پێویستبوونی قـانوون لـە کۆمەڵگـەی مرۆییـەوە دەسـتپێدەکات بـۆ پرسـیارێکی دی کـە پێوەندییـەکی تونـدو تـۆڵی بـە باسەکەوە هەیە: داخـوا دەکـرێ بیرۆکـەی قـانوون لـە سیسـتەمی داپڵۆسـین جـودا بکرێتـەوە؟ لـە فەسـڵی دووەمدا وەڵامی ئەمە دەدەینەوە.

## سەرچاوە

ماهی فکره القانون – سلسله عالم المعرفه (27)
ترجمه سلیم العویص.

# ئەدەب چییە؟

## (بەشی دووەم)

رۆجەر فۆلەر

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید



### ا. جیهان

ئاشکرایە "ئەدەب" لەدێرزەمانەوە، شێوەیەکە لەگوتار کەپەیوەندییەکی تایبەت و گرنگی لەگەڵ جیهاندا هەیە، بەڵام سروشتی ئەو پەیوەندییە بەپێی چاخە تیوریەکان گۆڕانی بەسەرهاتووە. تیورەکانی گێڕانەوە یان لاساییکردنەوە (المحاکاة) جەخت لەسەر بیرۆکەی "لاساییکردنەوەی جیهان" دەکەنەوە، بڕوایان وایە ئەوەی لەجیهاندا هەیە خاوەنی بوونی تەواوی خۆیەتی. زۆرجار ئەم بڕوایە بەئاشکرا دەرناکەوێ تەنانەت لەو کاتانەشدا کەبەرگری لەخەسڵەتەکانی تۆمارکردن و گێڕانەوەی سروشتی دەکرێ لەرۆماندا. بەمانایەکی گشتیتر، تیۆرسازو ڕەخنەگرەکان چەمکی "لاساییکردنەوە" یان بەشێوەیەکی ئەوتۆ شیکردۆتەوە کەپێیان وابووە پرۆسەیەکی بنیاتنانە لەپێناو ئەفراندنی وێنەیەکدا بۆ واقع یان دروستکردنی دیدێکی گەردوونی بۆ واقع. پاشان هەنگاوێکی چاوەڕوانکراوی بەدواداێ کەبریتییە لەبەراورد کردنی زمانی "شیعریی" یان "ئەدەبی" بەزمانی زانستی یان "مەرجەعیەت" بەپێی ئەدەبیەتی دەق:

"ئاشكرایه جەمسەری هونەری ئەدەبی لەژانرە تەقلیدیەكاندا هەیە: لیریكی، داستانی، شانۆیی. چاوگی هەموویان دەگەڕێتەوە بۆ جیهانێكی خەیاڵی fictive، یان جیهانێك لەخەیاڵ imagination. گوتار لەرۆماندا، یان چامەی شیعریی، یان لەشانۆدا لەڕووی ئەدەبییەوە ڕاستگۆ نییەو بابەتێكی لۆجیكی نییە. چونكە جیاوازییەكی گەوهەری و گرنگ لەئارادایە لەنێوان گوتاری ئەدەبی -لەلایەك- كە دەشێ لەڕۆمانی مێژوویی یان لەرۆمانەكانی بەلزاك-دا هەبێ، كە هەوڵدەدەن زانیاریی لەسەر واقعی ڕاستی پێشكەش بكەنو.. لەنێوان خودی ئەو زانیاریانەی كە نوسەرانی بواری مێژوو كۆمەڵناسی پێشكەشمان دەكەن، لەلایەكی ترەوە". (*wellek& warren*، 1963، ل25)

هەردوو زاراوە بنەڕەتیەكە "خەیاڵی *fictive*" و "خەیاڵ *imagination*" لەڕواڵەتدا هاوواتان. ئەمەش تاك واتایی زاراوەی خەیاڵ دەگەیەنێ و مانای ئەو هێزە ئەفرێنەرە دەردەخا كە توانای وێناكردنی جیهانێكی راستەقینەو چاوەڕوانكراو دەگەیەنێ. جیهانێك كە "جیهانی راستەقینە *real world*" لەخۆدەگرێ. ئەم دیدە بۆ داهێنانی شیعر شێوازێكی كلاسیكی وەرگرت لەسەر دەستی فلیپ سیدنی *philip sidneg* لەكتێبەكەیدا "بەرگری لەشیعر" *Apologie for poetrie (1595)*. تەنانەت جیاكاریی ویلێك و وارین لەنێوان گوتاری خەیاڵی و گوتاری مێژووییدا وەك دەنگدانەوەی قسەكەی سیدنی وابوو كاتێ ووتی: "شاعیر هیچ شتێك ناسەلمێنێ، بەلام هەرگیزیش درۆناكا".

هەرچەندە دەقی خەیاڵی جیهانێكی راستەقینە دروست ناكا، بەلام جیهانێك لەدالغەی مرۆڤدا دروست دەكا كە تا ئەندازەیەكی زۆر خاوەنی زیندوێتی و تایبەتمەندیی و وردەكارییە.. ئەڵبەتە ئەوانەش خەسڵەتگەلێكن كە رەخنەگرانو نوسەران زۆر سەراسیمەن لەئاستیدا. بۆ نموونە لەپاشكۆی كتێبەكان-ی رۆژنامەی سەندەی تایمس *The Sunday Times*، رۆژی 9ی ئۆكتۆبەری 1988، باس لەسێ رۆماننوس و شاعیرێك كراوە شاعیرەكە (لاركین- *larkin*)ەو چەند حوكمێك خراونەتەڕوو كەپەیوەندییان بەبابەتەكەی ئێمەوە هەیە: "وزەی- ئەو ئەدیبە- لە وەسفكردندا تایبەتمەندییەكی ئەوتۆی پێدەبەخشێ كەدەیكاتە رۆماننوسێكی خاوەن توانای گەورە"، "ئەو وزەیە-خەریكە- بە وەسف دەتەقێتەوە"، "رۆمانەكە بەشێوەیەكی سەرنجڕاكێش ژیان دەكا بەبەری وردەكارییە كۆمەلایەتیەكانی سالانی پەنجاكاندا"، "واقع تیایدا بەوردەكاریەكانیەوە جەختی لەسەر كراوەتەوە". ئەڵبەتە قسەكردن لەتایبەتمەندیی هەر دەقێك ئەگەرێكەو لەئارادایە، (بەلام) زۆربەی رەخنەگران بەورییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەكەن. كاتێ هەوڵدەدەین قسە لەپەیوەندیی نێوان دەق و ژینگەی كۆمەلایەتی و مێژوویی بكەین، دەبینین سەختە ئیدعای نەمری و خەسڵەتی گەردوونی دەقە ئەدەبیەكان بكەین. سەرەنجام دەبێ ئاسانكاری بكەین لە لەهجەی حوكمی رەخنەیی بەوەی حوكمێكی نموونەییە یان حوكمێكە دەربارەی تایبەتمەندیی دەق، چونكە ئەو جیهانەی كە دەق دروستی دەكاو ژیانی بەبەردا دەكا، هیچ نییە جگە لە نمونەیەك لەنمونەی بوونەوەران، پاشان ئەو نموونەیە قابلی هەمواركردنە لەبەر رۆشنایی یاساكانی گەردون و راستیە گشتییەكان. كارێكی وا-هەروەك بەرگریكاران لە "ئەدەب" دەڵێن- ئامرازێكە كە ئەدەب لەڕێگایەوە "هەقیقەت" وێنا دەكا، تەنانەت گەر دەقەكانی ئەو ئەدەبە هەڵگری بابەتی لۆجیكی و بەهاكانی راستگۆییش نەبن. یەكەمین كەس كە ئەم بابەتەی وروژاند د. جۆنسن *Dr. johnson* بوو، بەلام تاوەكو ئێستاش پەیوەندیی دیالیكتیكی سەبارەت بە "بوونی گشت لەناو

تایبەتدا" رەخنەگرە هاوچەرخەکانی سەرقاڵ کردووە.

سەرنج: پێداگرتنی تەقلیدیانە لەسەر جیاکاریی نێوان دەقی "خەیاڵی" و دەقی "ناخەیاڵی" وەك پێوەرێك بۆ حوکمی "ئەدەبی" لەبەرابەر حوکمی "نائەدەبی"دا، کێشەیەکی ئاڵۆزی لەتیۆری ئەدەبدا دروستکردووە. ئەو قسەیەی دەڵێ دەقی ئەدەبی خەیاڵییە، واتە ژێدەرێکی نییەو واقعێکی جیا لەسەر بنەمای بەڵگە ناگوێزێتەوە.. قسەیەکە بۆ داماڵینی دەق لەهەر شیکارییەکی ئەقلانیو لۆجیکی (کێشەی دابڕانی دەق ئاڵۆزتر دەبێ کاتێ باس لەسەربەخۆبوونی دەکرێ.. بڕوانە بڕگەی: ج). بەگوێرەی دەقناسی لەڕووی زمانەوانییەوە، جیاکارییەکی لەو شێوەیە پێویست نییە. بۆچوونێکی باویش هەیە دەڵێ دەقەکان بنیاتو قەوارەی خۆیان هەیەو زمانناسی دیدی خۆی پێشکەش دەکا سەبارەت بەجیهانی (دەق) لەڕێگای ئاشکراکردنی بنیاتو تایبەتمەندییە سیمانیکیەکانیەوە. ئەڵبەتە لێرەدا جیاکارییەکی فەلسەفیو جیاکارییەك لەژێدەر (مەرجەعیەت)دا هەیە لەنێوان جیهانی ئەفرێنراو لەرۆمانو جیهانی هەواڵئامێز لەرۆژنامەدا.. هەرچەندە "ئەفراندن" و "هەواڵ" لەڕووی سیمانتیکای دەقەوە یەك شتن. چونکە چیرۆکی رۆژنامەوانی هەر وەك چیرۆکی ئەدەبی (کە کەسایەتیەکانی خەیاڵین و تیایدا توخمەکانی گێڕانەوە بەکاردێن..) بریتییە لەئەفراندنی گوتار (ئەڵبەتە مەبەستم لەو چیرۆکە رۆژنامەوانیانەیە کەڕووداوی راستەقینە دەگێڕنەوە، نەك ئەو حیکایەتە فەنتازیانەی کەرۆژنامەکان "تابلۆید" بلاویدەکەنەوە، واتە ئەو رۆژنامانەی کە ریسواییەکان بلاودەکەنەوە). تا ئێستا سێ ناوچە لە زانستی زمانناسیدا هەن، کە لێکۆڵینەوە لەبارەیانەوە بەردەوامەو هاریکاریمان دەکەن بۆ تێگەیشتن لەسروشتی سترەکتوریی گوتار:

یەکەم: دەروازەی دەروونناسی مەعریفی *cognitive psychology*، هەروەها واتاناسی مەعریفی *cognitive semantics*، کە لەبارەی پرۆسەی پێکهێنانی جیهانی دەقەوە دەکۆڵنەوە–واتە دەربارەی چەمکەکانو پەیوەندییە بابەتییە تێکرژاوەکان– دەربارەی ئاستەکانی لێکسازی *schemata* کە چوارچێوەو بنەڕەتی دەقەکانو جۆرە بەراییەکانو..هتد، دەگرێتەوە. ئەو ئاستانەش ئاستی مەعریفین کە داهێنەرانو وەرگرانی دەق بەشداری تێدا دەکەن، هەروەها خوێنەران لەڕێگای جفرە زمانەوانیەکانەوە ئەو کارە دەکەن.

(*de Beaugrande& Dressler, 1981, chap.5*)

دووەم: پرۆسەی ئەنجامگیری *inferencing*، یان سۆراخکردنی ئەو زانیاریانەی پەیوەندییان بەشیکردنەوەی لێکسازییەوە هەیە.

بەگوێرەی ئەم پرۆسەیە دەقەکان لەبەر رۆشنایی زانیارییەکانمان لەمەڕ جیهان شیدەکرێنەوە، واتە ناسینی ئەو سیستمی بیرو بڕوایانەی کە لەدەقەکان ئالاون.

(*Downs, 1984, chap 9, brown & yule, 1983*)

سێیەم: زمانناسی فەرمانخوازی *functional linguistics* (*Halliday* و 1985) کە هاریکاریمان دەکاو کەرەستەکانی شیکردنەوەی دەقو لێکۆڵینەوەی جیهانی دەقمان پێدەبەخشێ، هەروەها ناسینی سەرچاوەکانی دەقو کاریگەرییان لەسەر هەڵبژاردنی (توخمەکانی) زمان کە هالیدای ناویدەنێ فەرمانە پەتیەکانی زمان. (12)

(*Halliday, 1971, 1978. Fowler, 1977, 1986*)

## ب. نووسەر

تا سەردەمی بنیاتگەری و پاش بنیاتگەریش، زۆر گرنگ بوو لای ئەوانەی سەرگەرمی رەخنەو تیورەی ئەدەبی بوون کە نووسەری دەق کەسێك بێ شوناسێکی دیاریکراوی هەبێ. هەرچەندە ئەوانەی

لەبواری تیورە هاوچەرخەکاندا کاردەکەن نکوڵی لەم گرنگیپێدانە دەکەن بەڵام تاوەکو ئێستا خوویەکی باوە لەناو رەخنەگراندا. ئەو کاتەی ئاشکراکردنی شوناسی نوسەر دەبێتە کارێکی سەخت، ئەوا ئێمە ناچارین وەك ئەگەرێك قسەی لەسەر بکەین، وەك ئەو قسانەی دەربارەی شاعیری نەناسراوی چامەی بیۆڵف *Beowulf* [13] دەیکەین. ئەڵبەتە نوسەر پێگەیەکی مەزنی هەیەو بە "دانەر" *author* یان "شاعیر" *poet* ناوزەد دەکرێ. شاعیر وەك ناونان لەدایەلۆگی تیوریی گشتیو لەبواری بەرگریکردن لە"ئەدەب" بەکاردێ، سەرباری جیاوازییە ئەدەبییەکان لەژانرو شێوەی عەروزیدا. دانەریش (وەك ناونان) جۆرێکە لەمتمانە بەخشین و ستایشی بەردەوام. هەر بۆیە ئەدیبەکان وەك فەیلەسوفو دانیارو ساحیر تەماشاکراون، شیللی *shelly* یەکێك بوو لەوانەی زۆر بەتوندی پشتگیریی لەو بۆچوونە دەکرد، لەکتێبی (بەرگریکردن لەشیعر *1821, Defence of poetry*) دا هاتووە:

"شاعیران.. تەنها دانەری زمان، مۆزیك، سەما، تەلارسازی، پەیکەرتاشی و نیگارکێشان نین.. بەڵکو دانەری یاساکانو دامەزرێنەری کۆمەڵگای شارستانیشن.. داهێنەری هونەرەکانی ژیانو ئەو مامۆستایانەن کە لەچەپکێ جوانیو راستگۆیی هاوجۆردا (..) دیدی هێزی غەیبی، کە ناونراوە ئاین، یەکدەخەن.. شاعیران یاسادانەرە نادیارەکانی جیهانن. (*in Adams, 1970, p. 500*)

ئەوان هەندێ جار ئیلهام لەخواوەندەکانی هونەر (*muses*)ی یۆنانەوە وەردەگرن، کەسروشتی (دەروونی) یان دەوروژێنێو دەیانخاتە دۆخی سەرسامییەوە *frenzy* (وەك شکسپیر). هەروەها لەجیهانی مرۆڤ بەرزتر دەبنەوەو دەچنە دۆخێکەوە کە توانای وێناکردنو تەفسیرکردنی جیهانیان هەبێت بەشەفافیەتێکی زیاتر لەوەی لەتوانای مرۆڤدایە، هەندێ جاریش پەنا دەبەن بۆ بەهرەو لێهاتوویییە تایبەتەکانیان لەو پێناوەدا. شاعیرو دانەرەکان برێکی نائاسایی لەداناییو بیرتیژییان پێبەخشراوە، یان خەسڵەتی زاتی زۆر گرنگیان پێبەخشراوە وەك هاوسۆزیو لێبوردنو توانای رابەرایەتیکردن، بڕوانە وۆردس وۆرس *words worth* کاتێ دەڵێ: "شاعیر کەسێکە کە توانای پەیبردنێکی زیندووی پێدراوە، هەروەها حەماسەتێکی پڕ لە هەست ناسکیو شارەزایی لەسروشتی مرۆڤی پێبەخشراوە. ئەوانەش خەسڵەتگەلێکن کە لەسەروو سروشتی مرۆڤەکانی ترەوەن" ( *in Adams, 1971,p. 437*). هەندێ جار بەو خەسڵەتانە دەوترێن "داهێنەرانە" یان "خەیاڵی" یان "ئەفرێنراو"، واتە توانای ئەفراندنی جیهانی تازەو جیهانی خەیاڵییان هەیە. ئەمە پێناسەی (کۆلێردج *coleridge*)یش بوو بۆ خەیاڵ "وزەیەکی لێکدراوی سیحرییە" لەهاوسەنگیو کۆکردنەوەی نێوان خەسڵەتە هاودژو ناجۆرەکاندا بەرجەستە دەبێ.. شتە سروشتیو شتە ناسروشتیو دەسکردەکان تێکەڵدەکاو دەیانگونجێنێ پێکەوە"

(*Adams, 1971, p.471*)

ئەم پێناسەیە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەرنجراکێشانی رەخنەگرانی بزاوتی رەخنەی نوێ *New critics*، دەربارەی هەردوو خەسڵەتی یەکێتیو پەشێوی لەدەقەکاندا.

بزاوتی رۆمانسی– وەك ئەبرامز تێبینی کردووە– خودی شاعیری کردۆتە تەوەری سەرەکی بایەخی تیورەی رەخنەیی. گوزارشتکردن لەخود تەنها ئامانجی ناوەڕۆکی ئەدەب نییە، یان تەنها جۆرێك نییە لە "هەڵقوڵانی خۆڕسکانەی هەستو سۆزە بەهێزەکان" وەك وۆردزۆرس وتوویەتی.. بەڵکو بووەتە ئامانجی شێوازی ئەدەبیش، واتە بەجێهێشتنی شوێنپەنجەیەکی تایبەت بەکەسایەتی نوسەر، ئەو خەسڵەتەی کە نووسەرە شێواز گەرەکانو رەخنەگرە رۆژنامەنوسەکانی سەرگەرم

کردووە، بەڵام لای رەخنەگرە ئەکادیمیەکان زۆر بایەخی پێنادرێ. بۆ نموونە لەڕانانێکی رەخنەیی بۆ دیوانی شاعیر (فلیپ لارکن *Larkin*) دا داڕشتنێکی رەخنەیی لەمجۆرە هاتووە:

"شوێنپەنجەیەکی گاڵتەجاڕی بەشیعرەکانیەوە دیارەو هەندێ جار تەوسئامێزە، بەڵام راشکاو و تایبەتن، شوێنپەنجەیەکی دەنگی شیعریی کە ئاسان نییە بەڵام قەبەش نییە.."

***(The Sunday Times. 9 October, 1988)***

هەندێ لەرەخنەگران لەگەڵ ئەم تیوریە "گوزارشتخوازە" نین، وەك ت. س. ئیلیوت ***(1917)*** ***T. S. Eliot*** کە جەختی لەسەر نەبوونی خودگەری لەداڕشتنی شیعردا کردۆتەوە "چاوگی هونەرمەند بریتییە لەهەڵاتنی بەردەوام لەخود، هەروەها هەڵاتن لەکەسایەتی***(Adams, 1971, p.785)*** "رەخنەی نوێ" "پێیوایە کە پێویستناکا کەسایەتی "دانەر" شوێن بایەخ بێت، چونکە ئەوەی دەینوسی دوور خستنەوەی خودە لەدەق، رەخنەیش هیچ پەیوەندییەکی بەمەبەست یان بەکەسایەتی ئەوەوە نییە (بڕوانە: ***wimsatt, 1954***). بەڵکو پێویستە بایەخ بەسنعەتەکەی بدرێ لەسەر ئاستی دەق، واتە خودی کارەکە. بۆچوونێك هەیە زۆر پەرگیر ترە داوای وەلانانی "دانەر" دەکا، ئەو بۆچوونەی کەپاشتر تیورەی (بنیاگەری ***structuralism***) ی بارت ***Barthes*** و فۆکۆ ***Foucault*** (1979). بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، تا ئێستا قسەکردن لەکەسایەتی "دانەر" کارێکی پێویستەو لەبیروڕای گشتیدا سەبارەت بەبواری "ئەدەب" و بەدواداچوونی رەخنەیی ئامادەیی هەیە.

***سەرنج:***

دوور خستنەوەی دانەر (نوسەر)و وەلانانی لەگوتاری بنیاتگەریدا رەتکردنەوەی ئەو بڕوایەیە کەپێیوایە مەعریفەیەکی بەهێزترو باڵاتر بوونی هەیە، هەروەها رەتکردنەوەی مۆنۆپۆلی تاکەکەسە بۆ دەقەکانو واتاکانیان. سەرەڕای پەسەندکردنی ئەم خاڵە، بەڵام جێی خۆیەتی زاراوەی "نوسەر" بۆ ئەو کەسە بەکاربێت کە لەپرۆسەی بەرهەمهێنانی دەقدا کاردەکا. ئەوکات دەتوانین نوسەرەکان بەگوێرەی دۆخی رۆشنبیری و ئابوریانو شوێنیان لەدەزگا جۆراوجۆرەکاندا وەسفبکەین، واتە: کێ کارەکانیان بڵاودەکاتەوە، ئەو ئامرازانە چین بەکاریاندێنن، ئەو یەکێتیو فیدراسیۆنانە کامانەن کە ئنتمایان بۆیان هەیە، چۆن کرێ وەردەگرنو لەکوێو چۆن کاردەکەن؟ (دەشێ پرسیارگەلی لەم جۆرەش لەخوێنەران بکەین) هەلومەرجی بەکارهێنانی زمانەوانی دۆخەکانی گوتارو رەهەندی واتاکان دیاریدەکا بۆ ئەو کەسانەی کەزمانو کتێب بەکاردێنن.. ئەمەش بابەتێکی بەربڵاوە لەئیتنۆگرافیای پەیوەندیخوازیدا ***ethnography of communication***. [14]

(بڕوانە: ***Bauman & Sherzer, 1974. Cumperz and Hymes, 1972***)

هەمان پرس لەشیکاریی مادیانەی پرۆسەی بەرهەمهێنانی دەقو شێوازەکانی وەرگرتنیدا بوونی هەیە (*Eagleton 1976*). یەکێك لەداخوازیە توندەکانی زمانناسی، کە هاریکاریماندەکا بۆ تێگەیشتن لە هەڵوێستی نوسەرو دەقو کۆنتێکست، ئەوەیە کە گوتارو مەغزای گوتار لەڕووی بونیانەوە پێش پرۆسەی نوسین دەکەون. نووسەر دەتوانێ وشەو پێکهاتەکان هەڵبژێرێ، بەڵام پەیوەندی ئەو کاتە دروستدەبێ کە وشەو پێکهاتەکان بەواتا کۆمەڵایەتییەکان تێر دەکرێن. ئەو کات دەتوانین بڵێین کە نوسەرانیش وەك هەر بابەتێك، لەڕووی سیمیۆتیکیەوە دەبنە ئاماژەگەلێك لەدەقەکانیاندا. ئەو سەرابە تەفرەدەرەش کە لەدەقدا هەیە وەك "دانەری پەنهان" ***implied author (Booth, 1961 )*** بنیاتێکی ئەوتۆ دەپۆشێ کەنیشانەکانی بۆ خوێنەر ڕووندەبێتەوە.

## ج. خوێنەر

هەستکردن بەهۆشیاریو ڕێز لەئاست "دانەر"ێکی بالاْ دەست بەسەر دەق "کارەکە"دا، واتە بوونی خوێنەرێکی پاشکۆ کەرۆڵێکی ئەوتۆی نییەو خوێنەرێك کەلەژێر کاریگەریی کارەکەدایە. دروشمی ئەوانەی بەرگری لە"ئەدەب" دەکەن زادەی قسەیەکی بەناوبانگی هۆراس-ە کەدەڵێ: "شیعر چێژبەخشو سوودبەخشە"، واتە "ئەدەب" دوو ئامانجی هەیە: لە یەك کاتدا چێژ بەخوێنەر دەبەخشێو شتیشی فێردەکا. زاراوەی سەرەکی "چێژ *pleasure*" لەڕستەکەدا، بەچەند شێوەیەك پێناسەدەکرێ: هەستکردن بەپایەبەرزی، پابوونەوەی دەروون لەڕێگای هەڵڕشتنی هەستو سۆزەوە، یان پێکەوە گونجاندنی هاندەرەکانی (ناخی مرۆڤ) (*Richards, 1924*). یان سەرسامبوون بەلێهاتوویی شاعیر. لێرەوە کاتێ قسە لەدیوانی (لارکن) دەکەین کەپێشتر ئاماژەمان پێدا، دەکرێ وشەی "چێژ" چوارجار لەسەر یەك بەکاربێنین، وەك "چێژی هاوجۆریی بەرایی.." و ئاستەکانی تری چێژ. تیۆرە زۆر "ئیستاتیکیەکان" خۆیان لەبابەتی "چێژ" دەپارێزن و وەك دۆخێکی وەستاو تەماشای دەکەن. ویلێكو وارین ئەو دۆخەی ناودەنێن "لەسەر وەستان، یان پێچوونێك کەپێویست ناکا" (1963، ل32).

بەلاّم نیوەی دووەمی ڕستە کورتەکەی هۆراس باس لەسودی "ئەدەب" دەکا کاتێ خوێنەر ئاڕاستە دەکا. ویلێك و وارین لەو بارەیەوە دەڵێن: "زمانی ئەدەبی دەخوازێ کاریگەری لەسەر دیدوبۆچوونی خوێنەر هەبێ، فریوی بداو دواجاریش بیگۆڕێ" (1963، ل23). کێشەکە ئەوەیە کە لەحاڵەتێکی وادا ناتوانین بەئاسانی جیاکاریی لەنێوان "ئەدەب" و ئەدەبی ریکلام و وتاربێژیدا بکەین. ئەو دوو نوسەرە (ویلێك و وارین) بەدرێژایی سێ لاپەڕە هەوڵدەدەن چارەسەری ئەم کێشەیە بکەن، دواجار ئەگەنە ئەو بڕوایەی کە "شیعری راستەقینە بەشێوەیەکی چاوبەستەکی کاریگەری خۆی بەسەرمانەوە جێدێڵێ" (ل 24). هەرچەندە ئەم دیاریکردنە بەس نییە بۆ چارەسەری کێشەکە، بەلاّم هەستێکی ئەوتۆمان پێدەبەخشێ کە "ئەدەب" ئامانجێکی ئایدۆلۆجی شاراوەی هەیە. ئەڵبەتە مەرج نییە ئەو ئامانجە قەناعەتمان پێبکا، چونکە هێڵێکی فێرخوازی راشکاوانە لەرەخنەی ئینگلیزیو ئەمریکیدا هەیە دەربارەی توانا ئەخلاقیو رەوشتیەکانی "ئەدەب"، یان ئەوەی کەناوی دەنێم هێڵێکی ناسك کە دژی رەوتی مادییە. بنەماکانی ئەم نەریتە دەگەڕێتەوە بۆ ڕەوتی ڕەشبینی کە لەسەردەمی فیکتۆریدا دەربارەی ئاین، زانستو دیاردەکانی گەندەڵی لەکولتوری چینی ناوەڕاستی ئینگلتەرا لەئارادا بوو (*Wimsatt & Brooks, 1967, p. 440*). بەلاّم دروشمی ئەوانەی باوەڕیان بەخەسڵەتە ئەخلاقیو ڕەوشتیەکانی "ئەدەب" هەبوو لەلایەن (ئارنۆڵد *Arnold*)ەوە لەساڵی 1880 دا داڕێژرا کاتێ و وتی:

"ژمارەیەکی زۆری مرۆڤەکان، پاشان ژمارەیەکی زۆرتر، (رۆژی لەرۆژان) دەگەنە ئەو بڕوایەی کە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ شیعر تا ژیانمان بۆ شیبکاتەوە.. تا خۆشنودمان بکاو هۆکانی مانەوەمان پێببەخشێ. گەر شیعر نەبێ زانست بەنوقسانی دەمێنێتەوە، رۆژێ دێ شیعر دەچێتە جێی ئەو شتانەی دەربارەی ئاینو فەلسەفە باسیان دەکەین". (*Adams, 1971, p. 596*)

سەدەی بیستەم ئەو دیدوبۆچوونانەی بەخۆوەدی کەپێیانوابوو "ئەدەب" و فۆرمەکانی دیکەی هونەر، هەڵگری هێزێکی ئەخلاقیو کولتوورین، پابەندی پێوەرەکانی ئەو جیهانانەن کە لەکتێبەکاندا هەنو وێنەی ڕیگاکانمان بۆ دەکێشن، بەها مرۆییە جوانەکانمان نیشاندەدەن، لەپێناو

هاوسەنگی ڕاگرتن بەرامبەر ئەو ڕەوتەی دژی هونەرو ڕۆشنبیرییە *philistinism*.

دیدێکی تر هەیە سەبارەت بەپەیوەندیی نێوان "ئەدەب" و خوێنەران، کەشوێنکەوتوانی قوتابخانەی فۆرمالیزمی ڕوسی *Russian Formalism* کردوویانەتە بەڵگەی خۆیان. دەق–بەپێی دیدی فۆرمالیستەکان– تەوەری بابەخە، بەڵام (لەهەمان کاتدا) دەبێ تیورەی نامەئلوفیەت یان دژە ئاشنایی (*Defamiliarzation*) (15) لەبەرچاوگرین، کەتیورەیەکی سایکۆلۆجییە لەکاتی وەرگرتن‌و خوێندنەوەی دەقدا. فیکتۆر شکلۆفسکی *(1965, 1917) shklovsky* پێیوایە کە پرۆسەی وەرگرتن لەژیانی ئاساییدا پرۆسەیەکی دووبارەو ڕۆتینییە، بەڵام جیهانی هونەر کە زمانێکی تێدا بەکاردێ پێشتر بەکارنەهاتووە خوێندنەوەیەکی پێویستە کە ئاسان نییە، خوێنەر ناچاردەکا پەردەی مەئلوفیەت‌و ئاشنابوون لەبەرچاوی خۆی هەڵماڵێ و لەبەر ڕۆشنایی تیشکێکی نوێ بڕوانێتە جیهان. ئەم تیۆرەیە دەڕوانێتە خوێنەر بەو پێیەی وەرگرێکی چالاک‌و خاوەن بەرپرسیارێتییە، نەك تەنها وەرگرێکی سەلبی بەهاکان بێت یان تەنها کارلێکراوێك بێت.

سەرنج: یەکێك لەهەنگاوە گرنگەکانی تیورەو ڕەخنەی هاوچەرخ بریتییە لەو ڕۆڵە زۆر ڕوون‌و چالاکەی کەدراوە بەخوێنەر کەپێشتر ڕۆڵێکی تەقلیدی بوو. بۆ نموونە قوتابخانەی "تیۆرەی وەرگرتن" *Reception Theory* ڕۆڵێکی بنەڕەتی دەبەخشێ بەخوێنەرو لەبنیاتی دەقدا (بڕوانە: *Holub, 1984*). ڕۆلان بارت وەك نەریتی هەمیشەیی خۆی دروشمێکی ئیستفزازی دادەڕێژێ کە دەروازە ڕەخنەییە هاوچەرخەکان لەخۆدەگرێ: "لەدەقدا، تەنها خوێنەر قسەدەکا" (1975، ل 151). چونکە واتاکانی دەق لەڕێگەی خوێنەرەکانیەوە دیاریدەکرێ‌و پەی پێدەبرێ، لەسەر بنەمای مەعریفە گشتییەکانیانەوە لەئاست جیهاندا، هەروەها لەسەر بنەمای بیروباوەڕەکانیان کە کارئاسانی دەکەن لەپرۆسەی ناسینی ئەدەبیەتی دەقەکان‌و هەڵێنجانی دەرەنجامەکان. بەڵام کۆسپێك دێتە بەرڕێمان، ئەویش ئەوەیە کە لەهۆکانی گەیاندندا چونیەکی تەواو لەنێوان ئەو شفرەو مەعریفانەدا نییە کەلایەنە جیاوازەکان پێکەوە کۆبکاتەوە. لەحاڵەتی دەقی ئەدەبیدا کەلێنەکە زۆر بەرفراوانترە لەنێوان نووسەرو خوێنەردا. ئەو کەلێنەی کەبەهۆی پاراستن‌و هەڵسەنگاندنی باڵای دەقەکانەوە دروست دەبن کە لەڕووی مێژوویی‌و کولتوورییەوە دوورکەوتوونەتەوە لەخوێنەری هاوچەرخ. پەروەردەی ئەدەبی لەقوتابخانەکاندا شارەزاییەکی ئاراستەکەرمان پێدەبەخشێ کە لەسەر بنەمای گوتاری ڕەخنەیی لەچوارچێوەی پێوەرێکی سنورداردا دادەمەزرێ، کە دەستی قوتابی دەگرێ‌و شفرەکانی دەقی پێدەناسێنێ (ئاستەکانی ڕەوانبێژی، کەسەکان، کەرەستە هونەرییەکان، دیاردەکانی لاساییکردنەوە کە واتاکانی دەق ئاساندەکەنەوە). ئەم پرسە جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی لە لەسەر چەند جۆرێکی جیاوازی گوتار ڕاهاتووە، فێریاندەبین‌و دەیانپارێزین کە قوتابخانەو شوێنەکانی کارکردندا، لەژێر گوشاری دەزگا جیاوازەکاندا، لە قۆناغەکانی گەشەکردندا). "توانای ئەدەبی" کەبەرەنجامی هەموو شتەکانە، چوارچێوەی مێژوویی‌و کولتوریی مەعریفە جیاوازەکان‌و شێوازە جیاوازەکانی مەعریفە لەخۆدەگرێ، نەك تەنها مەعریفەیەکی گەردوونی کە داماڵراوبێ لەخەسڵەتەکانی "ئەدەب"، کە بنیاتگەرەکان لەهونەری شیعردا بانگەوازی بۆ دەکەن (*Culler, 1975*).

پەروەردەی ئەدەبی‌و (پرۆسەی) سنوردار کردنی دەق بەهیچ جۆرێك ناتوانن کەلێنی نێوان

نوسەرو خوێنەر پڕبکەنەوە، بەڵام هۆکانی گەیاندنی بەئەندازەیەك دەتوانن. رەنگە تیورەی "پەیوەندیی مەعریفی" *informativity* لای بوگراندو دریسلەر لەمبارەیەوە هاریکاریمان بکا. چونکە ئەو دەقەی کە هەموو شتێك بۆ خوێنەر ئاشکرا دەکا دەقێکی بێ کەڵك و بێ کاریگەرییە، بەڵام گەر خوێنەر خۆی ماندووبکا لەپێناو تێپەڕاندنی کەلێنەکەو ئازار بچێژێ تا دەگاتە مانا، ئەوا دەق پڕ سوودەو کاریگەرییە. ( *de Beaugrande & Dressler, 1981, chap. 7*) رەنگە ئەم سەرنجەی خستمانەڕوو کاریگەری تیوری نامەئلوفیەت یان دژە ئاشنایەتی روون بکاتەوە کەپێشتر باسمانکرد.

### د. دەق

پێویستە ئەوە بزانین کە تیۆرسازیی لەچاخی نوێدا دەربارەی "ئەدەب" یان دەربارەی "دەق"، رێڕەوی خۆی وەرگرتووەو فاکتەرەکانی لاساییکاریی و سوودگەریی و گوزارشتکاریی وەلاناوە، یان بەلانی کەمەوە بەچاوێکی نزم تەماشای ئەو فاکتەرانە دەکا. دەبینین ستراتیژی سەرەکی تیۆرەی دەق-ی هاوچەرخ بریتییە لەسنورکێشان بۆ دەقی ئەدەبی، ئەو دەقەی کە لەناو سنورەکانی خۆیدا بەسەربەخۆیی دەژی و هیچ پەیوەندییەك نایبەستێتەوە بەریشەکانیەوە لەناو مێژووداو لەناو ژیانی نوسەرەکەیدا، هەروەها هیچ ئامانجێکی سوودگەر یان پراکتیکی نییەو هیچ کاریگەریەکیشی لەدوورو نزیکەوە بەسەر خوێنەرەوە نییە. ئەو مەرجانەی کە ویمسات و بیردزلی *wimsatt & beardsley* بۆ ئامانج و کاریگەریەکانی دەق دایاننابوو ( *wimsatt, 1954. P. 39*) گوزارشتیان لەئارەزووی تیورسازە هاوچەرخەکان دەکرد دەربارەی سنوردارکردنی دەق و وەلانانی ئەو شتانەی پەیوەندییان پێوەی نییە.. ئەو مەرجانە لەپەنجاکانی (سەدەی بیستەمەوە) گەورەترین کاریگەرییان بەسەر تیورەی ئەدەبی و رەخنەوە لەئەمریکاو ئینگلتەرا بەجێهێشتووە. بەهەمان شێوە "جیهان" *world* لەدەق دوورخراوەتەوە، چونکە "ئەدەب" واقعێك وێناناکا کەپێشتر هەبووبێ، بەڵکو جیهانێکی تایبەت بەخۆی دروستدەکا، هەر بۆیە چەند کتێبێکی قوتابخانەیی وەك کتێبەکەی ویڵیك و وارین (1963) جەختیان لەسەر بەکارهێنانی چەند زاراوەیەکی دەکردەوە وەك: خەیاڵ، خەیاڵسازی و ئەفراندن.

هەروەها دەقی ئەدەبی وەك زانست خاوەنی بەرپرسیارێتییەکی لۆجیکی نییە سەبارەت بەڕێزگرتن لەهەقیقەت و ساختەکاریی لەشایەتی و بەڵگەدا (*Richards, 1924*). پرەنسیپی سەربەخۆیی دەق بایەخێکی ئەوتۆ نادا بەجیهان و نوسەرو خوێنەر، چونکە دەق تەنها پێویستی بەخۆی هەیە، خاوەنی "ژیانی تایبەتی" خۆیەتی هەروەك (ئیلیۆت) دەیووت-کاتێ تەشبیهەکەی (کۆلیردج)ی دووبارە دەکردەوە کە دەق بوونەوەرێکی زیندووە واتە خاوەن بنیاتێکی تەواوە کە لەچەند ئەندامێك پێکهاتووەو پەیوەندییەکی یەکتەواوکەر لەنێوانیاندا هەیە لەپێناو درێژەدان بەژیاندا. بەگشتی، بەچەند وشەیەکی زۆر تاکخوازیی و خۆپەسەندیی و نەرجسی گوزارشت لەتیورەی سەربەخۆیی دەق کرا، وەك "چامەی شیعریی خۆی لەخۆیدا"، "بنیاتی ناوەکی"، "رەخنە لەناوەوە"، "شاراوە"، "ناوەکی"، "بنەڕەتی" و.. چەند خەسڵەتێك کە لەناو خۆیاندا بوون و پەیوەندییان بەشتی ترەوە نەبوو، وەك "خاوەن ئامانجی خودگەر"، "پەیوەندیدار بەخودەوە"، "خود کاریگەری" و "خود نێوەندی".

وتەزای سەربەخۆیی دەقی ئەدەبی ئەو مەتەڵە ئۆنتۆلۆجییە هەڵناهێنێ دەربارەی (بوونی شت لەناوخۆیداو بۆخۆی) واتە قەوارەی "ئەو". ئایا

بەکارهێنانی ڕاناوی "ئەو" بەشێوەیەکی ئاسان بەڵگەی ئەوەنییە کە دەقی ئەدەبی "شتێك"ی دیاریکراوە؟ ڕەخنەی مۆدێرن ڕیشەی وشەی (*poesis*)ی زیندووکردۆتەوە، کەبەشێوەیەکی گشتی مانای "سنعەت" دەگەیەنێ. کاتی خۆی ئەدیبە ئینگلیزەکان لەسەدەی چواردەدا زاراوەی "سنعەتسازیی شیعر" یان بەکارهێناوە، پاشان لەسەدەی شازدەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان بەمانای "شیعر" بەکارهاتووە وەك هاوواتای *poetic*. کەواتە دەق سنعەتسازییەکی زیرەکانەیە، کارێکی هونەرییە، توحفەیەکی هونەرییە کە مرۆڤ دروستی کردووە، دواتر چواندنی دەقی ئەدەبی بە کارە تەقلیدیەکانی هونەری شێوەکاری برەوی زۆری پەیدا کرد، کە پەیوەندییەکی یەکانگیر (لەنێوان شێوازەکانیدا) هەیە، وەك: ئایکۆن *icon*، گۆزە *urn*، مۆنیومێنت *monument*. هەر بۆیە شتێکی سەیر نییە کە چەند دەروازەیەکی ڕەخنەی هونەری شیعریی جەخت لەسەر مادیەتی دەقی ئەدەبیو بایەخی ئامرازی گەیاندن کە بە (زمان) ناسراوە، دەکاتەوە. دەکرێ ئەو دەروازە ڕەخنەییانە ناوبنێین دەروازە شێوەگەرەکان (فۆرمالیستەکان *Formalist*)، کە ڕێچکە خودگەرەکانیان زادەی فۆرمالیزمی رووسینو لەبیستەکانی (سەدەی بیستەم)ەوە بلاوبوونەتەوە (بەگشتی بڕوانە: *Hawkes, 1977. Bennet, 1979. Leman & peis, 1965*) هەر ئەو ڕێچکانە کاریگەرییان لەسەر بنیاتگەری هەبوو لەشەستەکاندا (*Hawkes, 1977. Culler, 1975*). گرنگترین پێشەنگانی ئەو بیرۆکانە بریتیی بووە لە: شکلۆفسکی (1917، 1965)، موکارۆڤسکی *Jan mukarovsky (1965, 1932)* و ڕۆمان یاکۆپسن (1960).

یاکۆپسن ئاشکرایدەکا کە "ئەرکی شیعریی زمان، واتە ئەو تایبەتمەندییەی ئەدەب دەکاتە ئەدەب، لەو جووڵەیەدایە کە بەرەو پەیام *message* دەڕوا، هەروەها چڕبوونەوەی ئەو ئەرکە لەگەیاندنیدا، بۆ پەیامەکەو لەناویدا. ئەم ئەرکەش کە بەپلەی یەکەم لەپەیوەندیەکاندا بەرجەستە دەبێ، دوالیزمی بەڵگەنەویستی نێوان نیشانەکان و شتەکان قووڵدەکاتەوە (1960، ل 356). مەبەستی یاکۆپسن لەپەیام ئەو فۆرمەیە کەزمانی دەق وەریدەگرێ لەڕووی دەنگ، دەسخەت، پێکهاتەو واتاکانیەوە، پتر لەوەی ناوەڕۆکێك بێت کەپێویست بەگەیاندن بکا. جەختکردنەوە لەسەر داڕشتنی دەق لەڕێگای دیدێکی چڕەوە بۆ چوارچێوەی ستراکتووریی دێتە ئاراوە، هەروەها لەڕێگای دابەشکردنی دروستەوە، لەڕێگای بەگەڕخستنی وردی تەکنیکە ڕەوانبێژیەکان کە تەونی زمانەوانی چڕدەکەنەوەو دەچنە نێو شێوازی دەرکەوتنی نیشانەکانەوە. یان وەك یاکۆپسن دەڵێ "پرۆسەی وەرگرتن- خوێندنەوە- سەختترو درێژتر - دەکاتەوە" (1917، 1965، ل12). دیریك ئاتریج *Derek Attridge* زمانی شیکاریی یاکۆپسن شیدەکاتەوەو ئاشکرایدەکا کە تیورەکەی یاکۆپسن زۆر سەرسامە بەرامبەر پێکهاتەی ئالۆزو وردەکاریەکانی چوارچێوەی ستراکتوریی (*Attridge, 1987, p. 24*). بەمجۆرە، شێوەگەریی زمانەوانی زۆر لە "ڕەخنەی نوێ" دەچێ کاتێ کە بایەخێکی زۆر بەئالۆزیەکانی بنیاتی ڕەوانبێژی دەدا. ئەمبرتۆ ئیکۆ *Umberto Eco* پێناسەیەکی هاوشێوەی هەیە کاتێ سەرنجمان رادەکێشێ بۆ لای "کەڵەکە بوونی جفرەکان *dvercoding*"، واتەبارکردنی دەق بەزۆرترین رازاندنەوەی ئاماژەییو نیشانەیی (*Eco, 1976. P. 264*) چونکە شێوەگەریی چەمکێکی بارۆکیی "ئەدەب"ە بۆ بەرزکردنەوەی پلەوپایەی چامەی لیریکی، بەوپێیەی نمونەی باڵای هونەری ئاخاوتنە. [16]

لەئەدگارە گشتیەکانی دیکەی چەمکی "ئەدەب" لەرەخنەی فۆرمالیستیو ڕەخنەی نوێدا،

ئەو گریمانەیەیە کە پێیوایە "زمانێکی ئەدەبی" و "زمانێکی شیعریی" تایبەتن جیاوازن لەزمانی ئاسایی‌و زمانی زانستی. ویلێك‌و وارین (1963، ل22–26) پێوەرە جیاکەرەوەکانی نێوان ئەو دوو ئاستەی زمان کورتدەکەنەوە بەپشتبەستن بەتێزەکانی تیۆرەی ئینگلیزی و ئەمریکی (کە بەپلەی یەکەم دەگەڕێنەوە سەر تیورەی واتا لای ا. ا. ریچاردس (*I. A. Richards*) دەربارەی تایبەتمەندییەکانی زمانی ئەدەبی‌و شیعریی: زمانێکە هیچ ژێدەر (مەرجەعیەت)ێکی نییە، تا زانستییە، خۆڕسکەو.. هتد. یەکێك لەو پێوەرانە دیدێکی فۆرمالیزمی ئەوروپی یان فۆرمالیزمی زمانەوانیمان یاددەخاتەوە بەوەی کە "زمانی شیعریی تواناکانی زمانی رۆژانە رێکدەخاو، هەندێ جار پێشێلیان دەکاو گوشاریان دەخاتەسەر وەك هەوڵێك بۆ بێدارکردنەوەی هوشیاریمان‌و ڕاکێشانی سەرنجمان" (ل24). زمانی شیعریی بەگشتی، لادانە لەزمانی (ئاسایی)و لادانە لەیاسا فۆنەتیکی‌و پێکهاتەیی‌و دەلالی‌و پراگماتیەکانی ئەو زمانە، لەڕێگای ئەو ئامرازانەوە کە داب‌و نەریتی رۆژانەمان تێکدەشکێنن‌و پەیوەندییەکانمان لەگەڵ ژیاندا دەشێوێنن، (ئەو دۆخەی) کەشکلۆڤسکی باسی کردووە. لەبواری زماننناسی شێوازگەریدا، لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەو کەرەستانەی دەقەوە ئەنجامدراوە کە رۆڵدەبینن لەپرۆسەی لادان‌و تێکشکاندنی مەئلوف‌و ئاشنا (بۆ نموونە بڕوانە: *Leech, 1969. Clugsenaar, 1976*) ، (بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی زمانی ئەدەبی‌و لادان لەمەئلوف، بڕوانە: *Fowler, 1981 & 1986*).

***سەرنج:***

بەستنەوەی رێچکەی فۆرمالیزم لەئەدەبدا بەزانستی زماننناسییەوە وێناکردنێکی ئەوتۆی خستۆتەوە کە دەقەکان بنیاتگەلێکی بابەتی‌و شێوەیی (شکلی)یان هەیە. پرۆسەی گەیشتن بەو بنیاتانە. بەڕای شوێنکەوتووانی بزاوتی رەخنەی نوێ– تەنها "لەڕێگای ئەو وشانەوە ئەنجامدەدرێ کە لەسەر لاپەڕە تۆمارکراون". چونکە دەقەکان خاوەن پێکهاتەگەلێکی فۆنەتیکین بەیەکەمین پلەو دواپلە. دەق لەدیدی زماننناسی نوێدا، لەسەدەی بیستەمدا، بریتییە لەزنجیرەیەك ڕستە کە لەسەر چەند ئاستێك گوزارشتیان لیدەکرێ. ئەو زنجیرە ڕستەیە بەشێوەیەکی ڕەمەکی بەدوای یەکدا نایەن، بەڵکو بنیاتێکی یەکانگیریان هەیە لەئەنجامی ئەو شتەی کە هالیدای‌و ئیهاب حەسەن (1976) ناویاننناوە: "پەیوەندییەکانی یەکانگیریی کە ڕستەکان بەیەکدییەوە دەبەستنەوە". ڕستەش –لای خۆیەوە– لەچەند یەکەیەکی بچوك‌و لەچەند پێکهاتەیەکی سێنتاکسی‌و مۆرفۆلۆجی پێکهاتووە وەك: نیمچە ڕستە، فرێز، نیمچە قسە، دەنگەکان‌و نیشانەکانی شیکاریی زمانەوانی و..هتد. هەروەها بنیاتی ڕستە لەچەند یەکەیەکی فەرهەنگی (معجمی) پێکهاتووە، وەك جۆرەکانی وشە کە لەفەرهەنگەکانی زمان وەردەگیرێن. جگە لەمانە، ڕستە بنیاتێکی دەلالی هەیەکە پەیوەندییە سیمانیکیەکانی لەشێوازە جیاوازو جۆراو جۆرەکاندا دروستدەبن، وەك: شیکردنەوە، وردکردنەوە، دووبارەکردنەوە، حەشو، هاودژی‌و رەتکردنەوە، کورتکردنەوەو درێژپێدان، دژە ڕەگەزی‌و هاوڕەگەزی (جناس و طباق)و ...هتد. دواجار، لەسەر ئاستی ماددیی پەتی، دەقەکان لەچەند دەنگێك پێکدێن کە بەپیتەکان ئاماژەیان بۆ دەکرێ‌و لەڕێگای شیکردنەوەی دەنگەکان و دەسخەتی نوسەرەوە گوزارشتیان لێدەکرێ.

ئەو ئاستە پێکهێنەرانەی باسکران، لەمیتۆدی وەسفی بۆ شیکردنەوەی زمانەوانی بەکاردێن، ئەوانەی ئەو میتۆدە بەکاردێنن پێیانوایە کە توانای شیکردنەوەی هەر دەقێکیان هەیە، جا ئەو دەقە "وتووێژ" بێت یان "ریکلام" یان "چامەی

شیعریی" یان "لێدوان لەسەر یاری تۆپی پێ" یان "کورتە چیرۆك" بێت. بەڵام سەرباری ئەوەی هەندێ لەو توێژینەوانە کە میتۆدی وەسفی پێڕەو دەکەن لە شیکردنەوەی دەقەکاندا و سەرباری ئەو پێوەرانەی بۆ پۆلێنکردنی دەقەکان بەکاریدێنین، بەوەی هەندێکیان "دەقی ئەدەبی" و هەندێکیان "دەقی نائەدەبین".. بەڵام ئەو توێژینەوانە سوودی ئەوتۆیان نەگەیاندووە، بگرە زمانناسەکانی وەك یاکۆپسن کە باسیان لە پێوەرگەلێکی زمانەوانی زانستی کردووە بۆ "ئەدەب"، بەشێوەیەکی خراپ (دەق)یان شیکردۆتەوە و تیۆرەی (دەق)یان بەکارهێناوە. بەهەرحاڵ، گەر بەشێوەیەکی نەزۆك توێژینەوەکان بەکارنەهێنرێن، ئەوا شیکردنەوەی دەق بەشێوەیەکی فۆرمالیستی سوودی خۆی هەیە بۆ هەموو لقەکانی دیکەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.

کورتبینی میتۆدی وەسفی شێوەگەریی لە لێکۆڵینەوەی دەقی ئەدەبیدا، بۆتە هۆی ئەوەی کە بەناچاری سنورە قەدەغەکراوەکان ببەزێنرێن و دان بەوەدا بنرێ کە دەقەکان تەنها چەند بنیاتێکی زمانەوانی شێوەیی نین. پێشتر لە سەرنجەکانماندا دەربارەی برگە تایبەتەکان دەربارەی (جیهان، نووسەر و خوێنەر) چەمکێکی ئاڵتەرناتیڤمان خستەڕوو کە پێیوایە دەق "گوتارێکی کۆمەڵایەتی"یە (*Fowler, 1981*) یان جۆرێکە لە "چالاکی پەیوەندی" (*de Beaugrande & Dressler, 1981*). گەر دەق وەك میتۆدی وەسفی بەمانایەکی زمانەوانی بەرتەسك دیاریبکرێ و تەنها ئامرازی گوتار و پەیوەندی بێت، ئەوا هێز و کاریگەری و دەلالەتی خۆی لەو مەعریفە و بەهاو بیروڕایانەوە وەردەگرێ کە دەیبەخشێ بە خوێنەر و بنیاتە زمانەوانی و رۆشنبیریەکان و لە چەند سیاقێکی دیاریکراوی گوتار و پەیوەندیدا لەسەری رێکدەکەون. بە مانایەکی زمانەوانی بەرفراوانتر دەبێ (زمانناسی شێوەگەری) خۆی پڕچەك بکا بە شیکردنەوەی پراگماتی، واتە "پەیوەندیی نێوان دەق و بەکارهێنەرانی دەق: وەرگرەکانی" بدۆزێتەوە.

(*Leavinson, 1983. Brown & Yule, 1983*)

پاشان پێویستە زمانناسی شێوەگەری بگۆڕدرێ بە شیکاریی سیاقی، واتە ئەو شیکارییەی کە پەیوەندیی نێوان دەق و نووسەر لەلایەك و دەق و وەرگر لەلایەکی ترەوە ئاشکرادەکا. لەوێیەوە بۆ: ئاستەکانی دەقنوسی، تێگەیشتن و هەڵگۆزینی ناوەڕۆك لە سایەی سیاقێکی پڕ لە مەعریفە، زانیاریی ئاڵوگۆڕکراو، ئایدیۆلۆجیا و ڕێکەوتنە گشتیەکان. گەر رووبەرەکەمان بەرتەسك نەبوایە و ئەرکمان تەنها نمایشێکی کورت نەبوایە، ئەوا بەدرێژی باسم لەم تیۆرەیە دەکرد. بەڵام بەهەرحاڵ بابەتەکە سەبارەت بە تیورەی دەق و گوتارە بەگشتی، نەك جۆرێك لە جۆرەکانی تیورەی "ئەدەب".

## (6)

## دوا تێبینی

لە دێر زەمانەوە "ئەدەب" قەوارەیەکی تایبەت و بەهایەکی مەزنی هەیە. بەڵام هیچ کام لە تیۆرسازانی ئەدەب یان فەیلەسوفانی جوانناسی نەیانتوانیوە پێناسەیەکی گشتگیر و تەواوی پێبەخشن. بەڕای من لێکۆڵینەوە لە "ئەدەب" بە مەبەستی دیاریکردنی سنورەکانی، هیچ نییە جگە لە بەفیڕۆدانی وزەی زەینی. بەڵام بەو مانایە نا کە بیرۆکەکە ڕەتبکەینەوە یان بایەخی بەها کۆمەڵایەتیەکانی ئەدەب بە کەم تەماشا بکەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە "ئەدەب" هێزێکی کۆمەڵایەتییە کە گاڵتەی پێناکرێ. لێرەدا حەزدەکەم ئاماژە بۆ نموونەیەك بکەم.

کاتێ سەرگەرمی نوسینی ئەم بابەتە بووم، حکومەتی بەریتانیا سەرقاڵی بەیاساییکردنی

ناوەڕۆك و شێوازی خوێندنی قوتابخانەكان بوو، كە دەبوو بەشێوەیەكی ئیجباری چەند بابەتێك بخوێندرێ، یەكێك لەوانە زمانی ئینگلیزی بوو. ناونیشانی بەڵگەنامەی پێشنیازكراو بریتی بوو لە "زمانی ئینگلیزی بۆ ئەوانەی لە نێوان تەمەنی پێنج ساڵان تا یازدە ساڵیدان" (*Cox, 1988*)، هەروەها خوێندنی "ئەدەب" و دەرخستنی بایەخی دەقی ئەدەبی لە ژیانی منداڵاندا، لەگەڵ زەرورەتی خوێندنی ئەدەب لە قۆناغە سەرەتاییەكانی قوتابخانەدا. ئەڵبەتە كەس لاریی لەم پرەنسیپە نییە، بەڵام من زۆر بە ئاسانی تێبینیم كرد – كە خوازیارم لێرەدا بۆچوونەكەم ڕوخێنەر نەبێ – كە بەڵگەنامەی ناوبراو شایەتێكی جوانی بەكارهێنانی زاراوەی "ئەدەب" یان خراپ بەكارهێنانیەتی لە گوتاری رەخنەیی هاوچەرخدا. ئەڵبەتە هەر زاراوەیەك بە ژینگەكەیدا دەناسرێتەوە وەك چۆن هەر مرۆڤێك بە هاوڕێكانیدا دەناسرێتەوە. رستەكانی وەك "باشترین ئەدەبی خەیاڵی" و "بەهای ئەدەب لە ژیانی تاك و پێگەیاندنیدا" (*Cox, 1988, p.27*) ئەوە ڕووندەكەنەوە كە تا ئێستا پێداگرتن لەسەر بەها نەریتیەكان هەر لە ئارادایە، هەروەها پێداگرتن دەربارەی رۆڵ و سوودی كۆمەڵایەتی ئەدەب لەلایەن ئەو لیژنەیەوە كە راپۆرتەكەیان نوسیوە، كە رۆڵێكە لەبەرچاوی هەر كەسێكە كە بایەخ بە شیكردنەوەی سیاقی ئەركی پەروەردەیی/ سیاسی بدا.

ڕەنگە تێگەیشتنی ئەو ڕێوشوێن و بەهایانە ئاسان بێت كە لە بەڵگەنامەكەدا خراونەتەڕوو گەر "ئەدەب" لە مەسەلەكە دەربێنین و تەنها قسە لە دەقە ئەدەبیەكان بكەین لە ڕووی بنیاتیانەوە، هەروەها لە ڕووی ئەو ڕۆڵەی لە چالاكی كۆمەڵایەتیدا دەیگێڕن. بەڵكو ئەم ئاسانكارییە گوڕوتین دەدا بە پەروەردەی ئەدەبی لە قوتابخانەكاندا، هەروەها بە لێكۆڵینەوەی ئەدەبی باڵا لای خاوەن پسپۆریەكان، (ئەم كارە مەیسەر دەبێ) گەر بیرۆكە ئاڵۆز و وشە شلەكانی وەك "خەیاڵ"و "هونەر" بگۆڕین بە چەمك و ئامرازی ئەوتۆ كە قابلی شیكردنەوەبن لە كارە رەخنەییەكاندا. چەند كەرەستەیەكی هونەریم خستوونەتە ڕوو كە لە زماننانسی دەق و شیكاریی زمانەوانی وەرگیراون، چەندین بیرۆكەی زانستی و تیۆرەی تر هەن كە لەم كتێبەدا هاتوون، هیوادارین هاریكاری بكەن لە پێناو پەردە هەڵماڵین و لابردنی ئاڵۆزی لە بواری لێكۆڵینەوە ئەدەبیەكاندان.

## پەراوێزەكان

1–لۆدفێگ جۆزیف یۆهان فیتگنشتاین (1889–1951) فەیلەسووفێكی بەریتانی بەرەچەڵەك نەمساییە. پاش لێكۆڵینەوەیەكی هاوبەش لەگەڵ بیرتراند راسڵ–دا، نامەیەكی فەلسەفی دەربارەی لۆجیكی فەلسەفی نوسیوە كە لە پەیوەندیی زمان بەجیهانەوە دەكۆڵێتەوە. خاوەنی كاریگەرییەكی گەورەیە لە بواری فەلسەفەی پۆزەتیڤیزمی لۆجیكیدا.

2–وشەی (كەشكۆڵ)مان لە جێگای *Corpus* داناوە، كە بەمانای (چوارچێوەیەكی كۆكەرەوە) دێت و بۆ بەرهەمی شاعیر یان بەرهەمی ئەدەبی نەتەوە. وەرگێڕی عەرەبی وشەی (دیوان) بەكارهێناوە. (و.ك).

3–*Coedemons Hymn* سرودێكی ئاینییە، كە قەشە و شاعیری ئەنگلۆساكسۆنی (كایدمۆن *Caedemon*) لە سەدەی حەوتی زاینیدا دایناوە. دەڵێن كایدمۆن كۆنترین شاعیری ئینگلیزە.

4–*The Vision Concerning Piers the Plowman* چامەیەكی شیعریی رەمزیی درێژە، گرنگترین چامەی ئەدەبی ئینگلیزییە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا. چەند برگەیەكی دراوەتە پاڵ ولیام لانگلاند *Langland*. لە نێو رەخنەگراندا مشتومڕێك هەیە سەبارەت بە خاوەنی راستەقینەی بەشە جیاوازەكانی ئەو چامەیە.

5-*Absalom & Achitophel* چامەیەکی گاڵتەئامێزی شاعیری ئینگلیزی (درایدەن *Dryden*)ە، ساڵی 1681 بە شێوازێکی ڕەمزیی نوسیویەتی دەربارەی هەندێ ڕووداوی سیاسی ئەو سەردەمە و جەماوەرێکی زۆری هەبووە.

6-"ژیان و بۆچوونەکانی ولیام شاندی" ڕۆمانێکە لۆرانس ستێرن *Stern* (1713-1768) نووسیویەتی، نۆ بەرگە و تەرجەمەکراوە بۆ زمانی فەرەنسی و ئەڵمانی.

7-چامەیەکی لاواندنەوەیە شاعیری ئینگلیزی تێنیسۆن نووسیویەتی لە نێوان ساڵانی 1833-1850، وەك یادێك بۆ هاوڕێکەی (هێنری هالام) کە لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا لە ڤیەننا گیانی لەدەست دابوو.

8-ڕۆمانێکە د. هـ. لۆرانس *D. H. Lawrance* نووسیویەتی و ساڵی 1915 بڵاوبۆتەوە.

9-ڕۆمانێکی ڕۆماننوسی ئینگلیزی هاوچەرخ (کینگزلی ئەمیس *K. Amis*)ە، کە ساڵی 1920 لە دایکبووە.

10-درامایەکی رادیۆییە شاعیری ویڵزی دیلان تۆماس *D. Thomas* (1914-1953) نووسیویەتی و پاشان چەند جارێك وەك شانۆ پێشکەشکراوە. چەندین گۆرانی و بڕگەی فۆلکلۆری تێدایە و بە زمانێکی شاعیرانە نوسراوە.

11-ڕۆمانێکی نوسەری ئینگلیزی بەرەچەڵەك هیندی (سەلمان روشدی)یە، کە ساڵی 1947 لەدایکبووە. ساڵی 1981 بڵاوبۆتەوە.

12-هاڵیدای پێیوایە کە پێویستە زمان گوزارشت لە ناوەڕۆکێك بکا. واتە وەزیفەی (وێناکردن *representational*)ی هەبێ، یان وەك خۆی ناویدەنێ وەزیفەی وێناکردنی پەتی، کەلای هەندێ کەس بریتییە لە گوزارشتکردن لە "واتای مەعریفی *cognitive meaning*". هاڵیدای بڕوای وایە کە وەسفکردنی ئەم ئەرکە بەوەی مەعریفییە وەسفێکی هەڵخەڵەتێنەرە، چونکە هەموو وەزیفەکانی زمان ئاستێکی مەعریفییان هەیە، هەربۆیە وەزیفەی وێناکردنی پەتی دابەشدەکا بەسەر دوو ڕەهەنددا:

یەکەم: ڕەهەندێکی مەعریفی کە لە ڕێگایەوە قسەکەر یان نووسەر شارەزایی خۆی لە ئاست دیاردەکانی جیهانی ڕاستەقینەدا بەرجەستە دەکا، کە ئەزموونەکانی جیهانی ناوەکیش بەرجەستە دەکا و لە چینەکانی هوشیاریدا کەڵەکەبوون، وەك: پەرچە کردارەکانی نوسەر، زانیاریەکانی.. هەروەها شێوازی بەکارهێنانی زمان لە ئاخاوتن و تێگەیشتندا.

دووەم: ڕەهەندێکی لۆجیکی کە لە پەیوەندییە لۆجیکییە بنەڕەتیەکانی زماندا دەردەکەوێ، بە پلەی یەکەم پشتئەستوورە بە تێگەیشتنی پەیوەندییە سێنتاکسیەکان، تا ببێتە توخمێکی وەزیفی بێلایەن و لۆجیکی کە ڕۆڵی خۆی دەبینێ لە بواری گشتی مەدلولەکاندا، دوور لەلایەنی مەعریفی کە پێشتر باسمانکرد. بڕوانە:

*M.A.K. Halliday: "Linguistic Function & Literary Style", in Essays in Modern Stylistics, ed. By Donlad C. Freeman (Methiuen, London, 1981), pp. 325-8.*

13-چامەیەکی شیعریی داستانئامێزیی ئینگلیزیی کۆنە، لە سێ هەزار و سەد و هەشتا و دوو دێڕ پێکهاتووە. چەند ڕووداوێکی ئەفسانەیی دەگێڕێتەوە، کە پێدەچێ لە سەدەی شەشەمی زاینیدا ڕوویاندابێ. پاڵەوانی ئەو ڕووداوانە (بیۆڵف)ە کە سەرکردەی خێڵێکی باکورییە، دەچێتە چەندین شەڕ و قارەمانێتییەوە دژی ئەژدیها و خەڵکانی سەر بە خێڵەکانی تر، لە سەردەمێکدا کە قۆناغی وەرچەرخانە لە بتپەرستییەوە بۆ ئاینی مەسیحی. خاوەنی ئەم چامەیە نادیارە، لە سەدەی هەشتەمی زاینیدا دۆزراوەتەوە و یەکێکە لە کۆنترین چامە شیعریەکان کە بە زمانە ئەورووپیە نوێیەکان نوسراوە.

14-زانستی ئینتۆگرافی *Enthography*، یان زانستی وەسفی مرۆیی، گرنگی دەدا بە توێژینەوەی دیاردە

مادی و کولتوریەکانی کۆمەڵ لە هەموو شوێن و زەمانێکدا. بایەخدەدا بە بەرهەمی کۆششی مرۆڤ بۆ کۆنترۆڵکردنی ژینگەی سروشتی و هەوڵدان بۆ وەبەرهێنانی دەرامەتەکانی ژینگە بۆ دابینکردنی پێداویستیە کۆمەڵایەتییە بەراییەکان. ئەو بابەتە مادیانەی کە گەشەی تەکنەلۆجی و مەعریفی گشتی وێنا دەکەن، لە پێشەوەی ئەو بابەتانەن کە ئەنتۆگرافیا گرنگییان پێدەدا. ئەو گەشەیەش زیندوێتی و توانای خۆگۆڕینی ئەقڵی مرۆیی دەردەخا لە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی سروشتیدا. ئەو زانیاریانەی ئەم زانستە کۆیاندەکاتەوە لە بواری زانستێکی تردا پۆلێندەکرێن و شیدەکرێنەوە کە ئەویش (زانستی مرۆڤشیکاریی)یە یان ئیتنۆلۆجیا *Ethnology*.

15–دژە ئاشنایەتی یان نامۆکردن *(estrangement)* *Ostranenie* زاراوەیەکە فۆرمالیستە روسەکان دایانڕشتووە. ئەوان بانگەوازیان بۆ ئەوە دەکرد کە زمانی ئەدەبی لە رووی پێویستی هونەرییەوە زمانێکی جیاوازە لە زمانی ئاسایی. چونکە زمانێکە دەچێتە بان ئەو ئاستانەی بەکارهێنانی زمانەوە کە پێیان ئاشناین. پاشان وزەیەکی گوزارشتخوازیی نوێ دەپۆشێ کە ئاشنایەتی لەو شتانە دەستێنێتەوە کە ئاشناین پێیان تاوەکو (بەجۆرێکی تر) وێنایان بکا، واتە ئەو شتانە نامۆ دەکا تا لە وێنەیەکی نوێدا کە پێشتر پێی رانەهاتووین بیانبینین.

16–ئاشکرایە نووسەر لێرەدا ئەو گرنگیدانە وردەی ڕێچکەی فۆرمالیزم بە وردەکاریی زمان و ڕەوانبێژی و جوانسازی ئەدەبی، دەچوێنی بە ڕێچکەی بارۆکی لە مۆزیك و هونەری شێوەکاریدا. هەر شیعرێك تەنرابێت بە زەخرەفەی فۆنەتیکی و وێنەی شیعریی سەرسووڕهێن و بەهێز لەو جۆرە مۆزیك و هونەرەی بارۆك دەچێ (کە لە ڕووی فۆرمەوە تەنراون) بەڵام لە ڕووی پەیوەندیی نێوان بەشەکانیەوە پێکەوە گونجاو نین. سیفەتی بارۆك *Baroque* بۆ شیعری لیریکی سەدەی حەڤدەی ئینگلتەراو سەرەتاکانی سەدەی هەژدەی فەرەنسا و ئیتالیا بەکاردێ.

## سەرچاوە

روجر فولر، الأدب. "موسوعة الأدب و النقد". ت: د. عبدالحميد شيحة، المجلس الأعلى للثقافة، 1999. ص 23–61.

# رۆژێك لە یۆنانی دێرین

-2-

## ئاگۆراو نیشتەجێكانی

ولیەم داڤیس

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد



ئەسیناى دێرین

### خانوبەرەكانی دەوروپشتی ئاگۆرا

بازاڕ بەردەوام هەیە[1]! ئاگۆرای گەورەو بەرین ئاوێزانی ژیان بووە. جیاوازیی نێوان شەقامە تەسكو پۆخڵەكانو ئەم شوێنە قەشەنگە زۆر سەر سامكەرە. خەڵكی ئەسینا زۆر گوێ نادەنە نمایش كردنی سامانو خودی تایبەتیو زیاتر گرنگیدەدەن بەرووكاری بیناو خانوبەرە گشتییەكانیان و بە سامانی نیشتمانی خۆیان دایاندەنێن، بۆیە رەونەقیان زۆرەو پێیانەوە ماندوو بوون.

ئاگۆرا مەیدانێكی بەرینە، لێرەو لەوێ بۆ سێبەر دارودرەختی لێ نێژراوە، بەرەو باكورو باشور درێژ دەبێتەوە. با بۆ ساتێك هەراو زەنای ئاپۆراو قەرەباڵغییەكە پشتگوێ بخەین، با چاوێك بخشێنین بە بیناو خانووبەرەكانی دەوری ئاگۆرادا. ئەوانە خەریكن شوێنەكە بەتەواویی دادەخەن و گەمارۆی دەدەن. گەرچی هەموویان وەكو یەك دڵگیر و قەشەنگ نانوێنن. هەندێكیان پەرستگای گەورەو بچووكن، وەك پەرستگای "باوانەی ئەپۆڵۆ" لە نزیكی گۆشەی باشوری خۆرەڵاتەوە، یان

"مێتروون" كە پەرستگای سیبێلی دایەگەورەی خوداوەندەكانە لە باشور. هەندێكی تریان خانووبەرەی میریین، كەمێك لە پشتی مێتروونەوە ستوونە دڵگیرەكانی خانەی ئەنجومەن دیارە، لەوێدا پێنجسەد ئەندامەكە وتووێژ لەسەر سیاسەتی ئەسینا دەكەن، لەولاشیەوە سۆڵۆس هەیە "بینا خڕەكە" سەربانەكەشی سایەوانێكی نووكتیژە، لە ژێر بنمیچەكەیدا بەردەوام ئاگری ناو ئاگردانە گشتییەكە بڵێسەی دێت، لەویَ كۆمیتەی ئەنجومەنی سەركردایەتی[2]و چەند ئۆفیسێكی دیكەی باڵا نان دەخۆن‌و دانوساندن لەسەر كاروباری شار دەكەن. زۆرینەی ئەو بینایانە لە سەرووی ئاگۆراوەن، جێگای هاتوچۆو گەڕانن، لە پایەو هەیوان و دالان‌و ستۆ پێكهاتوون.

ستۆ تێكەڵەیەكە لە سایەوانی باران، دوكان‌و بازاڕو نمایشگا، هەروەها ئۆفیسی گشتیشی لێیە. لەژێر سایەی ستۆی شاهانەدا، لە پاڵ ئەستونەكاندا، چپەچپو راگۆڕینەوەیەكە هەر مەپرسە، ئیشارەت‌و غەمزەكردنە، كۆبوونەوەی ئاپۆرای بیستەرانە، پاڵەپەستۆیە بەرەو هۆڵی دادگاو كۆبوونەوە. ریزی درێژی جورییەكان لەسەر سەكۆكانیان دانیشتون، "شا ئەرخۆن" كە یەكێك لە سەرۆكەكان راوەستاوە، هەژارێك بە تۆمەتی بێدینی غەرامە دەكرێت[3]. لەسەر دیوارەكانی پشتەوە یاسا دێرینەكانی داركۆو سۆڵۆن نوسراونەتەوە.

لە مەیدان تێپەڕین. لەوبەرەوە سەرایەكی هەتا بڵێیت بەشكۆ هەیە "دالانی رەنگین" راڕەوێكی سەرپۆشراوی درێژە، پەناگەیەكی چاكە بۆ بارانیش‌و بۆ هەتاویش، روكاری ناوەوەی دیوارەكان سپیكاریی كراون (چونكە پاڵی داوە بە ئاگۆراوە) پۆلیگنۆتۆس‌و نیگاركێشەكانی دیكە شارەزایی خۆیان لێرەدا سەرف كردووەو چیرۆكی ئەندێشەیی داگیركردنی تەروادەو بەزینی ئەمازۆنییەكانیان لەسەر دیوارەكان گێڕاوەتەوە، شەڕی ماراسۆنیشیان بەوجۆرە نیگار كردووە كە چیرۆكە مێژووییەكان دەیگێڕنەوە. "ستۆی زیۆس" شوێنێكی دڵگیری دیكەیەو تەرخانە بۆ پەرستنی زیۆسی بەخشەری ئازادی. بەڵام روكاری دەرەوەی دیوارەكان سواغ نەدراون، لەبری ئەوە قەڵغان‌و مەتاڵی جەنگاوەرە ئازاكانی ئەسینایان پێوە هەڵواسراوە.

لە ناوچەكراوەكانی مەیدانەكەدا جۆرەها وێنەو پەیكەری جیاجیا دەبینرێت، بۆ نمونە "دوازدە خوداوەندەكە"، بێشومار پەیكەری جەنگاوەرەكانی ئەسینای لێیە، وەك هارمۆدیۆس‌و ئەریستۆگیتۆن‌و بكوژانی ستەمكارەكان، هەروەها لە سێنتەریشدا چەپەرێك لە خۆرەلاتەوە بەرەو خۆراوا بازاڕ دەكات بە دوو كەرتەوە، لە ژمارەیەكی زۆر كەڵەكەبەردی هەڵچنراو پێكهاتووە، كەللەی ردێنداری هێرمێسی خواوەندی بازرگانی لەسەر یەكەبەیەكەیان دانراوەو هەریەكەی ژمارەی خۆی هەیەو تێبینی و راگەیاندنی ئاهەنگ و بۆنە رەسمییەكانیان لیَ هەڵدەواسرێت.

## ژیانی ناو ئاگۆرا

دەربارەی سیماو رووكاری ئاگۆرا زۆر شت هەیە بیڵێین، خەڵكی زۆر بایەخ دەدەن بە ئاگۆرا. مەیدانەكە پڕێتی لە ژاوەژاوو چالاكی‌و هاتوچۆ. كەسێكی ئەسینایی ئەگەر ئیشی بە بازاڕیش نەبێت، لانیكەم بۆ دەنگ‌وباس‌و هەواڵ زانین روو دەكاتە بازاڕ. بە دوو جار هاتوچووی سەرو خوار بە دالانە رەنگكراوەكەدا هەواڵ‌و دەنگ‌وباسەكانی پێدەگات، دەربارەی سیاسەتی دەرەوەی سێبێس، دەمگۆو پڕو پاگەندەی ئەوەی ئاگێسیلاوسی پیرە پادشای سپارتە مردووە، گەنمەشامی سەوز بووەو باری دانەوێڵە لە دەریای رەشەوە گەیشتووە یان نا، پادشای گەورەی فارس هەڵمەتێك ساز دەكات دژی میسر. زۆربەی ئاپۆراكە بەرگی سپییان پۆشیوە،

ئەوانەی سەر بە خێزانە هەژارەکانن چڵکن بوون، بەڵام کەم کەمە ڕەنگی شین و پرتەقاڵی و پەمەییش دەبینرێت. هەمووان بە زارێکی ئاتیکییانەی ڕەوان دەدوێن، هەمووان خەریکی دەستڕاوەشاندن و سەربادانن. ناوبەناو زەڕەی کەر، مرقەی بەراز، علیوەی قەلەمون، تێکەڵاوی ژاوەژاوی ئاخاوتنی مرۆڤەکان دەبێت. لەپاڵ ئەمەشدا کارگەو کارخانەکانیش بەدەنگی بەرز گرمەو خڕەیان دێت. ئیتر هات و هاوارە. لەمبەرو ئەوبەری ڕێگاکانەوە یەکتریی گاز دەکەن، جارچی هاواردەکات ئاندۆسیدێس ئەنگوستیلەیەکی گرانبەهای لێ بزر بووە، هەرکەسێك بیدۆزێتەوە خەڵات وەردەگرێت، یەکێکی تر دەڵێت فایدۆن ئەسپێکی چاکی هەیەو بە هەرزان دەیفرۆشێت. ئیتر هەریەکەی هەڵوەستەیەك دەکات و گوێ بۆ ئەم بانگەوازانە ڕادەدێرێت.

## دوکان و بازاڕ

وەلێ هەراو زەناو گەڕە لاوژێکە جۆرێك لە هارمۆنی و ڕێکوپێکیشی تێدایە. بەشی زۆری مەیدانەکە بە کۆشکی بچووك بچووك و مێزی فرۆشیارەکان گیراوە، شەوانە کۆیان دەکەنەوەو کلۆمیان دەدەن. بە نێوانی کۆشکەکاندا ڕاڕەوی تەسك هەیەو لەسەریان نیشانەی تایبەتی دانراوە، ڕێنمایی نەشارەزاکان دەکەن بەرەو شوێنە تایبەتییەکان: بۆ لای مەی و شەراب، بەرەو ماسی، گوڵ فرۆشان، ئیتر جۆرەها نیشانەو ئاماژە بەرەو جێگا جیاجیاکانی ئاگۆرا. بەشێوەیەکی گشتی بازرگانیکردن بە بڕو چەردەی بچووکەوە دەکرێت، هەر فرۆشیارێك بڕێکی دیاریکراو کاڵای هەیە بۆ ئاڵوگۆڕکردن، ئاگۆرا عەمبارو گەنجینەی گەورەی لێ نیە. هەرکەسە لای مێز و دەستگای خۆیەوە هەناسەبڕکێیەتی و هاوار دەکات: "وەرە بۆ زەیت"، "وەرە بۆ خەڵوز"، "وەرە بۆ گۆشتی قاورمە" ..هتد، جارجار بۆ ساتێك کپ دەبێتەوەو لەگەڵ مشتەریدا دەدوێت.

لە جوغزێکدا سیرو پیاز دەفرۆشرێت (خواردنی هەژاران)، کەمێك لەولاتر، شەراب و میوەو بەرهەمی باخ و کێڵگە دەفرۆشرێت. نیسك و بازێللا لە یەك ڕیزدان، یاخود لێنراون و بە حازری دەفرۆشرێن. یەکێك لە شوێنە گرنگەکان بازاڕی نان و کولێرەیە. چەند پیرێژنێکی زمانلووس و چەنەباز خەپلە کولێرەی زل زل دەبرژێنن و یەك لەسەر یەك بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش هەڵیان دەچنن. لەولاترەوە بازاڕی گۆزەو دیزەو ئیشی قووڕ هەیە، لای ئەوسەری ئاگۆراوە، ئەو شوێنانەی لێیە کە شتی گرانبەهایان لێدەفرۆشرێت، وەکو خشڵ و گالیسکەو کەلوپەلی نایاب. لەچەند بەشێکدا، کەسانێکی دەنگ گەورە، سینی و شتی وایان بەدەستەوەیە، دێن و دەچن و هاوار دەکەن و دەفرۆشن، ئەمانە خۆراك نافرۆشن، بەڵکو داودەرمانی پزیشکییان پێیە. دەوای شیفابەخش بۆ ئەوانەی هەست بە ناساغی دەکەن. خەڵکی بێئاگا فریویان پێ دەخۆن و لێیان دەکڕن؟

## گوڵ فرۆش و ماسی فرۆشەکان

دوو بەشی زۆر سەرنجڕاکێش و تایبەتی لە بازاڕ، گوڵفرۆشان و ماسیفرۆشانە. گوڵ و گەڵاو گژوگیا، بە تایبەتی کە دەکرێن بە تاجەگوڵینە، شتێکە یۆنانییەکان ناتوانن فەرامۆشی بکەن. ئەوەی ئاهەنگێکی خێزانیی تایبەتی هەیە، بۆ نمونە لەدایکبوونی کوڕێك، ئەوا دەبێت هەموو میوانەکانی تاجی گەڵازەیتون بکەنە سەریان. ئەگەر ئاهەنگی زەماوەندکردن بێت، ئەوا تاجەگوڵینە[4]. گەڵای داربەڕوو بۆ شکۆدارکردنی زیۆس، گەڵای کاژ بۆ ئەپۆلۆ، گوڵ بۆ ئەفرۆدێت ئامادە دەکەن (ئەی چۆن، بۆچی خودای خۆشەویستی ئازیزی هەمووان نیە؟). بە کورتی سازدانی بۆنەیەکی کۆمەڵایەتی

بەبێ تاجەگوڵینە، مەحاڵە. کچانی گوڵفرۆش لە ئەسینا کچی جوانو خڕنو سەلارن. لاوانی مێبازو قسەزان لە دەوری دوکانەکانیان خڕ دەبنەوەو خۆیان تێهەڵدەسون، ئەو کچانە هەموو کەس دەناسن و بەناوی خۆیانەوە بانگیان دەکەن، ئێوارانیش خۆیان پێشکەشی کڕیاران دەکەنو فلوت دەژەننو ئاهەنگ گەرم دەکەن.

بازاڕی ماسیفرۆشان ئاوەدانو پڕ هەراو زەنایە. ئەسینایییەکان خۆیان بەوەوە بادەدەن کە "گۆشتخۆرن"و زۆر حەزی لێدەکەن. ئەوانیش وەکو بۆیاتێکانی دراوسێیان وان، بەڵام زیاتر حەز لە ماسی دەکەن. هیچ ئاهەنگێکی شێوی ئێوارە بەبێ ماسی خۆش نیە. کاتێك باری ماسی لە دەریاوە دەگاتە کەنار، زەنگ لێدەدرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی نزیکەی هەموو دوکانەکانی تر چۆڵ بن. قەرەباڵغی لای دوکانی ماسیفرۆش دروست دەبێتو دەکەونە پاڵەپەستۆ. ماسیفرۆش تووڕەو تۆسنەو بە فیزێکەوە مامەڵە لەگەڵ کڕیارەکانی دەکات، پیاوێکی چرووك و پارەپەرستە. بە دڵنیایی بازرگانی ماسیو گوڵفرۆشی بە برەوترین کاسپی ئەو رۆژگارە بووەو دوکاندارەکانی دیکە ئیرەییان پێ بردوون.

بێشك ئەم هەموو بازرگانیو کاسپییانە لە ناو تەختو کۆشکەکانی ئاگۆرادا جێیان نابێتەوە. ژمارەیەکی زۆر فرۆشیاری دەستگێڕیش بەرچاو دەکەون لەسەر زەوییەکە سیپاڵێکیان راخستووەو کەمێك کەلوپەلیان لەبەردەمی خۆیاندا بلاو کردۆتەوە. گەلێکی تریشیان لە بەردەمی پایەی نێوانی دووکانەکاندا، لەسەر شەقامە جیاجیاکان راوەستاونو کالاکانیان بەدەستیانەوەیە، واتە هەر یەکەی سوچێکیان بۆ خۆیان گرتووە. لێرەو لەوێ سەرتاش دەبینین، دوکانی تەداویکەرو دکتۆر (گەرچی کەڵەشاخگرە باشەکان، زیاتر لە سواڵکەری گەڕۆك دەچن)، جۆرەها کارخانەی بچووکیشی لێیە، وەك ئاسنگەری کە تێیدا شاگردەکان لای کورەکەوە خەریکی دروستکردنی چەقۆو ئامێری بڕندەن، خاوەن دووکانەکەش لەسەر تەختێك ریزیان دەکاتو دەیانفرۆشێت، خانی فرۆشتنی کویلەو کارخانەی دروستکردنی شەرابیش هەیە. هەندێك دوکان شەراب دەفرۆشن، بەڵام بە قەڕابە نا، بەڵکو بە پێکی بچووك، مشتەرییەکان هەر لەبەردەمی دوکانەکاندا دەیخۆنەوە.

## میوانی بەیانیان لە ئاگۆرا

گەڕانی یەکەمینمان کۆتایی هات، چەند شتێکمان بۆ روون بۆوە. یەکێك لەوانە بەشی زۆری ئاپۆراکە پیاوانن. ژنە نانکەرەکانو کچە گوڵفرۆشەکانی لێدەرچێت، بە دەگمەن ئافرەتێکی تر لەناو فرۆشیارەکاندا دەبینیت. لە نێوانی کڕیارەکانیشدا یەك تاقە خانمی بەڕێز و خانەدان نادۆزیتەوە. هیچ ئافرەتێکی خانەدانی ئەسینا سەردانی ئاگۆرا ناکات. تەنانەت ئافرەتانی خێزانە هەژارەکانیش وایان پێباشترە هاوسەرەکانیان ئیشی بازاڕیان بۆ بکەن. بۆیە گرووهی پیاوان رۆژانە سەردانی ئاگۆرا دەکەن، ئەگەر ئیشێکی ئەوتۆشیان نەبێت، ئەوا بۆ قسەو قسەڵۆكو زەمکردن و بینینی هاوڕێکانیان هەر دەچن، زۆرجاریش خزمەتکارێکی متمانەپێکراو دەنێرن بۆ بازاڕ تا شتومەك بکرێت. بەڵام ئەگەر لە ماڵەوە ئاهەنگێکی گرنگی نانخواردنی ئێوارەیان هەبێت، ئەوا پیاوان خۆیان زەحمەت دەکێشنو دەچن بۆ شتکڕین. ئەگەر پیاو خۆی شت بکڕێت، خۆی هیچ شتێك هەڵ ناگرێت، کۆیلەکان ئەم کارە دەکەن، کۆیلەکان (کە لە هەمووان هەژارترن) نیسکی کوڵاو، بازێللا، فاسۆلیا، پیازو سیریش بە سەبەتە هەڵدەگرن. لەولاوە سەربازێك دێتو کەمێك بازێللای کوڵاو لە خودەکەی سەری خۆیدا وەردەگرێت.

شتێکی دیکەی سەرنجڕاکێش. بەشی زۆری ئەسینایییە هەژارەکان کیسەی پارەیان پێ نییە. بەڵکو زیاتر لە چنگیاندا پارەکانیان هەڵدەگرن. لای یەکێك لە مێزەکانەوە پیاوێکی قژ ئاڵۆسکاو وردەو باقی پارەکانی لەناو دەمیدا هەڵدەگرێت[5]. چەند خۆشحاڵن ئەو خەڵکە سادەیەی هێشتا وەکو خەڵکی سەدەی بیستەم باس‌و خواسی میکرۆبیان نەبیستووە! لەگەڵ ئەوەشدا بەشی هەرە زۆری ئەسینایییەکان لەشساغ و تەندروستن.

یەك راستی دیکەش هەیە دەبێت لەپێشچاوی بگرین. لەوێ "دیاریکردنی نرخی کاڵا" بەهیچ جۆرێك نەزانراوە. بچوکترین کڕین‌و فرۆش سەوداو مامەڵەیەکی خەستی لێدەکەوێتەوە. کێ ژیرتر بێت‌و ئەوەی تر قایل بکات، دوای بێنەوبەرەیەکی زۆر ئینجا کڕیارو فرۆشیار رێدەکەون. هەموو ئەو شتانەی باسکران، بوونەتە هۆی ئەوەی ئاگۆرا ببێت بە قوتابخانەیەك بۆ فێربوونی کاروباری گشتی یان کێشمەکێش و بێنەوبەرە یاساییەکان.

## چینی دەوڵەمەندی ئەسینا

ئەسینا، لەچاو گەلێك لە شارەکانی دیکەدا، هێڵێکی روونتر و ئاشکراتری تێدا هەیە بۆ جیاکردنەوەی کارگەران‌و خانەدانان لە یەکتریی. جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوانی پۆشاکی کۆیلەکان‌و کارگەرو بازرگانە هەژارە سەربەستەکاندا نییە، بەڵام جیاوازییەکی بەرچاویان هەیە لەگەڵ پۆشاکی سەربازە چوارشانەکان بەخۆیان‌و چەك‌و مەتاڵ‌و قەڵغانەکانیانەوە کە لە مەیدانی جەنگ‌و کوشتارەوە دێنەوە، هەروەها پۆشاکی خانەدانە پۆشتەکانیش جیاوازە کە بە نەرمی بەرەو پەرستگاکان مل دەنێن. لە ئەسینا دیموکراسییەکی سیاسی مەزن هەیە، بەڵام دیموکراسی کۆمەڵایەتی کەمە. خۆش گوزەرانی، لە جۆرەها رێگاوە بەدەست دەهێنرێت، پارەپەیداکردن‌و کاری گران، پلەو پایەی بەرز، خەڵکانێکیش وەك مشەخۆر لەسەر ماندووبوونی خەڵکی تر دەژین و خۆیان تەرخانکردووە بۆ خزمەتی مەدەنی یان نوسین و فەلسەفە، ئەسینایییەکان زۆر ئالودەی ئەوانەن.

بۆیە، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئەوێ، ئەوانەی لەناو ئاگۆرادا دەسوڕێنەوە، بۆ کارو پیشەیەکی تایبەت نەهاتوون، چونکە ئەوانە ئیشی رەسمییان هەیەو لە ئۆفیسەکانی حکومەتدا کاردەکەن[6]. بەڵام لە هیچ شارێکی هیچ سەردەمێکدا بەم رادەیەی ئێرە هونەری هیچ نەکردن تەشەنەی نەکردووە. ئەسینایییەکان خەڵکێکن زۆر حەز بە کۆبوونەوەو پێکەوەبوون دەکەن. هەموو کەسێك هەموو کەسێك دەناسێت. یان وەك رەوانبێژێك وتوویەتی "مەحاڵە پیاوێك بتوانێت لەم شارەدا شکۆدار یان نزم‌و بێبایەخ بێت، بێ ئەوەی هەمووتان بیناسن". چەند پیاوێك پێکەوە پیاسە دەکەن، بە مۆنی‌و گرژییەوە دەدوێن. سەردانی بەیانیانی ئاگۆرا، بۆ ئەوەیە شتێکی نوێ بڵێیت یان ببیستیت[7]و ئەوەش دەمەتەقێ‌و گفتوگۆیەکی خۆشی بەدوادا دێت‌و دواتر لە وەرزشگا باسی لێوە دەکرێت، لەوانەیە درەنگتریش بخایەنێت‌و لە ئاهەنگی نانخواردنی ئێوارەشدا هەر باس باسی ئەوە بێت. سڵاوکردن‌و رێزگرتنی تاکەکەسی لە نێوانی خۆیاندا سادەو بێ گرێ‌و گۆڵە، دەستهێنانێکی کەم بە پۆشاکی پۆشراودا، یان دەست راوەشاندن نیشانەی سڵاوکردنەو برایەوە. یۆنانی ئازاد، خۆی بۆ کەس نانوشتێنێتەوە تەنانەت ئەگەر بۆ پادشای مەزنیش بێت. بۆ سڵاوو رێز دەستی یەکتریی دەگوشن و دەڵێن:

چێری ئاریستۆمێنێس

چێری کلیاندرۆس

ئەمە سڵاوی باوە، رەنگە ئەو وشەیە مانای چاك‌و چۆنیش و ماڵاوایی کردنیش بگەیەنێت.

## شێوازە باوەکانی دەوروبەری ئاگۆرا

بە دڵنیایی ئەم پیاوە گوشادو رووکراوانە بە شێوەیەکی دڵگیر خۆیان لە پۆشاك لوول داوە، پێیان خۆشە لە ژێر داڵانە بۆیە کراوەکەدا پیاسە بکەن، یاخود لە ژێر ئاسمانی شینا بێن و بچن‌و فەلسەفەو نەخشە سیاسییەکانیان، یان ئامادەکردنی مادەو بابەتی وتارە رەوانبێژییو دراماکانیان پێش بخەن و رەواجیان پێ بدەن، نەك بچن لەناو ئۆفیسی داخراودا خۆیان بەسەر مێزدا شۆڕ بکەنەوە. لە نیو سەدە لەمەوبەرەوە لە دەوری ئاگۆرای ئەسینا، تەرزێکی راستەقینەی ئەم جۆرە خەڵکە تایبەتییانە کە لەکاتی بێکارییاندا بە خۆیان‌و روخساری پێکەنیناوی‌و لووتی قنج‌و سەری رووتاوەو جەستەی خڕو خڕین‌و چاوی ئارام لێبڕاویان‌و شان‌و شەوکەتی تایبەتییانەوە دەبینرێن، ئەمانە سەرقاڵی ئایدیاو هزرەکانیی خۆیانن. یەکێکیان پیاوێکی بە تەمەنی رێکپۆشی خۆهەڵواسی قسەزان و زۆربڵێیە، کە مێژوو ناوی سۆکراتی لێناوە.

بێشك، هەموو ئەسینایییەکان کاتی بێ ئیشی خۆیان ئاوا بەکارناهێنن. گەلێك لە پیاوە لاوەکان بە رۆبی درێژی ئاودامانەوە خڕبوونەتەوە، زەیتیان داوە لە قژیان‌و بەشێوەیەکی ژنانە پرچیان هۆنیوەتەوە، پەنجەکانیان پڕن لە ئەنگەستیلەو خشڵ. ئەمانە میوانی ئەریستۆفانێسی شاعیری کۆمیدن، هاتوون بۆ بینینی نمایشێکی گاڵتەجاڕانە. هەروەها زۆرێکی تریشیان کە خاوەنی هیچ فەلسەفەیەك نین یان دانایییەکیان نیە، تا پاساوی قسەکردنی بەردەوام بدەنەوە، بەهەرحاڵ پێویستە دان بەوەدا بنێین ئەسینایییەکان زۆر حەزیان لە کەیف‌و رابواردنە، گێلانە خۆیان ناخەنە ژێر کاری بێهودەی ناپێویستەوە. بەختەوەریی ژیانی ئەوان پیاوانی وەك پێریکلێس‌و سیۆسیدێس‌و ئەسخینیاس‌و سۆفۆکلێس‌و یۆرپیدێس‌و سۆکرات‌و ئەفلاتونی پێشکەشی جیهان کردووە، نابێت فیدیاسی هونەرمەندیشمان لەبیر بچێت، ئەو پیاوە بە هونەرەکەی خۆی هەموویانی سەراسیمەی کردبوو.

## سەرتاشخانەکان

نەریتی بێ ئیش‌و کاری بەشێوەیەکی سروشتی بووەتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێك دامودەزگای سەمەرە. بۆ نمونە، سەرتاشخانەکان ببوون بە شوێنی کۆبوونەوەو وتووێژ. لەو سەردەمەدا تەنها چەند هێلینییەکی کەم ردێنیان دەتراشی[8]، زۆربەی هاتۆچۆکردن بە ریشی بژی شانەنەکراوەوە دەگەڕان، بەڵام قژی درێژو ئاڵۆسکاویان، زۆر لا ناشرین بوو. بۆیە دوکانی سەرتاشەکان، یان ئەو ژورانەی لەسەر کۆڵانەکان کرابوون بە سەرتاشخانە، زۆر بوون و جمەیان دەهات. سەرتاشەکان دەستڕەنگین‌و هونەرمەند بوون، قژی ماش‌و برنجیان قاوەیی یان رەش دەکردەوە، دەیانتوانی قژی مەعمیلەکانیان خاو بکەنەوە یان لوولی بکەن (ئەوکاتەش پرچ کردن بۆ پیاوان عەیب نەبوو). بەشێوەیەکی تایبەتیش بۆن‌و بەرامەی توندو کەسکونیان لە خۆیان دەدا، هەموو بەیانیانێك خەڵکێکی زۆر پێویستییان بەوە هەبوو سەرتاش دەستێك بە قژیاندا بهێنێت‌و بۆنی لێ بدات، ئەگەر لەوە زیاتریشیان بۆ نەکات. وەلێ مەرج نەبوو هەموو ئەوانەی دەچوون بۆ سەرتاشخانە، لەسەر تەختەکە بەرامبەری ئاوێنە بریسکەدارەکە دابنیشن. هەموو کەس بۆی هەبوو بچێتە ئەوێ‌و گوێ لە قسەو باس‌و هەواڵ بگرێت‌و بەشداریی ئاخاوتن بکات. تا هەموو هەواڵێك‌و هەموو پروپاگەندەیەك ببیستێت: بڵێی ئەنجومەن گەیشتبێتە ئەنجام بۆ دانانی بەرنامەیەکی نوێ بۆ دروستکردنی رێگا تازەکە؟ تۆ بڵێی لە ئۆلۆمپیادی داهاتوودا، ستەمکارەکەی سیراکیۆسا، پێشبڕکێی

گالیسکە بباتەوە؟. سەرتاشەکانیش بە هەمان شێوە بە زۆربلێی ناسراون.

جارێکیان سەرتاشێك لە شا ئەرخیلاوسی مەکەدۆنی پرسی: چۆن سەرت بۆ چاك بکەم؟

ئەویش بە مۆنییەکەوە وەڵامی دایەوە: بەبێدەنگی.

وەلێ بە تەنها هەر موڵکدارەکان خەریکی قسەکردن نین. هەموو کەسێك لەناو ژوورە بچووکەکەدا بەشداریی ئاخاوتن دەکات. کێبڕکێ و چەلەحانێ دەکەن، ئەگەر گروپی ناو سەرتاشخانەکە خەڵکی بەسامو بەڕێز بوون، مشتومڕەکان دەگوازرێنەوە بۆ سەر تیورییەکەی ئەفلاتون لەمەڕ "جیهانی ئایدیاکان"، یان یاخود لێکدانەوەکەی یۆرپیدێس بۆ پەیوەندی نێوانی خواوەندو مرۆ، یاخود هێماگەرێتییە رۆحانییەکەی سکۆپاس لە هالیکارناسۆس.

کەواتە سەرتاشخانەکانی ناو ئاگۆرا بەشێکی گرنگن لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەسینا. دواتر دەبینین وەرزشگا (جومنازیا)ش تەواوکەری ئەمانە. ئاگۆرا بەشی خۆی گلی داینەوە. غەڵبەغەڵب و ئاپۆراش روو لە کزییە. خەڵك دەستیان کردووە بە گەڕانەوە بەرەو ماڵ. بە پێی کاتپێوەکە (گنۆمون) کە هەتاوپێوێکی سادەیەو لە نزیکی یەکێك لە تاقەکانەوە دانراوە، نزیکی نیوەڕۆیە. ئێمەش لەگەڵ خانەدانێکی ئەسینایدا بەرەو ماڵی خۆیان دەڕۆینەوە.

## پەراوێزەکان

1–لە نێوان نۆ و دوازدەی بەیانیدا.

2–ئەو کۆمیتە هەڵبژێردراوە ناونراوە پریتانێس.

3–ئەوەی پێی دەوترا "شا ئەرخۆن" تایبەت بوو بۆ لێکۆڵینەوەی زۆربەی ئەو کێشانەی پەیوەندییان بە مەسەلە ئاینییەکانەوە هەیە.

4–یۆنانەکان زۆربەی گوڵ و گوڵزارەکانی ئێمەیان نەبووە. گوڵە باوەکانی ئەوان بریتی بوون لە وەنەوشەی سپی، نێرگز، گوڵە سۆسەن، گوڵە یاقوت، لەگەڵ گوڵاڵە سورەدا (گوڵەکەی زیۆس). تاجەگوڵینەی باو لە گوڵەمۆرد یان لاولاو دروست دەکراو پاشان چەند گوڵێکی دیکەشی تێکەڵاو دەکرا.

5–کڕیاری دەوڵەمەند کیسەی پارەی خۆی پێ بووە، یاخود پارەی زیاتری هەڵگرتووە، بە زۆریی کۆیلەکەی هەڵی دەگرت.

6–خزمەتکردن لە یەکێك لە ئۆفیسەکانی شاردا (بە گشتی بێ ئەوەی هیچ موچەشی هەبێت) ئەوپەڕی هیوای هەموو یۆنانییەك بوو. ئارەزووی بەشدارییکردن لە کاروباری گشتیدا شتێك بوو هەمووان ئالودەی ببوون.

7–کاری پەیامبەرەکان، 17:21.

8–ئەسکەندەری مەزن (336–323پ.ز) داوای لە سەربازەکانی کرد ریشیان بتراشن (تا دوژمن نەتوانێت پڕ بکات بە ریشیاندا!) ئیتر لەوەوە نەریتەکە بەناو جیهانی هێلینیدا بڵاوبۆوە.

## سەرچاوە

*WILLIAM DAVIS:*

*A Day in Old Athens*

# چەپکە شیعرێکی ئانا ئاخماتۆڤ

له فارسییەوە: لەیلا سالْحی



ئانا ئاخماتۆڤ

"دابڕاو"

دەڵێی ئەوانە ئاگرێك بوون
لەگەڵ من تا کازیوەکان هەڵفڕین و
هەرگیز نەمتوانی تێبگەم
چلۆن بوون ڕەنگی ئەو چاوەسەیرانە
هەموو شتێکی دەوروبەرم
ئاوازی دەخوێندو من
هەرگیز نەمتوانی تێبگەم
تۆ دۆست بووی یان دوژمن.
زستان بوو یان هاوین

"کاتێک مانگ لە ئاسمان دا.."

کاتێك مانگ لە ئاسمان دا مۆرکێکی سەهۆڵینە
نەك چرایەك لە گەڕان دا..
هاوسەرە مردووەکەی من دێ
تا نامە عاشقانەکانم بخوێنێتەوە
ڕەمزی قفڵی کەشەوە دارینەکەی لە بیرە
زنجیری پێیەکانی لەسەر تەختی دارینی هۆدەکە
دەنگ دەداتەوە
مێژووی دیتنەوەکان دەبینێ
ئیمزا سەرسووڕهێنەرەکان دەبینێ

بەس نیە
ئەشکەنجەی ئەو.

## "تا ڕادەیەک لە ئەلبومێک دا"

هەورە تریشقە ببیستن، وە بیر من دەکەنەوە و
دەڵێن – ئەو تۆفانی دەویست.
ئاسۆ دەنگی گوڵ دەگرێ و
دڵەکان وەك جاران گڕگرتوو..
ئاوا دەبێ کاتێك من "مەسکەو"یش جێ دێڵم،
بۆ هەتا هەتایە و
دەچمە شوێنێك کە بە ئاواتم دەخواست
بە نیسێیەك کە لەلای ئێوەدا بەجێم هێشت.

## "وا ئێستە پاییز هات پڕ لە ڕەنگ و میوە"

وا ئێستە پاییز هات پڕ لە ڕەنگ و میوە
چەندی خایاند چاوەڕوانیم
پازدە بەهاری پڕاوپڕ لە خۆشی
زەوینم لە ئامێز گرت و
قەت لێی جودا نەبوومەوە
تا پاییز نهێنی خەوتووی خۆی
لەگیانما خوێندەوە.

## "دەبینی ئیتر باڵم نیە بۆ هەڵفڕین"

دەبینی ئیتر باڵێکم نیە بۆ هەڵفرین
لە نێوان ڕەوەی قووەکان دا..
خۆشەویستم! شاعیری هەڵبەستی عاشقانە
دەبێ پیاوبێ
ئەگینا هەموو شتێك ئاوەژوو دەبێتە
تا دابڕان دەگاتێ
باخ ئیتر باخ نیە، ماڵ ئیتر ماڵ و
دیتنەوە ئیتر دیتنەوە.

## "بەڵێ من.."

بەڵێ من کۆبوونەوەی شەوانەم پێ خۆش بوو:
پەرداخەکانی پڕ لە سەهۆڵ لەسەر مێزێکی بچووك
هەڵمی بۆن خۆش و لە سەمای قاوە
گەرمای شیرینی ئاگرینی سوور
گاڵتە خۆشە ئەدەبیەکان و
هەوەڵ نیگای دۆستێك
بەشەرمەوە هەڵبزڕکاو..
مەگەر من نەبووم لە پێی خاچ دا
مەگەر من نەبووم خنکاو لە زەریادا
خەفەتی چی، ئێستە لێوەکانم
تامی تۆیان بیرچۆتەوە.

## "بیرەوەرییەک لە ناخم دایە"

بیرەوەرییەك لە ناخم دایە
وەك بەردێکی سپی لە چاڵێك دا
ناتوانم لەگەڵیا بەشەڕ بێم، هێزیشیم نیە:
بۆ من شادییە و خەمیش
ئەگەر بێتوو کەسێك بڕوانێتە ناو چاومەوە
دەیبینێ.
خەمین تر دەبێ لەوەی کە
چیرۆکێکی دڵتەزێن ببیستێ.
دەزانم خوداکان مرۆڤ دەکەنە شتێك
بێ ئەوەی رووحی لێ بستێنن
تۆش بووی بە بەردێك لە ناخما
تا خەمەکان نەمر بکەی.

## "قەتم خۆش نەویستووە، هەر لە مێژە"

قەتم خۆش نەویستووە، هەر لە مێژە
"بەزەیی" بەهەر شێوەیەك کە بووبێ..
بەڵام لەلایەن تۆوە چ شیرینە
وەك لاواندنەوەی هەتاوێکی بەتین
سپێدە بەو هۆیەوە رووناکە و
من ئاوا مەستانە
سیحر دەخوڵقێنم.

بۆ دلاّوایی خوداوەند.

## "خولیا"

دابڕان تاریکە ومزر
بەشی خۆمی لێ وەردەگرم — تۆ بۆ دەگری.
دەستم بگرە ناو دەستت و بڵێ لە بیرم دەمێنی
بەڵێنی بدە سەرێك لە خەونەکانم بدەی
من و تۆ وەك دوو شاخ، دوور لە یەك، جیا لەیەك،
نەهێزی جووڵەیەك، نە هیوای دیتنێك.
ئاواتم ئەوەیە
ئەوینت ئاوێتەی ئەستێرەی نیوەشەو
بۆ منی بنێری.

## "بێ خەوی"

جێگایەك، لە دوورە دەستەکان پشیلەکان دەناڵێنن
دوورترین هەنگاوەکان دەبیستم
وشەکانت لایەلایەم بۆ دەخوێنن
بێ ئەوەی کە بێڵن لەو سێ مانگەدا بۆ ساتێك
چاو لەسەر یەك دانێم.
دیسانەوە لەگەڵ منی شەونخوونی!؟
سیمای ئارامت دەناسمەوە
وەرە شۆخەکەم، دڵدارەکەم
شیعرەکانمت خۆش ناوێ؟
پەردەکانی پەنجەرە سپین
جۆبارێکی کاڵ لە دڵی ڕەشایی بەرەو پێش ئەکشێ
دەگیرسێمەوە لە هەواڵە دوورە دەستەکان دا
چ شیرینە لەگەڵ تۆ بوون.

## "پێمان وا بوو دەس کورتین و نەدار"

پێمان وابوو دەس کورتین و نەدار
بەلاّم کاتێ لە دەسچوونی هەموو شتێ دەستی
پێکرد،
هەموو ڕۆژێکمان بوو بە بیرەوەری
ئەوسا شیعرمان گوت
بۆ هەمووی ئەوەی هەمان بوو،

## "دەڵێی لێرە"

دەڵێی لێرە
هەرگیز دەنگی مرۆڤ نایەتە گوێ،
تەنیا بای سەدە بەردینەکان
دەرگا ڕەشەکان دەکوتن.
دەڵێی لێرە
لەژێر ئەم ئاسمانەوە
تەنیا من زیندوو ماومەوە
چونکە هەوەڵ مرۆڤێك بووم
ئاواتم خواست بۆ جامێکی شەوکەران.

## "ماڵە سپییەکەت.."

ماڵە سپییەکەت، باخە ئارامەکەت بەجێ دێڵم و
ژیانم دەسڕمەوە
ئەوسا لە شیعردا سەنات دەکەم
ئەو جۆرەی تا ئێستا هیچ ژنێك نەیکردبێ و
هەمیشە
بەشێك دەبم لە ژیانت
لەو بەهەشتەی بۆت چێ کردم
بە قیمەت ترینەکانی دەفرۆشم،
ئەوینەکەت، ناسك خەیاڵییەکەت.

## "بۆ شیعر"

منت تا ئەو شوێنە بردووە، هیچ ڕێگەیەك نایبا
بەگۆ ئەستێرەیەکی ئاگرینەوە، تانیشتمانی ڕەشی
خەم
بۆ من نائومێدی بووی، فریوبووی
بەلاّم، سوکنایی، هەرگیز.

## "شەوانە"

لەگەڵ شەپۆلەکان دەچمە پێش
لە دارستانا خۆم حەشار دەدەم

له قوولآیی ئاسمانەوە دەردەکەوم
دابڕانت دەتوانم
دیتنت، بەڵام چەتوونە.

## چوارینەکان

(1)

ڕۆژەکانی سپی و خاڵی کریسمەس
کڕێوە و بەفر، کڕێوە
بە من چی شەقامەکان خلیسکن
جێگەیەکم نیە بچم.

(2)

دەنگی زێڕ دەگۆڕێ، مەڕمەڕ دەبێتە خاک
پۆلا ژەنگ دێنێ، نەمان هاوڕێی هەموو شتیکە لە دونیادا
تەنیا خەمە خۆڕاگرە
تا ئەو کاتەی وشە بە شکۆ بمێنێتەوە.

(3)

هەموویان دەبەخشم و
لەپای خاچی مەسیح
ماچ دەکەم نێو چاوانی ئەوەی کە خیانەتی کرد
لێوەکانی ئەوەی نەیکرد.

## سەرچاوە

خاطرەی در دونم است، گزینەی شعرهای عاشقانە.
ترجمە احمد پوری. نشر چشمە، چاپ اول. 1377
تهران.

# دیکارت
# گفتوگۆ لەگەڵ بێرنارد ویلیامزدا

**لە فارسییەوە: محەمەد کەریم**



دیکارت

## پێشەکی:

ئاسایی هەرکاتێ زاراوەی "فەلسەفەی نوێ *Modern philosophy*" لە زانکۆکاندا بەکاردێ، بۆ جیاکردنەوەی ئەم فەلسەفەیەیە لە فەلسەفەی کۆن و فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست. بەم پێیە فەلسەفەی نوێ بە مانای فەلسەفەیە لە قۆناغی ریفۆرمی ئایینیەوە (لە سەدەی شانزەهەمدا) هەتا ئەمڕۆ، نەك فەلسەفەی سەدەی بیست. ئەو کەسەی کە بە گشتی–و بە ڕای من، بەڕاستی– بە بنیاتنەری فەلسەفەی نوێ لە قەڵەم دەدرێ، دیکارتە. کەواتە، بە دەربڕینێکی ڕوونتر، زاراوەی "فەلسەفەی نوێ" واتە "فەلسەفە لە دیکارتەوە بۆ دوای ئەو".

ڕینیە دیکارت – *Rene Descartes* – ساڵی 1956 لە فەرەنسا لەدایکبووە و زۆر باش خوێندوویەتی، هەڵبەتە فیکرێکی زۆر سەربەخۆشی هەبوو. هێشتا خوێندکار بوو کە دەرکی بەوە کرد کە ئەو کەسە مەزنانەی کە قسەکانیان بە بەڵگە لە قەڵەم دەدرێ، زۆر جار بەڵگەهێنانەوەکانیان ناڕاستە. بەلاویی چووە بواری سەربازییەوە و

سەفەری بۆ زۆر شوێنی ئەورووپا کرد بەڵام لە هیچ شوێنێ نەچووە بەرەی جەنگەوە. بەزوویی ئەو ڕاستیە سەرنجی ڕاکێشا کەمەیدانی ژیانیش وەکو جیهانی کتێب، پڕە لە دژایەتی و ناکۆکی و ئەو مەسەلەیەی کردە جێگەی بایەخی خۆی کە ئایا ڕێگایەك هەیە کە مرۆڤان بتوانن لەوێوە بەشتێ یەقین پەیدا بکەن و ئەگەر هەیە، ئەو ڕێگایە چۆنە. لەو کاتە بەدواوە دیکارت وازی لە سەفەر هێناو لە هۆڵەندا کە ژیانی فیکریی لەوێ لە هەموو شوێنی ئازادتر بوو، گۆشەگیریی هەڵبژارد و لە ماوەی بیست ساڵدا لە 1629 تا 1649 چەند بەرهەمێکی لەبیرکاریی و فەلسەفەدا خوڵقاند کە لە ڕووی قووڵی و ڕەسەنێتیەوە بێوێنەبوون، هەروەها لێکۆڵینەوەی زۆری لە زانستدا ئەنجامدا. (فەلسەفە و زانست بە دوو شتی جیا لە قەڵەم نەدەدران و هەروا تا سەدەی هەژدە لە یەك جیا نەکرابوونەوە) ئەو لقەی لە بیرکاریدا بە ئەندازەی شیکاریی ناسراوە لە داهێنانەکانی دیکارتە کە بە بیریدا هات باری هەر خاڵێك بەپێی دوورییەکەی لە دوو هێڵی جێگیرەوە بپێوێت. بەم پێیە، هەر کاتێ نیشاندەرێ دێتە بەرچاومان، لە ڕاستیدا لە شتێك دەڕوانین کە دیکارت دایهێناوە. بەو دوو هێڵە ستوونەی کە هەمیشە لە هەموو نیشاندەرێکدا بەرچاو دەکەون، بە یادی دیکارتەوە دەڵێن "میحوەرەکانی کارتزین" *Cartesian axes*، (کارتزین) سیفەتێکە لە ناوی دیکارتەوە دروست بووە. بەناوبانگترین بەرهەمی فەلسەفی دیکارت دوو کتێبە یەکێکیان گوتارێك لە بارەی میتۆدەوە (پەیبردنی عەقڵ) *Discovrse on the Method* و ئەویتریان (وردبوونەوەکان)ە (لە فەلسەفەی سەرەتاییدا) *Meditations* کە یەکەمیان ساڵی 1637 و دووەمیان ساڵی 1642 بڵاوبۆوە.

دیکارت قەت ژنی نەهێنا بەڵام کچێکی ناشەرعی هەبوو کە لە تەمەنی پێنج ساڵیدا مرد و مردنی گەورەترین گورزی عاتیفی لە دیکارت وەشاند. دیکارت هەمیشە شیك پۆش بوو وا خۆی دەردەخست کە ئەفسەری سوپایە و بە گشتی هاوڕێیەتی و هەمنشینی پیاوانی ئەهلی کار و مامەڵەچی لە هی زانایان پێخۆشتر بوو. بەڵام لەو ساڵانەدا کە سەرگەرمی کاری داهێنەرانە بوو، تێکەڵاویی کەسی نەدەکرد و بە گۆشەگیریی دەژیا. لە تەمەنی پەنجاو سێ ساڵیدا بە جەخت و سوور بوونی شاژن کریستینا *Christina* شاژنی سوید، بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆیەوە، چوو بۆ ستۆکهۆڵم بۆ ئەوەی وانەی فەلسەفە بە شاژن بڵێتەوە. ئەم کارە هەڵەیەکی مەرگ هێنەر بوو. دیکارت لە زستانی تاقەت پڕوکێنی سویددا تووشی نەخۆشی سیل بوو و ساڵی دوای ئەوە لە 1650دا مرد.

بۆ قسە و باس سەبارەت بە یەکەمین فەیلەسوفی فەیلەسوفانی مۆدێرن، بانگهێشتی پرۆفیسۆر بێرنارد ویلیامز *Bernard Williams*م کردووە کە مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە بارکلی و خاوەنی یەکێ لە کتێبە بەناوبانگەکانە دەربارەی دیکارت.

## کرۆکی باسەکە

ماگی: پێموایە باشترین ڕێگەی دەستپێکردنی باسەکە ئەوەیە کە یەکەم زەینمان دەربارەی ئەوە ڕوون بکەینەوە کە دیکارت لە کوێوە دەستی پێکرد. بفەرموو دیکارت کاتێ دەستی پێدەکرد، مەسەلەی سەرەکی ئەو بەپێی دەستنیشانکردنی خۆی چیبوو؟

ویلیامز: دیکارت بەهۆی ئەو خوێندنەوە کە خۆت ئاماژەت بۆ کرد هەروەها بەهۆی ئەو ئەزموونانەوە کە لە ژیاندا کەڵەکەی کردبوو، ئەو فیکرە لەلای جێگەی بایەخ بوو کە هیچ ڕێگایەکی دڵنیا بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە لە ئارادا نییە. وادیار بوو کە هەندێ بەشی مەعریفە لە ئارادایە بەڵام هیچ میتۆدێکی جێگەی متمانە نییە کە خەڵك

لە ڕێگایەوە زانین بەرەو پێشەوە بەرن و تیایدا سەرکەوتووبن. بۆ ئەوەی لە ڕوانگەی مێژوویی سەردەمی خۆمانەوە تەماشای بابەتەکە بکەین، پێویستە ئاگامان لەوەبێ کە زانست (*Science*) بەو مانایەی کە ئەمڕۆ لە زەینمادایە، لەو ڕۆژگارەدا بەڕاستی لە ئارادا نەبوو. زانست بە مانای کارێکی ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی لە تەك چەند میتۆدێکی لێکۆڵینەوەی دیاریکراوو تاقیگە و شتی لەو بابەتە، لە کاردا نەبوو. تەنانەت بوار بۆ دەربڕینی بیروڕای زۆر جیاواز ڕەخسا بوو کە لە بنچینەدا چ ئەگەرێ بۆ بوونی زانست هەیە. لە لایەکەوە، هەندێ کەس (کەسانی زۆر خاوەن هەست) باوەڕیان وابوو کە ئەگەر کەسێ میتۆدی ڕاست بدۆزێتەوە، زۆرنابات کە لە چارەسەرکردنی هەموو کێشە بنەڕەتیەکانی دەرککردنی سروشتدا سەرکەوتوو دەبێت. بۆ نموونە فرانسیس بیکۆن-ی سیاسەتمەداری ئینگلیز، پێیوابوو کە دەکرێ لە ماوەیەکی زۆر کەمدا زانست بخرێتە سەر شاڕێی ڕاست. لەلایەکی ترەوە کۆمەڵێ کەسی بە گومان هەبوون کە پێیانوابوو مەعریفەیەك لە ئارادا نییە و ڕێکخستنی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بە هیچ ڕێگایەکی عەقڵی کاری کردە نییە.

یەکێك لە هۆ گرنگەکانی ئەوەی بۆچی ئەو هەموو گومانە لە ئارادا بوو، ڕێنیسانسی ریفۆرمی ئاین بوو. لە قۆناغی دوای ئەو ڕێنیسانسەدا بانگەشەی هەمەجۆر دەخرایە ڕوو کە دۆزینەوەی ڕاستیی ئایینی چۆن چۆنیی کاری کردەیە. ئەم بانگەشانە زۆربەیان لەگەڵ یەکدا ناکۆکبوون و هیچ ڕێگایەك نەبوو بۆ بەرزکردنەوەی یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا و ئەمەش دەبووە هۆی مشتومڕێکی زۆر. یەکێك لەو شتانەی کە بەتایبەتی دوژمنانی ئاین دەیانوت ئەوە بوو کە ڕێگایەك بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە لە ئارادا نییە: دەیانوت هەموو ئەم جیاوازی بیر و بۆچوونانە هەن بەلام هیچ ڕێگایەك بۆ چارەسەرکردنیان نییە. مەزهەبییەکانیش لای خۆیانەوە کاردانەوەیان نیشان دەداو دەیانوت لەم ڕووەوە ئایین لەگەڵ باقی شتەکاندا جیاوازیی نییە، بەم پێیە، هیچ ڕێگایەك لە ئارادا نییە بۆ ئەوەی هیچ شتێك بتوانێ کەسێ لەسەر بنەمایەکی مکوم جێگیر بکات. کەواتە گومانکردن یەکێك بوو لە ڕەوەتە گرنگەکان لە فەزای فیکریی سەردەمی دیکارتدا و بەشێوەیەکی سەیر لەگەڵ هیوا دوورەکاندا هاوژیانیی پەیداکردبوو دەربارەی ئەوەی زانست ڕەنگە بەتایبەتی بە یارمەتی ئەوەی ئەمڕۆ بە تەکنەلۆژیا ناو دەبرێ، چ کارێکی لە دەست دێت. بۆ نموونە ئومێدی گەورە بە توانای سەرهەڵدانی پزیشکیی زانستی و پیشەسازیی زانستی و لەو بابەتە پەیدابوو، بەلام کەس چۆنیەتی ئەم کارەی نەدەزانی.

ماگی: بێگومان بۆ کەسێکی لە بنەڕەتدا داهێنەری وەکو دیکارت، بوونی هەندێ دەزگا لەو سەردەمەدا کێشەی گەورەی دەخوڵقاند. تەقریبەن هەر دەزگایەکی گرنگی زانستی یان فێرکاری لە دەستی کلێسای مەرجەعیەت خوازدابوو کە ڕێبەرە فیکرییەکانی بۆ خۆیان شەیدای سەرچاوە کۆنەکان بوون.

ویلیامز: بەڵێ، بێگومان وایە. هەڵبەتە هەروەکو وتم، کۆمەڵێ کاریگەریی مەزهەبیی جۆراوجۆر لە ئارادا بوون. یەکێك لەو کاریگەرییانەی کە ڕێنیسانسی ریفۆرمی ئایین داینابوو ئەوەبوو کە هەندێ لە کلێساکان زیاتر مۆرکی پرۆتستانتیان پێوەبوو کلێساکانی تر - وەکو کلێسای پاریس لە سەردەمی دیکارتدا کاسۆلیك بوون. بەلام هەڵبەتە گومان لەوەدا نییە کە ئەو خاڵەی دەربارەی مەرجەعیەت باست کرد، زۆر بایەخی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەوەی ئەمڕۆ بە زانستی میکانیك ناسراوە، واتە جۆرێك لە

فیزیای بیرکاری ئەنجام درابوو (نابێ بە هیچ جۆرێ ئەم خاڵە لە یادبکرێ) دیسان بڕێکی زۆر لەوەی بە زانست ناو دەبرا بە شێوەی ڕاڤە و شیکردنەوە لەسەر کتێبی نووسەرە کۆنەکان، مابۆوە —بەتایبەتی ئەرستۆ بەڵام نەك بە تەنها ئەو— یەکێك لەو شتانەی کە دیکارت و هاوتەمەنەکانی بەڕاستی دەیانزانی ئەوە بوو سەرچاوەی مێژوویی لێکۆڵینەوەی یەکەم دەست و یەکلاکەرەوە نییە.

ماگی: ڕەنگە بکرێ لە مشتومالکردنی بابەتەکەدا ئاوا بگوترێ کە کێشەی دیکارت دۆزینەوەی ڕێگایەکی سەلامەت بوو بۆ دەرچوون لەو بارودۆخە. پرسیاری بنەڕەتی و هەستیار ئەوە بوو ئایا هیچ میتۆدێ —تەنانەت بەپێی پرەنسیپ— بۆ وەدەستهێنانی مەعریفە و کەڵەکەکردنی مەعریفە هەیە یان نا. ئەگەر هەیە، ئەو میتۆدە چییە؟ بە زمانی ئەمڕۆ، دیکارت بە شوێن بەرنامەیەکی لێکۆڵینەوەدا دەگەڕا، لە پێش ئەوەشدا بە دوای میتۆدێکدا دەگەڕا بۆ لێکۆڵینەوە.

ویلیامز: بەڵێ، پێموایە ئەمە شەرحێکی ڕاستو دروستە سەبارەت بە بارودۆخی ئەو ڕۆژگارە. بەڵام ڕاستیەکی دیکەش لە ئارادا بوو کە هەموو کارەکانی دیکارت پابەندی بوون و زۆر گرنگ بوو. خەڵك لەو ڕۆژگارەدا، بە پێچەوانەی ئەمڕۆوە، زانستیان وەکو یەکێك لە کارە هاوبەش یان ڕێکخراوەکان وێنا نەدەکرد. ئەمڕۆ ئێمە بێچەند و چون ئەوەمان قبوڵە کە زانست یەکسانە بە کۆمەڵێ زانا، واتە کۆمەڵێ کەس کە لەگەڵ یەکتریدا بیر و ڕا ئاڵوگۆڕ دەکەن و کاری فیکری لە نێوانیاندا دابەش دەبێت. لەو ڕۆژگارەدا، لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەدا، هێشتا ناماقوڵ نەبوو کە یەکێك بە تەنیا بیر لە داڕشتن و دامەزراندنی هەموو زانستەکانی داهاتوو بکاتەوە. لە ڕاستیدا دیکارت باوەڕی بەم مەسەلەیە هەبوو فیکرێکی وا لەو ڕۆژگارەدا، بە پێچەوانەی دنیای ئەمڕۆوە، وەکو شێتی خۆ بە گەورەبینی لێکنەدەدرایەوە.

ماگی: من لە پێشەکی باسەکەدا وتم کە دیکارت ئەو مەسەلەیە سەرنجی ڕاکێشا بوو کە ئایا شتێك هەیە کە ئێمە بتوانین بە (یەقین) بیزانین؟ و لە سەرەتاوە بەلایەوە روون بوو کە (یەقین)[1] و ڕاستی دوو شتی جیاوازن. بۆ ئەوەی بابەتەکە بە زمانێکی سادە و ساکار دەربڕین دەبێ بڵێین (یەقین) یەکێکە لە حاڵەتە زەینیەکان لە کاتێکدا کە ڕاستی سیفەتی گوزارەکانە و ئاسایی پەیوەستە بەوەوە کە شتەکان لە دەرەوە چۆنن. بەڵام دیکارت باوەڕی وابوو تەنها بەو مەرجە یەکێك دەشێ بگاتە ڕاستی کە بنەما و بەڵگەیەکی بۆ بەیەقین گەیشتن هەبێ و بەم پێیە، گەڕان بە دوای ڕاستیدا خۆی لە خۆیدا گەڕانە بەدوای یەقیندا. بە دەربڕینێکی تر، دیکارت هەر لە سەرەتاوە پێیوابوو ئەو میتۆدەی کە دەیەوێ بیدۆزێتەوە، دەبێ هەم ئەنجامی بەهادار بەدەستەوە بدات، و هەم لە بەرامبەر ڕەخنەی گومانکاراندا بە چاکی قابیلی بەرگری لێکردنبێ. ئێستا بفەرموو دیکارت چۆن ئەم دوو مەرجەی دیاریکرد؟

ویلیامز: دیکارت بۆ لێکۆڵینەوە باوەڕی بە چەند مەرجێ هەبوو. هەندێ لەو مەرجانە ڕێك چەند بنەمایەکی عاقڵانە بوون دەربارەی ئەوەی کە دەبێ مەسەلەکان بکرێن بە چەند بەشێکەوە کە قابیلی لێکۆڵینەوە بن، دەبێ کارێ بکرێ کە بۆچوونەکان ڕوون و ئاشکرابن و شتی لەم بابەتە. بەڵام دیکارت بنەمایەکیشی دانابوو کە لە تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی بوو سەبارەت بەوەی کە هەرگیز نابێ یەکێك ڕاستی شتێ قبوڵ بکات کە بچوکترین گومانی هەبێ دەربارەی. ئەم بنەمایە بە ڕووکەش بنەمایەکی عاقڵانە نییە چونکە گەرچی ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەدا دەمانەوێ بیروبۆچوونی ڕاستمان دەربارەی مەسەلەکان هەبێ، وەکو پێویست بە نیازنین و ناتوانین هەرچەندی دەکرێ ئەو بیر و

بۆچوونانەمان بگەیەنینە پلەی یەقین چونکە ئەگەر بمانویستایە دەست بدەینە کارێکی وا، دەبوو هەوڵو کۆششێکی زۆرمان خەرجبکردایە. بەڵام ئامانجی دیکارت گەیشتن بوو بە قولایی و بنەمای زانست — واتە نەك تەنها بنەمای یەکێ لە زانستەکان بە مەفهومی هەندێ ڕاستیی گشتیی و بنەڕەتی دەربارەی جیهان، بەڵکو بنەمای لێکۆڵینەوەش. دیکارت دەیویست بنەمایەك فەراهەم بکات کە بکرێ بەهۆیەوە درێژە بە لێکۆڵینەوە بدرێ و پەی بە شتی زیاتر ببرێ، دەیویست ئەوە بسەلمێنێ کە مەعریفەی زانستی بەڕاستی لە توانادایە، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، هەستی دەکرد کە دەبێ گەڕان بە دوای راستیدا لە گەڕان بەدوای یەقینەوە دەست پێبکات.

دەیویست کاری زانستی والێبکات کە لە ئایندەدا گومانکاران نەتوانن هێرشی بکەنە سەر. بەم پێیە، دەکرێ یەکەم کار کە دیکارت کردی بە (دەستپێشخەریی لە گومانکردن)دا ( *Pre- emptive* *Scepticiam*) ناوبەرین. دیکارت بۆ ئەوەی بنەمای زانست لە ڕەهەندی گومانکردن بەدوور بگرێ، لەبەرخۆیەوە وتی: "هەرکارێ کە گومانکاران بتوانن بیکەن، خۆم دەیکەم، باشتریش دەیکەم. هیوادارم لێکۆڵینەوە شانبەشانی گومانکردن بە شوێنێ بگەیەنم کاتێ کارەکە تەواو دەبێ، شتێکی تەواو بنەڕەتیی و وەك بەرد تۆکمەم لەبەردەستدابێ"[٧].

دیکارت گەڕان بە دوای ڕاستیدا لەگەڵ گەڕان بەدوای یەقیندا هەڵەی نەکردبوو. تەواو ئاگاداری ئەوە بوو کە ئەم دوانە لەیەك جیان. بەڵام باوەڕی وابوو کە ڕێگەی ڕاست بۆ دۆزینەوەی ڕاستیی — لەسەروو هەمووشیەوە— گۆڕینی دۆزینەوەی راستی بۆ ڕەوتێکی مەنهەجی و سیستماتیك — ئەوەیە کە یەکەمجار بە دوای یەقیندا بگەڕێ.

ماگی: ئەمەش ئەو گومانەی لێکەوتەوە کە بە گومانی دیکارتی ناسراوە — واتە گومان وەکو میتۆد. هەڵبەتە ئەمە لەوە جیایە کە لەناونیشانی کتێبەکەیدا واتە (گوتارێك لە بارەی میتۆدەوە) مەبەستی بووە. هەرچەندە بێگومان بەشێکی گرنگە لەو کتێبە. دەکرێ ئەوە روون بکەیتەوە کە گومانی "میتۆددار — *methodological*"ی دیکارت چۆن چووە قۆناغی پراکتیکیەوە؟

ویلیامز: دیکارت بە دوای یەقیندا دەگەڕاو، بەم پێیە، هەر لە سەرەتاوە بچوکترین گومانی لە هەر شتێ بکردایە، دەیخستە لاوە. خۆی لە وتەیەکی بەناوبانگدا وتوویەتی ئەم کارە وەکو ئەوە وایە کە سندوقێ سێومان هەبێ و هەندێ لە سێوەکان عەیبدار بن و ئەوانی تر ساغ بن و بمانەوێ ساغەکان جیابکەینەوە. یەکەم شت هەموو سێوەکان لە سندوقەکە دەردەهێنین و یەکەیەکە تەماشایان دەکەین و ئەوانەی گومانمان لێیەتی دووریان دەخەینەوە و تەنها سێوە تەواو ساغەکان دەکەینەوە ناو سندوقەکە. بەم پێیە، دیکارت یەکەمجار هەموو بیرو بۆچوونەکانی لە زەینی دەرکرد و هەرشتێ کە کەمترین گومانی لێی هەبوو خستیە لاوە.

ئەم کارەی بەسێ قۆناغ ئەنجامدا. یەکەم ئەو شتانەی خستە لاوە کە ڕەنگە تەنها بەهۆی هەستێکی ئاسایی و باوەوە گومانی لێکردبن، بۆ نموونە بۆ خۆی ئەم جۆرە ڕاستیە زانراوانەی باس کردووە کە داری ڕاست لە ئاودا بە چەوتی دێتە بەرچاو یان ڕەنگە شتەکان لە ئەنجامی هەندێ ناتەواویی لە بیناییدا، ڕەنگیان سەیر بنوێنێ و لەم بابەتە. بەڵام دەیەویست لە گومانی ڕۆژانە و هۆی ئەم جۆرە گومانانە کە سەبارەت بە هەندێ شتی هەست پێکراو ڕاست دەردەچن، زیاتر بڕوات. هەنگاوی دووەم ئەوە بوو کە گومان بکات کە ئایا لە هیچ ساتە وەختێکدا بە ڕاستی بێدارە و بە هەست دەرك بە شتێ دەکات یان نا، گەیشتە ئەو باوەڕەی کە لە ڕابردوودا زیاتر خەوی دیووە کە لە ڕێی

هەستەوە دەرك بە كۆمەڵێ شت دەكات و لە دنیای خەوندا، ڕاست وەكو ئێستا، بیری كردۆتەوە كە كەسێك یان مێزێك یان شتێكی دیكە دەبینێ بەڵام هەڵبەتە كاتێ خەبەری بۆتەوە، پەی بەوە بردووە كە هیچ كام لەوانە جگە لە خەون و خەیاڵ شتێكی دیكە نەبوون. بەم پێیە چۆن دەیتوانی لەو ساتەوەختەدا بگاتە یەقین كە خەون نابینێ؟ ئەم بەشەی گومانكاریی بە تەواوی مایەی پەرێشانییە. لە رابردووشدا گومانكاران پەنایان بۆ ئەم ڕەخنەیە بردبوو بەڵام دیكارت لە لێكۆڵینەوەكانیدا جێگایەكی ڕێكوپێك و سەقامگیریی بۆ تەرخانكرد. دواجار گومانێ كە بنەماكەی خەون بینین بێ پێویستی بەوەیە كە ئەو كەسە بەلای كەمەوە هەندێ شت بزانێت، پێویستی بەوەیە كە لە رابردوودا هەندێ جار بەخەبەر هاتبێ و هەستی بەوەكردبێ كە خەونی دیووە، پێویستی بەوەیە كە بیر لەوە بكاتەوە كە هەندێ جار دەخەوێ، جاریوایە بەخەبەردێ، جاریوایە خەون دەبینێ، هتد. بەم پێیە، پێویستی بەوەیە كە شتێ لە بارەی دنیاوە بزانێ.

پاشان دیكارت هەنگاوێكی تری هەڵگرت و گەیشتە بەرزترین ڕادەی مومكینی گومان. لە خەیاڵیدا ئەوەی وێناكرد كە (ڕۆحێكی ناپاك – *malignspirit*) (یان وەكو ئەوەی كە هەندێ جار لەو نووسینانەدا كە سەبارەت بەم بابەتەن بە شەیتانی ناپاك – *malicious demon* گوزارشتی لێدەكەن) تەنها نیازی فریودانی ئەوی هەیە و لە خۆی پرسی: گریمان ڕۆحێكی وا هەبوو، ئایا شتێك هەبوو كە نەیدەتوانی من دەربارەی ئەمە گومڕا بكات؟ هەڵبەتە ئەمە تەنها وەرزشی فیكرییە. دیكارت هەرگیز مەبەستی ئەوە نەبوو كە یەكێك لە ژیانی ڕۆژانەدا گومانی فەلسەفی ئەو بەكاربهێنێت و چەندین جار ئەم خاڵەی ڕاگەیاندووە. میتۆدی گومان – بەتایبەتی ڕۆحی ناپاك خەیاڵیی–جگە لە بەشێك ڕەخنەی عەقڵی شتێكی دیكە نییە، بۆ ئەوەی بیرو بۆچوونەكان لە بێژەنگ بدات و ئەوە دیاری بكات كە ئایا هەندێكیان زیاتر نزیكە لە یەقینەوە یان نا؟

ماگی: هەڵبەتە مەبەستی كۆتایی دیكارت – واتە ستراتیجی درێژخایەنی دیكارت بۆ لە بێژنگدانی هەرشتێ كە ئەگەری ئەوە هەبوو ڕەنگە لە هەموو بارودۆخێكدا گومانی لێبكرێ– بەدەستهێنانی چەند مەسەلەیەكی گومان هەڵنەگر و وەك بەرد تۆكمە بوو كە پاشان بشێ وەكو سەرەتای بەڵگەهێنانەوە بەكار بهێنرێن و بنەمایەكی سەقامگیر بهێننە ئاراوە و بینای مەعریفە لەسەر پایەكانیان دروست بكرێ.

ویلیامز: ڕاستە. لە ڕاستیدا دوو مەسەلە لە ئارادا بوون. یەكێكیان ئەوە بوو كە دیكارت بە نیازی بەدەستهێنانی چەند مەسەلەیەكی گومان هەڵنەگر و تۆكمە بوو وەكو بەرد كە بە مانایەكی تایبەتی لە ئەگەری گومان بەدووربن و لەبەرامبەر زۆرترین گومانیشدا خۆیان ڕابگرن. دیكارت لەلایەكەوە دەیویست وەكو پێشەكی بەڵگەهێنانەوە ئەم جۆرە مەسەلانە بەكاربێنێ و لەلایەكی ترەوە، وەكو زەمینەیەكی گشتی كەزامنی ڕاستی و متمانەی میتۆدی لێكۆڵینەوە بێت. ڕەنگە خراپ نەبێت شتێكیش لەمبارەیەوە بڵێین.

ماگی: بەڵام با ئەوەمان لەبیر نەچێت كە بەڕاستی تۆپەكە هێشتا لە گۆڕەپانی شەیتانی ناپاكدایەو دەبێ هەرچۆنێ بێت وەریبگرینەوە. دیكارت پاش ئەوەی یەكەیەكە ئەو مەسەلانەی خستەلاوە كە قابیلی گومان بوون. بەم ئەنجامە گەیشت كە دەربارەی هەندێ شت مەحاڵە نەگەیتە یەقین. دەكرێ بفەرمووی ئەو شتانە چیبوون؟

ویلیامز: سەرەنجام گومان دەگاتە خاڵی سەرنگون بوون. كاتێ كۆتایی دێت. دیكارت پێچ دەكاتەوە و دەگەڕێتەوە و لە كاتی گەڕانەوەیدا سەر لە نوێ مەعریفە بنیات دەنێتەوە. گومان كاتێ

دەوەستێ کە دیکارت دەبینێ بیری سەرقاڵدەکات، بە قسەی خۆی، دەڵێت شەیتانی ناپاك هەر چەندە فریوم بدات، لەم بارەیەوە هەرگیز ناتوانێ فریوم بدات کە کاتێ بیرناکەمەوە، قەناعەتم پێبکات کە بیردەکەمەوە. تەنانەت ئەگەر بیرێکی ناراست و درۆشم هەبێ، خودی ئەوەش دیسان بیرە. تەنانەت بۆ ئەوەی بیرێکی فریودەریش بە خەیاڵمدا بگوزەرێ، دیسان دەبێ بیرێکم هەبێ. کەواتە بەناچاری دەبێ ڕاستبێ کە بیردەکەمەوە. دیکارت لەم بابەتەوە ئەنجامێکی دیکەشی بەدەست هێنا – یان بەلای کەمەوە ئەم بابەتەی بەڕاستیەکی دیکەوە گرێدا– ئەویش ئەوەیە کەواتە من هەم. بەم پێیە، یەکەم یەقینی بنەڕەتی کە بەدەستی هێنا ئەوە بوو "من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم" یان بە زمانی لاتینی (*Cogito ergo som*) (کۆگیتۆ ئێرگۆ سوم) کە بەم بۆنەیەوە زۆر کەس بەم بەڵگەهێنانەوەیە دەڵێن (*Cogito*).

ماگی: ئەو خاڵەی کە دیکارت خۆشی پێی دواوە، شایانی جەخت لێکردنەوەیە کە مەبەستی دیکارت لە (بیرکردنەوە) تەنها بیری ئەبستراکت نییە، بەڵکو هەموو وێنە جۆراو جۆرەکانی هەڵچوونەکانی هەستە، لەوانیش هەست و دەرك پێکراوە هەستیەکان و ئازار و شتی تر. بەحسابکردن بۆ ئەم مەسەلەیە، جێی خۆیەتی کە بڵێین لە ڕاستیدا دیکارت دەیویست بڵێت "من ئاگام لێیە کە هوشیارم، بەم پێیە دەزانم کە دەبێ هەبم"

ویلیامز: ڕاستە. دیکارت لە بەرهەمە گەورەکەیدا واتە کتێبی (وردبوونەوەکان) کە تیایدا ئەم بابەتە بە وردی و بە درێژی تەواوە وە باسکراوە، هەنگاو بە هەنگاو و بە شارەزاییەکی زۆرەوە سنوورەکانی *Cogito* بە ئەزموونی جیاجیای زەینی یان بەشتی ویژدانی جۆراوجۆر دەگەیەنێ. بەڵام هەڵبەتە بەرهەمی مەسەلەکە ئەوەیە کە وتت.

ماگی: ئاشکرایە دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە دیکارت هاوزەمان لەگەڵ بەدەستهێنانی ئەم مەسەلە بنەڕەتی و بێگومانانەدا، ئەوەشی نیشانداوە کە ئەگەرچی ئێمە دەتوانین سەبارەت بەم مەسەلانە یەقینمان هەبێ، هەر ئەنجامێ کە لێیان بەدەست بێنین قابیلی ئەوەیە هەڵەبێ، بەم پێیە، هیچ شتێکی بێگومان لەم مەسەلانە بەدەست نایەت. بۆ نموونە بەلای منەوە جێگای گومان نییە کە لەم ساتەوەختەدا دەبینم کە تۆ بێرنارد ویلیامزیت، شتێکی مادیت لە جیهانی دەرەوەی من، بەڵام لەم مەسەلەیەوە پێویست نایەتە بەرچاو کە جیهانێ هەیە لە دەرەوەی من بە شتە مادیەکانیەوە کە بوونیان سەربەخۆیە لە ئەزموونی من (واتە بینینی من). ئەم بەڵگەهێنانەوەیە سەبارەت بە هەموو شتێکی تریش ڕاستە. من هەمیشە دەتوانم یەقینم هەبێ کە ئەوەی ڕاستەوخۆ بە هەست یان بە دەرککردنی من دەگات هەمان ئەو شتەیە کە هەیە، بەڵام هەرگیز ناتوانم سەبارەت بە ڕاستی و متمانەی ئەو ئەنجامەی کە لەسەری دەستم دەکەوێ و ئەنجامەکەی شتێکی دیکە دەبێ، بگەمە یەقین.

ویلیامز: هەتا ئەوەی ئەنجامەکە چۆن ئەنجامێ بێت. بۆچوونی دیکارت ئەوە بوو کە خودی ئەو ڕاستیە کە من ئەزموونێ بۆ نموونە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم مێزەدا حاسڵ دەکەم، گرەنتی بوونی مێزەکە نییە لە دەرەوەی من. یەقین لەم مەسەلەیەدا تەنانەت لە حاڵەتێکدا کە خەون بینین بنەمای گومان بوو لە ناوچوو و کاتێ دیکارت مەسەلەی شەیتانی ناپاك هێنایە ئاراوە، بابەتەکە لە جاران ڕوونتر بۆوە. کاتێ دیکارت نموونەی شەیتانی دەهێنایەوە، ئاگای لەوە بوو کە ڕەنگە ئەزموونێکی وا حاسڵ بکات، بەو پێیە، هیچ شتێ لە واقیعدا وجودی نەبێت. کەواتە کەس ناتوانێ بوونی جیهان لە دەرەوەی خۆی ڕاستەوخۆ و بەبێ

هۆ و نێوەند لە ئەزموونێکەوە کە لێی ڕوودەدات هەڵێنجێ. دیکارت ئێستا ئیدی بە نیازە چەند تێبینیەکی نوێ بهێنێتە ئاراوە بۆ ئەوەی بتوانێ دووبارە جیهان لە شوێنی خۆی دابنێتەوە. هەڵبەتە دەبێ خێرا ئەوەش بگوترێ کە ئەو جیهانەی دووبارە لە شوێنی خۆی دادەنرێتەوە بەشێوەیە کە جیاوازە لەو جیهانەی کە سەرەتا هەستی ئاسایی وێنای دەکرد. دوای ئەوەی تەواوی کەلوپەلەکانمان لە ئەنجامی گومانەوە لە گەنجینە هێنایە دەرەوە، ئیتر نابێ دووبارە هەموو شتەکان بەبێ هیچ چاکسازیەك بخەینەوە شوێنی خۆی. لە کاتێکدا کە جیهان چاکسازیی دەکەین. بیروبۆچوونمان سەبارەت بە دنیا جیاوازە لەوەی کە لەگەڵ ئەزموونی بیر لێنەکراوەی سەرەتاییدا هەمانبووە و ئەمەش بۆ خۆی یەکێکە لە ڕاستیە زۆر گرنگەکان دەربارەی میتۆدی گومانکردن. دیکارت بە بەڵگەی پۆزەتیف لە تەك گوماندا بەرەو پێشچووە و کاتێ دووبارە جیهان دەخاتەوە شوێنی خۆی، بە ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی عەقڵیی دەربارەی ئەوەی چۆن دەکرێ سەبارەت بە مەسەلەکان مەعریفە بەدەست بێنین، گۆڕانکاریی ورد و شارەزایانەی تێدا بەدی هێناوە. بەڵام بەڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە کە دیکارت چۆن جیهان دەخاتەوە سەر جێگای خۆی.

ماگی: وا دێتە بەرچاو کە دیکارت لە کاتی بەدەستهێنانی ئەو مەسەلە گومان هەڵنەگرانەدا کە بەشوێنیاندا گەڕاوە، خۆی بە بنبەست گەیاندبێ. ڕاستە کە مەسەلە گومان هەڵنەگرەکانی بەدەست هێناوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوەی نیشانداوە کە ناکرێ لەو مەسەلانە هیچ بەدەست بهێنرێ.

ویلیامز: باوا بڵێین تەنها شتێ کە دیکارت لە قۆناغی پێشوودا تێبینی کردبوو ئەوە بوو کە تەنانەت ئاشکراترین ڕێگەی ئەنجامگیریی بوونی جیهان لەسەر بنەمای ئەزموونە تایبەتیەکانی خۆی، ڕاست نییە و جێی متمانە نییە. ئێستا دەیەوێ ڕێگایەك نیشان بدات کە بە ئیدیعای خۆی جێگەی متمانەیە. چونکە گەیشتۆتە خاڵێك کە چیتر جگە لە ناوەڕۆکی خود ئاگایی یان (هەستی) خۆی هیچ شتێکی قبوڵ نییە، دیارە کە ئەگەر بیەوێ دووبارە دنیا بخاتەوە شوێنی خۆی، دەبێ تەنها لەسەر بنەمای ناوەڕۆکی خود ئاگایی (یان هەستی) خۆی ئەم کارە بکات، چونکە هیچ شتێکی دیکەی لەبەردەستدا نییە. کەواتە دەبێ لە نێو ئەو هەستانەی کە هەیەتی شتێ پەیدا بکات کە لە ناخی خۆی بیباتە دەرەوە. دیکارت ئیدیعای ئەوە دەکات کە ئەمە هەمان وێناکردنی خودایە. وێناکردنی خودا لە ناوەڕۆکی خود ئاگاییەوە خۆی ئاشکرا دەکات و دەڵێت ئەم وێناکردنە لە نێو هەموو ئەو وێناکردنانەدا کە هەیەتی بێهاوتایە، لە نێو هەموو ئەو شتانەی کە لە زەینیدایە، تەنها ئەو وێناکردنە بە جۆرێکە کەڕێك بەرهەمەکەی ئەوە دەسەلمێنێ کە بەراستی خولقێنەرێکی هەیە، بە دەربڕینێکی دیکە، بەڕاستی خودا هەیە.

ماگی: بەلای خوێنەرانی ئەمڕۆوە —تەنانەت بەلای ئەو کەسانەوە کە باوەڕیان بە خودا هەیە — هەرسکردنی ئەم بەڵگەیە قورسە.

ویلیامز: بەڵێ. لە ڕاستیدا دیکارت دوو بەڵگە دەهێنێتەوە و لە کتێبی (وردبوونەوەکان)دا هەردوو بەڵگەکە بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنێ. یەکێکیان پەیوەندی بە سەدەکانی ناوەڕاستەوە هەیە و بە بەڵگەی بوون ناسراوە و ڕەنگە پێویستی بەوە نەبێ کاتەکەی پێبکوژین چونکە لە ڕاستیدا نهێنیەکی لۆجیکی یان میتافیزیکی تەرح دەکات و ڕەنگدانەوەی تایبەتمەندیی بیری دیکارت نییە. بەڵگەکەی تریان زیاتر تایبەتمەندیی بیری دیکارت دەگەیەنێ، ئەگەرچی لەمەشیاندا دیسان کەرەستەی سەدەکانی ناوەڕاست بەکارهاتووە. بنەمای ئەم بەڵگەیە پرەنسیپێکە کە دەوترێ پێویستە سەبارەت بەوەی کە ناشێ گەورەتر لە بچوکتر پەیدابێت یان

هۆکاری بێت. دیکارت گەیشتۆتە یەقین کە وێناکردنێکی هەیە سەبارەت بە خوداوەند و ئەم وێناکردنە، وێناکردنی مەسەلەیەکی ناکۆتایە. ئەم وێناکردنە بۆ خۆی لە وێناکردنیٚ زیاتر نییە، بەلاٚم لەبەرئەوەی وێناکردنی مەسەلەیەکی ناکۆتایە، پێویستی بە ئاشکراکردنێکی تایبەتی هەیە. دیکارت دەزانێت کە بوونەوەرێکی سنووردارە و ئیدیعای ئەوە دەکات کە وێناکردنێکی وا مەحاڵە — واتە وێناکردنی بوونەوەرێکی ناکۆتا— لە بوونەوەرێکی سنوورداری وەکو خۆی پەیدابووبیٚ. تەنها ئەگەری ئەوە هەیە کە خودا خۆی ئەو وێناکردنەی تێدا دروستکردبیٚ. دەستەواژەی لەبیرنەکراوی دیکارت لە دەربڕینی ئەم مانایەدا ئەوەیە کە خودا ئەم وێناکردنەی وەکو نیشانەیەك کە دروستکەر لەسەر دورستکراوەکەی خۆی دایدەنیٚ، لە مندا دایناوە، بە کورتی خودا بە دانانی وێناکردنی ناکۆتای خۆی لە مندا، ئیمزای خۆی لەسەر من کردووە. کاتیٚ بیر دەکاتەوە کە بچوکتر ناتوانیٚ بەدیهێنەری گەورەتر بیٚ، پەی بەوە دەبات کە تەنها لەبەر ئەم هۆیەیە خاوەنی وێناکردنێکە سەبارەت بە خودا کە خودایەك هەیە کە ئەوی خوڵقاندووە.

ماگی: پاشان لەسەر بنەمای ئەوەی کە هۆشیاریی خۆی پێیدەڵێت، سەبارەت بە بوونی خودا دەگاتە یەقین، دەچێتە سەر ئەوەی کە لە یەقین سەبارەت بە بوونی خوداوە بگاتە یەقین سەبارەت بەبوونی جیهان.

ویلیامز: راستە. ئەوەی دەربارەی خودا دەیزانیٚ، هەڵیدەسەنگێنیٚ و دەڵێت: دەزانم خودا وجودی هەیە و دەسەلاٚتداری رەهایە و منی دروست کردووە، هەروەها دەزانم کە خودا خێرخوازە (هەڵبەتە هەموو ئەمانە لەبیروباوەڕە باوەکانی مەسیحیەکانە) لەبەرئەوەی خودا منی دروست کردووە و خێرخوایە، هەم نیگەرانی باشی ئاکاریی منە و هەم نیگەرانی چاکی عەقڵیی و فیکریی منە، بەو مانایەی کە ئەگەر منیش ڕۆڵی خۆم ببینم و (ئەم خاڵە زۆر بایەخدارە)، بەشێوەیەکی باش بیر و بۆچوونەکانم ڕوون بکەمەوە و بەخێرایی باوەڕ بەو شتانە نەکەم کە هێشتا سەرو ژێریانم هەڵنەسەنگاندووە، بەکورتی رۆڵی خۆم ببینم، ئەوسا خوداش متمانە و قورسایی بۆ ئەو مەسەلانە دادەنیٚ کە من زۆر حەزدەکەم باوەڕیان پێبکەم. لەلایەکی ترەوە، هەرچەندەش بە توندیی رەخنە لە بیرو بۆچوونەکانی خۆم دەگرم و هەرچەندە بە وردی هەڵیاندەسەنگێنم کە بیرو باوەڕەکانم دەربارەی جیهانی مادی چیان لەخۆگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بە گومانکردن حوکمدان بە هەڵواسراوی دەهێڵمەوە (هۆیەکەشی ئەوەیە کە ئەگەر وامنەکردایە نەدەگەیشتمە ئێرە) دیسان دەبینم کە زۆر حەز دەکەم باوەڕم بە بوونی دنیایەکی مادی هەبیٚ. لەبەرئەوەی ئەم حاڵەتە یان ئەم رەغبەتە لە مندا هەیە و هەرچیەکم لە تواناداا بووبیٚ بۆ دڵنیابوون لەم مەسەلەیە سەرفم کردووە کە بیرو بۆچوونەکانم لەسەر هەڵە بنیات نەنرابن، کەواتە دەگەمە ئەو ئەنجامەی کە سەرئەنجام خودا گرەنتی ئەوە دەدات کە لە ڕەگوڕیشەوە بەشێوەیەکی سیستماتیك بە هەڵەدا نەچووبم. بە دەربڕینێکی تر، مافی ئەوەم هەیە باوەڕم هەبیٚ کە جیهانێکی وا هەیە.

ماگی: ئەمە بەلای دیکارتەوە دەبیٚ بە ڕێگایەك کە دەکریٚ لەو ڕێگایەوە قسەی هەر کەسێك کە دەربارەی ئەگەری بوونی فەلسەفە یان زانست گومانی بنەڕەتی هەیە، بەتاڵ بکاتەوە. وانییە؟ دواجار دیکارت بەوەی کە دەڵیٚ ئەو جیهانەی کە سەرۆکاریمان لەگەڵیدا هەیە دیاری خودایە —ئەو خودایەی کە بوون و خێرخوایی ئاشکرایە— زیاتر لەوەی وەلاٚمی گومانکاران بداتەوە، هەوڵیداوە دەستپێشخەرییان لێبکات.

ویلیامز: بڕوانە، ئەوەی کە سەبارەت بە پێگەی دیکارت بایەخی بنەڕەتی هەیە ئەوەیە، کە بە باوەڕی ئەو، هەر کەسێ بەنیاز پاکیەوە سەبارەت بەخودا، بە تەواوی حساب بۆ بەڵگەکانی بکات، ڕاستی ئەو بەڵگانە دەسەلمێنێ. گرنگی ئەم خاڵە تەواو بنەڕەتییە. ئەگەر دیکارت ئەوەی قبوڵ بکردایە کە باوەڕی تۆ پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە لە ڕووی دەروونییەوە لە چ کلتوورێکدا یان لە چ هەلومەرجێکدا گەورە بوویت و ئەوەشی قبوڵ بکرایە کە کەسانی تەواو خاوەن هەست دەتوانن، هەرچەندەش قووڵ بینەوە، دیسان دەربارەی بوونی خودا جیاوازیی بیروبۆچوونیان هەبێ، هەڵوێستی یەکسەر دەگۆڕا. بەڕای دیکارت، نکوڵی کردن لە بوونی خودا دوای بیستنی ئەم بەڵگانە، بە قەد نکوڵی کردن لە دوو کەڕەت دوو دەکاتە چوار پێویستی بە کەللەڕەقی و لاسارییە. بەڕای دیکارت، ئەگەر تۆ ئەم بەڵگانە بخەیتە بەر دەستی کەسێکی گومانکار و هەنگاو بە هەنگاو ڕێنمایی بکەیت و ئەگەر ئەو گەرموگوڕ و ڕاستگۆبێت و ئامانجی گەمەی زمانی و خەڵك خستنە ژێر کاریگەریی نەبێت، دواجار بەناچاریی باوەڕ دەکات. هەندێ خەڵك باوەڕیان نەکردووە لەبەرئەوەی بە تەواوی قوڵ نەبوونەتەوە و بە دیسپلینی پێویستەوە بە شوێن مەسەلەکاندا نەچوون. بێگومان زۆر لە گومانکاران فێڵبازن و بەبێ ئەوەی بە ڕاستی بیر بکەنەوە و تەنها بۆ ئەوەی قسە بکەن هەڵوێست وەردەگرن. بەڵام ئەگەر کەسێك نیازپاکی هەبێ و بەڕاستی قووڵ بێتەوە، بێگومان ئاگای لە راستی مەسەلەکە دەبێت و چیتر ناتوانێت بێئەوەی ڕووبەڕووی ناکۆکی بێتەوە، نکوڵی لە بوونی جیهانیی دەرەوە بکات. ئەوەی دیکارت باوەڕی پێی هەبوو، ئەمە بوو.

ماگی: یەکێك لە ئەنجامەکانی ئەم بەڵگانە کە بایەخی مێژوویی هەبوو، بەڕاست وەرگرتنی ئەوە بوو کە جیهان لە دوو بەشی خود پێکهاتووە. یەکێکیان جیهانی دەرەوەیە خودا پێیداوم کە دەتوانم پشتی پێببەستم. بەڵام منیش هەم کە ئەو جیهانە دەبینم. لە ڕەوتی گەیشتن بە دەستەواژەی "من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم"دا بینیم کە دەشێ هەر شتێ کە لە جیهانی ئەندێشەدا سەبارەت بەو وێناکردنەی دەربارەی خۆم هەمە بیهێنمە ئاراوە جگە لە پرۆسەی بیرکردنەوە، ئەمە بە قسەی دیکارت، مانای ئەوە بوو کە لەدوا شیکردنەوەدا من خودی (بیر) ئەندێشەم. دەتوانم وێنای ئەوە بکەم کە بەبێ (بەدەن)یش هەم, بەڵام ناتوانم وێنای ئەوە بکەم کە بەبێ ئەوەی هۆشیاربم هۆشیارم و هەم. کەواتە ئەو مادەیەی کە بەدەنی منە، بەشێك نییە لەچڕکراوەی بوونی من. ئەم باوەڕە لەگەڵ بیرو بۆچوونی ئایینی مەسیحیدا دێتەوە (بەڵام هەڵبەتە مەسیحییەکان لەبەرهۆی تر پەسەندیان کردووە)و ڕاستەوخۆ ئەو تیۆرەی لێدەکەوێتەوە کەجیهان دابەش بووە لەنێوان زەین‌و چاودا کە یەکەمیان ئەندێشەی ڕووتەو دووەمیان ڕەهەند یان ماوەی ڕووتە. دوانە یان دوالیزمی ناسراوی دیکارت یەعنی ئەمە، واتە دابەشبوونی سروشت بۆ دووبەش واتە ڕۆح‌و مادە، تەماشاکەرو تەماشاکراو، ناسێنەرو ناسێنراو، زەین‌و عەین (چاو). ئەم دوالیزمە لەگەڵ تەواوی ڕوانینەکانی مرۆڤی خۆرئاواییدا سەبارەت بەمەسەلەکان‌و سەراپای زانیارییەکانی ئێمە هەڵشێلراوە.

ویلیامز: ئەم قسەیە لەزۆر لایەنەوە ڕاستە. دەکرێ وا بگوترێ کە دیکارت کاتێ دەگاتە دوا سنووری گومان، وا بیر دەکاتەوە کە دەشێ جیهانی دەرەوە وجودی نەبێ، بەڵام لەدەستەواژەی سادەی "جیهانی دەرەوە"دا زۆر شت هەیە. (جیهانی دەرەوە) واتە لەدەرەوەی چی؟ واتە لەدەرەوەی من. بەڵام (لەدەرەوەی من) ماناکەی "لەدەرەوەی بەدەنی من" نییە.

بەدەنی من بەو مانایەی کە دیکارت مەبەستێتی، بەشێکە لەجیهانی دەرەوە، بۆ خۆی یەکێکە لەشتەکان لەدەرەوەی من. بەڵام سەرئەنجام کاتێ جیهان دوبارە لەڕێگەی زانینی خوداوە دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی، منیش دوبارە دەبمەوە بەخاوەنی بەدەن‌و ئاشکرا دەبێ لەراستیدا بەدەنێکم هەیە. بەڵام هەرگیز ئەو ئەنجامەی لێناکەوێتەوە کە من بەدەنم. ئەوەی بەشێوەیەکی ئاسایی ناوی لێدەنێم "من"، لەراستیدا بەڕای دیکارت دوو شتە: لەلایەکەوە، نەفس یان رۆحێکی نامادییە-دیسان بەباوەڕی دیکارت-بێمەرگ‌و نەمرە، کە هەروەکو وتت, فکر یان نەفس یان زەینی رووتە بەبێ هیچ رەهەندێکی مادی. لەلایەکی ترەوە بەدەنە (جەستە). لەئەنجامدا، لەژیانی رۆژانەدا هەرکاتێ بەشێوەی یەکەم کەس (واتە من) سەبارەت بەخۆمان قسە دەکەین، لەراستیدا دوو جۆر گوزارە پێکەوە کۆدەکەینەوەو بەبێ ناڕەحەتی و نیگەرانی بەوی دی دەڵێین، "من شەرمەزارم، من بیر لەپاریس دەکەمەوە، من کێشم حەفتاو پێنج کیلۆیە" لەروانگەی دیکارتەوە، ئەمە راست بەمانای ئەو شتەیە کە زمانەوانەکان پێیان دەوت "مەبەستی دوو مانا"[2]، واتە ئەوەی کە دەربارەی دوو شتی تەواو جیاواز قسەبکەین. کاتێ من دەڵێم بیر لەپاریس دەکەمەوە، گوزارشت لەناخ یان دەروونی خۆم-واتە بەڕای دیکارت گوزارشت لە "من"ی راستەقینە خۆم-دەکەم. بەڵام کاتێ دەڵێم کێشم حەفتاو پێنج کیلۆیە بەمەجازی قسەدەکەم.

ماگی: واتە دەربارەی بەدەنت قسەدەکەی کە لەراستیدا بەهیچ شێوەیەك خودی خۆت نییە.

ویلیامز: راستە. یەکێك لەفەیلەسوفە ئەمریکاییەکان زۆر باش ئەم مانایەی دەربڕیووە، کە بەڕای دیکارت، کاتێ یەکێك بڵێت "من کێشم حەفتاو پێنج کیلۆیە" وەکو ئەوە وایە کە بڵێت "کاتێ دەهاتم تایەکەم پەنجەر بوو".

ماگی: لەسەرەتادا وتمان کە ئامانجی درێژ خایەنی دیکارت ئەوە بوو کە بوونی ئەوەی کە ئێمە ئەمڕۆ بەزانست ناوی دەبەین بەدەستبێنێ‌و تۆ ئەوەت نیشاندا کە دیکارت لەڕێگەی چ بەڵگەیەکەوە ئەم تێڕوانینە تایبەتیەی دەربارەی جیهانی دەرەوە حاسڵ کرد. دەکرێ بفەرمووی کە دەکرێ چۆن چۆنی بەشێوەیەکی زانستی مامەڵە لەگەڵ جیهاندا بکرێ؟

ویلیامز: پێشان باسی ئەوەم کرد کە ئەو دنیایەی بەیارمەتی خودا دوبارە خستمانەوە شوێنی خۆی هەمان ئەو دنیایە بوو کە توڕمان دابوو چونکە لەو بارەیەوە کەوتبووە بەر رەخنەو هەڵسەنگاندن. لە (وردبوونەوەکان)دا خۆمان دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە نەك تەنها جیهانی لەدەرەوە وجودی هەیە، بەڵکو بەهەمان شێوە کە ماهیەتی من ماهیەتی بوونەوەرێکی بیرکەرەوەو خاوەن عەقڵ‌و ئەندێشەیە، جیهانی دەرەوەش ماهیەتێکی هەیە کە رەهەند یان دوورابییەو خاسیەتی زاتی ئەوەیە کە شوێنی داگیرکردووەو قابیلی ئەوەیە کە ببێتە بابەتی ئەندازەو زانستی بیرکاری. هەموو لایەنە رەنگاو رەنگەکانی دیکەی- واتە ئەو راستیەی کە رەنگی هەیەو تامی هەیەو دەنگ دەداتەوە- لەراستیدا زەینیە، واتە لەلای زەینەوەیەو دیاردەی زەینیە کە لە هۆشیاریی ئێمەدایەو مەعلومی هەمان جیهانی مادی‌و رەهەندو ئەندازەییە.

ماگی: دیکارت بۆ ئەوەی بەڵگەیەك بۆ ئەوە بهێنێتەوە کەناوەڕۆکێکی پەیوەست بەتەواوی خاسیەتەکانی خۆیەوە کە وابەستەیە بەهەستەوە بۆ خۆی جیایە، نموونەیەکی زۆر کاریگەر دەهێنێتەوە کە بێگومان شایانی ئەوەیە لێرەدا باسی بکەین. دەڵێت مۆمێك بگرە بەدەستتەوە. دەبینیت ئەندازەو شێوەیەکی دیاریکراوی هەیە، کاتێ دەستی لێدەدەی سفتە، پیکهاتەو گەرمی‌و رەنگ‌و بۆنێکی

تایبەتی هەیە، و وا دێتە بەرچاو کە پێکهاتەیەکە لەو خاسیەتانە. بەڵام ئەگەر بخرێتە بەرئاگر، یەکسەر ئەم خاسیەتانەی دەگۆڕێ. مۆمەکە دەتوێتەوە، شێوەیەکی تر بەخۆیەوە دەبینێ، گەرمتر دەبێ، رەنگەکەی دەبێ بەقاوەیی تێر، بۆنێکی تری لێدێت‌و هتد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا حەزدەکەین بڵێین کە ئەمە هەمان مۆمە. چ شتێکی هەمان شتی جارانە؟ وەڵام ئەوەیە چۆن شتێکی دیکە هەیەو ئەوەیە کە مۆم بەردەوام شوێنێکی داگیرکردووەو ئەم مەسەلەیەش قابیلی پێوانە کردنە بەپێی شوێن‌و قابیلی پێوانەکردنە بەپێی کاتیش، ئەم دوو پێوانەکردنەش هەردووکیان ماهیەتی بیرکارییان هەیە.

ویلیامز: بەڵێ. هەڵبەتە ئەو بابەتە جێگای مشتومڕە کە دیکارت تەسەوری کردووە بەڵگەهێنانەوە سەبارەت بەمۆم خۆی لەخۆیدا رێك چ شتێ دەسەلمێنێ. بەڵام گومان لەوەدا نییە کە دیکارت ئەم نموونەیەی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بەڵگە بۆ ئەو وێناکردنە بهێنێتەوە کە بەلای خۆیەوە وێناکردنێکی بنەڕەتییە سەبارەت بەوەی کە شتی مادی رێك ئەو شتەیە کە جێگایەك داگیردەکات‌و بەمەفهومێك، لەبنەڕەتدا بەشێکە لە شوێن. دیکارت پێیوابوو کە خودی شتی مادی بەشێکە یان قەبارەیەکە لەشوێن، نەك ئەوەی تەنها جێگایەکی داگیرکردبێ. یەکێك لەهۆیەکانی ئەم بیرکردنەوەیە ئەوە بوو کە دیکارت باوەڕی بە بۆشایی نەبوو و باوەڕی وابوو کە جیهانی مادی سەراپای شتێکی درێژکراوەیەو شتەکان بەجیا، وەکو ئەم مێزە یان هەر شتێکی دیکە، چەند بەشێکن لەدەوری شتە گەورەکە لەهەندێ حاڵەتی دیاریکراوی جوڵەدا. ئەم باوەڕە بنەمای فیزیای بیرکاریی سەدەی حەڤدە بوو بەڵام بەجێگریی نەمایەوەو دواجار زانستی دینامیکی نیوتن جێگای گرتەوە کە مامەڵەیەکی دیکەی لەخۆی دەگرت بۆ جیهانی مادی. بەڵام بەهەرحاڵ، ئەو وێنەیەی کە دیکارت ڕەسمی کرد لەسەقامگیرکردنی ئەو وێناکردنە دا زۆر کاریگەر بوو کە جیهانی مادی لەبنەڕەتدا خەسڵەتی بیرکاریی هەیەو بوونی فیزیای بیرکاریی دەکاتە کاری کردە. راستی گرنگ‌و پڕ مانا دەربارەی شۆڕشی زانستی ئەو چاخەی جێی باسی ئێمەیە ئەوەیە کە یەکەم زانستی مەزن کە لەژیانی دیکارتداو بە بەرەکەتی لێکۆڵینەوەکانی ئەو کەوتە ڕێ فیزیای بیرکاریی بوو. کیمیا کەزانستێکە دەربارەی بەشە جیاوازەکانی مادە لەگەڵ بایەخدانی زیاتردا بەتایبەتمەندییەکانی مادە لەمادە دەدوێ، بەشێوەیەکی سەرەکی کیمیا بەرهەمی سەدەی هەژدەو نۆزدەیە نەك سەدەی حەڤدە.

ماگی: ئایا بۆ ئەوەی بەویژدانەوە داوەریمان کردبێ، دەتوانین بڵێین کە دیکارت لەسەردەمی خۆیدا لەهەر کەسێکی دیکە زیاتر -بێجگە لە بیکۆن- بۆ سەقامگیرکردنی ئەگەری بوونی زانست‌و جێگیرکردنی ئەم فیکرە لای خەڵکی ئاسایی دەرچووی ئەورووپای خۆرئاوا زەحمەتی کێشا؟

ویلیامز: وای بۆ دەچم وابێ. هەڵبەتە کەسێکی دیکەش هەیە کە ناوبانگێکی گەورەی هەیەو فیزیاکەی لەفیزیای کلاسیك نزیکترە هەروەکو دواجار وا دەرچوو، ئەو کەسەش گالیلۆیە. بەڵام گالیلۆ بەدناوبوو ڕێزی لێنەگیرا چونکە لەدادگای پشکنینی بیرو باوەڕدا دادگایی کراو حوکمدرا. دیکارت وێڕای ئەوەی زۆر لەبەشەکانی فیزیاکەی دواجار ڕەتکرایەوە، لەم بوارەدا نفوزێکی زۆر زۆری بەدەست هێنا.

ماگی: لەباسەکەماندا هەتا ئێرە، دیکارت هێشتا فیزیای نەخستۆتەڕوو، تەنها ئەوەی نیشانداوە کە ئەو فیزیایەی بنەمای بیرکاریی هەبێ لەتوانادایەو دەشێ- واتە هەم لەبازنەی توانای

عەقڵی ئێمەدایەو هەم سەبارەت بەجیهانی دەرەوە ڕاستە. دەکرێ لەم بارەیەوە قووڵتر قسەبکەیت کە چ جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەوەدا کەیەکێك لەبوارێکی زانستیدا کار بکات لەگەڵ ئەوەدا کە ئەگەری بوونی ئەو زانستە نیشان بدات؟

ویلیامز: بەڵێ. دیکارت ئومێدەوارە بەو ڕێوشوێنانەی کە دیمان، ئەوە نیشان بدات کە جیهان بەشێوەیەك دروست کراوە، کە مرۆڤ دەتوانێت شتی لەبارەوە بزانێت. بەدەربڕینێك خودا مرۆڤ و جیهانی بۆ یەکتری دروست کردووە. بەڕای دیکارت، وەکو ماهیەت مرۆڤ بەشێك نییە لەسروشت لەبەرئەوەی جەوهەرێکی عەقڵیو نا ماددییەو ئەم جەوهەرە نە بەشێکە لەجیهانی سروشتو نە پاشکۆی یاسا زانستیەکانە. کەواتە بەم مانایە مرۆڤ بەشێك نییە لەسروشت بەڵام هێزو توانای بەباشی لەگەڵ سروشتدا دەگونجێ. بەم پێیە. ئێمە لەتوانامانداا هەیە کە فیزیای بیرکاریمان هەبێ. دواجار دیکارت باوەڕی وابوو دەکرێ بەوەی کە دەشێ ناوی لێ بنێین بیرکردنەوەی قووڵی فەلسەفی، هەندێ پرەنسیپی بنەڕەتی فیزیا بزانین، بەتایبەتی باوەڕی وابوو کە دەتوانین لەڕێگەی ئەم جۆرە بیرکردنەوە قووڵەوە پەی بەوەبەرین کە فیزیا دەبێ یاسایەکی هەبێ کە چاودێری مانەوەی (چەندایەتی) بکات. لەبەرئەوەی، دەبێ چەندایەتیەك هەبێ بۆ ئەوەی بمێنێتەوە. ئەو چەندایەتییەی کە دیکارت پێیوابوو دەمێنێتەوە، جووڵە بوو کە مانەوەی نەبوو لەفیزیای کلاسیکی دوای ئەوەدا تەنانەت بەراستیش پێناسە نەکرا. بەڵام بەهەر حاڵ، ئەو بۆچوونە هەبوو گریمانە لەسەر ئەوەبوو کە (رابردوو) سەربەخۆیە لەهەست و ئەزموون بەبیرکردنەوەی قووڵ ئاشکرا دەبێ. دیکارت باوەڕی وابوو کە هەندێ پرەنسیپی بنەڕەتی دیکەش لەفیزیادا هەن کەزانینیان بەشێوەی (رابردوو) ئاسانە، بەڵام ئەگەر لەمە بترازێین، دەبێ بەڕێگەی ئەزموون ڕاستیە فیزیاییەکان بدۆزینەوە.

ئەم خاڵە بایەخی تایبەتی هەیە چونکە بەڕاستی دەگوترێ کە دیکارت ئەهلی رەسەنێتی عەقڵ یان فەیلەسوفێکی عەقڵانی بووە. ئەو شتەی کە دەبێ لەبەرچاومان بێت ئەوەیە کە بەبۆچوونی ئەو، دەکرێ بەبیرکردنەوەی قووڵ خاسیەتە بنەڕەتییەکانی جیهانو نەفس بدۆزرێتەوەو هەموو شتێ بەرهەمی ئەزموون نییە. دواجار هەندێ کەس پێیان وایە کە دیکارت ئەوەندە پابەندی ڕێبازی عەقڵی بوو کەپێیوابوو دەکرێ تەواوی زانست بەڕێگەی پێوانەکردنو ڕێك بەهۆی بەڵگەی بیرکاریی یان لۆجیکیەوە لەمیتافیزیك یان لە فەلسەفەی سەرەتاییەوە هەڵبهێنجرێتو باوەڕی وابوو کە ئەگەر کەسێك دابنیشێو بەتەواوی دەربارەی (منم بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم) و مادەو خودا قووڵ ببێتەوە، سەراپای زانستی چنگ دەکەوێت. دیکارت بەهیچ جۆرێ وێناکردنێکی واینەبوو هەمیشە بەبێ ئەوەی قسەکانی یەکتری رەت بکەنەوە دەیوت ئەزموون پێویستە بۆ ئەوەی لەنیوان ڕێگا جیاوازەکانی بەڵگە هێنانەوە لەسروشتدا جیاوازیی بکات. باوەڕی دیکارت ئەوە بوو کە دەکرێ تۆ مۆدێلی جیاجیا دروست بکەی. ئەمە رەنگدانەوەی لایەنی زۆر مۆدێرنی بیرکردنەوەی دیکارتە. دەتوانیت لەچوارچێوەی یاساکانی دیکارتدا مۆدێلی فیکریو عەقڵی جیاواز سەبارەت بەجیهان بینابکەیت یان دابڕێژیت، بەڵام بۆ ئەوەی پەی بەوە ببەیت کام مۆدێلە بەراستی نیشاندەری سروشتە، پێویستیت بەئەزموون هەیە.

ماگی: ئایا، بەڕای دیکارت، ئەزموون بەو مەبەستە دەخرێتە ڕوو کە تیۆرەکانی ئێمە دەربارەی سروشت تاقیبکاتەوە یان بەو مەبەستەی کە چەند دراوێك بۆ ئێمە فەراهەم بکات تا بەو دراوانە تیۆر دابڕێژین؟

ویلیامز: بۆ چەند شتێکی جیاواز دەخرێتەڕوو، بەڵام خاڵی بنەڕەتی ئەوەیە کە ئەگەر یاسا بنەڕەتییەکانی سروشت لەبەرچاو بگریت – واتە ئەو پرەنسیپانەی کە مادە لەسەر بنەمایان دەجوڵێت– دەبینیت دەتوانیت زۆر میکانیزمی جیاواز وێنابکەیت کە بەڕووکەشی هەموویان هەمان شت بەرهەم دێنن. پاشان ئەزموونی جیاواز ئەنجام دەدەیت و ڕێوشوێنێك دەهێنیتە ئاراوە کە ئەگەر بۆ نموونە ئەم مۆدێلە لەگەڵ واقیعدا بێتەوە فلان شت ڕوو دەدات و ئەگەر مۆدێلێکی دیکە لەگەڵ واقیعدا بێتەوە، شتێکی دیکە ڕوودەدات، بەم پێیە، یەکێك لە مۆدێلەکان هەڵدەبژێریت. لەڕاستیدا ئەمە وەسفێکی شایستەیە بۆ ئەوەی فیزیازانەکان ئەنجامی دەدەن.

ماگی: واتە وەکو ماهیەت بەهەمان مەفهومی ئەمڕۆی ئەزموون هەستیار یان چارەنووسسازە؟

ویلیامز: دیکارت زۆر جەختی لەم خاڵە دەکردەوە. یەکێ لەو شتانەی کە بەشێوەیەکی پەسەندکراو پێی لەسەر دادەگرت ئەوە بوو کە بێسوودە یەکێك گێژو سەرگەردان تەنها بۆ ئەوەی ببینێ چ شتێکی دەستگیر دەبێت، لەڕێگەی تاقیکردنەوەوە، دەست بەئەزموونی جیاواز بکات. گرنگ ئەوەیە کە پرسیاری ڕاست تەرح بکات. لەڕاستیدا ئەمە یەکێکی ترە لە بەڵگە سەرەکیەکان کە پێشان باسمان کرد. بەو مانایەی کە خودا لەگەڵ تۆدایە بەو مەرجەی تۆش ڕۆڵی خۆت ببینیت. خودا نایەڵێت تۆ بەردەوام هەڵبخەڵەتێیت ئەگەر تۆش بەردەوام خۆت هەڵنەخەڵەتێنیت. بەم پێیە، ئەو کارەی کە دەبێ بیکەی ئەوەیە کە پرسیاری ڕاست بکەیت خودا بە شێوەیەك هەلومەرجەکانی ڕێکخستووە کە سروشت وەڵامت بداتەوە.

ماگی: پێموایە لە جێی خۆیدایە ئەو خاڵە ڕابگەیەنین کە بە بۆچوونی دیکارت، ئەگەرچی بوونی خودا بۆ بەدەستهێنانی (میتۆد) پێویستە، بەڵام پاش ئەوەی کەسێك میتۆدەکەی بەدەستهێنا، ئیتر پێویست نییە بۆ بەکارهێنانی کەسێك میتۆدەکەی بەدەست هێنا، ئیتر پێویست نییە بۆ بەکارهێنانی ئەو میتۆدە باوەڕی بە خودا هەبێت.

ویلیامز: ڕاستە. حسابکردن بۆ ئەم خاڵە زۆر گرنگە کە دیکارت دەیویست کاری زانستی لە فشاری کۆت و پێوەند و دەستێوەردانی دەقی ئایینی ڕزگار بکات. ئەگەر بڕیار بوو تەنها پیاوە ئاینییەکان بنەمایەك بۆ کاری زانستی فەراهەم بکەن، دەیەویست کاری زانستی لە کۆتی بنەمایەکی لەو جۆرە ڕزگار بکات. بەڵام هەروەکو بینیمان، خودا پایەی سیستمی فیکری ئەوی پێکدەهێناو دیکارت لەڕادەبەدەر پێی لەسەر ئەو خاڵە دادەگرت کە لێکۆڵینەوەکانی جیهانێکی بێخودامان بۆ ناهێڵێتەوە. دنیای دیکارت دەسکردی دەستی خودا بوو، خودا خۆی زانینی ئێمەی لە بارەی دنیاوە دابین دەکرد. واتە ئەو جێگایەی کە تۆ دەبێ لە ژیانی عەقڵیدا پەنا بۆ خودا بەریت. وەکو خۆشت ئاماژەت بۆ کرد، لە ناواخنی کاری زانستیدا نییە، لەوێدایە کە دەتەوێت توانای کاری زانستی بۆ گومانکاران بسەلمێنیت. جگە لەمەش، دیکارت عاقڵانە ڕای وابوو کە پێویست ناکات هەموو جارێ کە نیازی کاری زانستیت هەیە، توانای کارێکی وا بۆ گومانکاران بسەلمێنیت. تەنها جارێك بەسەو دیکارت پێیوابوو ئەو کارەی کردووە.

دیکارت زۆر جەختی لە بوونی خودا دەکردەوە و باوەڕی تایبەتی من ئەوەیە کە لەم کارەدا تەواو ڕاستگۆ بوو و بە هیچ جۆرێك کارەکەی بە ڕووکەش نەبوو، هەرچەندە هەوڵی دەدا لە ڕێگەی جۆراوجۆرەوە دڵی قەشەکان ڕازیبکات چونکە تاقەتی کێشەی نەبوو لەگەڵ کڵێسادا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەگەرچی خۆی ڕاستگۆبوو، بەو دەربڕینەی کە دایبەدەستەوە،

ئامادەکاریی خودای سەبارەت بە جیهان و تێگەیشتنی خەڵکی سەبارەت بە جیهان، ئاسانتر کرد.

ماگی: هەندێ کەس ئیدیعای ئەوەیان کردووە کە دیکارت بە هیچ جۆرێ لە باوەڕیدا بەخودا ڕاستگۆنەبووە بۆ پەسەندکردنی ئەم ئیدیعایە، چەند بەشێکیان لە نووسینەکانی هێناوەتەوە کە بێگومان تیایاندا هەندێ خۆگێلکردن بەدیدەکرێ. بەلاّم بەبۆچوونی من، ئەم ئیدیعایە قابیلی سەلماندن نییە، هۆی ئاسانیشی ئەوەیە کە ئەگەر ڕاست بوایە، شتێك لە کاری کلتووری دیکارت نەدەمایەوە. ڕەنگە دیکارت مەسیحیەکی خاوەن باوەڕ نەبووبێ و من ئاگام لێنەبێ. بەلاّم ئەمە بابەتێکی ترە. گومان لەوەدا نییە کە ئەو بەخۆش خەیاڵیەوە تەماشای کڵێسای نەدەکرد، بەلاّم گومانم نییە کە بە ڕاستگۆییەوە باوەڕی بە بوونی خودا هەبوو، پێموایە کەسانێك باوەڕیان بە پێچەوانەی ئەمەی منەوەیە، باوەڕنەبوونی دیکارت بە کڵێسا بەهەڵە بە باوەڕ نەبوونی دیکارت بەخودا لێك دەدەنەوە، هەروەکو زۆر لە مەسیحیەکان بەداخەوە هەم لەو ڕۆژگارەدا و هەم ئەمڕۆش، مەیلیان بەلای ئەم هەڵەیەدا بووەو هەیە.

بەلاّم ئێستا دەمەوێ بچمە سەر شتێکی تر. پێشتر وتمان کە دیکارت باوەڕی بە دوالیزم هەبوو، واتە دابەشکردنی بوون بۆ مادە و ڕۆح. لەو کاتەدا نەمانتوانی درێژە بە باسەکە بدەین. دەکرێ ئێستا درێژەی بدەینیێ؟ ڕوونترین مەسەلەیەك کە ئەم باسە دەیهێنێتە پێشەوە، بریتییە لە بەیانکردنی چۆنێتی کاروکاردانەوە لە نێوان ئەو دوانەدا. بفەرموو کە دیکارت چۆن ئەم مەسەلەیەی ڕوونکردۆتەوە کە ڕۆح دەتوانێت شتە مادییەکان لە شوێندا جێگۆڕکێ پێبکات.

ویلیامز: وەلاّمی پوخت ئەوەیە کە دیکارت هەرگیز ئەو کارەی نەکردووە. لایب نیتس دەربارەی مەسەلەی کاروکاردانەوەی نێوان ڕۆح و مادە بەڕیتمێکی کەمێك سووك تەماشاکردنەوە دەڵێت "دیارە تا ئەو شوێنەی کە دەتوانرێ بەدیبکرێ مسیو دیکارت مەیدانەکەی چۆڵکردووە" دیکارت ڕاست پێش سەفەری بۆ سوید، کتێبێکی نووسی و بەشێوەیەکی سەیر جێگای کارو کاردانەوەی نێوان ڕۆح و بەدەنی بەغودەی سنەوبەری *pineal gland* لە بەشی ژێرەوەی مێشکدا ناساند. بەلاّم ئەو قسەیە تەقریبەن بێمانایە. بیری ئەوەی کە شتێکی نامادی و پەتیی وەکو ڕۆح، ئەو شتەی کە تەقریبەن بە تەواوی لە گۆتەی عەدەد نییە، بتوانێت بە گۆڕینی ئاراستەی ڕۆحی هەندێ گیانەوەری دیاریکراو، لە دنیای مادیدا گۆڕانکاریی بکات —واتە ئەو بۆچوونەی کە دیکارت باوەڕی پێی بوو— ئەوەندە وێناکردنی تەنانەت بەپێی پرەنسیپیش دژوار بوو کە هەمووانی تووشی سەرگەردانی کرد. بەشێکی زۆری فەلسەفەی سەدەی حەڤدە —دوای ئەویش— لە دەوری ئەو مەسەلەیە دەخولایەوە کە چۆن پەیوەندی نێوان ڕۆح و بەدەن بەشێوەیەکی باشتر لەوەی لە دیکارت بە میرات مابۆوە، بەیان بکات.

ماگی: لەگەڵ ئەوەدا دەبێ ئەوە پەسەند بکەین کە دوا لیزمی دیکارت بەشێوەی جیاواز لەم سێ سەد ساڵەی دواییدا لە بیری خۆرئاواییدا ڕەگ و ڕیشەی داکوتاوە.

ویلیامز: بەهەرحاڵ، بەڕای من، هیچ چارەیەکمان نییە جگە لەوەی بەشێوەیەك لە شێوەکان جیاوازیی لە نێوان زەین و عەین یان عالەم و مەعلومدا بکەین. لە هەندێ سیستمی فەلسەفیدا هەوڵیانداوە بڵێن کە ئێمە هیچ وێناکردنێکمان سەبارەت بە مەعلوم بە جیا لە عالەم نییە و بە کورتی ئێمەین کە جیهان دروست دەکەین. بەلاّم باوەڕکردن بەم بۆچوونە تەنانەت بەشێوە جوانتر و زانایانە ترەکەشی، زۆر دژوارە. هەم لەبیرکردنەوەی ئاسایی ئێمە و هەم بە شێوازی سەرەتایی لە

بیرکردنەوەی زانستییدا، هەمیشە شێوەیەك لە دوالیزم لە نێوان عالەم و مەعلومدا بەکاردێت، واتە ئەو وێناکردنەی کە جیهان بەجیا لە مەعریفە حاسڵکردنی ئێمەیە لە جیهان. ئەو شتەی کە ئیتر کەمتر کەسێ باوەڕی پێدەکات، دوالیزمی ڕەها لە نێوان ڕۆحی تەواو پەتی و بەدەندایە. ئەمڕۆ بێگومان دەبێ مامەڵە ئەوەبێ کە جیهان وەکو ماهیەت بوونێکی بەرجەستەو خاوەن بەدەنە، نەك تەنها ڕۆحێکی دەگمەن. ئەم مەسەلەیە تەنانەت پێش دیکارتیش لە فەلسەفەدا لای کەسانی وەکو تۆماس ئەکویناسی قەشە و ئەرستۆ پەسەند بوو.

ماگی: ئایا بەڕاستی خەوشی بنەڕەتیی دیکەش لە سیستمی فەلسەفی دیکارتدا هەیە؟

ویلیامز: هەرچەندە کات زیاتر تێپەڕی، زیاتر دەرکەوت کە بەڵگەی دیکارت بۆ سەلماندنی بوونی خودا لاوازترین بەشی فەلسەفەکەی ئەوە. ئەم مەسەلەیە لە ڕووی مێژووییەوە کاریگەرییەکی گرنگی هەبوو، چونکە هەروەکو خۆشت پێشان وتت، وا دەهاتە بەرچاو کە دیکارت بە بەکارهێنانی میتۆدی گومانکردن خۆی بە بنبەست گەیاندووە. بۆچوون لەسەر ئەوە وەستا کە ئەگەر دیکارت بەڕێوشوێنی ئاینیش نەتوانێت لە بنبەستەکە بێتە دەرێ، ڕێگایەکی دیکە بۆ ئەو کارە وێنا ناکرێ، بەم پێیە، هەرکەسێ لە ڕێگای گوماندا هاوڕێی بێت، سەرئەنجام بە هەڵوێستێکی ئایدیالیستی یان مەعنەوی وا دەگات کە جگە لە ناوەڕۆکی هۆشیاریی خۆی هیچ شتێکی بۆ نامێنێتەوە.

خاڵێکی دیکە کە شایەنی باسە ئەوەیە کە سیستمی فەلسەفی دیکارت تەنانەت لە ژیانی خۆشیدا لەبەرئەوەی کە دەیانوت بۆ قۆناغێکە، ڕووبەڕووی نارەزایی بۆوە. گریمان وایە کە ڕاستی و متمانەی هەموو شتی لە خوداوەیە. پێشان لەم باسەدا تەئکیدمان لە دەوری خودا کردەوە، بەتایبەتی بۆ بەڕاست زانین و متمانە بەخشین بە بیروباوەڕەکانمان سەبارەت بە جیهان. ئەوەی کە پێویستە بیخەینە سەری ئەوەیە کە دیکارت باوەڕی وا بوو کە خودا لە متمانە بەخشیندا بە بیر و باوەڕی گشتی ئێمە بە بەڵگەو دەلیلیشەوە دەورێکی گرنگی هەیە. بەڵام لەوێوە کە دیکارت لە ڕێگەی بەڵگەهێنانەوەوە باوەڕی بە خودا پەیداکردبوو، کاتێ نووسینەکەی بڵاوبۆوە خەڵکی ناڕەزاییان دەربڕی کە دیکارت گیرۆدەی سەردەم و زەمانە بووە.

ماگی: دیکارت تەنها لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی "ڕوون و جیاواز" دەرك بەوە دەکات کە خودا وجودی هەیە، دەتوانێت لە قۆناغی "من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم" هەنگاوێ بەرەو پێشەوە هەڵبگرێ و بچێتە پێشەوە. لەلایەکی ترەوە، تەنها لەبەرئەوەی کە دەزانێت خودا وجودی هەیە و هەڵخەڵەتێنەر نییە دڵنیایی پەیدا دەکات کە ئەوەی بەشێوەیەکی "ڕوون و جیاواز" هەستی پێدەکرێ ڕاستە.

ویلیامز: وردەکاریی ئەم بابەتە تەنها لە خوێندنەوەی فەلسەفەی دیکارت لەلایەنێکی زۆر تایبەتیەوە سەرنج ڕادەکێشێ. بەڵام مەسەلەی زۆر گشتی کە ئەم بابەتەش لەخۆدەگرێ ئەوەیە کە چ پەیوەندییەك لە نێوان فەلسەفە و بوونی خودادا هەیە. ئەوەی کە ناویان لێناوە سەردەمی کارتزین یان (دیکارتی) — *Cartesian circle* یەکێکە لە ڕاستیە جوزئیەکانی ئەم کێشە گشتییە کە فەلسەفە دەبێ چۆن ئەگەری بوونی خۆی بەیان بکات، چۆن دەبێ دامەزراندن و متمانەی خۆی و باقی ئەم جۆرە مەسەلانەش حساب بکات و ئەم کارە بەبێ دوورکەوتنەوە لەسەردەم *circle* یان ریزبەندیی *regress* قورسە.

ماگی: بایەخی گشتی ئەم خاڵە بەڕادەیەکە کە بەهای ئەوەی هەیە کەمێ لەبارەیەوە قووڵ بینەوە.

هەر چوارچێوەیەکی بەیانکردنی گشتی کە ئیدیعای ڕاستی و متمانە دەکات، دەبێ نەك تەنها ڕاستی و متمانەی خۆی، بەڵکو چۆنیەتی بەدەستهێنانی خۆشی بەیان بکات. نموونەیەك دەهێنینەوە کە زۆر لە فەلسەفەی دیکارتەوە دوورە. ئەگەر پەیڕەوانی فەلسەفەیەك بڵێن بیروباوەڕە فەلسەفیەکان هیچ پەیوەندییەکیان بە مەسەلەی ڕاستی و درۆوە نییە و تەنها یارمەتی بەرەو پێشەوە بردنی بەرژەوەندی چینایەتی ئەو کەسانە دەدەن کە باوەڕیان پێیانە، مانای قسەکەیان ئەوەیە کە فەلسەفەکەی خۆشیان هیچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەی ڕاستی و درۆوە نییە و تەنها یارمەتی بەرەوپێشەوەبردنی بەرژەوەندیی چینایەتی ئەو کەسانە دەدات کە باوەڕیان بەو فەلسەفەیە هەیە. کەواتە فەلسەفەیەکی ئاوا خۆی ئەو دەسەڵاتە لە خۆی دەسێنێتەوە کە بە فەلسەفەیەکی جدیی و شایانی بایەخپێدان لە قەڵەم بدرێ. یان پەیڕەوانی شێوە مامەڵەیەکی تر بڵێن، بەپێی پرەنسیپی ناوەندیی ئەم شێوەیە، تەنها گوزارەیەکی مەعنادارە لەبەرئەوەی دووبارە کردنەوەی زانراوو هەمان شتە ڕاستە یان لەبەرئەوەی بە تاقیکردنەوە قابیلی بەدیهاتنە، شێوەیەکی وا یەکسەر دەسەڵاتی خۆی لەدەستدەدا چونکە خودی ئەو گوتەیە نەدووبارەکردنەوەی زانراوە کە ڕاستبێ و نەبەتاقیکردنەوە قابیلی بەدیهاتنە. زۆر لە سیستمە فکرییەکان خۆبەخۆ لەم جۆرە کێشانە بۆخۆیان دەهێننە پێشەوە. واتە ئەگەر ڕاست بن، چیتر ناتوانین بە ڕاست لە قەڵەمیان بدەین و لە هەندێ حاڵەتدا تەنانەت توانای ڕەسمکردنیشیانمان نابێت. کەواتە هەر تیۆرەیەك دەبێ حساب بۆ خۆشی بکات. دەبێت بەشێوەیەك کە بۆ خۆی نەبێتە پێویستی (مەلزومی) ناکۆکیی، هەم شەرعیەتێك بۆ بوونی خۆی فەراهەم بکات و هەم بۆ ڕێگای گەیشتن بە خۆشی. ئەگەر لەم کارەدا سەرکەوتوو نەبێ، یان بۆ خۆی مەلزومی ناکۆکییە یان نامەفهوم و بێمەعنایە و لە هەردوو حاڵەتەکەدا قابیلی بەرگری لێکردن نییە.

بابگەڕێینەوە سەر دیکارت: دەسەڵات و کاریگەریی دیکارت لەسەر فەلسەفە گەورە بووە. ئایا دەکرێ لەم بارەیەشەوە بدوێی؟

ویلیامز: ئەگەر بمانەوێ بابەتەکە تەنها لە شتێکدا کورت بکەینەوە، دەبێ بڵێین ئەو کەسەی کە لەم سێ سەد ساڵەی دواییدا باسی مەعریفەی کرد بە میحوەری فەلسەفەی خۆرئاوا دیکارت بوو و تەقریبەن جگە لەو کەسێکی دیکە نەبوو. دیکارت بووە هۆی ئەوەی کە فەلسەفە لە جیاتی ئەوەی لەم پرسیارەوە دەست پێبکات "چیی وجودی هەیە؟" یان "جیهان چۆن چۆنییە؟"، ئەم پرسیارە بکات بە پرەنسیپ "دەتوانم چیی بزانم؟" سەرنج بدە کە پرسیارەکە ئەمەیە "من دەتوانم چیی بزانم؟" نەك ئەوەی "دەتوانرێ چیی بزانرێ؟" یان تەنانەت "دەتوانین چیی بزانین؟" — واتە فەلسەفە لە پرسیارێکەوە بەشێوازی کەسی یەکەمی تاك دەستپێدەکات کە میحوەرەکەی (من)ە. لە سەرەتادا باسی ئەوەم کرد کە لەسەردەمی دیکارتدا هێشتا ئیمکانی ئەو فکرە هەبوو کە ڕەنگە کەسێك بە تەنیا بتوانێت کاری زانست بە ئەنجام بگەیەنێ. بەڵام ئەگەر تەنانەت ئەو واقیعە مێژووییەش بخەینە لاوە، خودی ئەو هەنگاوە گەورەیەی دیکارت لە قاڵبی ژیاننامەیەکدا کە خۆی نووسیوویەتی هەڵیگرتووە، بەشێکی زۆر گرنگە لەوە.

بەڕێکەوت نییە کە هەردوو بەرهەمە گەورەکەی دیکارت (وتارێك لە بارەی میتۆدەوە — و وردبوونەوەکان) بەشێوازی کەسی یەکەمی تاك نووسراون و کارێکن لە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی خودیدا. کاریگەریی سەرەکی دیکارت لەمەدا جەخت بووە لەسەر ئەپستمۆلۆجیا (مەعریفەزانی) بەشێوازی یەکەم کەسی تاك.

ماگی: له دوای دیکارت تا پێش ئەم سەدەیە (مەبەستی سەدەی بیستە)، کەمتر یەکێ لە فەیلەسوفەکان لەو بارەیەوە جیاوازیی دەکرد کە پرسیاری میحوەریی لە فەلسەفەدا ئەوەیە "دەتوانم چیی بزانم؟"

ویلیامز: هەڵبەتە ئەو مەسەلەیەش هەیە کە لەم بارەیەوە دەبێ چ مامەڵەیەك لەگەڵ فەلسەفەی هێگڵدا بکەین. دەکرێ سەبارەت بە هێگڵ مامەڵەی جیاواز بکرێ. یەکێکیان ئەوەیە کە هیگڵ هەوڵیدەدا بگەڕێتەوە بۆ هەندێ مامەڵەی ئەرستۆیی کە ئەو پرسیارەی جێگەی باسەکەمانە کەمتر بایەخی هەیە. بەڵام بێگومان ئەوەی بایەخی هەیە ئەوەیە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو لەم سەدەیەدا (مەبەستی سەدەی بیستە)، خەڵك لەو جەختەی هێگڵ دوورکەوتنەوە کە لە ئەپستمۆلۆجیای دەکردەوە و زیاتر جەختیان لەسەر لۆجیك و زمان کردەوەو لەوە بەدواوە هەوڵیاندا لە جیاتی باسی مەعریفە، فەلسەفەی (شیکاریی) زمان بکەنە میحوەری فەلسەفە.

ماگی بەو گریمانەی فەلسەفەی دیکارت چەند خەوشێکی هەبووە کە باسمان کرد — و هەندێ خەوشی دیکە کە باسمان نەکرد — دیسان بەو گریمانەی فەیلەسوفەکان بەهەر حاڵ لە مەسەلەی مەعریفە دوورکەوتوونەتەوە، بۆچی خوێندنەوەی دیکارت هێشتا ئەوەندە پڕ بایەخە؟ ڕێمبدە بابەتەکە بەشێوەیەکی شەخسی بەیان بکەم. تۆ بیست ساڵ ناوبەناو بۆ نووسینی کتێبێ دەربارەی دیکارت زەحمەتت کێشاوە. بۆ پێتوابوو کە ئەم کارە بەهای سەرمایەگوزارییەکی گەورەی وای هەیە لە تەمەنتدا؟

ویلیامز: پێموایە لەبەر دوو هۆ. لە ڕاستیدا کارمان بە پێویستیی تێگەیشتنی مێژوویی ئەو دەورە نییە کە دیکارت لە گەیاندنی ئێمەدا بە بارودۆخی ئێستا دیویەتی. هەر ئەوەندەی کە کەمێ بە وردەکارییەوە بزانین چیی وتووە، بەڕای من لە ڕوانگەی تێگەیشتنی ئەوەوە کە ئێمە کێین و لە کوێوە هاتووین زۆر گرنگە. ئەگەر کەسێك حەزی لە فەلسەفە بێت، ئەمڕۆش دەیەوێت کارەکانی دیکارت بخوێنێتەوە "هەڵبەتە مەبەستم لە (کارەکانی) زیاتر (وردەکارییەکان)ە". پێموایە هۆی ئەم مەسەلەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەم بەرهەمەدا ڕێگایەك گیراوەتەبەر — واتە پرسیاری لەم بابەتە (چی دەزانم؟) و (دەتوانم گومان لە چ شتێ بکەم؟) و لەم بابەتە بەشێوەیەك خراونەتە ڕوو کە ناتوانی لێیان دابڕێیت. بەڕێگای ڕێکەوت نەبووە کە جەخت کردنەوە لەم بابەتە بایەخێکی وا گەورەی هەبووە لە فەلسەفەدا. مەسەلەکە ئەوە نییە کە دیکارت لەبەرئەوەی قەڵەمێکی وا جادویی و داڕشتنێکی ڕەوانی هەبووە، توانیوویەتی زەینی ئەوروپا لە ڕێگەی دوورەوە بەو جۆرە سەرسام بکات. هۆیەکەی ئەوە نییە. هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو شتەی ئەو کەشفی کرد خۆی لە خۆیدا ئەندێشە وروژێن بوو: یەعنی نەك ئەوەی من بۆ خۆم بڵێم هەموو ئەو بیروبۆچوونانەم هەیە، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە چۆن بتوانم بچمە ئەودیو ئەو بیروبۆچوونانەوە و بزانم ئایا بەڕاستی بیروبۆچوونەکانم ڕاستن یان نا؟ چۆن دەتوانم لە بیروبۆچوونەکانم دوور بکەومەوە و بزانم کامیان لایەنی پێشداوەرییان تێدایە. چەندە ئیمکانی گومانکاریی هەیە. ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە بەڕاستی ئەندێشە وروژێنن و مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێ لەناو ئەم تۆڕە زۆر سروشتیەی بیرکردنەوەی قووڵەوە ڕێگایەك بۆ دەرەوە بکاتەوە، پێویستی بە خەیاڵی فەلسەفی بەهێز و کاری زۆرە هەروەکو خودی دیکارت وتوویەتی، دوای ئەوەی ئەم ڕێگایەت بڕی ئیتر لە کۆتاییدا نایەیتەوە سەر جێگای یەکەمجار. مەسەلەکە ئەوە نییە کە لەو نەخۆشیە فەلسەفیە قوتار بیت کە بەدەستی خۆت تووشی بوویت.

پرسیارێکی دیکە کە دیکارت بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو تەرحی دەکات ئەمەیە "من کێم؟" ئێمە دەتوانین بەغەیری ئەوەی کە هەین وێنای خۆمان بکەین. ئەو توانایەمان هەیە کە لە دنیای خەیاڵدا خۆمان لە شێوە و حاڵی ئێستا بەرینە دەرەوە. دەتوانین خەیاڵ بکەینەوە کە لە چاوی بەدەنێکی دیکەوە تەماشای جیهان دەکەین. دەتوانین لە دنیای خەیاڵدا ئەوە بهێنینە بەرچاوی خۆمان کە تەماشای ئاوێنە دەکەین و روخسارێکی دیکە دەبینین و لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە بەبینینی ئەو روخسارە سەراسیمە نابین. ئەم مەسەلەیە ئەو وێناکردنە بەهێزە لای من دروست دەکات کە لە بەدەن و رابردووم جیام. بنەمای فیکری دیکارت کە من بەشێوەیەك لە شێوەکان لە هەموو مەسەلە مادیەکان جیام (سەربەخۆم)، هەمان ئەزموونە. ئەگەر لەناوەوە وەکو تیۆرێك تەماشای دوالیزمی دیکارت بکەین، باوەڕپێکردنی لەبەر ئەو هۆیانە بە جوانی وتمان، زۆر دژوارە. بەڵام لە هەمان کاتدا دەبینیت کە ئەگەر لە رێگەی زنجیرەیەك قووڵبوونەوەوە پێیبگەیت. بەربەرەکانیی لەبەردەمیدا زۆر سەختە. ئەو زنجیرە قووڵبوونەوەیەی کە دیکارت بەو روونی و توانا بێهاوتایەیەوە دەیخاتە بەردەمت و بەرەو رێگایەك وەکو دیمان -بەرای من هەڵە- رێنماییت دەکات، هەم زۆر کاریگەر و بەرچاوە و هەم دەچێتە قووڵایی وجودتەوە. هەروەکو وتمان، تەنانەت ئەگەر هەوڵبدەیت قووڵبوونەوەو فیکری دیکارت رەت بکەیتەوە، دیسان ناتوانی بەبێ گۆڕان لەم زۆر کارییە وەکو یەکەمجار بێیتە دەرەوە. یەکەم ئەرکی فەلسەفی تۆ ئەوەیە کە هەوڵبدەیت دەربارەی ئەوەی دەشێ چیی بیت تێگەیشتنێ لە بارەی خۆت و خەیاڵت و وێناکردنەکانتەوە حاسڵ بکەیت و لەم رێگەیەوە لە کۆتی ئەم مۆدیلەی دوانەی (رۆح و بەدەن) رزگار بیت.

## پەراوێز

1-(یقین) یەقین: بریتییە لە زانست و زانیارییەك کە دوای لێکۆڵینەوە و سەلماندن و نەهێشتنی شك و گومان بەدەستدێت، یان مەسەلەیەك کە روونبێ و سەلمێنرابێ (فرهنگ عمید جلد 3 ص 2531) وشەیەکی گونجاوی کوردیم بۆ نەدۆزییەوە بۆیە وەك خۆی دامنایەوە. (وەرگێڕ)

2-*zeugma* (قصد المعنین) واتە کرداری یان سیفەتێ لە رستەیەکدا دوو مەفعول یان دوو مەوصوف وەربگرێ و لە بارەی هەر یەکێکیانەوە مانایەکی دیکە بدات و تەنیا پەیوەستێ لە نێوان ئەو دوانەدا (و. فارسی).

## سەرچاوە

فلاسفە بزرگ، اشنایی با فلسفە غرب، لا123-151.

# ڕۆمانی ( یەکەم مرۆڤ )ی ئەلبێر کامۆ

## لە گفتوگۆیەکی نێوان ڕاسڵ ویلکنسۆنو کاترین کامۆدا

لە ئینگلیزییەوە: ئازاد بەرزنجی



کامۆ

لە جەنیوەریی 1960دا نووسەرو فەیلەسووفی فەرەنسی (ئەلبێر کامۆ) لەگەڵ هاوڕێو بڵاوکەرەوەی کتێبەکانی، میشێل گالیمار لە ڕووداوێکی ئۆتومبێلدا گیانی لەدەستدا. ئەوەی لەنێو پاشماوەی ئەم ڕووداوەدا ڕزگاری بوو دەسنووسێکی تەواونەکراوی دوا ڕۆمانی کامۆ بوو، کە ئەویش ڕۆمانی (یەکەم مرۆڤ)ە.

لە ساڵی 1957داو وەکو داننانێك بە بەناوبانگترین ڕۆمانەکانیدا، واتە (نامۆ) و (تاعوون)، خەڵاتی نۆبڵ بە کامۆ بەخشرابوو.

پاش پەنجا ساڵ لە یەکەم چاپی (نامۆ)، تا ئیستاش پڕفرۆشترین ڕۆمانی فەڕەنسییە لەم سەدەیەدا.

لە ئۆکتۆبەری 1995دا دواجار (یەکەم مرۆڤ) بە ئینگلیزی چاپکرا، واتە سیو پێنج ساڵ دوای مەرگی کامۆ. کاترین کامۆی کچی ئەو دەسنووسەی بۆ چاپ هەڵبژارد کە چاوی پیانەخشێنراوەتەوە. ڕەش نووسەکانی لە شێوەی دەقی تەواوکراوی ڕۆمانەکەو تێبینیەکانی نووسەردا ڕێکخراون کە بەدوایەکدا هاتنو بەرەوپێشچوونی کارەکە تەوادەکات. بەم جۆرە (یەکەم مرۆڤ) تا ڕادەیەکی زۆر پرۆسەیەکی تێبینیکراوی کارێکمان لە کاتی ئیشکردن تیایدا پیشاندەدات.

ڕۆمانەکە خۆی بریتییە لە ڕامانێکی ژیاننامەئاسای مناڵیی پڕ لە هەژاریی کامۆو خێزانێکی

هەتیو لە جەزائیرداو لە خاڵی وەرچەرخانی ئەم سەدەیەدا.

لە کاتێکا ئەم ڕۆمانە تەواویش نەکراوە، بەڵام بەشێکی زۆری دەقەکە ڕوونیی بەرجەستەکراوو هەستیاریی کامۆی پێوە دیارە، کە بە ڕوونی ئەوە دەخەنەڕوو کە بەر لە مەرگە کارەساتبارو ناوەختەکەی لە تەمەنی 47 ساڵیدا باشترین نووسینی بەڕێوە بوو.

کاترین کامۆو ڕۆبرت گالیماری هاوکاری لە ئۆکتۆبەری 1995دا چوون بۆ لەندەن. لەوێو لە ئوتێلی باسیل لێدوانیان لەسەر ئەو ئاماژانەی (یەکەم مرۆڤ) کرد کە پێویستن بۆ هەڵسەنگاندنمان بۆ ئەلبێر کامۆ وەك نووسەرێك‌و فەیلەسووفێکی سیاسی لە کۆتاییەکانی ئەم سەدەیەدا. ئەم گفتوگۆیە بە فەرەنسی ئەنجامدراوە.

* * * *

ڕاسڵ: لە سەرنجی بڵاوکەرەوەکەتدا بۆ (یەکەم مرۆڤ) پێشنیازی ئەوە دەکەیت کە ئێستا کاتێکی زۆر گونجاوە بۆ پێشوازیکردن لە کارەکانی کامۆ. تۆ لەو بڕوایەدایت کە لەم ساڵانەی دواییدا کامۆ پشتگوێ خرابوو؟

کاترین: ئەو هەرگیز لە لایەن خوێنەرەکانیەوە فەرامۆش نەکراوە. کامۆ زۆر دەخوێنرێتەوە. ئەو پڕفرۆشترین نووسەرە لە کۆی کارە چاپکراوەکانی گالیمار، چەند ساڵێکە وایە و تا ئێستاش هەروایە. بۆیە قسەکردن لە سەرلەنوێ کەشفکردنەوەی ئەو وا دەگەیەنێت کە چیدی ئەو ناخوێندرێتەوە، لە کاتێکا ئەمە ڕاست نییە. مەسەلەکە ئەوەیە کە لە کاتی بڵاوکردنەوەی (یەکەم مرۆڤ)دا لە دڵی خۆمدا وتم ئەمە ئەبێتە شتێکی ترسناك، بەڵام ترسناك لە گۆشەنیگای ڕەخنەوە.

من لە جەماوەری خوێنەرەکانی کامۆ ناترسم. بەڵکو لەو شتانە دەترسم کە لە ڕۆژنامەکاندا دەنووسرێن.

بەهەرحاڵ، کۆمەڵێك نیشانە هەن ئەوە پیشان دەدەن کە ڕۆشنبیران بۆ کامۆ دەگەڕێنەوە. چ مێژوو و چ شکستی کۆمۆنیزم ئەو پاساوەی پێداون. لە ڕاستیدا ئەوە هەر کێشەی کۆمۆنیزم بوو کە لە دژایەتیکردنی کامۆ بەرپرسیار بوو. بەردەوام‌و لەسەروو هەموو شتێکی ترەوە هۆیەکی سیاسی بوو، جۆرێك لە بەدحاڵیبوون، کامۆ گوڵاگ‌و دادگاییکردنەکانی ستالینی مەحکوم کرد. ئەمڕۆ بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو لەسەر هەق بووە. وتنی ئەوەی کە لە یەکێتیی سۆڤێتدا ئۆردوگای زۆرەملێ هەبووە کاتی خۆی کفر بووە، هەر بە ڕاستی شتێکی ترسناك بووە. ئەمڕۆش ئێمە کاتێ بیر لە یەکێتیی سۆڤێت دەکەینەوە ئەو ئۆردوگایانەمان لە زەیندایە، بەڵام پێشتر ئەوە ڕێپێدراو نەبوو. کەس ڕێی پێ نەدەدرا بیر لەوە بکاتەوە یان بڵێین کە چەپە. کامۆ بەردەوام جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە بە تەنها پێوانە مێژووییەکان‌و هۆکارە مێژووییەکان تاقە شت نین کە دەبێ لەبەرچاو بگیرێن، هەروەها ئەمانە هۆکاری تەواو بەهێز نەبوون، دەشێ مێژوو بەردەوام سەبارەت بە مرۆڤ هەڵە بێت. لەبەرئەمەیە ئەمڕۆ وا بەمجۆرە دەست بە بیرکردنەوە دەکەین.

ڕاسڵ: تۆ لەو بڕوایەدایت کە دوای ئەم سەردەمی گۆشەگیرییەی ڕۆشنبیرانە کە کارەکانی کامۆ خەریکە پشتیوانییان لێدەکرێ؟

ئارجی: ئەمە پشت بە قۆناغەکە دەبەستێت. هەر پاش جەنگ، پاش شەڕی ئازادیخوازنەی 1945، کامۆ باش ناسرابوو، لای سارتەرو لای تەواوی ڕۆشنبیرەکانی ئەو نەوەیە خۆشەویست بوو. چاوپێکەوتنێك هەیە کە لە ئەمریکا لەگەڵ سارتەردا سازکراوە، کە لێی دەپرسن پاشەڕۆژی ئەدەبی فەرەنسی چییە، ئەویش وەڵام دەداتەوە کە نووسەری گەورەی داهاتوو لە پاشەڕۆژدا کامۆیە. بەمجۆرە ڕۆژان تێدەپەڕن‌و پتر دەرەنجامی سیاسی لەبری ئەدەبی دێنە پێشەوەو، لەو

ڕۆژهەوە کە کامۆ لە ساڵی 1955دا (یاخی) دەنووسێت، تەقینەوەکە ڕوودەدات و، زۆربەی زۆری ڕۆشنبیرە چەپەکان دوژمنایەتیی دەکەن. لە هەمانکاتدا ڕاستەکانیش تێڕوانینیان بۆی باش نەبوو، ئیدی بەمجۆرە بە تەواوەتی خۆی تەنیا بینییەوە.

پاشان، لە هەشتاکاندا، ئەوانەی کە تۆ ناویان دەنێیت فەیلەسووفە لاوەکانی فەڕەنسا، وەکو بیرنارد و گلۆکسمان، ئاماژەیان بەوەدا کە کامۆ شتی وای گوتووە کە لە گۆڕەپانی سیاسیدا کەس نەیویستووە بیانبیستێت. ئەوان وتیان کە کامۆ ڕاستی کردووە، نەك ئەوانەی لەژێر کاریگەریی سارتەردا نوقم بووبوون، واتە ئەوانەی بێ هیچ قەیدو شەرتێك گوێڕایەڵی کۆمۆنیزم بوون بەو شێوەیەی کە لە یەکێتی سۆڤێتدا دەبینرا، ئیدی لەو کاتەوە بەرزڕاگرتنی کامۆ تا ئێستا بەردەوام بووە. ڕۆشنبیرانی سەردەمی کامۆ کە پێشتر ڕقیان لێبووە، ئێستا ڕێزی لێدەگرن. لەم خاڵەشەوەیە کە دەگەڕێینەوە سەر ئەدەب و، بەردەوام ڕێکەوتنیش لەسەر ئەوە هەیە کە هەمیشە نووسەرێکی گەورەیە.

ڕاسل: بە شێوەیەکی تایبەتی ئەوە چییە کە وامان لێدەکات (یەکەم مرۆڤ) چاپ و بڵاوبکەینەوە، ئەم کتێبە چۆن تێگەیشتنی ئێمە بۆ کاری کامۆ دەگۆڕێت؟

کاترین: ئێمە دەبێ ئەوەمان بیرنەچێت کە کامۆ تەنانەت سێیەکی ئەوەشی نەنووسیوە کە ویستوویەتی بینووسێت. پاش مەرگی (یەکەم مرۆڤ) دواکاری بڵاوکراوەیەتی. بەڵام لە ڕاستیداو بە شێوازێکی دیاریکراو، یەکەم کاریێتی، لەبەرئەوەی لەم کارەیدایە کە نیشانەکانی ئیلتیزامی ئەو دەبینینەوە، هەروەها نیشانەکانی ڕێگای دروستی نووسین. ئەم ئاوێتەیەی ساکاری و هەستیاری، خواستی قسەکردن بە زمانی ئەوانەی کە ناتوانن قسەی خۆیان بکەن.

ڕاسل: لە هەندێ شوێنی نامەکانیدا بۆ جان جرینیە (مامۆستای فەلسەفەی کامۆ لە جەزائیر، لە هەڵبژاردەی یاداشتەکانیدا بڵاوبۆتەوە) ئاماژەی ئەوە هەیە کە لە کارکردنیدا لەسەر "یەکەم مرۆڤ" شادمان نەبووە. ئایا دوای وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ، هەستی کرد لەژێر گوشاردایە بۆ بەرهەمهێنانی دواکاری؟

کاترین: ئەو لەژێر کاریگەریی خەڵاتی نۆبڵدا نەینووسیوە ئەوە شتێکی دەرەکی بووە بەلای ئەو هونەرمەندەوە کە لەناخی ئەودا هەبووە. خەڵاتی نۆبڵ لە دەرەوە دێت. ئەوە لە سەرێکەوە دانپیانانێکی ڕەسمیانەی کۆمەڵایەتییە.

بە بڕوای من ئەوەی هونەرمەندی ڕاستەقینەش هان دەدات پێداویستییە ناوەکیەکانە. ئێمە ناتوانین دەربارەی ئەو کتێبە بدوێین کە ویستوویەتی بینووسێت، لەبەرئەوەی هەر سەرەتاکانیمان لەبەردەستدایە، کە بە زەحمەت نووسیونی، بەڵام پێویستی بە نووسینیان هەبووە. من وایدەبینم ئەگەر سەیری شێوازی "یەکەم مرۆڤ" بکەیت، زۆر لەو دەچێت کە چۆن بووە و وەکو پیاوێك ڕاستەوخۆ زۆر لەو دەچێت.

ڕاسل: ئایا ئێمە دەتوانین لە ڕێی (یەکەم مرۆڤ)ەوە بۆچوونێکی ڕوونتر سەبارەت بە بیروڕاکانی بەدەست بهێنین؟

کاترین: لەوانەیە نەتوانین، لەبەرئەوەی ئەوکارە لە حاڵەتی کەرەسەیەکی تەواو خاودایە، بەڵام لەم حاڵەتەشدایە کە مرۆڤ شتی زیاتر دەبینێت، بەبێ هیچ فرت و فێڵێکی هونەری، بەبێ ئەوەی شتێك هەبێت سڕابێتەوە. لەوانەیە لە هەمانکاتدا ئەم حاڵەتە زۆر ڕاستگۆیانەتریش بێت. من لەو بڕوایەدام ئەو ویستی هەندێ شت بنووسێت تا ڕوونی بکاتەوە کە ئەو کێ بووەو چۆن جیاواز بووە لەو سەردەمەی کە پێی بەخشراوە. زۆر کەس ئەوی وەك ئاکارگەرایەکی زاهید سەیرکردووە، بەڵام ئەو لەناو یاریگای تۆپی پێ و لە شانۆدا فێری ئەو

"ئاكار"ەی بووە. ئەمەش شتێکە هەستپێکراوە، کە بە شێوەیەکی تایبەتی بە هزردا تێناپەڕێت، ئەوە شتێکی مومکین نەبوو ئەو. لە ڕێی "هەست"ەوە بیری دەکردەوە. ئەو هەرگیز نەیدەتوانی لە ڕێی شتە دروستکراوەکان یان مۆدێلە کەلتوورییەکانەوە بیربکاتەوە، لەبەرئەوەی شتێکی وا لە ئارادا نەبوو.

بۆیە ڕاستە گەر بڵێین کە ئاکار یان ئەخلاقیەتی ئەو تەواو شتێکی "ژیانی" بوو، لە شتە مەلموسەکان پێکهاتبوو. هەرگیز بە بیروڕای ئەبستراکتدا تێنەدەپەڕی. بەڵکو ئەوە ئەزموونی خۆیەتی و شێوازی بیرکردنەوەی خۆیەتی. هەندێك هەن کە بیرۆکەکانی ئەو سەبارەت بە پووچی (**absurdity**) بە سەرنجڕاکێش دەزانن، هەندێکی تریش هەن کە دەکەونە ژێر کاریگەریی لایەنی هەتاویی کارەکانیەوە دەربارەی جەزائیرو گەرمی و شتی لەم بابەتە.

ڕاسڵ: بەوپێیەی "یەکەم مرۆڤ" مامەڵە لەگەڵ لەدایکبوون و مناڵیی کامۆدا دەکات لە جەزائیر، شتێکی سەیرە کە بەشداریبوونی قووڵی شەخسیانەی لە قەیرانی نیشتمانیی جەزائیردا وا دەنوێنێت کە ئەو وەکو نووسەرێکی فەرەنسی لە وێنەکێشانی سوننەتیانەی ئەو قەیرانەدا کەمتەرخەم بووە. تۆ لەو بڕوایەدایت کە "یەکەم مرۆڤ" بۆ بیرکردنەوەی ئێمە سەبارەت بە کامۆ جەخت لەسەر گرنگیی جەزائیر دەکاتەوە؟

کاترین: هیوادارم وابێت، کامۆ لە جەزائیر لەدایك بووە، بەڵام ڕەگەزنامەی فەرەنسییە. ئەو لەناو کۆلۆنییە فەرەنسیەکاندا ئیندماجی کرد. گەرچی کۆلۆنیستە فەرەنسیەکان بە تەواوەتی ئەویان ڕەت دەکردەوە، لەبەرئەوەی هەژار بوو. لە ڕووی سیاسیەوە، ئەو فیدراڵیەتی پەسەند دەکرد. لە ڕووی کردەییشەوە باوەڕی بە نموونەیەکی وەکو باشووری ئەفریقای ئەمڕۆ بوو. (یان وەك ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەن) واتە کۆمەڵێك لە دانیشتووانی تێکەڵ هەبن کە لە ڕووی مافەوە یەکسان بن، هەمان ماف بۆ عەرەبەکان و بۆ دانیشتووە فەرەنسیەکان، هەروەها بۆ تەواوی ئەو ڕەگەزانەی تریش کە لەوێ دەژین.

ڕاسڵ: تۆ لەو بڕوایەدایت کە ئەو خۆی بە یەکەم ئەندامی ڕەگەزێکی ڕەگوڕیشە هەڵکەنراو دەزانێت بە هۆی نەبوونی باوك لە سەرێکەوەو دوالیتیی کەلتووری لە پەروەردەکردنیدا لە سەرێکی ترەوە؟

کاترین: لەسەر ئاستی سیاسی نەخێر. ئەو یەکەم مرۆڤە لەبەر ئەوەی هەژارە، کە هەرگیز ئەمە بۆ مرۆڤ زۆر نەبووە.

ئەو بە ڕاستی جەزائیری ناسیوە. ئەو لە وڵاتەکەی خۆی دوورخرابۆوە، بەڵام هێشتا لەناو زمانی وڵاتەکەیدا دەژیا. (تەنیا و هاوکار Solitaire et Silidaire)*. ئەو وەکو ئەوانە نەبوو کە دووردەخرێنەوە بۆ وڵاتێك کە زمانەکەی هی خۆیان نییە. ئەو زۆر ئومێدی بەوە نەبوو کە شتەکان ڕوو لە باشبوونن، بەڵام دەیویست ئەوان دەستیان لە باشکردنیاندا هەبێت.

جەزائیر گەیشتبووە ڕادەیەکی وا لە توندوتیژی کە هیچ بوارێك بۆ تێڕامان نەمابوو. هەروەها هەڵوێست بۆ ناوبژیکردن نەمابوو. ئەمڕۆ گەر تۆ سەیری بۆسنیا بکەیت، کرواتەکان، بۆسنیەکان و سربەکان، ئەمانە هەموو ترسێکی وەهایان خوڵقاند کە مرۆڤ سەری سووڕدەمێنێت چۆن ئەمانە پێکەوە هەڵدەکەن، دوای ئەوەی بە یەکیان کرد! کاتی خۆی توندوتیژی گەیشتبووە پلەیەکی وا هەموو کەسێك لە ڕق و کینەدا دەژیا، دەرفەتێك بۆ بیرکردنەوە نەمابوو، هەڵوێستێك بۆ ناوبژیکردن. کەسێك نەبوو بتوانێ بڵێت "ئەم کەسە لەمەدا هەڵەیەو لەوەدا ڕاستە" ئەو شتەی کەوا لە خەڵك دەکات، یان وا لە دوو مرۆڤ دەکات بتوانن پێکەوە بژین. ئێمە تەنها لە ڕێی قبووڵکردن و دەوڵەمەندکردنی جیاوازییەکانمانەوە دەتوانین کێشەکانمان چارەسەر بکەین.

ڕاسڵ: کەواتە کامۆ هەوڵی داوە لە ناودژێتی (پارادۆکس)ی (تەنیاو هاوکار)دا بژی؟

کاترین: بە بڕوای من کامۆ زۆر هەستی بە تەنیایی کردووە. تۆ دەتوانیت ئەمە لە هەموو کتێبەکانیدا ببینیتەوە. (نامۆ) کامۆ نییە، بەڵام چەند بەشێك لە کامۆ لەناو (نامۆ)دا هەیە. وێنەیەك بۆ تاراوگە دەبینینەوە. بەڵام تاراوگەکەی ئەو بە تایبەتی لە پاریس یان شوێنێکی دیکەدا نییە، بەڵکو لەنێو دونیای هزریدایە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگوڕیشەکەی. هەر خودی ئەمە خۆیشی تاراوگەی تەواوە.

ئەمەش تەنها لەبەر شێوازی ئەو لە هەستپێکردندا بەر لە بیرکردنەوە. ئەو لە بوارێکدایە کە زۆرجار هەست بە جۆرێك هەڵاتن ئەکات لێی. بەهەرحاڵ، تۆ دەبێ بزانیت خوێن چییە. دەبێ هەموو ئەو شتانە پاساو بدرێنەوە. لەمەشدایە کە ئەو هەست بە نەفۆو هەست بە تەنیایی دەکات..

ئاڕ. جی: تا ئێستا ئەوەی ڕوونە ئەوەیە کە کامۆ هەرگیز نەیتوانیوە مرۆڤێکی "بێلایەن" بێت. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو پابەند (مولتەزیم) بوو. بڕوانە پەیوەستبوونی فیزیکیی ئەو بە بەرهەڵستکارانەوە. ئەو ڕۆڵی خۆی لە شەڕدا دژ بە نازیزم بینی. پاشان ئەو بەردەوام ئیلتیزامێکی قووڵی بە بەرەنگاریی ڕاستەقینەوە هەبووە دژ بە هەموو جۆرەکانی تۆتالیتاریزم. بۆ نموونە، زۆرجار ئەوە لەبیر دەکرێ کە کامۆ تەواو دوژمنی ڕژێمەکەی فرانکۆ بوو و تا کۆتاییش هەروا مایەوە. ئەو سەفەری بۆ ئیسپانیا ڕەتکردەوەو وازی لە یۆنسکۆ هێنا، لەبەرئەوەی یۆنسکۆ ئیسپانیای فرانکۆی وەك ئەندام قبووڵ کرد. کامۆ لەوەدا کەللەڕەق بوو و ئەمەش بە هیچ جۆرێك بێلایەنی نییە. ئەمە نەبەردە، ئەمە مرۆڤێکە کە دەروەست (مولتەزیم)ە. هەڵبەت ئەو بوونگەرا نەبوو، بەڵام مرۆڤێکی دەروەست بوو. مرۆڤی نەبەرد بوو. بە خۆڕاییش نەبوو کە ڕۆژنامەیەکی بەرهەڵستکارانەی بە ناوی "نەبەرد"ەوە دەردەکرد.

ڕاسڵ: چی وا دەکات کە دەروەستیی ئەو لە هی بوونگەراکان جیاواز بێت؟

کاترین و ئاڕجی پێکەوە: ئەو بوونگەرا نەبوو.

ئاڕجی: ئەو بەردەوام ئەوەی ڕەتکردۆتەوە.؟

ڕاسڵ: نمونەیەکی تری ئەوەی کە ئەو "تەنیاو هاوکار" بوو ئەوە بوو کە لەگەڵ سارتەردا دوو هاوڕێی نزیك بوون، بەڵام لە ڕێبازی بوونگەراکەی ئەو جیابوو؟

کاترین: بەڵێ ئەمڕۆ ئەنجامی ئەو جیاوازییە دەبینین. بەڵام عادەتەن کاتێ بە توندی ڕووبەڕووی شتەکان دەبیتەوە ئینجا وردە وردە لێیان تێدەگەیت. هەموو کەسێك ئومێد بە مرۆڤایەتیەکی باشتر دەخوازێت، زۆر لە خەڵکیش، تەنانەت سارتەریش، لەسەرەتاکانیدا بەلای ئایدیای کۆمۆنیزمدا شکاندیانەوە.

بەخشندەیی لە ئومێدی خەڵکدا جێی خۆی هەبووە. بەڵام کامۆ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە زۆر شت هەن پێویستە پیایاندا تێبپەڕین. دەبێ بەر لە چاککردنیان هەموو شتەکان قبووڵ بکرێن. کاتێك لە سارتەریان پرسی ئاخۆ لەژێر سایەی ڕژێمێکی کۆمۆنیستدا دەژی، وتی "نەخێر، بۆ خەڵکی تر باشە، بەس بۆ من نەخێر" بۆیە قورسە بڵێین کە هەڵوەستەی فیکریی چۆن بووە. چۆن بڕوا دەکەیت کە تۆ هەرگیز ئامادە نەبیت ژیان لە سای ڕژێمێکی کۆمۆنیستدا بەسەربەریت کەچی بۆ خەڵکی تر بە باشی بزانیت؟ ئەمە شتێکی زۆر قورسە، بەڵام سارتەر تەگبیری ئەمەی کردبوو.

کامۆ نەیکرد، ئەمڕۆش ئەم شتەیە کە ئێمە ڕووبەڕووی دەبینەوە. مەبەستم لەوەیە ئەو ئایدیۆلۆجیا پەتییە چییە کە هیچ حسابێك بۆ چوارچێوەی مرۆیی نەکات. لە ئابووریناسیشدا هەمان شتە. ئابووریناسیش ویستی

تیۆرەیەك بخاتە سەروو پێودانە مرۆییەکانەوە، یان مرۆی بالاوە.

ئەو کات خۆت دەبینیتەوە کە دیسانەوە سەرت بە دیواردا دەکێشیتەوە، ناگەیتە ئەنجامێك. کاتێك مرۆڤ لە هەموو شتەکان دابماڵێت. لەبەرئەمە دەبینین کامۆ ئیستاش هەر تازەیە، لەبەرئەوەی ئەو بەردەوام وتوویەتی بەڵێ، بەلام مرۆڤ هەیە. مرۆڤ یەکەم شتە، لەبەرئەوەی من مرۆڤم، هەر ئەمەش (هاوکاری Solidarity)یە.

ڕاسلێ: کەواتە ئایا "یەکەم مرۆڤ" پردەکەی ئەوە لە نێوان ئەزموون و فەلسەفەدا؟

کاترین: ئەوەی ئەو بابەتانە پێشنیازی دەکەن کە سەبارەت بە "یەکەم مرۆڤ" نووسراون، خاکێتی (تەوازوع)ە. قبووڵکردنی ئەم دژایەتیانە. گەڕان بە دوای هەر پاساوێکیشدا بریتییە لە مەرگ. درۆ لای کامۆ بریتییە لە مەرگ. هەر بۆیە لە شانۆنامەی (بەدحاڵیبوون)دا کوڕەکە دەمرێت، لەسەر دەستی خوشکی و دایکی دەکوژرێ، لەبەرئەوەی درۆی کرد. ئەو هەرگیز بەوانی نەوت کێیە، ئەوانیش کوشتیان لەبەرئەوەی نەیانناسیەوە. بەلام لە هەمانکاتدا کامۆ دەڵێت هەر شتێك مرۆڤ ناچاری دوورخستنەوە بکات شتێکی ڕاستەقینە نییە. هەر لێرەوەیە کە تۆ ناچاریت دژایەتیەکان قبووڵ بکەیت گەر نەتەوێ شتە ڕوون و حاشاهەڵنەگرەکان سەبارەت بە ژیان و بەڵگە حاشاهەڵنەگرەکان ڕەت بکەیتەوە. تۆ ئەگەر سیستمێك بخولقێنیت و بڵێیت "ئەمەتانێ حەقیقەت" لەو جۆرە ڕێگایەدا، ئەوکات تۆ تەواوی ڕێگاکانی تر پووچەڵ دەکەیتەوەو ژیان دەکوژیت. ئەمە ئەرکێکە لە ئەستۆی هەموو کەسێکدایە. ئەو بە تەنها هێرشی نەدەکردە سەر دامەزراو (یا سیستمەکە —و—). ئەو دەیوت "ئەگەر دامەزراوەکە باش بێت، ئەوا چاکتر". ئامانجی ئەو یارمەتیدانی خەڵك بوو بۆ ژیان. ئەوە بە لایەوە گرنگترین شت بوو. بە بڕوای من ئەوەی بەلای هەر هونەرمەندێکەوە زۆر گرنگە ئەوەیە کە چۆن بچێتە زۆربەی دڵەکانەوە.

ڕاسلێ: بەوپێیەی کە ئەم ڕۆمانەی بۆ دایکی نووسیوە، ئایا تۆ لەو بڕوایەدایت کە "یەکەم مرۆڤ" وێنەیەکی ڕوونتری بیروبۆچوونەکانی ئەومان سەبارەت بە مێینایەتی دەداتێ؟

کاترین: ڕاستە کە لە کارەکانی تریدا ئافرەت زۆر بە کەمی دەرکەوتووە. لە پەراوێزدان. بەلام مێینایەتی، بەڵێ، ئامادەگیەکی کاریگەری لە "یەکەم مرۆڤ"دا هەیە. نەك هەر لەو شتانەدا کە پەیوەندییان بە ئافرەتەوە هەیە، بەڵکو لە ڕووی شێوازیشەوە، لە توخمەکانیداو، لەو سەرنجانەدا کە نووسیونی. دەتوانیت چیرۆکێکی خۆشەویستیی ڕاستەقینەی تیا ببینیتەوە. چیرۆکێکی خۆشەویستیی منداڵی، یەکەم چیرۆکی خۆشەویستیی کامۆ. لە ڕاستیدا مێرسۆ (پاڵەوانی نامۆ) و ماری زۆر دەرنەکەوتوون. دۆراش هەیە لە (دادپەروەران)داو هەروەها ئافرەتی تر لە شانۆنامەکانی دیکەیدا، بەلام زۆر نەناسراون. بە بڕوای من بەلای کامۆوە دایکی لەوە زیاتر بوو. ئەو بریتی بوو لە خۆشەویستی، خۆشەویستیی ڕەها. هەر بۆیە ئەو ڕۆمانەی بۆ نووسیوە، پێشکەشە بە "تۆ، ئەو کەسەی هەرگیز ناشتوانێت بیخوێنێتەوە". هەروەها لە "یەکەم مرۆڤ"دا خۆشەویستی زۆر گرنگە، تیایدا کامۆ ئەو شتانەی خۆشدەوێت کە خۆی هەڵینەبژاردوون، ئەو بە شێوەیەکی زۆر ڕاستەقینە منداڵیی خۆی خۆشدەوێت. هەژارییەکەیان مانای ئەوە بوو کە هیچ شتێکی دی نەبوو بیری لێ بکەنەوە جگە لەوەی چی بخۆن، چی لەبەربکەن. تەنانەت خێزانەکەیان لە ژوورێك زیاتریان نەبوو تا شتی تری تیا دانێن. بەلای خەڵکی ترەوە زەحمەتە ئەو دۆخە بهێنێتە بەرچاوی کە کامۆ خۆی تیا بینیوەتەوە. لە ژیانیاندا بوونێکی خەیاڵاوی نەبوو.

زۆربەی ڕۆشنبیرە فەرەنسیەکان وردە بۆرژوا بوون. زەحمەتیشە بتوانین بڵێین کە ئەوە وای کردووە کە کارەکانی کامۆ بەهادارتر بن. من وا پەسەند دەکەم بڵێم کە کارەکانی جیاوازن. ئەو بە ناچاری هەستی بە بارودۆخەکانی خۆی کردووە. هەر بۆیە شتێکی سروشتییە کە ئەو ڕۆشنبیرانەی بەو ئەزموونەی ئەودا تێنەپەڕیون زەحمەتە لێی تێبگەن. بەڵام بە بڕوای من ئەمە وای لە کامۆ کردووە لێبوردەتر بێت، لەبەرئەوەی ئەو هەردوو دیوی شتەکانی بینیوە، لە کاتێکا ئەوانی تر بە تەنها یەك دیویان بینیوە. ئەوان بە خەیاڵ هەژاری دەهێننە بەرچاوی خۆیان، بەڵام نازانن هەژاری چییە. لە ڕاستیدا ئەوان هەستکردن بە گوناهیان سەبارەت بە چینی کرێکار هەیە، ئەوە گۆشەنیگایەکە کە ئەوان نەیانتوانیوە لای خۆیان دروستی بکەن، هەڵبەت نەك بەو شێوازەی سارتەریش، لەبەرئەوەی بەوان ئاشنا نەبوون. هەرگیز خۆیانیان بۆ چینی کرێکار تەرخان نەکردووە. ناشزانن ئەوە مانای چییە، هەر بۆیە ئەمە وای کردووە لەو بارەیەوە هەست بە گوناه بکەن. کامۆ لە ڕووی هەژارییەوە پەیوەندییەکی نزیکتری بەوانەوە هەیە.

ڕاسڵ: ئاخۆ ئەم نزیکیەی لەو خاکێتی (تەوازوع)یەوەی سەرچاوەی گرتووە کە لە کۆتایی (یەکەم مرۆڤ)دا لەو نامانەیدا بەدی دەکرێن کە بۆ کۆنە مامۆستاکەی خۆی (مۆنسیۆ جێرمەین) نوسیونی؟

کاترین: لەبەرئەوەی مامۆستاکەی لە (یەکەم مرۆڤ)دا شوێنێکی سەرەکیی هەیە. ئەو مامۆستایە چۆن بووە، کامۆ ڕێك وەکو خۆی پیشانمان دەدات. یەکەم مرۆڤ تەواو کارێکی بایۆگرافییە. ئەو دایکەی وەسفی دەکات ئەو ئافرەتەیە کە من ناسیومە، ڕێك ئەو کەسەیە کە ئەو وەسفی کردووە. ئەم مامۆستایەش دەقاودەق خۆی بووە. بەڵام ئەمە دیسانەوە ئەوەش پیشان دەدات کە خەڵکی بایەخێکی زۆر بەناوبانگ دەدەن، کامۆش لە وتاری قبووڵکردنی خەڵاتی نۆبڵەکەیدا سوپاسی ئەو مامۆستایەی دەکات. پێزانین‌و سوپاسی تیایە. ئەوە بۆ ئەوەیە پیشانی بدات کە ئەو خەڵاتەی لەوەوە هاتووە کە مامۆستاکەی بۆ ئەوی کردووە. هەروەها لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەشدا مۆنسیۆ جێرمەینێك هەیە. لەبەرئەمە من نامەکانیشم چاپ کرد، بۆئەوەی لە کارەکەدا شوێنێکیان هەبێت. بەڵام من هەرگیز لەبری باوکم ڕەفتار ناکەم‌و شت ناڵێم. ئەو هونەرمەندێکە، خۆی بە هونەرمەند دەزانی، بۆیە بەرپرسیارێتیی قسەکردنی لەبری ئەوانە گرتە ئەستۆ کە ئامرازو دەرفەتی قسەکردنیان بۆ نەڕەخساوە.

## پەراوێز

*(Solitaire et Silidaire) ئەم دەستەواژەیە کە فەرەنسییە ناونیشانی سەرەکیی ئەم گفتوگۆیەشەو بە مانای (تەنیا یا گۆشەگیر) و ئەوی تریش Solidaire بە مانای (هاوکار) دێت، کە دوو زاراوەی مانا تایبەتن لای کامۆو بە واتای ئەوە دێن کە مرۆڤ لە سەرێکەوە بوونەوەرێکی تەنیایەو لە سەرێکی تریشەوە لەناو کۆمەڵێکی مرۆییدایە کە دەبێ ڕۆڵی خۆی تیا ببینێت.

-وەرگێڕ-

## سەرچاوە

www.spikemagzine.com

ناونیشانی بابەتەکە:

*Solitaire et Soledaire*

*Russell Wilkinson talks to Catherine Camus about Albert Camus' The First Man*

# فایلی ژماره
# گابریل گارسیا مارکیز



- مارکیز بۆ؟
- ژیان و کارنامەی مارکیز
- مارکیز، ئەو پیرە بە گومانەی...
- مارکیز بە قەڵەمی هاوڕێکانی
- خوێندنەوەیەك بۆ پێنج بەرهەمی مارکیز
- یادەوەری سۆزانییە خەمبارەکانم
- پاتریارك و چیرۆکی ستەم
- ڕۆمانی.. هەواڵی ڕفاندنێك
- گفتوگۆیەك لەگەڵ مارکیزدا
- خنکاوێك لەسەر خاکێکی ڕەق
- ئەو شێوازەی کە نەنکم ڕاهاتبووچیرۆکان بگێڕێتەوە
- بۆنی گەواڤە
- چاوی سەگە شینەکە
- وەسێتنامەی مارکیز

# ماركیز بۆ؟

سەرنووسەر



گابریل گارسیا ماركیز نووسەرێكی هەرە ناوداری ئەمڕۆی ئەدەبیاتی دنیایە. لەو نووسەرانەیە كە لە ڕێی بەرهەمەكانیەوە، بەتایبەتی لە رۆمانەكانیدا كلتوری ئەمریكای لاتینی بە گشتی و كۆلۆمبیای ولاتی بەتایبەتی بەرجەستە كردووە. چ لەسەر ئاستی مێژووی سیاسی ئەو ولاتانە یان ئەو ئەفسانە و حیكایەت و سیحر و خورافاتەی دەماودەم لە سەر زمانی نەوەكان گێردراونەتەوەو بوونەتە بەشێكی تەواوی پێكهاتە ڕۆشنبیریەكەی. ماركیز لەناو خێزانێكدا پێگەیشتووە كە ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە، چ وەك واقیع و چ وەك ئەفسانە هەمیشە بەسەر زمانیانەوە بوەو گوێی ئەمی مندالیان پێ پڕكردوە، بۆیە بەرهەمەكانی سیمای ئەو كەش و هەوا ئەفسوناوییەی گرتوەو ناوی ئەو شێوازەیشیان ناوە ریالیزمی جادویی یان واقیعی سیحری. ماركیز سالی 1928 لە شارۆچكەی ئاراكاتاكا (*Aracataca*) لە باكوری كۆلۆمبیا لەدایك بووە و تا تەمەنی دەسالانی هەر لەوێ لای نەنكی ژیاوە. وەك خۆی باسی دەكات نەنكی دەوری گەورەی لە چێژ پێبەخشینی رۆحی

ئەمدا هەبوە بەو چیرۆك و ئەفسانانە. بە تایبەتی کە نەنکی دەستی بالآی هەبوە لە چنین و لە ڕوونانی بەسەرهاتەکاندا.

هەروەها باپیریشی کە سەربازێکی کۆنەکاری شەڕی ئازادیخوازی بووە، دەوری هەبوە لە فێرکردنی فەرهەنگی زماندا و چاوکردنەوەی مارکیز بەو بەسەرهاتە مێژوویی و شەڕ و ڕاپەڕینانەی لە ولآتەکەیدا روویانداوە.

زمانی نووسینی مارکیز زمانێکی کورت و پوخت و سەخت داڕێژراوە، لە هەمان کاتدا زمانی تێگەشتنە و کاریگەریی لەسەر خوێنەر هەیە، دنیاکەیشی دنیایەکی سەرسامکەری پڕ لە رووداوو بەسەرهاتی سەیرە. ئەگەرچی مارکیز لە خەیاڵێکی هەرە پڕو دەوڵەمەندەوە کارەکانی ئەنجام دەدات. بەلآم وەك خۆی دەڵێت ئەو لە واقیع دانەبڕاوە و بابەتەکانی چەندە بەناباو بدرێنە قەڵەم هێشتا هەرهەن و لەناو ژیانی ڕۆژانەی خەڵکیدا بەتایبەتی لە ئەمریکای لاتیندا — باون. واتا زەمینەی ڕۆمان و چیرۆکی واقیعن و خەیاڵ کردوونی بە هونەر، لە گەلێك بۆنەدا کە باس لە واقیع و فانتازیا دەکات لەسەر ئەوە سوورە کە ریالیزمی جادویی بە مانای دابڕان نیە لە واقیع وەك هەندێك وای بۆ دەچن، بەڵکو " بەوردی و قووڵی چوونە ناو واقیعەوە و بێ ئەوەی لە پێشدا فەرمانی ئەقلآنیت دابێت، پانورامایەکی مەزن لە رووی ڕۆمانەکانماندا دەکاتەوە، هەرچەند خەڵکیی ڕێبازەکەمان بە ڕێبازێکی هەلآتن بداتە قەڵەم، بەلآم نزیك یان دوور واقیع ئەوە دەسەلمێنێت کە خەیاڵ لەسەر هەقە"

بەلای مارکیزەوە تەنیا ئەقڵ سەرچاوەی راڤەکردنی واقیع نیە، بەڵکو و هوشیاری مرۆڤ بە دەوروبەرەکەی و ئەو بڕوایەی دەبێتە بەشێکی هوشیاریەکەیشی کارەکانی ئەقڵ تەواو دەکەن.

دیارە یەکێك لە خەسڵەتە هەرە دیارەکانی بەرهەمی مارکیز خۆبەستنەوەیەتی بە ژیان و چارەنووسی مرۆڤەوە. ئەو باس لەو دیکتاتۆرانە دەکات کە بە درێژایی دەیان ساڵ دانیشتوانی ئەمریکای لاتینیان چەوساندۆتەوە و کۆیلەیان کردوون. خۆیان بە خوای سەر زەوی داناوە و ئەوانەیان لە ڕەگەوە هەڵکێشاوە کە لە بەهاو توانایانی کەم کردبێتەوە. باس لە ئەفسانەو نەریت و رەوشتە تایبەتیەکانی خەڵکی دەکات کە گەلێك جار بە هۆی خەیاڵ و وێنە هەرە سەیرەکانەوە وەك موجیزە خۆ دەنوێنن و ناتوانیت لە بەردەم گومانێکدا خۆت نەدۆزیتەوە کە تەنیا بەهرە و داهێنانی نووسەرێك دەتوانێت گومانەکە بڕەوێنێتەوە.

مارکیز ئەو شتە دەنووسێت کە دەزانێت شیاوی نووسینە و نرخی وتنی هەیە. بۆیە هەمیشە خوێنەری لە زیادبووندایە، باسەکانی چیرۆکی هەموو کەسێکن، چیرۆکە تایبەتیەکانی تەنیایی و سۆز و خەم و خۆشەویستی و ساتە شوومەکان و ئەو چاوەنوارِیانەی بە ئومێد ناگەن. چیرۆکی ئەو مرۆڤانەی تەنیا جارێك لە هەموو ژیانیاندا — ئەویش بۆ چەند شەوێك — بەختەوەر دەبن و ئەو پاڵەوان و جەنڕاڵە مێژوکردانەی ژیانێکی تری تایبەتی و پڕ لە ڕسواییان هەیە و کەسەکانی دەوروبەریان بە چاوی ئاسایی دەرك بە هەقیقەتیان ناکەن. ئەمانە ئەو چمکە زیندوانەن کە هەموو جیاوازیەکانی رەگەز و زمان و ئاین و مێژوو دەبڕن و لە بەستێنی مرۆڤایەتیدا دەگیرسێنەوە.

مارکیز لە چاوپێکەوتنێکدا کە باسی رەواجی ڕۆمانی سەد ساڵ تەنیایی لێ دەپرسن دەڵێت: "هۆی وەرگێڕانی زۆری سەد ساڵ تەنیایی بۆ سەر زمانی تر ئەوەیە کە زۆر کەس خۆی تیا دەبینێتەوە، بۆ نموونە ژاپۆنیەك دوای ئەوەی بە زمانە ئەسڵیەکەی خوێندبوویەوە پێی وتم ئەوەی زۆر کاری لێ کردوە ئەوە بووە کە ئەو وای هەست کردوە چیرۆکی خێزانەکەی خۆی دەخوێنێتەوە لە



گونـدێکی بچـووکی ژاپۆنـدا. هـەروەها کچـێکی ئـەڵمانی نامەیـەکی بـۆ ناردم تیـا نووسـیبووی ئـەو گومـانی لـەوە نیـە کـە مـن بـە دوای خێزانەکـەی و گوندەکەیانـدا لـە ئـەڵمانیا گـەڕاوم و چـیرۆکەکەی ئەوانم نووسیوە، پاشان، بە هێوری لەگەڵ وڵاتەکەی خۆمدا گونجاندوومە"

بـەلای مـارکیزەوە نووسـەر لەبەرهـەمهێنانی ئەدەبیـدا تاکایـەتی (فردیـة)تـی خـۆی دەپارێزێـت چونکە خودی کارەکە بەرئەنجامی کەسێکی تـەواو کامڵـە لـە داهێنانـدا، ئەمـە بـە پێچـەوانەی کـاری سیاسیەوە کە چالاکیەکی بە کۆمەڵ و هەرەوەزیە.

مـارکیز وەك گـەلێك لـە نووسـەرانی ئـەمریکای لاتین بڕوای بـە سیسـتمی سوشیالسـتی بوەو ساڵی 1959 کە شۆڕشی کوبا دەستی پێکرد یـەکێك بوو لەوانـەی پاڵپشـتی کـرد و هاوڕێیـەکی نزیکـی فیـدڵ کاسترۆی سەرۆکی ئەم وڵاتەیە. خۆی لـەم بارەیـەوە دەڵێت: "دەمەوێت هەموو دنیا سوشیالیستی بێت، بێگومانیشـم زوو یـان درەنـگ ئەمـە هـەر دێتـە دی" لەگەڵ ئەوەیشدا خۆی نەبەستۆتەوە بـەو قوتابخانـە ئەدەبیـەوە کـە نـاوی ریـالیزمی سوشیالیسـتیان لـێ نـاوە و مـەرجی دەربەسـت بـوون – التـزام– بەسـەر نووسـەردا دەسـەپێنن و پێیـان وایـە نابێت نووسـەر لەو چوارچێوەیە دەربچێت کە بۆی دیـاریکراوە. لـەم بارەیـەوە ڕوو لـەو دوگماتیسـتانە دەکات و دەڵێت: "زۆر لــە هــاوڕێ چــالاکەکانی بــواری سیاســیم. ئەوانـەی وا هەسـت دەکـەن دەبێـت داهێنـەر بـە پێـی کۆمەڵێك پێوانەی دیاریکراو بنووسێت، دەبێت ئەوە بـزانن کـە ئـەوە هەڵوێسـتێکی کۆنەپەرسـتانەیە، چونکە بـەو کـارە ئازادیی هونـەریی کـۆت و پێوەنـد دەکەن، بۆیـە مـن وای دەبینـم ئـەو ڕۆمانـەی بـاس لـە خۆشەویستی دەکات هیچ لـەو ڕۆمانانـە کـەمتر نییـە کە باس لە بابەتی تر دەکەن. کەواتە ئەرکی نووسەر – دەتوانین بڵێین ئەرکـە شۆڕشـگێڕیەکەی – ئەوەیـە کە باش بنووسێت"

لـەم فایلـەدا کـە ئـەم ژمارەیـەی سـەردەممان بـۆ تەرخان کـردووە، مەبەستمانە مـارکیز بـە خوێنـەری کورد بناسێنین و لەبەرهەمە جیدیـەکانی ئـەم گـەورە نووسەرەی ئاگادار بکەین. چونکە تا ئێستا زۆر کەم لـە کارەکـانی کراونەتـە کـوردی و لـە وتارەکـانی نـاو ئـەم فایلـەدا خوێنـەر بـۆی دەردەکـەوێت کـە چـەند دەیەیــە میللــەتانی دنیــا ســەرقاڵی وەرگێــڕان و بەدواداچوونی بەرهەمـەکانی ئـەم نووسـەرەن و هـیچ کارێکی نییە وەرنەگێڕدرابێتـە سـەر زووربـەی زمانـە زینـدووەکانی دنیـا. بـە تایبـەتی ڕۆمـانی سـەد سـاڵ تـەنیایی کـە سـاڵی 1982 خـەڵاتی نـۆبڵی ئـەدەبیی لەسـەر وەرگـرت و، ڕۆمـانی پـاییزی بـاوك سـالار و خۆشەویستی لەسەردەمی کۆلێرا و سەعاتی شووم و کــەس نییــە نامــە بــۆ کولۆنیــل بنووســێت و خۆشەویســتی و شــەیتانەکانی تــر و گــەلێك لــە چیرۆکە کورتەکانیشی. ئامادەبوونی ئەم جۆرە نـاوە لــە بەســتێنی ئــەدەب و رونــاکبیریی کوردیــدا فاکتەرێکی تـەواو گرنگـە بۆ تێگەیشتن لە ئەدەب و داهێنـانی دنیا و لـەو ڕوانگەیەشـەوە تەماشـاکردنی ئەدەبی خۆمان، بەتایبەتی لە بواری ڕۆماننووسیدا کە تا ئێستا لای ئێمە لە بازاڕێکی بێ کالا دەچێت و بێجگـە لـە زاق و زریقێکـی بـێ مانـا و کاسـکەر بـە دەگمەن نەبێت هەناسەیەکی جوانی تیا هەست پـێ ناکـەیت. دەشـێت ئـەم فایلـەی ئێمـەیش بـە کارێکی هەمــە لایەنــەی بەرهــەمی مــارکیز دانــەنرێت و هەروایشە، بەڵام هـیچ نـەبێت پێناسـەی پیاوێکە کـە لـەڕێی داهێنـانی خۆیـەوە شوناسـی وڵاتەکـەی و هەموو ئەمریکای لاتینی بە مرۆڤایـەتی بەخشیوەو، توانیویەتی ئـەو کلتـووره بـەرز ڕابگرێـت کـە ئەڵقـەی پێکبەستنەوەی نەوەکانە و، ئەوەیش بە نەوەی نوێ بڵێـت کـە ئـەدەب رونـاکترین مێـژووی هـەموو سەردەمەکانە و هەر لەبەردەم ئەو تیشکەدا ئایندەی پرشنگدار و بێ خەوشتر دەبێت.

نیسانی 2005.

# ژیان و کارنامەی مارکیز

لە فارسییەوە: فەرهاد



1928 لە گوندی ئاراکاتاکا لەدایك بووە، تا تەمەنی هەشت ساڵی هەر لەو گوندەدا لای نەنکی ژیاوە.

1935 گەڕاوەتەوە لای باوك و دایکی و لە شاری (بارانکیا) و لە قوتابخانەی سیمون بولیڤار سەرەتایی تەواو دەکات و دەچێتە ناوەندیی (سان خوزە) کە قوتابخانەی یەسوعیەکان بووە.

1941 یەکەم بەرهەمی نووسینی لە رۆژنامەی (خوڤینتود)دا بڵاوکردەوە کە تایبەت بوو بە قوتابیانی ناوەندیی.

1943 دەچێتە شاری (بوگوتا)ی پایتەخت و لەوێ لەسەر خوێندن بەردەوام دەبێت هەر لە هەمان ساڵدا لە ناوەندی (زیپاکویرا) کە پەنجا کیلۆمەتر لە پایتەختەوە دوورە دەوامی خوێندن دەکا. لەوێ لە گۆڤاری (لیتراتورا) دەست بە نووسین دەکات.

1947 دەچێتە بەشی ماف لە زانکۆی بوگوتا. پاشکۆیەکی هەفتانەی زانکۆ بە ناوی (رازون)ەوە لە ئەستۆ دەگرێت. لەگەڵ پلینیو مندوزاو کامیلو توریس دەبێتە هاوڕێ.



1948 دەڕواتە شاری کارتاخناو هەر لە کۆلێجی ماف دەخوێنێت. لە هەفتەنامەی (ئال ئونیڤرسال) ستونێك وەردەگرێت بەناوی نوختە، سەری دێڕ.

1950 وتار لە رۆژنامەی (ئال ئارالدوی بارانکیا)دا بڵاودەکاتەوە. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا دەبێتە سەرنووسەری هەفتەنامەی (کرونیکا) پێنج نوقڵ دەنووسێت و دەست دەکات بە نووسینی ڕۆمانی گەڵاڕێزان.

1951 مارکیز دەگەڕێتەوە بۆ (کارتاخنا) کە دایك و باوکی لەوێ نیشتەجێن.

1952 دەگەڕێتەوە بۆ (بارانکیا) دەستنووسی ڕۆمانی گەڵاڕێزان لەلایەن بنکەی بڵاوکردنەوەی لوسادای بوینس ئایرسەوە ڕەت دەکرێتەوە و بۆی چاپ ناکەن. دەستدەکات بە نووسینی ڕۆمانی ماڵ.

1953 واز لە ڕۆژنامەنووسی دێنێت بە دوای بڵاوکەرەوەیەکدا هەموو کەنارەکانی ئەتلەنتیك بە پێوەدەدات. ڕۆمانی پیرەمێردو زەریا دەخوێنێتەوە.

1954 دەبێتە نووسەری ڕۆژنامەی (ئال ئسپکتادۆر) لە بوگوتا. لەوێدا ڕەخنەی سینەمایی دەنووسێت کە کارێکی تازەیە. هەروەها لەسەر چیرۆکی ڕۆژێك دوای شەممە خەڵاتی ئەدەبی وەردەگرێت.

1955 گوزارشێك دەربارەی لویس ئالخاندرو ڤیلاسکوی خنکا و دەنووسێت کە بە ئابڕووبردنی دەوڵەت کۆتایی دێت. بڵاوبوونەوەی گەڵاڕێزان لە بوگوتا. دەبێتە نوێنەری ئال ئسپکتادۆر لە ئەوروپا. بۆ دەست بەکاربوون دەچێتە کونفرانسێك لە جنێف. هەر لەم ساڵەدا سەفەری ئەم وڵاتانە دەکات: ڕۆما، پۆڵۆنیا و چیکوسلوفاکیا، پاریس. ڤینیسیا.

1956 ڕۆژنامەی (ئال ئسپکتادۆر) لەلایەن دەوڵەتەوە دادەخرێت. هەر ئەو ڕۆژنامەیە بەناوی (ئال ئیندی پێندت)ەوە دووبارە دەکەوێتەوە بازاڕ. دیسانەوە (ئال ئیندی پێندت) ڕادەگیرێتەوە.

مارکیز بەبێ پارەیی ڕوو لە فەرەنسا دەکات.

بە یارمەتی مندوزا هەواڵ و گوزارشت بۆ هەفتەنامەی (ئلیت) دەنێرێت لە کاراکاس.

1957 لە نووسینی ڕۆمانی (کەس نیە نامە بۆ کۆلۆنێل بنێرێت) دەبێتەوە لەگەڵ مندوزادا دەڕواتە ئەڵمانیای خۆرهەڵات.

هەر لەگەڵ مندوزادا دەڕوات بۆ یەکێتی سۆڤیەت و پاشان بۆ هەنگاریا.

دەگەڕێتەوە بۆ پاریس و گوزارشتێکی درێژ دەربارەی وڵاتانی بلۆکی ڕۆژهەڵات دەنووسێت، پێش ئەوەی هەواڵەکە لە (ئکستنسو) لە بۆگۆتا بڵاوبێتەوە، بەشبەش لە کاراکاس بڵاودەبێتەوە.

مارکیز لە پاریسەوە دەڕوات بۆ ڕۆما.

پلینیو مندوزا هانی دەدات لە هەفتەنامەی مومنتودا وتار بنووسێت. دەگەڕێتەوە بۆ کاراکاس.

1958 لە سەفەرێکی کورتدا بۆ کۆلۆمبیا (مارسیدس بارکا پاردو)ی دەزگیرانی دەگوازێتەوە.

بە هاوکاری مندوزا واز لە هەفتەنامەی مومنتو دەهێنێت تا لە کایریلدا کار بکات. دەبێتە سەرنووسەری گۆڤاری ڤنزویلا گرافیکا.

ڕۆمانی کەس نییە نامە بۆ کۆلۆنێل بنووسێت لە بوگوتا بڵاودەبێتەوە. لە گۆڤاری میتودا گەلێك لە چیرۆکەکانی ناو ڕێوڕەسمی ناشتنی دایە گەورە بڵاودەکاتەوە. ڕۆمانی ساتە شوومەکە تەواو دەکات.

1959 سەرکەوتنی شۆڕشگێڕانی (سوپای خەڵك) لە کوبا. لەگەڵ مندوزادا چەند ڕۆژێك دەڕوات بۆ کوبا. لەگەڵ مندوزادا دەگەڕێتەوە بۆ کۆلۆمبیا. لە کوبا نووسینگەی پرنسالاتینا دەکاتەوە. لە پیشانگای کتێبدا، بۆ یەکەمجار دەقی ڕۆمانی ساتە شوومەکە پیشان دەدرێت.

1960 لە کۆلۆمبیاوە دەڕوات بۆ هاڤانا، لەوێ بەردەوام دەبێت لە کارکردن لە پرنسا لاتینیدا. دوای ماوەیەك لەوێوە دەچێتە نیویورك.

1961 چاپی تازەی كەس نیە نامە بۆ سەرهەنگ بنووسێت لە میدینی كۆلۆمبیا.

واز لە پرنسا لاتینا دەهێنێت، نیویورك بەجێدێڵێ و، لەگەڵ ژن و كورە دوو ساڵەكەیدا لە مەكسیكوسیتی نیشتەجێ دەبێت و لە ڕێی ڕۆژنامەنووسیەوە ژیان دەگوزەرێنێت. دەست دەكات بە نووسینی سیناریوی سینەمایی. لەسەر ڕۆمانی ساتە شوومەكە لە بوگوتا خەڵاتی یەكەم وەردەگرێت.

1962 دووەم كوڕی دەبێت.

بڵاوبوونەوەی (ڕێوڕەسمی ناشتنی دایە گەورە) بەهۆی زانكۆی ڤیراكروسی مەكسیك.

1962 بنكەی بڵاوكردنەوەی ئیرای مەكسیكی ڕۆمانی كەس نییە نامە بۆ كۆلۆنیل بنووسێت بڵاودەكاتەوە.

لە پاریس هەمان ڕۆمان دەكرێتە فەرەنسی.

1965 دەستی كرد بە نووسینی ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) واتا شێواز و ناونیشانی هەمان ڕۆمانی ماڵ كە ساڵی 1949 لە كارتاخنا دەستی پێكردبوو.

1966 بنكەی بڵاوكردنەوەی ئیرا جارێكی تر سەعاتی شوومی چاپ كردەوە. یەكەمین چاپێك كە نووسەر بە ڕەسمی دانیپێدانا.

1968 بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) لە بوینس ئایرس، ڕۆمانەكە هێند سەركەوتوو بوو بەردەوام چاپی تازە دەكرایەوە.

چاپكردنەوەی كتێبەكانی پێشووی گارسیا ماركیز

چاوپێكەوتنی پاپای گەورە لە كۆلۆمبیا

سەفەر بەناو وولاتانی ئەمریكای لاتیندا، لەوانە ئارژەنتین، پیرۆ، كۆلۆمبیا، ڤەنزویلا.

لە مەكسیكەوە چوو بۆ بەرشلۆنە.

سەد ساڵ تەنیایی بۆ گەلێك زمانی دنیا وەرگێڕا.

1969 سەد ساڵ تەنیایی خەڵاتی فەرەنسایی باشترین كتێبی دەرەوە بەدەست دێنێت. كار لەسەر ڕۆمانی پاییزی پێشەوا یان پایزی باوك سالار دەكات.

1970 لە بەرشلونە (بەسەرهاتی خنكاوێك) بڵاودەبێتەوە.

سەفەرێكی دوورودرێژ دەكات بە وڵاتانی كاریبیدا.

1972 بڵاوبوونەوەی نوڤەلێتی (چیرۆكی غەماوی و باوەڕپێنەكراوی ئەریندیرای سادە دڵ و نەنكە دڵرەقەكەی)

لە كاراكاس خەڵاتی (ڕومولوگایە گوس) لەسەر چاكترین ڕۆمان وەردەگرێت. ئەم خەڵاتە دەدرێتە ڕۆمانی ئیسپانیا – ئەمریكای پێنج ساڵی ڕابوردو. ماركیز پارەكەی دەداتە *M.A.S* واتا پارتی چەپی ڤەنزویلا.

1973

بۆ ئەوەی باری دارایی پارتی *M.A.S* چاكتر بێت، ڕێگایان پێدەدات ئەو وتارانەی ساڵانی 1957 و 1958 لە ڤەنزویلا نووسیونی بڵاویبكەنەوە.

1976 بڵاوبوونەوەی پاییزی پێشەوا.

دەوری باڵیوزێكی نهێنی دەبینێت لە بارەی پێشكەوتن و ئینسانیەتی ئەمریكای لاتین و دنیای سێ. لە ئەنجومەنی ئازادی خوازانەی (برتراندراسل) وەك ئەندامێك بەشداری دەكات.

1977 پایزی باوك سالار، ڕێوڕەسمی ناشتنی دایەگەورە، چیرۆكی خەماویو باوەڕپێنەكراوی ئەریندیرا.. وەردەگێرین بۆ زمانی فەرەنسی.

1978 لە هابیس چاوی بە پاپاو شای ئیسپانیا دەكەوێت و دوای ئەوە، لەسەر ڕەوتی كاری مرۆڤ دۆستانەی خۆی بەردەوام دەبێت.

چیرۆكی خنكاوێك دەكرێتە فەرەنسی.

1980 چاپی تازەی كەس نییە نامە بۆ كۆلۆنێل بنووسێت بە زمانی فەرەنسی. زوربەی



رۆژنامەکانی ئیسپانی زمان وتارەکانی بڵاودەکەنەوە.

1981 یەکەم بەرهەمی وتارە رۆژنامەییەکانی لە بەرشلونە چاپ دەکرێت. سوپای کولۆمبیا هەڕەشەی لێ دەکات، ئەویش زوو وڵاتەکەی بەجێدێڵێت کەوای نیازبوو زۆر تیایدا بمێنێتەوە، دەڕوات بۆ مەکسیک.رۆمانی (کارەساتی کوشتنێکی پێشتر ڕاگەیەنراو) لە بەرشلونە و بوینس ئایرس چاپ دەکرێت. یەکەم تیراژی چاپی ئەم کتێبە دوو ملیون دانە بوو، بەردەوام کرایە زمانی تر و فیلمێکی سینەمای لێ بەرهەمهێنرا.

گارسیا مارکیز فرانسوا میترانی سەرەك کۆماری فەرەنسا دەبینێت و خەڵاتی لژیون دونوری دەداتێ.

1982 بڵاوبوونەوەی چیرۆکی چاوی سەگەشینەکە لە بنکەی سود ئەمریکانا.

خەڵاتی نۆبڵی لەسەر رۆمانی سەد ساڵ تەنیایی وەرگرت.

1986 رۆمانی (خۆشەویستی رۆژانی ڕشانەوە) بڵاوبوەوە.

1989 بڵاوبوونەوەی رۆمانی (ژەنەراڵ لە سەرگەردانیدا) کە دنیای وروژاند.

1992 بڵاوبوونەوەی رۆمانی عەشق و شەیتانەکانی تر.

1996 رۆمانی هەواڵی فڕاندن.

1998 وەرشەی سیناریو

1999 سەرزەمینی زارۆکان

تا ئەم دواییەیش گابریل گارسیا مارکیز لەگەڵ مارسیدسی ژنی و هەردوو کوڕەکەی و بووك و کوڕەزا پێنج ساڵەکەیدا لە شاری نیومەکسیکو دەژیان. بەڵام بە هۆی تێکچوونی باری تەندروستی و نەخۆشی شێر پەنجەیی و هەستکردنی بە نزیکبوونەوەی مەرگ گەڕایەوە بۆگۆتای شاری خۆی. شایانی باسە کە ماوەیەك لەمەوبەر، ناونیشانی "مەزنترین پیاوی کۆلۆمبیا و پیاوی ساڵی 1999ی ئەمریکای لاتینی بە ڕەسمی پێدرا.

## سەرچاوە

یاداشت های روزهای تنهایی گابریل گارسیا مارکیز

# گابرییێل گارسیا مارکیز

## ئەو پیرە بەگومانەی کەبوونی راستەقینەی سادەترین مەتەڵی بوو.

لەئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف



**کابرییێل گارسیا مارکیز:**

لە 6ی ئازاری 1928، لەئاراکاتاکا، کە شارۆچکەیەکە لە باکووری کۆڵۆمبیادا، لەدایکبووە. لەوێ، لە ماڵێکدا، کەپڕ بووە لە گوتە گوتی خێوو ژمارەیەکی بێشوماری پوور، لەلایەن نەنکو باپیرییەوە –لای دایکییەوە– بەخێو کراوە. بۆ ئەوەی باشتر لە ژیانی گابرییێل مارکیز تێبگەین، چاکتر وایە شتێك دەربارەی مێژووی کۆڵۆمبیاو پێشینەی نائاسایی خێزانەکەی بزانین.

**کۆڵۆمبیا**

کۆڵۆمبیا لەساڵی 1810 لەئیسپانیا جیابووەوەو سەربەخۆیی بەدەستهێناو بوو بە کۆنترین دەوڵەتی دیموکراتی لەئەمریکای لاتینیدا، بەڵام، بەداخەوە، ئەم دەوڵەتە "دیموکراسییە" بەدەگمەن ئاشتیو دادپەروەریی بەخۆیەوە بینی.

لەپێشدا، بێگومان، ئیسپانەکانو هیندییە سوورەکان پێکەوە دەژیانو چاك رقیان لەیەکتر بوو، ئیسپانەکان وڵاتەکەیان وێرانکردبوو بەهۆی گەڕان بەدوای هەڵگەڕاندنەوەی خەڵکەکە لەئایینە

کۆنەکانیانو زێڕی "ئەلدۆرادۆ" و دەسەڵاتی رامیاریدا، ئینگلیزەکانیش رۆڵی خۆیان گێڕاو *Drake* لەساڵی 1568 دا هێرشی کردە سەر (ریۆهاچی)و بۆ سەدەیەکی دوایی وردە شەڕی کۆڵۆنیالی درێژەی کێشا.

پاش ئەوەی ناپلیۆن لەساڵی 1810 دا شای ئیسپانیای لەسەر دەسەڵات لابردو کۆڵۆمبیا سەربەخۆیی بەدەستهێنا، ئەم دەوڵەتە نوێیە بۆ ماوەیەکی زۆر بەئازادی ژیا، بەڵام هەر زوو، لەساڵی 1815دا، لەئەنجامی پەلامارە ناخۆشو خوێناوییەکەی جەنەڕاڵ مۆرێلۆوە دووبارە داگیرکرایەوە. کۆڵۆمبیەکان، بەهۆی دووبەرەکیی ناوخۆییەوە، هێشتیان دەوڵەتە ساواکەیان بکەوێتە ژێر شمشێری مۆرێلۆوە. ئەم سەردەمە لەمێژووی کۆڵۆمبیادا پارێزراوەو ناوێکی سەیری لێنراوە، ئەویش *la putria boba* (واتا: وڵاتی مرۆڤی دەبەنگ). بەڵام، جارێکی دیکە کۆڵۆمبیەکان هەلیان بۆ رەخسایەوەو ئەوە بوو سیمۆن بۆلیڤار توانی جارێکی دیکە وڵات رزگاربکاتەوەو خۆی ببێت بەیەکەم سەرکۆمار. لەساڵی 1849دا، وڵاتەکە ئەوەندە پێشکەوتنی بەخۆوە بینی کە بتوانێت ئەو شەڕو شۆڕو دوو بەرەکییەی ناوخۆی لەشێوەی دوو پارتدا بەرجەستە بکات، کە پارتی لیبڕاڵ (ئازادەکان) و (پارتی پارێزگارانن) کە هەتا ئێستا هەر ماون. ئەم دوو پارتە چوارچێوەی زۆربەی چیرۆکەکانی گارسیا پێکدەهێنن، هەروەها تێگەیشتنی سروشتی تەواوی ئەم دوو پارتە کلیلی تێگەیشتنی هەم نووسینەکانیو هەم تێگەیشتنی ژیانی رامیارین لەئەمریکای لاتینیدا بەگشتی.

هەرچەند لەبنەڕەتدا ئەم دوو پارتە بەدەوری ناوکی دوو ئایدۆلۆجیای جیاوازدا پێکهاتن، بەڵام ساڵانی دوورو درێژی ململانێی خوێناوی لەنێوانیاندا وایکرد کەجیاوازیی گرنگی لەنێوانیاندا نەهێشت وەکو دوو بەشی بەشەڕهاتووی یەك خێڵیان لێهات، نەك دوو پارتی خاوەن دوو ئایدۆلۆجیای جیاواز. هەردوو پارت چەوسێنەرو گەندەڵن. هەردووکیان کاتێك کە دەسەڵات دەکەوێتە دەستیان زۆر بەخراپی بەکاریدەهێنن.

بەدرێژایی مێژووی غەمناکی کۆڵۆمبیاش ئەم دوو پارتە لەگەڵ یەکتردا هەر لەشەڕدابوون. زۆرجار دەوترێت مرۆڤ پەیوەندی بەم دوو پارتەوە نابەستێت. بەڵکو لەناویاندا لەدایکدەبێت. لەراستیشدا هەر وایە چونکە وەکو دوو بنەماڵەی ناوچەیی کار دەکەن نەك دوو بەرنامەی سیاسی کە ئاشتیانە کاربکەن. سەرەڕای ئەوەش، وڵات بەسەر دوو کۆمەڵی ناوچەییدا دابەش، کۆمەڵی *costenos* (کەنار دەریاییەکان)، کە لەکەناری دەریای کاریبیدا دەژینو کۆمەڵی *cachacos* کە لەناوەڕاستی وڵاتدا دەژین. هەر یەك لەم دوو کۆمەڵەیە زاراوەکەی بەرامبەر وەکو ناتۆرەیەك بەکاردەهێنێت بۆ شکاندنی ئەویترو بەچاوێکی سووکەوە سەیری یەکتر دەکەن. کۆمەڵی (کەنار دەریاییەکان) *costenos* لەلایەن رەگەزەوە تێکەڵنو هاتوچۆیان لەگەڵ دەرەوە زیاترەو باوەڕیان بەسیحرو شتی پڕوپووچ زۆرە. ئەمانە بەگشتی "نەوەی قاچاغچی و جەردەکانی دەریانو خوێنیان تێکەڵ بەخوێنی کوێلە رەشەکان بووە".

ئەم تاخمە "حەزیان لەسەماو سەرچڵییەو خەڵکانێکن قۆشمەو حەزیان لەکەیفو خۆشییە". کۆمەڵەکەی دیکە لەلایەن رەگەزەوە خاوێنترنو پابەندی نەریتنو خۆیان بەخانەدانتر دادەنێنو شانازی بەوەوە دەکەن کە شاری پێشکەوتووی وەکو (بۆگۆتا) یان هەیەو دەتوانن بەزمانێکی ئیسپانیی رێکوپێك قسەبکەن. هەر لەکۆنیشەوە خەڵکانی کەنارەکانی دەریای کاریبی بەرەللاتر بوونو خەڵکانی دۆڵو شاخە فێنکەکانی ناوەڕاستی وڵات پارێزگارتر بوون. گارسیا مارکیز

زۆرجار وتوویەتی کە خۆی هەم بە *costeno*و هەم بە *mestizo* دادەنێت. ئەم دوو کەسایەتییەش یارمەتی زۆری داوە لەدروستبوون‌و گەشەکردنیدا وەکو نوسەرێك.

بەدرێژایی سەدەی نۆزدە کۆلۆمبیا، بەهۆی شەڕی دەرەکی‌و ناوخۆیی‌و دەها کوودەتاوە، کاولکراوە. ئەم سەدەیە سەدەی خوێنڕێژی بوو و لوتکەی ئەم خوێنڕێژییە لەساڵی 1899 دا بوو کاتێك کە شەڕی سەد ڕۆژە دەستیپێکرد کەشەڕێکی ناوخۆیی کاولکەر بوو و لەساڵی 1902دا بەدۆڕانی لیبراڵەکان (ئازادەکان) کۆتاییهات. ئەم شەڕە بووە هۆی کوژرانی زیاتر لەسەد هەزار کەس، کە زۆربەیان جوتیارو منداڵەکانیان بوون. باپیری گارسیا مارکیز لەم شەڕەدا بەشداریکردو وەکو کەسایەتییەکی خەیاڵی لەچیرۆکەکانی مارکیزدا چاویدانی بەرکەوت.

ڕەگەزێکی دیکە کە کاریگەریی بەسەر کارەکانییەوە هەبوو ڕەشە کوژییەکەی جوتیارە مانگرتووەکانی مۆز بوو لەساڵی 1928. قاوە بەگشتی نێردراوی سەرەکییە لەبازرگانی کۆلۆمبیادا، بەڵام مۆزیش گرنگیی زۆری هەیە لەئابووریدا. کۆمپانیای (یونایتد فرووت)، کە کۆمپانیایەکی ئەمریکاییە، ئەم پیشەسازییەی، کە تاکە سەرچاوەی پەیداکردن بوو بۆ دانیشتووی کەنارەکان *costenos*، بەدانیشتوانی شاری ئاراکاتاکایشەوە، بۆ خۆی قۆرخکردبوو. کۆمپانیاکە کەوەکو نموونەی خۆشگوزەرانی خۆی پیشاندەدا لەراستیدا نموونەیەکی شینباری ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوایی بوو و دەسەڵاتێکی بێ ڕەوشت‌و بێسنووری ئابووری‌و زەبری سیاسی مەزنی هەبوو. کۆمپانیایەکی گەندەڵ بوو و کرێکارە کۆلۆمبییەکانی زۆر دڕندانە دەچەوساندەوە. لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی 1928 زیاتر لە 32 هەزار کرێکاری خۆجەیی دەستیان بەمانگرتن کرد. داوای هەندێك شتی زۆر ناماقووڵیان دەکرد، وەکو چارەسەری پزیشکی، چاککردنی بارودۆخی کارکردن، پێدانی مووچە بەپارە نەك بەپسوولەی کۆمپانیاکە، کەنرخەکەی ڕۆژ بەڕۆژ دادەبەزی، دروستکردنی ئاودەستی گونجاو. لەراستیدا لەسادەترین ماف بێبەشبوون‌و هەفتەی حەوت ڕۆژ کاری سەختیان ئەنجامدەدا بەرامبەر بەمووچەیەکی کەم.

کۆمپانیاکە هەموویانی بەناونیشانی "بەڵێندەری لاوەکی" دامەزراندبوو بۆ ئەوەی لەهەموو مافێك کە لەیاسای کاری کۆلۆمبیادا هاتبوو بێبەشیان بکات. هەر لەسەرەتاوە کاردانەوەی ئەمریکاییەکان پشتگوێخستنی داواکارییەکانیان بوو. لەگەڵ دەستپێکردنی مانگرتنەکەدا، حکومەتی کۆلۆمبیا ناوچەی مۆزی داگیرکردو هێزی سەربازیی بەکارهێنا بۆ شکاندنی مانگرتنەکە. شەوێکیان، ئاپۆڕەیەکی زۆری خەڵك لەناوچەی (سیناکا)، کە لەدووریی سی میل لەباکووری (ئاراکاتاکا) دایە، کۆبوونەوە بۆ سازدانی ڕێپێوانێك. حکومەتی پارێزگاری کۆلۆمبیا هێزی سەربازیی نارد بۆ دامرکاندنەوەی. سەربازەکان تەقەیان لەکرێکارە بێچەکەکان کردو بەسەدەهایان لێکوشتن. لەمانگانی دوای ئەوەدا خەڵکانێکی زۆر بێسەروشوێن کران. حکومەت بەڕەسمی نکووڵیی لەهەموو کارەکە کردو نەیهێشت لەلاپەڕەکانی مێژوودا تۆماربکرێن. گارسیا مارکیز پاشان ئەم ڕووداوانەی لە ڕۆمانی (سەد ساڵی تەنیایی)دا تۆمارکرد.

ڕووداوی دووەم کە کاریگەریی هەبوو بەسەر نووسینەکانیدا، سەردەمانێك بوو کە خۆی تیایدا ژیاو لەمێژووی کۆلۆمبیادا بەڕووداوی ترسناکی (توندوتیژی *la violencia*) دەناسرێت. ڕەگی ئەم توندوتیژییە دەگەڕێتەوە بۆ ڕەشە کوژییەکەی کرێکارانی مۆز. لەو سەردەمەدا سیاسەتمەدارێکی



بوێری لیبراڵ هەبوو بەناوی (خۆرخە ئیلسێر گایتان)، کە توانی هەڵوێست لەدژی حکومەت وەربگرێت. کۆمەڵێك کۆبوونەوەی ڕێکخستو داوای لێکۆڵینەوەی کرد دەربارەی ڕووداوەکە. بەهۆی ئەم هەڵوێستەوە لەبەرچاوی جوتیارو هەژاراندا بوو بەقارەمانێك، بەڵام لەلای ئەندامە بەهێزەکانی حیزب بووە مایەی بێزاریو بەترسو قینەوە سەیریان دەکرد. گایتان وتەکانی لەڕێگەی رادیۆوە پەخش دەکردو مژدەی سەردەمی گۆڕانی دەدا بەخەڵك، سەردەمێك کەخەڵك بەراستی بتوانێت ڕۆڵی خۆی بگێڕێت لەپرۆسەی دیموکراتیداو دامەزراوەکان ناچاربکرێن بەرپرسانە هەڵسوکەوت بکەن.

لەساڵی 1946دا ئەوەندە هێزی بەدەستهێنا کە بتوانێت حیزبەکەی خۆی، کە لەساڵی 1930 ەوە دەسەڵاتی بەدەست بوو لەتبکات. ئەم لەتبوونەی حیزبەکەی بووە هۆی ئەوەی کە پارێزگاران دەسەڵات بگرنەوە دەستو لەترسی یاخیبوون دەستیانکرد بە دامەزراندنی میلیشای چەکدار، کە مەبەستی سەرەکیی تۆقاندنی دەنگدەرە لیبراڵەکان بوو. ئەم کارەشیان زۆر بەباشی ئەنجامدەداو لەکۆتایی ساڵەکەدا بەهەزارەهایان لێکوشتن. لەساڵی 1947دا لیبراڵەکان کۆنترۆڵی کونگریسیان گرتە دەستو گایتان کرا بەسەرکردەیەکی حیزبەکە. (سەرەڕای هەوڵی پارێزگاران ژمارەیەکی زۆر بەشداریی هەڵبژاردنەکەیان کرد).

گرژی پەرەیسەندو لە 9ی نیسانی ساڵی 1948دا گایتان لەشاری بۆگۆتادا کوژرا. شارەکە بەتەواوی هەژاو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئاژاوەو کوشتو کوشتار بڵاوبووەوە. ئەم ماوەیە، کەتیایدا 2500 کەس کوژران، پێی دەگوترێت *el bogotazo*. بەمجۆرە، توندوتیژی *la violensia* چووە قۆناغێکی کوشندەترەوە. هەردوو حیزب میلیشیای چەکداریان دامەزراندو تۆقاندن باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا. شارو لادێکان سوتێنرانو بەهەزارەها کەس، لەوانە ژنو منداڵ، زۆر بێبەزەییانە کوژران. کێڵگەکان دەستیان بەسەرگیراو زیاتر لە لەملیۆنێك ناچاربوون کۆچبکەن بۆ ڤێنزویلا. لەساڵی 1949 پارێزگارەکان سیاسەتمەدارێکی لیبراڵیان کوشت لەکاتێکدا کە لەناو هۆڵی گونگرێسدا وتەیەکی پێشکەش دەکرد. لەئاکامدا کۆنگرێسیان هەڵوەشاندەوەو باری نائاساییان ڕاگەیاندو کەوتنە ڕاونانو کوشتنی لیبراڵەکان بەتوومەتی ئەوەی کە "کۆمۆنیست"ن. وڵات لەتبوو و هەتا ساڵی 1953 توندوتیژی بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە 150 هەزار کۆلۆمبی. ئەم توندوتیژییە بووە سەرچاوەی زۆر چیرۆكو کورتە ڕۆمانی گارسیا مارکیزو لەهەموویان بەناوبانگتر کورتە ڕۆمانی (لەسەعاتێکی بەددا *In Evil Hour*).

## خێزانەکەی

گرنگترین خزمی گارسیا مارکیز، بێگومان، نەنكو باپیری بوون لەلایەنی دایکییەوە. باپیری کۆلۆنێل نیکولاس ریکاردۆ مارکیز مێخیا (*Mejia*) بوو، کە جەنگاوەرێکی دێرینی لیبراڵەکان بوو لەشەڕی هەزار ڕۆژەدا. لەشارۆچکەی ئاراکاتاکا دەژیا، کە لەبنەڕەتدا گوندێکی کەنار دەریای کاریبی بوو و خۆی بەشداریی دامەزراندنی کردبوو. کەنار دەریاییەکان (*costenos*) بەقارەمانیان دادەنا چونکە لەبەرامبەر ڕەشە کوژییەکەی کرێکارانی مۆزدا نەبوو و لەساڵی 1929 دا نارەزاییەکی توندی ئاراستەی کۆنگرێس کرد. کەسایەتییەکی سەیرو ئاڵۆزبوو. چیرۆکبێژێکی نایاب بوو و ژیانێکی پڕ لە فرتو فێڵو پیلانگێڕیی دەبردە سەر. لەکاتی لاوێتیدا زەلامێکی لەزۆرانبازیدا کوشتبوو. هەروەها دەگێڕنەوە کەشانزە منداڵی بەخێو کردبوو. کەباسی قارەمانێتی خۆی لەکاتی شەڕدا دەگێڕایەوە دەتووت ئەزموونێکی خۆش

دەکات- وەکو سەرکەشییەکی خۆشی گەنجانەو یاریکردن بەتفەنگ. کۆلۆنێلە پیرەکە لەسەر فەرهەنگێك وانەی بەگابریێل دەووتەوەو هەموو ساڵێك دەیبرد بۆ بینینی سێرك. بۆ یەکەمجار لەژیانیدا سەهۆڵی پێ ناسانرا، کە لەعەماری کۆمپانیای میوەدا هەبوو و وەکو موعجیزەیەك وابوو لای ئەمان. پێی دەووت کە کوشتنی کەسێك قورسترین بارە بەسەرشانی مرۆڤەوە. ئەم وتەیەش دواتر گارسیا مارکیز نایە سەر زاری یەکێك لە کارەکتەری چیرۆکەکانییەوە.

نەنکی ناوی (ترانکویلینا ئیگواران کۆتیس) بوو. ئەمیش کاریگەریی لەسەر مارکیز لەمێردەکەی کەمتر نەبوو. وەکو خوشکەکانی مێشکی پڕ بوو لەئەفسانەو باوەڕی میللی. لەبەرئەوە ماڵەکەیان پڕ بوو لەچیرۆکی خێوو ترسو دڵەراوکێو مزگێنیو جادوگەری. مێردەکەی گوێی لەم چیرۆکانە نەدەگرتو داوای لەگابریێلی لاو دەکرد کە گوێیان بۆ نەگرێت. دەیگوت "گوێیان لێ مەگرە. ئەوانە باوەڕی ژنانەن". بەڵام گارسیا مارکیز گوێی بۆ دەگرتن چونکە نەنکی شێوازێکی بێهاوتای هەبوو لەگێڕانەوەی چیرۆکدا. هەرچەند ئەو شتانەی کە دەیگێڕانەوە نەشیاو ناماقووڵ بوایە، بەڵام ئەو وای دەگێڕانەوە کە دەتووت باس لەراستیەکی حاشانەگر دەکات. بەشێوازێکی تایبەتی سەنگینی چیرۆکەکانی دەگێڕایەوە، ئەم شێوازەش، سی ساڵ دواتر، گابریێل مارکیز هەڵیبژارد بۆ گێڕانەوەی گرنگترین رۆمانی.

لەسەرەتای ژیانیدا گابریێل مارکیز هەستی بەنامۆیی دەکرد لەبەرامبەر دایكو باوکیدا. هۆی ئەم هەستکردنەش سەیر بوو. دایکی یەکێك بوو لەو دوو منداڵەی کە کۆلۆنێلو ژنەکەی هەیانبوو. کچێکی ورە بەرزو چالاك بوو، بەڵام بەداخەوە کەوتە عەشقی زەلامێکەوە بەناوی "گابریێل ئیلێخیۆ گارسیا". "بەداخەوە" چونکە گارسیا لەلایەن دایكو باوکییەوە نەفرەتلێکراو بوو لەبەرئەوەی لەلایەکەوە لایەنگرە حیزبی پارێزگاران بوو و لەلایەکی دیکەوە "*la hojarasca*" بوو. ئەم زاراوەیە لەبازرگانیی مۆزەوە وەرگێرا بوو و بەواتای "گەڵای مردوو" واتا شتێکی مردوو و وەریو کەدەبێت بماڵرێت. هەروەها ئەم زەلامە ناوبانگی ئەوەی هەبوو کە مێبازەو چوار منداڵی زۆڵی ناوەتەوە، بەکورتی ئەو جۆرە کەسە نەبوو کە کۆلۆنێڵ دەیویست کچەکەی بداتێ. بەڵام گارسیا بەنامەو شیعری دڵداریو کەمانچە لێدانو تەنانەت ناردنی بروسکەی دڵدارییەوە بەردەوام سۆزی کچەکەی رادەکێشا. هەوڵێکی زۆریان دا کەدووریخەنەوە، بەڵام بیسوود بوو، پاش هەموو دەرکردنێك هەر دەگەڕایەوە، دەیانزانی کە کچەکەیان خۆشیدەوێت. لەئەنجامدا ملکەچی ئەو خوازبێنییە رۆمانتیکییە بوونو کۆلۆنێل قایلبوو کە کچەکەی بدات بەو کۆنە قوتابیەی کۆلێجی پزیشکی. بۆ ئەوەی کە پەیوەندییەکانیان ناخۆش نەبێت بڕیاریاندا کە لەشاری ڕێوهاچا *riohacha* بژین.

(پاشان گابریێل گارسیا چیرۆکی تراجیکۆمێدیی ئەم دڵدارییەی لەرۆمانی "دڵداری لەسەردەمی کۆلێرادا" دارشت).

## سەرەتای ژیانی

گابریێل خۆزێ گارسیا مارکیز لە 6ی ئازاری 1928 لەشارۆچکەی (ئاراکاتاکا) هاتۆتە دنیاوە، بەڵام باوکی سوورە لەسەر ئەوەی کە لەراستیدا لەساڵی 1927 لە دایکبووە. لەبەر ئەوەی کە دایكو باوکی هێشتا هەژاربوونو تێدەکۆشان بۆ ژیان، نەنكو باپیری ئەرکی بەخێوکردنیان خستە ئەستۆی خۆیان، ئەمەش نەریتێکی باوبوو لەو سەردەمەدا. بەداخەوە، ساڵی 1928 دواساڵی گەشەکردنی بازرگانی مۆز بوو لەئاراکاتاکا. مانگرتنو دامرکاندنەوەی بەشێوەیەکی دڕندانە کارێکی





خراپی کردە سەر شارەکە. زیاتر لەسەد هەزار مانگرتوو کوژران‌و خرانە گۆڕی بەکۆمەڵەوە. ئەمە سەرەتایەکی غەمناك بوو لەژیانیداو پاشان لەنوسینەکانیدا سەریان هەڵدایەوە.

لەمنداڵیدا بەناوی "گابیتۆ" (گابرییێلی بچووك) بانگیان دەکرد. شەیدای چیرۆکەکانی باپیری‌و ئەفسانەکانی نەنکی بوو. ماڵەکە، بێجگە لەکۆڵۆنێل، پڕ بوو لەژن. گابرییێل مارکیز دان بەوەدا دەنێت کە وایان لێکردبوو لەترسی خێو نەوێرێت لە کورسییەکەی بێتە خوارەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، تۆوی داهاتووی لەو ماڵەدا چێنرا بوو– چیرۆکەکانی شەڕی ناوخۆو کۆمەڵکوژییەکەی کرێکارانی مۆزو خوازبێنییەکەی دایکی‌و باوەڕە پڕوپووچەکانی نەنکی‌و هاتوچۆی بەردەوامی پوورەکانی‌و کچە نایاساییەکانی باپیری، ئەمانە هەمووی ماکی نووسینەکانی بوون. گارسیا مارکیز دواتر نووسی: "وا هەستدەکەم کە هەموو نووسینەکانم دەربارەی ئەزموونەکانی ئەو سەردەمەن کە لەگەڵ نەنك‌و باپیرمدا دەژیام".

کاتێك کە هەشت ساڵان بوو باپیری مردوو رادەی کوێریی نەنکی رۆژ بەرۆژ لەزیادبووندا بوو. لەبەرئەوە ناچاربوو کە بگەڕێنەوە بۆ لای دایك‌و باوکی لەشاری (سوکرە). باوکی لەوێ دەرمانخانەیەکی هەبوو. پاش گەرانەوەی بڕیار درا بخرێتە قوتابخانەیەکی رەسمییەوە. نێردرا بۆ قوتابخانەیەك لە (بارانکیلا)، کە بەندەرێکە لەسەر رووباری ماگدەلینا. لەوێ بەوە ناسرا کە منداڵێکی شەرمنەو شیعری پێکەنیناوی دەنووسێت‌و وێنەی کاریکاتێری دەکێشێت. لەبەرئەوەی یاری نەدەکردو لەژیانیدا زۆر جیدی بوو، هاوڕێکانی ناتۆرەی "پیاوە پیرەکە" یان لێنابوو.

لەساڵی 1940، کاتێك کە تەمەنی دوانزە ساڵان بوو، کورسیی خوێندنی لەخوێندنگایەکی ناوەندی پێبەخشرا کەتەرخانکرابوو بۆ خوێندکارە بەهرەمەندەکان. خوێندنگاکە ناوی *liceo nacional* (ناوەندیی نیشتمانی) بوو و لەشارۆچکەی زیپاکیرا بوو، کە سی میل لەباکووری (مۆگۆتا) بوو و قەشە جزویتەکان بەڕێوەیاندەبرد. گەشتەکەی هەفتەیەکی دەخایاند. هەستیدەکرد کە حەزی لەشاری (بۆگۆتا) نییە. کە بۆیەکەمجار چاوی بەپایتەخت کەوت هەستیکرد کەشارێکی ناخۆش‌و بێزارکەرە. ئەو ئەزموونانەی کە تووشی بوون وایان لێکرد کە پێناسەی کەنارنشینی (*costeno*) لەلای بەهێزتر کرد.

بابەتەکانی قوتابخانە زۆر هانیان نەدەدا بۆ کۆشش کردن. زۆربەی ئێواران لەبەشی ناوخۆییدا بەدەنگی بەرزکتێبی بۆ هاوڕێکانی دەخوێندەوە. زۆر حەزی لە ئەدەب‌و وێنەکێشان دەکرد، ئەمەش مایەی دڵخۆشیی بوو. بێئەوەی هیچ جۆرە نووسینێك بلاوبکاتەوە ناوبانگی نووسەری پێوەلکا بوو. لەوانەشە ئەم ناوبانگە ئەو ئەستێرەیە بێت کە کەشتیی خەیاڵی ئاراستە دەکرد. پێویستیی بەو ناوبانگەش بوو، چونکە ئەو "نووسەرە" تەمەن هەژدە ساڵە، پاش تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی‌و لەسەر داخوازیی دایك‌و باوکی چوو بۆ *universidal nacional* (زانکۆی نیشتمانی) لە شاری بۆگۆتا بۆ خوێندنی یاسا، نەك رۆژنامەوانی.

لەو سەردەمەدا بوو کە گارسیا مارکیز چاوی بەژنی داهاتووی کەوت، لەسەردانێکدا بۆ باوك‌و دایکی کچێکی سیانزە ساڵەیان پێناساند بەناوی (مەرسەیدس بارخا پاردۆ) وە. کچێکی ئەسمەری بێدەنگ‌و بەرەوشت بوو. "لەهەموو ئەو کەسانەی کە ناسیبوونی سەرنجراکێشتر بوو". پاش تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی مۆڵەتێکی کورتی وەرگرتبوو پێش ئەوەی بچێت بۆ زانکۆ. لەو کاتەدا خوازبێنی کچەکەی کردو ئەویش قایلبوو، بەڵام نیشانکردنەکەی دواخست‌و داوای لێکرد کەدەبێت لەپێشدا خوێندنی تەواو بکات. هەرچەند هەتا

چوارده ساڵی داهاتوو شووی پێی نەدەکرد، بەڵام (مەرسەیدس) بەڵێنی ئەوەی پێدا کە هەمیشە دڵسۆزی بێت.

## ساڵانی برسێتی

وەکو هەموو ئەو نووسەرە گەورانەی کە دەچنە زانکۆ بۆ خوێندنی بابەتێك کە رقیان لێیەتی، گارسیا مارکیز هیچ جۆرە بایەخێکی بەخوێندنەکەی نەدەداو خۆی لە وانەکان ئەدزییەوە. خۆی لەوانەکان دەدزییەوەو، وانەکانی دەپەڕاندو خۆیو بابەتەکانی فەرامۆشدەکرد. لەبری ئەوە بەکۆڵانەکانی بۆگۆتادا دەسووڕایەوەو سواری عەرەبانە دەبوو.

لەبری یاساش شیعری دەخوێندەوە. خواردنی لەچایخانە هەرزانەکاندا دەخواردو جگەرەی دەکێشاو تێکەڵاوی هەموو جۆرە گومانلێکراوێك دەبوو وەکو شوسیالیستە نەخوێندەوارەکانو هونەرمەندە برسییەکانو رۆژنامەنووسە تازە دامەزراوەکان.

رۆژێك، پاش خوێندنەوەی کتێبێکی سادە، هەموو ژیانی گۆڕا. وەکو ئەوەی هەموو خەتەکانی چارەنووس بگەنەیەك، ئەویش ئەو کاتە بوو کە نوسخەیەکی کتێبەکەی کافکا (گۆڕان) یان پێبەخشی. کتێبەکە کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر گارسیا مارکیز هەبوو. بۆی دەرکەوت کە مەرج نییە ئەدەب راستەوخۆ شت بگێڕێتەوە لەسەر شێوازی تەقلیدی. کاریگەرییەکی رزگارکەر بوو. "لەدڵی خۆمدا وتم کەس ناناسم بتوانێت شتی لەم جۆرە بنووسێت. ئەگەر دەمزانی زووتر دەستم بەنووسین دەکرد". تێبینیکرد کە "دەنگی" کافکا لەگێڕانەوەدا هەمان دەنگدانەوەی هەبوو لەچیرۆکەکانی نەنکیدا. "نەنکم بەم شێوازە چیرۆکەکانی دەگێڕایەوە، دژوارترین شتی بەزمانێکی زۆر سادەو سروشتی باس دەکرد".

بڕیاریدا کە دەستبکات بەخوێندنەوەی هەموو ئەو ئەدەبەی کە "لەدەستی چووە". چاوچنۆکانە، هەرچییەکی دەستبکەوتایە بەپەرۆشەوە دەیخوێندەوە. هەروەها دەستیکرد بەنووسین. یەکەم چیرۆکی "وازهێنانی سێیەم" لەساڵی 1946 لەرۆژنامەی لیبرالی *El ispectador*، کە لەبۆگۆتا دەردەچوو، بلاوکرایەوە. ئەم بلاوکردنەوەیە سەرسامیکرد. سەرنووسەری خوێنگەرمی رۆژنامەکە پێشوازییەکی گەرمی لەنوسینەکە کردو گارسیا مارکیزی بە "بلیمەتێکی نوێی ئەدەبی کۆلۆمبیا" ناوزەد کرد. گارسیا مارکیز چووە قۆناغی داهێنانەوەو لەچەند ساڵی دواییدا دە چیرۆکی دیکەی نووسی.

وەکو مرۆڤدۆستێکی خێزانێکی لیبڕاڵ، کوشتنی "گاتیان" لەساڵی 1948 کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر گارسیا مارکیز هەبوو. تەنانەت بەشداریشی کرد لەئاژاوەکانی شاری (بۆگۆتا)و لەسووتاندنی بەشێك لەگەڕەکەکەی خۆی. زانکۆی نشتمانی داخراو چوو بۆ ناوچەی باکوور، کە شوێنێکی ئارامتر بوو. خۆی گواستەوە بۆ زانکۆی (کارتاجینا). لەوێ، بەنابەدڵییەوە بەردەوامبوو لەسەر خوێندنی یاسا. لەهەمان کاتدا ستوونێکی رۆژانەی بۆ رۆژنامەی *El universal* (گەردوون) دەنووسی کە لەشارەکە دەردەچوو. ساڵی 1950 بڕیاریدا واز لە هەوڵی خوێندنی یاسا بهێنێت و خۆی تەرخانبکات بۆ نووسین. چوو بۆ شاری (بارانکیلا) و لەوێ پەیوەندیکرد بە کۆمەڵێکی ئەدەبییەوە بەناوی "گرووپی بارانکیلا" *El grupo de Barranquilla*. لە ژێر کاریگەریی ئەواندا دەستیکرد بە خوێندنەوەی نووسینەکانی هێمنگوەی و جوێس و وڵف و لە هەمووشیان زیاتر نووسینەکانی فۆکنەر. هەروەها دەستیکرد بە خوێندنەوەی ئەدەبی کلاسیکی و بۆی دەرکەوت کە خوێندنەوەی "ئۆدیب"ی سۆفۆکلیس زۆر ئیلهامبەخشە.

سۆفۆکلیس و فۆکنەر گەورەترین کاریگەرییان لەسەری هەبوو بە درێژایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکان. سەرسامبوو بەو توانایەی کە فۆکنەر هەیبوو لە دارشتنەوەی منداڵیی خۆی لە رابوردوویەکی ئەفسانەییدا. لە (یۆکنا پاتاوفا)ی ئەفسانەیی فۆکنەرەوە (مۆکۆندۆ)ی وەرگرت و لە (ئۆدیب) و (ئەنتیگۆن)ی سۆفۆکلیسەوە بیرۆکەی بەسەرهاتی کۆمەڵگا و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات. گارسیا مارکیز نارازیبوو لەو چیرۆکانەی کە بڵاویکردبوونەوە چونکە زۆر ئابستراکت (تەجریدی) بوون و دووربوون لە ئەزموونە راستیەکان. چیرۆکەکان "درێژە پێدانی رۆشنبیرانە بوون و هیچ پەیوەندییان بە واقعەوە نەبوو". فۆکنەر فێریکرد کە نووسەر دەبێت لە بارەی ئەو شتانەوە بنووسێت کە لێیانەوە نزیکە. گارسیا بۆ ساڵەها لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە بزانێت بەراستی دەیەوێت لە بارەی چییەوە بنووسێت؟

ئەم بیرۆکانە کاتێك دەقیانوەرگرت کە لە ماڵی باوکییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵی باپیری لە ئاراکاتاکا. ماڵەکە دانرابوو بۆ فرۆشتن، بەڵام پێویستی بە نوێکردنەوە هەبوو. "ئەو ماڵەی کە خێوی تێدایە" ئەوەندە یادەوەریی لای ئەوروژاند کە بە تەواوی نوقمی ئەو یادەوەرییانە ببوو. لە راستیدا هەموو شارەکە وەکو مردوو دەهاتە بەرچاوی و دەتگوت کات لەو شارەدا وەستاوە و بەستوویەتی. پلانی چیرۆکێك لە مێشکیدا ئامادەبوو لە بارەی ئەزموونەکانی ژیانی پێشنیازی ناونیشانی *La casa* (ماڵەکە)ی بۆ کردبوو. بەڵام وایهەستدەکرد کە هێشتا ئامادە نییە بۆ نووسینی. دەیزانی کە بەشێك لەو شتەی دۆزیوەتەوە کە بۆی دەگەڕا ئەویش هەستکردنە بە شوێن. سەردانەکەی ئیلهام بەخش بوو. لە گەڕانەوەیدا یەکەم کورتە رۆمانی نووسی بە ناونیشانی *Leaf storm* (زریانی گەڵاکان)، گرێچنی رۆمانەکە لە (ئەنتیگۆن)ەوە وەرگیرا بوو، بەڵام شوێنەکەی گۆڕیبوو بۆ شارێکی ئەفسانەیی. رۆمانەکەی بە وزە و چالاکییەکی باشەوە نووسی و بۆ یەکەمجار ناوی (ماکۆندۆ)ی بەکارهێنا وەکو شوێنی رووداوەکە، کە هاوتای (یۆکناپاتاوفا)ی فۆکنەر. لە راستیشدا شوێنی وا هەبوو و بەشێك بوو لە کێڵگەی مۆز و لە منداڵیدا زۆر جار سەری لێدابوو. (ماکۆندۆ، بە زمانی پانتوو واتا "مۆز").

بەداخەوە، یەکەم دەزگای چاپ کە رۆمانەکەی بۆ نارد رەتیکردەوە و ئەمەش خستییە گومانەوە لە خۆی و دەستنووسەکەی خستە چەکمەجەیەکە. (لە ساڵی 1955، لە کاتێکدا کە گارسیا مارکیز سەردانی ئەورووپای رۆژهەڵاتی دەکرد، هاوڕێکانی دەستنووسەکەیان دۆزییەوە و رزگاریانکرد و ناردیان بۆ دەزگایەکی چاپکردن، ئەمجارەیان چاپکرا).

سەرەڕای هەژاری و وەرنەگرتنی نووسینەکانی، گارسیا مارکیز لە ناخەوە هەر کامەران بوو. هەرچەند لە گەڕەکی سۆزانییەکان دەژیا، بەڵام هەمیشە ژمارەیەك هاوڕێ لە دەوریدا ئامادەبوون، کارێکی بەردەوامی هەبوو کە بریتی بوو لە نووسینی ستوونێکی رۆژانە بۆ رۆژنامەی *El Heraldo* (مینبەر). ئێوارانیش، بەدەم جگەرەکێشان و قاوە خواردنەوەوە، خەریکی نووسینی رۆمانەکەی بوو و لەگەڵ هاوڕێکانیدا گفتوگۆیان لەسەر دەکرد. پاشان، لە ساڵی 1953، لەپڕ تووشی حاڵەتێکی بێئارامی بوو. وازی لە کارەکەی هێناو شتەکانی پێچایەوە و لەگەڵ هاوڕێیەکیدا چوو بۆ شاری (لە کواجێرا) بۆ فرۆشتنی ئینسایکلۆپیدیا. هەندێك خەریکی سووڕانەوە و گەشتکردن بوو و لە هەمان کاتدا سەرقاڵی تاوتوێکردنی بیرۆکەی هەندێك چیرۆك بوو. لەو سەردەمەدا بەرەسمی (مارسەیدس بارخا)ی مارە کرد. لە ساڵی 1954 جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ



(بۆگۆتا) وەکو ئەندامی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی ***El Espectador*** دامەزرا بۆ نووسین و پێداچوونەوەی چیرۆك. لەوێ مەیلی بیری سوشیالیزمی پەیدا کرد، بەڵام هەوڵیدەدا کە سەرنجی (گۆستاڤۆ رۆخاس پنیلا)، دیکتاتۆری ئەو سەردەمە، رانەکێشێت. هەرچەند سەردەمەکە سەردەمی توندوتیژی (***la violencia***) بوو، بەڵام ئەم، وەکو نووسەرێك، سەرقاڵی کارەکەی بوو.

لە ساڵی 1955 رووداوێك جارێکی دیکە خستییەوە سەر رێگەی ئەدەب و بووە هۆی ئاوارەبوونێکی کاتی لە کۆڵۆمبیا. لەو ساڵەدا کەشتییەکی بچووکی جەنگی، بە ناوی (کاڵداس)ەوە لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ (کەرتاجینا) لە گەرداوێکدا نوقم بوو. هەموو دەریاوانەکانی کەشتییەکە کەوتنە ئاوەکەوە و خنکان، تەنها یەکێکیان نەبێت کە زەلامێکی سەرنجڕاکێش بوو کە ناوی (لویس ئەلیخاندرۆ ڤیلاسکۆ) بوو. ئەم دەریاوانە خۆی بە قەیاغێکەوە گرت و توانی بۆ ماوەی دە رۆژ لە دەریادا بمێنێتەوە، هەتا شەپۆلی دەریاکە گەیاندییە کەناری دەریا. لە ئەنجامدا ڤیلاسکۆ بوو بە قارەمانێکی نەتەوەیی. پرۆپاگەندەی میری سوودی لێوەرگرت و ڤیلاسکۆ هەموو شتێکی دەکرد، لە وتار خوێندنەوەوە تا دەگاتە ریکلامکردن بۆ سەعات و پێڵاو. پاشان هەموو شتێکی ئاشکرا کرد. راستیەکەی ئەوە بوو کە بارێکی قاچاغیان هەڵگرتبوو و بە هۆی نەزانی نەشارەزاییەوە نوقم بوون! ڤیلاسکۆ سەردانی رۆژنامەی ***El Espectador***ی کرد و راستیی چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوە. پاش تۆزێك دوو دڵی باوەڕیان پێکرد و بڕیاردرا کە چیرۆکەکەی بۆ گارسیا مارکیز بگێڕێتەوە، کە ئەوسا چیرۆکی خێوی دەنووسی چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوەو ئەویش لە دەقێکی پەخشانی رێکوپێکدا دایڕشتەوە. چیرۆکەکە بە زنجیرە بۆ ماوەی دوو هەفتە لە ژێر ناونیشانی "راستی دەربارەی سەرکەشییەکەم، نووسینی لویس ئەلیخاندرۆ ڤیلاسکۆ"دا بڵاوکرایەوە. حکومەت بەم کارە زۆر تووڕە بوو و ڤیلاسکۆ لە هێزی دەریایی دەرکرا. کاربەدەستانی رۆژنامەکە ترسان لەوەی (پنیلا)ی دیکتاتۆر راستەوخۆ سزای گارسیا مارکیز بدات. لەبەرئەوە ناردیان بۆ دەرەوەی وڵات بۆ نووسینی بابەتێك لەسەر مردنی (پاپا پیۆسی حەوتەم) کە چاوەڕوان دەکرا. کاتێك کە مردنەکە دواکەوت و ئەرکەکەی بێهوودە بوو، گارسیا مارکیز ناچار بوو وەکو پەیامنێرێکی رۆژنامەکە بە ئەوروپادا بسووڕێتەوە. پاش خوێندنی هونەری فیلمسازی لە ئیتالیا بۆ ماوەیەکی کورت، دەستی بە گەشتێك کرد لە بلۆکی کۆمۆنیستی، هەر لەو ماوەیەدا بوو کە هاوڕێکانی کورتە رۆمانی (زریانی گەڵا ***leaf storm***) یان لە بۆگۆتۆ بۆ چاپکرد.

گارسیا مارکیز گەشتێکی کرد بەناو جنێڤ و رۆما و پۆلەندا و هەنگاریاداو پاشان لە پاریس نیشتەجێ بوو. حکومەتەکەی (پنیلا) چاپخانەی رۆژنامەی ***El Espectador***ی داخستبوو و ئەمیش بێکار بوو.

لە پاریس لە گەڕەکی لاتین بە قەرز دەژیا. ژنە خاوەند خانووەکە دەستی دەگرت و لە گێڕانەوەی قاپە شووشە بۆ سەرچاوەکانیان هەندێك پارەی پەیدا دەکرد. لەوێ، لە ژێر کاریگەریی (هێمنگوەی)دا یانزە رەشنووسی (کەس نامە بۆ کۆلۆنێل نانووسێت) و بەشێك لە رۆمانی ***Este pueblo de mierda*** (ئەم شارە گووە)ی نووسی کە پاشان بوو بە کورتە رۆمانی (لە سەعاتێکی بەدی دا ***In Evil Hour***). پاش تەواوکردنی (کۆلۆنێل) چوو بۆ لەندەن، پاشان گەڕایەوە بۆ کیشوەرەکەی خۆی – بەڵام بۆ ڤێنزەوێلا، کە شوێنی هەڵبژاردەی ئاوارە کۆلۆمبیەکان بوو، نەك بۆ کۆلۆمبیا. لەوێ رۆمانی (***Este pueblo de mierda***)ی تەواو کرد کە چیرۆکێك

بوو راستەوخۆ باسی سەردەمی توندوتیژیی ( *la violencia*)ی دەکرد. هەرچەند ئاشکرابوو کە پەرەیداوە بە شێوازێکی نووسینی تایبەت بە خۆی، بەڵام هێشتا بەوە قایل نەبوو. چیرۆکە سەرەتاییەکانی بێ سۆز و تەجریدی بوون، (زریانی گەڵاکان) کاریگەریی فۆکنەری پێوە دیار بوو، (کەس نامە بۆ کۆلۆنێل نانووسێت) و (لە سەعاتێکی بەدیدا) زۆر دووربوون لەو ئامانجەی کە لە خەیاڵیدا بوو، ئەو ئامانجەی کەساڵانێك بوو بەرەبەرە پەرەیپێدەدا. دەیزانی کە لە ئەنجامدا چیرۆکەکانی دەبێت لە شاری ئەفسانەیی (ماکۆندۆ)دا روودەن، بەڵام دەبوایە چاوەڕوانی دۆزینەوەی تۆنێکی راست بێت بۆ گێڕانەوەیان. دەبوایە دەنگی راستیی خۆی بدۆزێتەوە.

لە ڤێنزوێلا، بەزۆری لەگەڵ هاوڕێیەکی کۆنی خۆیدا دەگەڕا کە ناوی (پینیۆ ئەپۆلیۆ مێندۆزا) بوو و لە رۆژنامەی نوخبە (دەستەبژێر *Elite*) کاریدەکرد کە لە کاراکاس دەردەچوو. بەدرێژایی ساڵی 1957 ئەم جووتە پێکەوە بە گەشتێك هەستان لە وڵاتە کۆمۆنیستەکاندا. بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ نەخۆشییەکانی کۆلۆمبیا و لە زۆربەی بڵاوکراوەکانی ئەمریکای لاتینیدا وتاریان بڵاودەکردەوە. لە کاتێکدا کە شتێکی بەسوودیان لە سۆشیالیزم بەدیدەکرد، بەڵام گارسیا مارکیز بە پەستییەوە بۆی دەرکەوت کە کۆمۆنیزمیش هێندەی *la violencia* ناخۆش و ترسناکە. پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی کورت لە لەندەن مایەوە، گارسیا مارکیز گەڕایەوە بۆ ڤێنزەوێلا. کاتێك لە رۆژنامەی *Momento* کاریدەکرد، کارێکی دۆزییەوە بۆ هاوڕێ کۆنەکەی. لە ساڵی 1958 سەرکێشیی ئەوەی کرد کە بگەڕێتەوە بۆ کۆلۆمبیا. بە دزییەوە گەڕایەوە و (مەرسەیدس)ی مارە کرد کە چوار ساڵ بوو لە شارۆچکەی بارانکیلا چاوەڕوانیی دەکرد. بەهۆی کێشەکانی کەراکاسەوە و پاش ئەوەی چەند وتارێکی بڵاوکردەوە دژی ناپاکیی ئەمەریکا و خراپەکاریی حاکمە زۆردارەکان، رۆژنامەی *Momento* ناچار بوو سەر بۆ فشاری سیاسی دابنەوێنێت و هەڵوێستێکی پاساودانی سەر بە ئەمریکا هەڵبژێرێت، بەتایبەتی پاش سەردانە شوومەکەی (نیکسن) لە مانگی مایسدا. گارسیا مارکیز و مێندۆزا بەم خۆبەدەستەوەدانە تووڕە بوون و دەستیان لە کارکردن کشاندەوە. پاش ئەوە گارسیا مارکیز و ژنەکەی سەردانی هاڤانایانکرد و وتاری لەسەر شۆڕشی کاسترۆ نووسی. بە ئیلهام وەرگرتن لەو شۆڕشە، لقێکی ئاژانسی سەر بە کاسترۆی کردەوە بەناوی *prensa Latina* و لەگەڵ کاسترۆدا هاوڕێیەتی پەیدا کرد کە هەتا ئێستا بەردەوامە.

لە ساڵی 1959، یەکەم کوڕیان، رۆدریگۆ، لە دایکبوو و خێزانەکەیان چوو بۆ شاری نیویۆرك. لەوێ گارسیا مارکیز سەرپەرشتیی لقی ئەمریکای باکووری ئاژانسی *presna Latina* ی دەکرد. بە هۆی هەڕەشەی ئەمریکییە تووڕەکانەوە بە کوشتنی، گارسیا مارکیز پاش ساڵێك دەستی لە کار کێشایەوە. بەهۆی ئەو هەڵە ئایدیۆلۆجیانەی کە لە پارتی کۆمۆنیستی کوبادا روویاندەدا، بەرەبەرە لەو وەهمەی کە لە مێشکیدا هەبوو لە بارەی ئەو پارتەوە نەما. سەردانی ئەمریکای کرد و چووە ئەو شوێنانەی کە فۆکنەر تیایاندا دەژیا. پاشان چوو بۆ شاری مەکسیکۆ. سەردانی ئەمریکای لێ قەدەغە کرا هەتا ساڵی 1971.

لەشاری مەکسیکۆ سەرقاڵی نووسینی سیناریۆ و وەرگێڕانی فیلم بوو. هەر لەو کاتەشدا هەندێك کورتە رۆمانی بەچاپ گەیاند. کورتە رۆمانی (کەس نامە بۆ کۆلۆنێل نانووسێت) کە خەریکبوو مۆرانە بیخوات و بفەوتێت لەلایەن هاوڕێکانییەوە لە ساڵی 1961 چاپکرا. پاشان لە ساڵی 1962 رۆمانی (نەرمی دایە گەورە) چاپکرا.

هەر لەو ساڵەدا، کوڕی دووەمی، گۆنزالۆ، لەدایکبوو.

هاوڕێکانی قایلیانکرد کە بەشداریی پێشبڕکێیەکی ئەدەبی لە شاری بۆگۆتا بکات. دەستیکرد بەبژارکردنی ڕۆمانی *Este pueblo de mierda* و ناوەکەی لە (شاری گوو)ەوە گۆڕی بۆ *La mala hora* (لە سەعاتێکی بەدی دا). ڕۆمانەکەی بەشدارکردوو خەڵاتەکەی بردەوە. چاودێرانی خەڵاتەکە ڕۆمانەکەیان نارد بۆ مەدرید. کاتێك کە لە ساڵی 1962 بڵاوکرایەوە، پێشوازییەکی جیهانیی لێکرا، بەڵام خۆی زۆر پێی نائومێد بوو، چونکە چاپکەرەکە ئەو شتانەی کە بەدڵی نەبوون لایبردبوون و هەموو ئەو گفتوگۆیانەی کە بە زمانی میللیی ئەمریکای لاتینی نووسرابوون گۆڕیبوونی بۆ ئیسپانییەکی فەرهەنگی و ئیتر وایکردبوو کە ڕۆمانەکە نەناسرێتەوە. پەست و دڵشکستە، گارسیا مارکیز ناچار بوو خۆی لەو چاپە بێبەریبکات و زیاتر لە پێنج ساڵ دواتر ئینجا توانی کتێبەکەی بگێڕێتەوە بۆ سەر دەقە ڕاستیەکەی و چاپی بکات.

ئەو چەند ساڵەی دوای ئەوە سەردەمی نائومێدییەکی قووڵ بوو هیچی ئەوتۆی تێدا نەنووسی، بێجگە لە دەقی فیلمێك بە هاوکاری لەگەڵ (کارلۆس فوینتس)دا. هاوڕێکانی بە هەموو شێوەیەك هەڵیاندەدا کە دڵی بدەنەوە، بەڵام بێسوود بوو. هەستی بە نوشستی دەکرد. هیچ کام لە کتێبەکانی لە (700) دانە زیاتریان لێ نەدەفرۆشرا – هیچ پارەیەکی لە کتێبەکانییەوە بەدەست نەدەکەوت. هێشتا چیرۆکی شاری (ماکۆندۆ)ی لێوە دوور بوو.

## سەرکەوتن

پاشان، ڕۆژانی جەژنی هات. ساڵی 1965، لە کاتێکدا کە خۆی و خێزانەکەی لە گەشتێکدا بوون لە (ئاکاپولکۆ)، لە پڕ ئیلهامی بۆ هات و ئەو دەنگەی دۆزییەوە کە بۆی دەگەڕا، بۆ یەکەمین جار، پاش بیست ساڵ بروسکەیەك ئەو دەنگەی بۆ ئاشکرا کرد کە دەبوایە (ماکوندۆ)ی پێ بنووسێت. لەم بارەیەوە پاشان نووسی: "لەپڕ، نازانم چۆن، ئەوەم بۆ ڕوونبووەوە کە چۆن ئەم کتێبە بنووسم.. بیرۆکە ئەوەندە بە تەواوی قاڵبی وەرگرتبوو کە دەمتوانی یەکسەر وشە بە وشەی بە چاپکەرەکە بنووسمەوە".

هەروەها لە بارەی ئەم ڕوونکردنەوەیەوە دەنووسێت:

"ئەو تۆنەی کە لە ئەنجامدا بەکارمهێنا بۆ نووسینی (سەد ساڵ تەنیایی) لەسەر ئەو بناغەیە ئەو شێوازە دانرابوو کە نەنکم چیرۆکی بۆ دەگێڕامەوە. نەنکم شتی خەیاڵی و نائاسایی بۆ دەگێرامەوە، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر سروشتی. ئەوەی کە زۆر گرنگ بوو ئەو دەربڕینە بوو کە بە ڕوخسارییەوە دیاربوو. کاتێك کە ئەو چیرۆکانەی دەگێڕایەوە کە خەڵکەکەی سەرسام دەکرد، ڕوخساری هیچی پێوە دیارنەبوو. لە پێشدا هەوڵمدەدا چیرۆکێك بگێڕمەوە کە خۆم باوەڕم پێنەبێت. پاشان بۆم دەرکەوت کە دەبێت خۆم باوەڕم بە چیرۆکەکە بێت و بە شێوەیەك بیگێڕمەوە کە ڕوخسارم هیچ دەرنەبڕێت، وەکو نەنکم".

یەکسەر گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و (مەرسیدسی) ژنی دایە دەستی کەس و کاری بۆ ئەوەی ئاگایان لێبێت و خۆی خزاندە ژوورەکەیەوە بۆ نووسین.

بە ڕاستیش دەینووسی. بۆ ماوەی هەژدە مانگ هەموو ڕۆژێك دەینووسی و شەش پاکەت جگەرەی دەکێشا. سەیارەکەی فرۆشت بۆ دابینکردنی مەسرەفی ماڵ و زۆربەی کەلوپەلی ماڵەکەی خستە ڕەهنەوە بۆ ئەوەی ژنەکەی مەسرەفی خێزانەکەی بکێشێت و دنیایەك کاغەز و جگەرەی بۆ دابین بکات. هاوڕێکانی ژوورە

دووکەلاوییەکەیان ناونابوو "ئەشکەوتی مافیا". هەموو دەوروبەرەکەی کۆمەکیان دەکرد، چونکە دەیانزانی کە خەریکی داهێنانی شتێکی سەرنجڕاکێشە. متمانەی قەرز پێدانی درێژتر کرا، ئامێرە پێویستەکانیان بە قەرز پێداو لە قەرزە کۆنەکانی خۆشبوون. پاش نزیکەی ساڵێك لە کارکردن، گارسیا مارکیز سێ بەشی ڕۆمانەکەی نارد بۆ (کارلۆس فوینتس). ئەویش بە ئاشکرا بە خەڵکەکەی ڕاگەیاند: "هەر ئێستا هەشتا لاپەڕەی شاکارێکی ئەدەبیم خوێندەوە". لەگەڵ نزیکبوونەوەی کۆتاییهێنان بە ڕۆمانەکە، کە هێشتا ناوی نەنرابوو، پێشبینیکردن دەستی پێکرد و دەنگی سەرکەوتنی لە ئارادا بوو. لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا کەسایەتی خۆی و ژنەکەی و هاوڕێکانی تێکەڵ بە چیرۆکەکە کرد. ئینجا لە ئەشکەتەکەی دەرکەوت و سەدەها لاپەڕەی بەدەستەوە بوو، ماندوو و نیکۆتینی جگەرە نیمچە ژەهراویی کردبوو. نزیك بوو لە داروخانی جەستەیی ومێشکەوە، دەهەزار دۆلاریش قەرزاربوو. بەلاَم، لەگەڵ ئەوەشدا، شاد و بەختەوەر بوو. پێویستی بە هەندێك پارەی دیکە هەبوو بۆ ناردنی کتێبەکەی بۆ چاپکردنی لە بۆینس ئایرس، لەبەرئەوە هەندێك کەلوپەلی دیکەی ماڵەکەی لە ڕەهن دانا.

(سەد ساڵ لە تەنیایی) لە حوزەیرانی 1967 چاپکراو لە ماوەی یەك هەفتەدا هەر هەشت هەزار نوسخەی کتێبەکە فرۆشرا. لەو کاتەوە ئیتر سەرکەوتنی مسۆگەر کرد و هەفتەی جارێك کتێبەکە لە چاپدەدرایەوە. لە ماوەی سێ ساڵدا نیو ملیون دانەی لێ فرۆشرا. چوار خەلاَتی جیهانیی وەرگرت. سەرکەوتن لە ئەنجامدا گەیشت و گابرێیل مارکیز لە تەمەنی 39 ساڵیدا ناوبانگێکی جیهانیی بەدەستهێنا.

ناوبانگ لە پڕ هێرشی بۆ هێناو نامە و چاوپێکەوتن و دەرکەوتن لە بۆنەکاندا دەوریدا ئاشکرا بوو کە ژیانی گۆڕا. لە ساڵی 1969 ڕۆمانەکەی خەلاَتی (چینچیافۆ)ی ئیتاڵی وەرگرت و لە فەرەنسادا کتێبەکەی بە باشترین کتێبی بیانی دانرا. لە ساڵی 1970 کتێبەکەی وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی و بەیەکێك لە باشترین دوانزە کتێبی ساڵ دانرا لە ئەمریکادا. دوو ساڵ دوای ئەوە خەلاَتی (ڕۆمۆلۆ گالیگۆس) و ڕۆمانی (*Neustadt*)ی وەرگرت. نووسەرێکی خەڵکی پیرۆ کە ناوی (ماریو ڤارگاس یۆسا)یە کتێبێکی نووسی دەربارەی ژیانی و بەرهەمەکانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم هەموو دەرکەوتنە گارسیا مارکیز هەر ئەوەندەی بۆ کرا بگەڕێتەوە بۆ نووسینی. بڕیاریدا لەسەر دیکتاتۆرێك بنووسێت، لەبەرئەوە چوو بۆ شاری بەرشەلۆنە لە ئیسپانیا. لەو سەردەمەدا ئیسپانیا لە ساڵانی دوایی حوکمی دیکتاتۆر فرانسسکۆ فرانکۆدا دەژیا. هەوڵیدا کە ڕۆمانی داهاتووی دەربارەی دڕەندەیەك بێت کە پێکهاتەکەی تێکەڵاو بێت لە دیکتاتۆرێکی کاریبی لەسەر شێوازی دەستسووکیی ستالین، بەلاَم بەخۆپەرستییەکی ستەمکارانەوە لەسەر نموونەی ستەمکارەکانی ئەمریکای لاتینی. لە هەمان کاتدا، کتێبی (ئێرێندیرای بێتاوان و چەند چیرۆکێکی تر)ی لە ساڵی 1972 بلاَوکردەوە. هەروەها لە ساڵی 1973دا، کارە ڕۆژنامەوانییەکانی ساڵانی پەنجاکانی بلاَوکردەوە لەژێر ناونیشانی *Cuando era felise in documentado* (کاتێك کە کامەران و بێئاگابووم).

(پایزی پاتریارک)ی لە ساڵی 1975 بلاَوکردەوە. ئەم ڕۆمانە دابڕانێکی توند بوو لە ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) هەم لەلایەن بابەتەکەیەوە و هەم لە تۆنی نووسینەکەیدا. کتێبێکی ئاڵۆز و ڕستەکانی پێچاوپێچ بوون، لەبەرئەوە ڕەخنەگرەکانی نائومێد کرد چونکە چاوەڕوانی (ماکۆندۆ)یەکی دیکەیان دەکرد. بەلاَم

ساڵەکانی دوایی ئەم بۆچوونە گۆڕاو ئێستا بە شاکارێکی تایبەتی ئەدەبی واقعی دەژمێردرێت.

## ژیانی دواتری

ژیان لە سیستەمێکی دیکتاتۆریدا و چوونە ناو مێشکی ستەمکارێکەوە باجێکی سۆز بوو کە دەبوایە بدرایە. پاش تەواوکردنی رۆمانەکە گارسیا مارکیز بڕیاریدا کە ئیتر هیچ جۆرە رۆمانێك نەنووسێت هەتا (بینۆشیت)، کە ئەمریکا پشتگیری دەکرد، لەسەر دەسەلأت لانەچێت، بەلأم دواتر خۆی ئەم بڕیارەی هەڵوەشاندەوە. وەکو نووسەرێکی ناودار ئاگاداری دەسەلأتی سیاسی خۆی بوو. ئەو دەسەلأتەی کە رۆژ بە رۆژ لە زیادبووندا بوو. دڵنیابوونی لە دارایی خۆی توانای ئەوەی پێدا کە زیاتر بایەخ بە چالاکییە سیاسییەکانی بدات. پاش گەڕانەوەی بۆ مەکسیکۆ خانوویەکی نوێی کڕی و پەرەیدا بە هەڵمەتەکانی بۆ کارتێکردن لە کەسانی دەوروبەری، هەروەها بەردەوامبوو لە تەرخانکردنی بڕێك لە پارەکەی بۆ هەندێك کێشەی سیاسی و کۆمەلأیەتی. بەهۆی نووسین و بەخشینی پارەوە، پشتگیری کرد لە کێشەی چەپەکانی کۆڵۆمبیا و ڤێنزوێلا و نیکاراگوا و ئەرجەنتین و ئەنگۆلا. بەشداریکرد لە دامەزراندنی رێکخراوی *HABEAS* کە خۆی تەرخانکردووە بۆ راستکردنەوەی خراپەکارییەکانی بەکارهێنانی دەسەلأت لە ئەمریکای لاتیندا و هەوڵدەدات بۆ بەرەڵلأکردنی زیندانییە سیاسییەکان. هاوڕێیەتی بەست لەگەڵ هەندێك سەرکردەدا، وەکو (عومەر تۆریخۆس)ی سەرۆکی پەنەما و لەگەڵ فیدل کاسترۆدا پەیوەندییەکەی هەر بەردەوام بوو پێویست ناکات ئەوە بڵێین کە بەم چالاکییانەی لە دڵی سیاسەتمەدارەکاندا خۆشەویستر نەبوو، نە لە کۆڵۆمبیا و نە لە ولأتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا. لە هەموو سەردانێکیدا بۆ ئەمریکا ڤیزای کورتخایەنی پێدەدراو دەبوایە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ڤیزاکەی پەسەندبکردایە. (ئەم سنووردانانە پاشان لەلایەن بیل کلنتونەوە لابرا). لە ساڵی 1977 کتێبێکی بلأوکردەوە بەناونیشانی *Operacion Carlota* کە بریتی بوو لە کۆمەڵە وتارێك لە بارەی رۆڵی کووبا لە ئەفریقادا. سەیر لەوەدا بوو کە لە کاتێکدا خۆی بە هاوڕێی کاسترۆ دادەنا، کە یارمەتیدا لە چاپکردنی رۆمانی *chronicle of a death forelold* (تۆماری روودانی مەرگێکی پێشبینیکراو) بەلأم کتێبێکی زۆر "رەق و راشکاوانە"ی نووسی لە بارەی کەموکوڕییەکانی شۆڕشی کووبا و ژیان لە سایەی رژێمی کاسترۆدا. ئەم کتێبە هەتا ئێستا چاپ نەکراوە و گارسیا مارکیز دەڵێت کە هەڵیگرتووە هەتا ئەو کاتەی پەیوەندییەکانی نێوان کووبا و ئەمریکا ئاسایی دەبنەوە.

لە ساڵی 1981 فەرەنسا میدالیای شەرەفی پێبەخشی و لەسەردانێکیدا لەگەڵ کاسترۆ لە کاتی گەڕانەوەیدا دووبارە تووشی کێشە بووەوە. حکومەتی پارێزگاری کۆلۆمبیا تاوانباریکرد بەوەی کە پارە دەدات بە ریکخراوی (*M-19*) کە دەستەیەکی گەریلای لیبرال بوون. ناچار بوو رابکات و داوای پەناهەندەیی لە مەکسیك بکات. لە مەکسیك ماڵێکی پێکەوە نا کە هەتا ئێستا هەر ماوە. حکومەتی کۆلۆمبیا زوو پەشیمان بووەوە لەو تووڕەبوونەی کە لە بەرامبەر کوڕە ناسراوەکەی نواندی. لە ساڵی 1982 خەلأتی نۆبڵی وەرگرت. لەبەرئەوەی کە شەرمەزار بوون و لەبەرئەوەی کە سەرۆکێکی تازەیان هەڵبژاردبوو کۆلۆمبیەکان داوایان لێکرد کە بگەڕێتەوە. سەرۆك کۆماری هەڵبژێردراو خۆی چوو بۆ بەرێخستنی بۆ ستۆکهۆڵم.

لە ساڵی 1982 بە یارمەتی هاوڕێیەکی کتێبی (*El odor de la guagaba*) (بۆنی گواڤا)ی چاپکرد،



که بریتییه له گفتوگۆیەك لەگەڵ هاوڕێی دێرینی (پنیۆ ئەپۆلیۆ میندۆزا). له هەمان ساڵدا سیناریۆیەکی نووسی بەناوی *viva sandino* (بژی ساندینۆ) دەربارەی شۆڕشی ساندانیستەکان له نیکاراگوا. کاری دوای ئەوە دەربارەی خۆشەویستی بوو نەك سیاسەت.

بەبیرکردنەوەی له رابوردووی دەوڵەمەندی خۆی و مەسەلەی دڵدارییەکەی دایك و باوکی، چیرۆکێکی نووسی که باس له دڵدارییەکی درێژخایەن دەکات. چیرۆکەکە دەربارەی دوو عاشقی رێگەپێنەدراون که ماوەیەکی دوورو درێژ هەیە له نێوان یەکەم و دووەم خوازبێنیدا. له ساڵی 1986 رۆمانی (دڵداری له سەردەمی کۆلێرادا) ئاشکرا کرا بۆ جیهانێك که بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی دەکرد. بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر پێشوازیی لێکراو تەنانەت نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی وازی له گۆشەگیرییەکەی هێناو وتارێکی له نیویورك تایمز لەسەرنووسی. گومان لەوەدا نەبوو که گارسیا مارکیز بۆتە نووسەرێکی جیهانی و بەردەوام سەرنج رادەکێشێت.

ئێستا گارسیا مارکیز یەکێکە له ناسراوترین نووسەرانی دنیا و شێوازێکی تایبەتی هەیە له نووسینداو له چالاکیی سیاسیدا. له ساڵی 1990 کتێبی جەنەرال له وێڵبوونەکەیدا بڵاوکردەوە و دوای ئەوەش (حاجیە سەیرەکان *strarge pilgrims*). له ساڵی 1994 تازەترین بەرهەمی چیرۆکی بڵاوکردەوە، بەناونیشانی (خۆشەویستی و دێوەکانی دیکە). پاشان له ساڵی 1996 کتێبی (دەنگ و باسی رفاندنەکە)ی بڵاوکردەوە که کارێکی رۆژنامەوانییە دەربارەی دڕندەیی بازرگانی تلیاك له کۆلۆمبیادا. ئەم گەڕانەوەیە بۆ رۆژنامەگەری له ساڵی 1999 زیاتر پەرەیسەند به کڕینی گۆڤاری خەباتکەری *combio*. ئەم گۆڤارە ئامێرێکی زۆر بەجێبوو بۆ گارسیا مارکیز بۆ گەڕانەوە بۆ رەگ و ریشەی خۆی. ئەمڕۆش، ئەم گۆڤارە بوونێکی سەرکەوتووی هەیە له وێژەی کۆلۆمبیادا.

### El otono del patriarca

بەداخەوە له ساڵی 1999 دەرکەوت که گارسیا مارکیز تووشی شێرپەنجەی لیمفاوی بوو، هەتا ئێستا ئازاری چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە دەچێژێت و ناچار دەبێت له شاری مەکسیکۆ یان کارتاجیناوە بچێت بۆ (عیادە)کانی لۆس ئەنجلز، که کوڕەکەی روودریگۆ گارسیا لەوێدا دەژێت و دەرهێنەری سینەماییە.

ئێستا (گابۆ) وازیهێناوە له چیرۆك نووسین و خۆی تەرخانکردووە بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی. "یەکەم بەرگی یادەوەرییەکانی به ناونیشانی (ژیان بۆ ئەوەی بیگێڕیتەوە *vivir para contarla*) له ساڵی 2001دا بڵاوکرایەوە. کتێبەکە لەلایەن دەزگای *knopf* له وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڵاوکرایەوە و یەکسەر برەوێکی زۆری هێناو بەبایەخدارترین کتێب دانرا لەو وڵاتانەی که به ئیسپانی قسه دەکەن. وا بڕیاریشە که هەمان دەزگا له ساڵی 2003دا وەرگێڕاوە ئینگلیزییەکەی بڵاوبکاتەوە. بیرەوەرییەکانی، که بڕیار وایە له سێ بەرگدا بێت، باسی وەردەکاریی ژیانی (گابۆ) دەکات هەتا ساڵی 1955. ئێستا سەرقاڵی نووسینی بەرگی دووەمیانی که تیشك دەخاتە سەر نووسین و چاپکردنی کارە سەرەکییەکانی، لەوانە رۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی).

### سەرچاوە

له ئینتەرنێتەوە: سایتی

*The modern world, Gabo biography*

# مارکیز بەقەڵەمی هاوڕێکانی

لە عەرەبییەوە: تارا شێخ عوسمان



لەساڵی (2002)دا گۆڤاری (کامبیو)ی کۆڵۆمبی ژمارەیەکی خۆی تەرخان کرد بۆ ئاهەنگگێڕان بەبۆنەی دەرچوونی چاپی یەکەمی بیرەوەرییەکانی (گابرێل گارسیا مارکیز)ەوە بەناونیشانی (بۆ ئەوە دەژیت تا بیگێڕیتەوە)، ئەم کتێبە بەتیراژی (یەك) ملیۆن دانە لە ئیسپانیاو ئەمریکای لاتین بڵاوکرایەوە. ئەو گۆڤارە وەك تازەکارییەك میوانداریی قەڵەمی ژمارەیەك لەو کەسانەی کرد کە هاوڕێ و دۆستی نزیکی مارکیزی گەورە نووسەری کۆڵۆمبین. بۆ ئەوەی قسە لەسەر ئەو نووسەرە بەتوانایە بکەن کە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبییە.

لەو کەسانەش کە گۆڤارەکە میوانداریی نووسینەکانیانی کردووە (ڤیدل کاسترۆ)ی سەرۆکی کوباو (میلان کۆندێرا)ی گەورە نووسەری (چیك)و سەرەك وەزیری پێشووی ئیسپانیاو (فلیپی گۆنزالیس)و هەریەك لە (کارلۆس فۆینتس)و (ئەلڤارۆ مۆتیس)و (رێدیارد کابسنسکی)و (خوان گارسیا بونسی)و (تۆماس ئەلوی مارتیین)و (سێرهیو رامبرین)و (ئەلما جوبیر مۆبیرییتۆ)یە.

بەر لەهەموو شتێك دەبێت سەرنج لەوە بدەین کە مارکیز لەو کتێبەیدا (596) لاپەڕەی یەکەمی تەرخانکردووە بۆ سەردەمی منداڵی و لاوێتی، ئەو ساڵانەش (مارکیز) ژیانی لەکەنارەکانی کۆڵۆمبیادا بەسەربردووە کە دەڕوانێت بەسەر دەریای کاریبیدا. لەوێدا داهێنانی (ئاراکاتاکا) دووبارە دەکرێتەوە، ئەو شارۆچکەیەی کە لێوانلێوە لەکەسێتییە نازناو ئاڵۆزەکان، کەیبانوی ماڵانی ئەو شارۆچکەیە رۆڵی چارەنوسسازییان هەبووە لەسەر مارکیز تا بڕواتە جیهانی داهێنانەوە، بەبڵاوکردنەوەی چیرۆکەکانی لەڕاگەیاندنە نووسراوەکاندا دەستپێدەکات، تا دەگاتە ئەوکاتەی کە لە سەرەتادا رۆژنامەگەریی رەتدەکردەوە بەوەش کۆتایی نایەت کە لێکۆڵینەوەیەکی ڕۆژنامەوانی پەسەند کرد، وەك ژانرێك داهێنانی رۆمانی بڵندکرد.

هەروەها (ماركیز) داهێنانی ساڵەکانی خوێندنگەو قۆناغەکانی کۆلێژی ماڤ گێڕاوەتەوە، بەرلەوەی بەشێوەیەکی یەکجارەکی بڕیاری بەجێهێشتنی پۆلەکانی خوێندن بدات و خۆی بۆ ئەدەب و تەختەکانی شانۆی لاوانی بوهەیمی تەرخان بکات، بەڵام مەسەلەکە بەوەندەوە ناوەستی بەڵکو تێڕوانینەکانی بەرەو پیشەی نووسینیش دریژبۆوە. دوا لاپەڕەکانی ئەو کتێبە بەوە کۆتایی دێت مارکیز دەبێتە (23) ساڵ و لە کۆڵۆمبیاوە وەك پەیامنێرێکی ڕۆژنامە بەرەو ئەوروپا کۆچی کرد.

لەبەرئەوەی قسەکردن لەسەر ئەو کەسەی نازناوی (ریالیزمی سیحریی لەئەدەبدا) پێبەخشراوە زۆر دەهێنی و دێڕەکان ناتوانن بالأبدەن لەو بەرزییەی کە (گابۆ) پێیگەیشتووە و ئەو جیهانە بوهەیمیەو ئەو پەیوەندییە بێسنوورانەی دەوری ناوبراوی داوە، بۆیە تەنها نووسینەکانی سێ کەس لەو کەسایەتییە بەناوبانگانە بڵاودەکەینەوە کە لەسەر (مارکیز) نووسیویانە.

### ( 48 ) سەعات لەگەڵ ( گابۆ )دا

چل و هەشت سەعات لەقسەکردن کە چێژی ساتەکانی بێدەنگی تێدا بوو کەسمان هەستمان بەپێویستی بڕینی ئەو قسانە نەکرد. پڕبوو لەپێکەوەبوون، هەروەك ئەوەی زەمەنێکی بێکۆتایی بەرەو پێشەوە دەچێت، پڕە لەسەرکێشی وەك هەگبەکانی چارەکەی کۆتایی سەدە.

نەزوەکانی بیرەوەریمان هەڵیگرتین بەرەو بیرەوەرییە هاوشێوەکان، یان بەرەو ئاڕاستەی ئەو بۆشاییانەی کە هەردووکمان بۆمان دەرکەوت ئەوە هەمیشە لەدڵەڕاوکێکانی ئێستامانەوە سەرچاوە دەگرێ، سەرەڕای ئەوەی زۆربەی جار سۆزی بۆ رابردوو دەبێت.

ناتوانم لەسۆنگەی خوێنەرێکەوە قسە لەسەر (گابۆ) بکەم سەرەڕای گەورەیی نووسینەکانی و خوێندنەوەو دووبارە خوێندنەوەی. هەر لەپیتەکانی چاپکردنییەوە بەچێژ وەرگرتن لە هەموو خوێندنەوەیەکی بۆ ئەو توانا بێکۆتاییەی کە لەداهێناندا هەیبوو. یان بەهۆی بێگەردیی و جوانی چیرۆکەکانی یان لەبەر ئەو ریتمە سینەماییەی کە کارە ئەدەبییەکانی هەیەتی، نەخێر: من وەك هاوڕێیەك و وەك مرۆڤێك سەیری مارکیز دەکەم کە لەگەڵیدا ژیاوم و وەك ئەو کەسەی لەپشت ئەدەبەکەیەوەیەتی.

ئەو گفتوگۆیە گرفتەکانی ئەو بیرەوەرییە تاووتوێدەکات کە بەم دواییە کۆتاییهاتووە، ئینجا دەگۆڕێ بۆ بیرەوەریی ئەو سەرکێشیانەی کە کراون لەئەمریکای ناوەند، لەکوبا و لەکۆڵۆمبیادا. لەڕووداوەکانەوە باز دەدات بۆ کاراکتەرە چڕو ونەکانی وەك (تریخۆس، رۆکی دلتان)و زۆرێکی تریش کە بەشێوەیەکی توندوتیژانە پەلکێش کراونەتە بەردەم مەرگ لە (پەنەما، نیکاراگوا، سیلڤادۆر، گواتیمالا)و دیکتاتۆرەکانی کە بە

(قوچەکی باشوور) ناسرابوون. لەپشت ئەدەبەکەی مارکیزەوە ژیانێك هەیە پڕ لەپابەندی و لێوانلێوە لەسەرکێشی و پڕە لەمەترسی، دەڕوات بۆ دوورتر لەڕاستی و هەڵە، لەپێشبینییەکانی واقیع و پێشکەوتن لەگەڵ ئایندە دەکات، دەچێتە ناخی ئەو زەوییەی کە خۆی خۆشیدەوێت.

فلیپی گۆنزالیس

(سەرەك وەزیری پێشووتری ئیسپانیا).

## گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی

من و(گابۆ) هەردووکمان لەڕۆژی (9)ی مانگی (ئەپریل)ی ساڵی (1948)دا لەشاری (بۆگۆتا) بووین، ئەو ڕۆژە بوو کە (گایتان)یان کوشت، هەردوکمان هاوتەمەن بووین، واتە هەردوکمان (21) ساڵ بووین، هەردووکمان شایەتحاڵی ڕووداوەکان بووین، هەردووکیشمان خوێندکاری هەمان رشتە بووین ئەویش کۆلێژی (ماف)بوو.

پێکەوە وامان بیردەکردەوە کە هیچمان زانیاریمان دەربارەی ئەویترمان نییە، کەسمان یەکدیمان نەدەناسی، تەنانەت خۆشمان هیچمان لەبارەی خۆمانەوە نەدەزانی. دوای تێپەڕبوونی نیو سەدە، من و (گابۆ) ئەو ئێوارەیەی بۆ (بیرام) دەچووین کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی کوباوە، کەوتینە قسە.

ئەوکاتە سپێدەی (13)ی ئابی (1926) دەرکەوت ئەو چاوپێکەوتنەش مۆرکێکی خێزانی گرتە خۆی، کە بیرەوەریی ئاشنایەتیکراوە و راشکاوانە خۆی دەسەپێنی و سەرڕێژە لەهەست و سۆز لەبارودۆخێکدا لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێ و سەرکردەی شۆڕش دابەشمان کرد.

لەو شەوەدا کە گفتوگۆمان دەکرد لەگەڵ (گابۆ)دا دووبارە ئەو دیمەنانە هاتنەوە بەرچاومان کە لەیادەوەریماندا چەسپابوون. ئەوکاتەی (گایتان)یان کوشت، هاوارو قیژەکانی (9)ی نیسان لە (بۆگۆتا)دا گەڕایەوە، ئەو کاتەی لەگەڵ کۆمەڵێك گەنجی کوبا سەفەرمان کردبوو بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا کۆنگرەیەکی خوێندکاری لە (ئەمریکای لاتین)دا رێکبخەین، لەوکاتەدا سەرسوڕمان و دڵەڕاوکی هەموو لایەکی گرتەوە، گەلی کوبا بکوژی (گایتان)ی لەشەقامەکاندا دەستگیرکردو ژمارەیەکی زۆری خەڵك چەندین ناوەندی بازرگانی و نووسینگەو سینەماو تەلاری نمایشکراو بۆ کرێیان سووتاند. بەمەش نارەزایی و دڵتەنگی خۆیان دەردەبڕی، خەڵکیی لەدەروازەکانی شارو بەردەم شەقامەکان و لەبالکۆنە سوورەکانیانەوە نارەزاییان دەردەبڕی. لەناخی ئەم دیمەنانەشدا، پیاوێك لەوپەڕی هەڵچوونیدا قیژاندی و مستێکی کێشا بەو ئامێری چاپەی کە لەبەردەستیدا بوو و هەڵیدا بەئاسماندا. ئامێرەکەش بەرلەوەی بکەوێتە خوارەوە و بیدا بەزەوییە کۆنکرێتەکەدا بەئاسماندا پەرشوبڵاو بۆوە.

ئەوەی سەیر بوو لەوکاتەدا ئەوە بوو کاتێك چیرۆکەکە تەواو بوو زانیم (گابۆ)ش لەوێبووە، لەوەش گەیشتم کە رێکەوت چی دەردەخات. پێدەچێت هەردووکمان پێکەوە بەشەقامەکاندا گەڕابین، لەوانەشە هەردووکمان لەهەمان راپەڕیندا ژیابین، رەنگیشە هەرووکمان هەمان هەستی ترس و سەرسوڕمان باڵی بەسەردا کێشابێن، کە منی کردە یەکێکی تر لەو رووبارەی کە کتوپڕ هوروژمی کردە سەر گردۆڵکەکان. ئەو پرسیارەم ئاراستەکرد کە هاورێ بوو لەگەڵ فزوڵێکی چەسپاوو هەمیشەیی (ئەی تۆ، تۆ لەکاتی راپەرینەکەی بۆگۆتادا چیت دەکرد؟). ئەویش واتە (گابۆ) لەوەڵامدا بەخەیاڵی خۆیدا شۆڕببۆوە بەزەردەخەنەوە کە بەلێهاتووییەکەوە لەسروشتە وەرگێراوەکانییەوە سەرچاوەی دەگرت وتی (ڤیدل، من هەمان ئەو پیاوەی خاوەن ئامێری چاپەکە بووم).

ڤیدل کاسترۆ – سەرۆکی کوبا

## ڕۆژنامەنووسی مەزن

ژمارەیەکی زۆر موعجیبی هەیە، کتێبەکانی بەڕێژەیەکی زۆر دەفرۆشری. من دەپرسم ئەو جەماوەرە زۆرە لەکوێوە دێت؟ لەو بڕوایەشدام ئەوە لەمرۆیی بوونی ئەدەبەکەیەوە سەرچاوە دەگرێ و لەو دەوروبەرو لەو ژینگەیەوە کە لە هەموو کتێبەکانیدایە. ڕۆمانسییەتی چیرۆکەکانی لاوان ڕادەکێشێ و گەورەکانیش ستایشی قوڵیی و هەندێکجاریش خەم و تێڕوانینەکانی (گابۆ) دەکەن سەبارەت بەژیان و خەڵك و ئەو جیهانەی کە تێیدا دەژین.

لەپۆڵۆنیا (گابۆ) یەکێکە لەڕێنوێن و ڕابەرە ڕۆحییەکان، کەسێکە نموونەکان دەنەخشێنی بۆ ئەوەی چۆن بژین و چۆن بیر بکەینەوە. تەنانەت لەوێ هەندێ خوێنەر هەن لەسەداسەد خۆیان تەرخان دەکەن بۆ کارەکانی ئەوو بەردەوام پرسیار دەکەن داخۆ هیچ شتێکی تازەی مارکیز لەکۆڵۆمبیاوە گەیشتۆتە کتێبخانەکانی پۆڵۆنیا؟

خوێنەران بەپرۆشن بۆ گوێگرتن لەو دەنگە دەگمەن و تایبەتە، سەبارەت بەوان (مارکیز) خەونی هەموو نووسەرێکی هێناوەتەدی، بەوەی دەقەکانی پیرۆزن و ناتوانرێ دەستی لێهەڵبگیرێ.

لەساڵی (1970)دا کاتێك پەیامنێری ڕۆژنامە بووم لەمەکسیك مارکیزم ناسی، ئەمەش بەر لەسی ساڵ بوو کە هێشتا ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنهایی) نەکرابوو بەپۆڵەندی. لەوکاتانەدا زیاتر وەك ڕۆژنامەنووسێك و بەهۆی ئەو ڕاپۆرتە هەواڵانەی لەسەر ئەمریکای لاتین بڵاویدەکردنەوە ناسرابوو. هەمیشە بەهاوڕێیەکی خۆم داناوە، وەك خۆشم زۆر گونجاو بووم لەگەڵیدا. زۆر هەست بەشانازییەکی گەورە دەکەم کە ئەو شوێنە بەڕێوەدەبەم کە مارکیز سەرۆکایەتی دەکات، کە (کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسی ئەیبیری- ئەمریکی- نوێ)یە.

سەرەڕای ئەوەی من زۆر سەرسامم بەڕۆمانەکانی، بەڵام من بۆ خۆم هەستدەکەم مەزنیی (مارکیز) لە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونە ڕۆژنامەنووسییەکانییەوە سەرچاوەی گرتووەو بەڕای من ڕۆمانەکانی لە دەقە ڕۆژنامەنووسییەکانییەوە هاتوونەتە بوون. چونکە ئەو بەرهەمانەی بەشێوەی پارچەی هونەریی لەڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاودەکردەوەو دواتریش گەشەی کردو بوون بە پارچەی هونەریی لەخەیاڵ دروستکراو.

ڕدیاردکابسونسکی - نووسەری پۆڵۆنی

### سەرچاوە

بیان - ژمارە (237)، 18ی نۆڤەمبەری 2002.

ئامادەکردنی بۆ عەرەبی/ باسل ئەبوحەمدە.

# خوێندنەوەیەک بۆ پێنج بەرهەمی مارکیز

ئیلیزابیس گراف ریمارم

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد










### خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرادا

ڕۆمانی "خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرادا" لە ساڵی 1985 چاپکراوە. لەم ڕۆمانەدا سێ کارەکتەری سەرەکی هەن لە چیرۆکی خۆشەویستییەکی نائاساییدا دەژین. کاتێک دوکتۆر جوڤینال ئوربینوی مێردی خاتوو فیرمینا دازا لە تەمەنی 81 ساڵیدا دەمرێت و کاتێك پێکەوە ژیانیان بۆ ماوەی پتر لە پەنجا ساڵ کۆتایی پێدێت، فلۆرینتینۆ ئەریزای کوڕە عاشق دەردەکەوێت، ئەو کوڕە عاشقەی پەنجا ساڵ لەمەوبەر فیرمینا دازای خۆشدەویست بەڵام فیرمینا ئەوی ڕەتکردەوە، لە دوای پتر لە پەنجا ساڵ فلۆرینتینۆ دێت تا جارێکی تر بەڵێنی وەفاو ئەوینی هەمیشەیی پێ بدات، بەڵام فیرمینای بێوەژن دەریدەکات، بەمجۆرە بەشی یەکەمی ڕۆمانەکە تەواو دەبێت کە لە شەش بەش پێك دێت و لەو شەش بەشەدا ژیانی هەرسێ کارەکتەرەکە بەهێنانەوەی ڕابردوو و لەمیانی گێڕانەوەی ڕابردوودا باس دەکرێت.

فلۆرینتینۆ ئەریزای عاشق بۆ ماوەی پەنجاویەك ساڵ و نۆ مانگ و چوار ڕۆژ چاوەڕێی

ئەو دەرفەتەی دەکرد تا جارێکی تر بە فیرمینا دازا بگات. ئەوسای فلۆرینتنیۆ گەنج بوو، کەوتە نێو داوی عەشقێکی هەتاهەتایی فیرمیناوە، فیرمینا لەو کاتانەدا قوتابی بوو وا پێدەچوو ئەویش هەمان هەستی فلۆرینتینۆی هەبێت بە تایبەتی دوای ئەوەی سەدان نامەی دڵداری و پڕ لە ئەوینی رۆمانسییانەی لە فلۆرینتینۆوە پێدەگەیشت. دواتر فلۆرینتنیۆ دەچێتە خوازبێنی، بەڵام باوکی فیرمینا ڕازی نابێت کچەکەی بدات بە کرێکارێکی هەژار کە لە فەرمانگەی تیلیگرافدا کار دەکات. ئەم باوکە کچەکەی لەو شارە دووردەخاتەوە و لە گەشتێکدا کە ساڵ و نیوێك دەخایەنێت، دەیبات بۆ لای خزم و کەسوکاری، بەڵام پەیوەندیی فلۆرینتنیۆ و فیرمینا بە نهێنی و لە ڕێگەی سێنتەرەکانی تیلیگرافەوە بەردەوام دەبێت. پاش ئەوەی فیرمینا دەگەڕێتەوە، لە یەکەمین دیداریدا لەگەڵ فلۆرینتینۆ، بۆی دەردەکەوێت ئەم خۆشەویستییەی بۆ ئەو کوڕە گەنجە جگە لە وەهم و درۆ شتێکی تر نییە، پاشان فلۆرینتینۆ ڕەت دەکاتەوە. دواتر یەکێك لە سەرنجڕاکێشترین لاوانی شار، واتە دکتۆر ئۆربینۆ کە گەنجێکی ڕێزدار و خۆشەویستە لەلای خەڵك، دێتە خوازبێنی فیرمینا، ئەویش بەرەزامەندیی باوکی شووی پێدەکات بێئەوەی خۆشیبوێت. لە ماوەی پەنجا ساڵی ژیانی هاوبەشدا فیرميناو مێردە دکتۆرەکەی جۆرێك لە خۆشەویستی دەژیان کە هەردووکیان لە زۆربەی ئاهەنگ و دانیشتنە تایبەتییەکاندا داکۆکییان لە "خۆشەویستی ڕامکراو" دەکرد. هەر لەو ماوەیەدا فلۆرینتینۆی عاشقی دۆڕاو دەبێت بە بەڕێوەبەری "کۆمپانیای کاریبی بۆ گواستنەوەی دەریایی"، وەك "دۆن جوان"ێکی لێزان دەژیا و لەگەڵ ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ئافرەتدا پەیوەندیی بەست، بەڵام هەمیشە تەنها بوو و بڕیاری دابوو دڵسۆزی فیرمینابێت، ئامانجی لە ژیاندا ئەوەبوو بەورەیەکی بەهێزەوە لە ژیاندا بمێنێت و تەندروستیی باش بێت تا ڕۆژێ لە ڕۆژان بە فیرمینا بگات، ئەو لە پێناوی خۆشەویستیدا لە جەنگێکدا بوو دژی مەرگ.

ئەوینی تازەی فلۆرینتینۆ بۆ فیرمینا ئۆربینۆی بێوەژن لە میانی ئەو سەد و چل نامەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە فیرمینا وەڵامی نەدانەوە، لەو نامانەدا دڵنەوایی ئەو تەنهاییەی دەکات کە لە پاش ساڵانێکی دوورودرێژی شووکردن دوچاری ببوو، بێئەوەی لاپەڕەکانی رابردوو هەڵبداتەوە. کاتێکیش لە نزیکەوە یەکتردەناسن و دیدەنیی یەکتر دەکەن، دواجار سەردانی هەفتانەی فلۆرینتینۆ دەبێتە شوێنی بیرکردنەوەی بەردەوامی فیرمینا. ئەگەرچی کوڕەکانی هەوڵدەدەن واز لەو پەیوەندییە نائاساییە بهێنێت کە شایانی تەمەن و سومعەی ئەو نییە، کە چی فیرمینا لە پێناوی ئەو ئەوینە نوێیەدا تێدەکۆشێت و داکۆکی لێدەکات. پاشان فیرمینا و فلۆرینتینۆ بە درێژایی دەریای مجدلینا گەشتێکی دەریایی دوورودرێژ دەکەن و لە پەیوەندییەکی خۆشەویستیدا پرۆسەی سێکسی دەکەن، دەبن بە ژن و مێرد و گەشتی دەریایی و مانگی هەنگوینی دەیانبەنە نێو جەوهەری خۆشەویستییەوە و ڕاستەوخۆ و بەبێ ڕێگەی پێچاوپێچ کرۆکی ئەوین دەناسن. بۆ ئەوەی لە دەستی ئەو واقیعە ڕەتکراوە هەڵبێن، ئاڵایەکی زەردی ڕشانەوە لەسەر کەشتییەکە هەڵدەکرێ و فلۆرینتینۆ فەرمان بە کاپتنی کەشتییەکە دەدات بەردەوام دەریا ببڕێت، کاتێکیش کاپتن لێی دەپرسێت تاکەی ئەم گەشتە و ئەم هاتوچۆیە بەردەوام دەبێت، فلۆرینتینۆ ئازایانە وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: تا کۆتایی ژیان.

تیمەی سەرەکیی ڕۆمانی "خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرادا" لە ڕستەیەکدا کۆدەبێتەوە: "لەم جیهانەدا هیچ شتێك لە خۆشەویستی زەحمەت تر نییە" دەشێت ئەم ڕستەیە وەك دروشمی ڕۆمانەکە بخرێتە ڕوو. لێرەدا مەبەست لە گەوهەری

ئەوین و خۆشەویستییە، واتە خۆشەویستی و تێپەڕبوونی ساڵانی تەمەن و فەنابوون. ژینگەی سیاسی و مێژوویی ئەم رۆمانە نزیکەی سەدەیەك دەگرێتەوە بێئەوەی باسی جەنگە جیهانییەکان و ئەو جەنگە نێوخۆییە بکات کە لە ناوچەی کاریبیدا بەردەوام بووە و ڕۆڵێکی گرنگیان لە رۆمان و چیرۆکەکانی مارکیزدا بینیوە. ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە لەودیوی زەمەنی واقیعی شاری کاریبیدا روودەدات بەتایبەتی لە کەنارەکانی روباری مجدلینا، مارکیز لەم رۆمانەدا دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی تەقلیدیی گێڕانەوە لە میانی ئەو گۆشانەوە کە پەیوەستن بە چیرۆکبێژێکەوە هەموو شتێك دەزانێت، ئەم شێوازە کۆنەی گێڕانەوە لە چیرۆکێکی خۆشەویستیی سەرنجڕاکێشی لەو چەشنەدا، دەبێتە چێژێکی گەورەی راستەقینە بۆ خوێنەرانی شێوازی کۆنی رۆمان.

### کەس نییە نامە بۆ کۆلۆنێل بنووسێت

ئەم کورتە رۆمانە یاخود ئەم نۆڤلێتە لە ساڵی 1958 لە گۆڤاری میتۆ *Mito* دا بڵاوکرایەوە. تەنها لە ساڵی 1961دا وەك کتێبێکی سەربەخۆ چاپکرا. ئەم نۆڤلێتە لە بنەڕەتدا بابەتی رۆمانی "لە ساتەوەختێکی شوومدا" بوو کە لە ساڵی 1962 دا چاپکرا. بەڵام مارکیز ویستی ئەو تێکستە لە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپ بکات.

ئەم نۆڤلێتە چیرۆکی کۆلۆنێلێك دەگێڕێتەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەم و لە کۆتایی دواجەنگی ناوخۆی کۆلۆمبیادا رووبەڕووی بێکارییەکی کوشندە دەبێتەوە. ئەم رۆمانە بەشێوەیەکی چڕوکورت و بەبێ خەیاڵێکی شیعریی، بەسەرهاتی کۆلۆنێلێکی خانەنشین دەگێڕێتەوە کە پێشتر لەناوچەی ماکاندۆ بەرپرسی دارایی شۆڕش بووە، ئەم کۆلۆنێلە خانەنشین کراوە، بۆ ماوەی پتر لە پەنجا و شەش ساڵ چاوەڕێی موچەی خانەنشینی دەکات کە بۆ جەنگاوەرە دێرینەکان بڕاوەتەوە، هەموو رۆژانێکی هەینی لە دەربەندی شارەکەیاندا چاوەڕێی گەیشتنی پۆست دەکات و ئەم حاڵەتە بەردەوام دوچاری بێئومێدیی دەکات، چونکە هیچ جارێك پۆستەچییەکە نامەی بۆ ئەو پێ نییە، فەرمانبەری پۆست بەنەغمەیەکی بریندارکەرەوە پێی دەڵێ: "کەس نییە نامە بۆ کۆلۆنێل بنووسێت".

کۆلۆنێل هیچ موڵك و سامانێکی بۆ نەمایەوە تەنها ئەو کەڵەشێرە شەڕکەرە نەبێت کە یادگاریی ئۆگستینی کوڕی بوو کە بەر لە نۆ مانگ درایە بەر رێژنەی گوللە و کوژرا، لەبەرئەوەی لەبەرەی ئۆپۆزیسیۆندا بوو و بەیاننامەی لە دژی حکومەتی سەربازی بڵاوکردەوە. برسێتی و هەژاری وا لە کۆلۆنێل و ژنەکەی – کە دوچاری تەنگەنەفەسی ببوو – دەکات دواجار کەڵەشێرەکەیش بفرۆشن. هەر کە کۆلۆنێل پێشەکیی پارەکە لە کریارەکە وەردەگرێت، رۆمانەکە دەچێتە قۆناغی وەرچەرخانێکی گەورەوە، هاوڕێیانی ئۆگستین کە دوکانی بەرگدروویەك دەکەن بە سەرەتای دروستکردنی ئۆپۆزیسیۆنێکی ناشەرعی لە گوندەکەدا، کەڵەشێرەکە بۆ خولێکی شەڕکردن ئامادەدەکەن، لە ساتەوەختی شەڕەکەڵەشێردا کۆلۆنێل بە هەست و حەماسی گەنجێکەوە تێکەڵی ئەو دیمەنە دەبێت، ئەو کەڵەشێرەی هەموو کەڵەشێرەکانی تر دەبەزێنێ، دەبێتە هێمای هاوکاری و ئۆپۆزیسیۆنێکی کاریگەر. کاتێکیش کۆلۆنێل جارێکی تر کەڵەشێرەکە دەباتەوە بۆ ماڵەوە، هەست دەکات "پێشتر بوونەوەرێکی پڕ لە ژیانی لە نێو دەستەکانیدا هەڵنەگرتووە"، ژنەکەی بە پلارێکەوە پێی دەڵێ "مرۆڤ لەسەر وەهم ناژی" و چۆن دەشێت لەبری نان وەهم بخۆین. کۆلۆنێل دەڵێ "بەڵام وەهم دەبێتە خۆراك و ئیرادەمان دەرخوارد دەدات"، ئەم قسەیە لە کاتێکدا دەکات کە



حەماسێکی زۆری بۆ سەرکەوتنی کەڵەشێرەکەی هەیە و ئامادەیە پیسایی و پاشەڕۆك بخوات نەك لە پێناوی نانداکەڵەشێرەکە بفرۆشێت.

رۆمانی "کەس نییە نامە بۆ کۆلۆنێل بنووسێت" بە مانا تەقلیدییەکەی رۆمانێکی سیاسی نییە، بەڵام دەچێتە سەر باسی پێشێلکارییە کۆمەڵایەتییەکان و داپڵۆسینی سیاسی و سانسۆر و بەکارهێنانی توندوتیژی دژ بە ئۆپۆزیسیۆن. مارکیز لە یەکێ لە چاوپێکەوتنەکانیدا لە بارەی هەندێ لە کارە سەرەتاییەکانی، دەڵێ کارەکتەری کۆلۆنێل و رۆمانەکە جۆرێك لە ئەدەبی ئامانجدار پێکدەهێنێت و وێنەیەك پێشکەش دەکات تا ئەندازەیەك سەر بە واقیعێکی راستەقینەیە، واتە سەر بەو کتێبانەیە کە لەگەڵ دوا لاپەڕەدا کۆتاییان پێ دێت.

ئەم رەهەندە پەیوەستە بە ئامادەنەبوونی رەهەندی ئەفسانەیی، ئەو ئەفسانەیەی دواتر بایەخێکی زۆری لە کارەکانی مارکیزدا دەبێت بەتایبەتی لە رۆمانی "سەد ساڵ لە تەنیاییدا" 1967. بەڵام ئەو رەواجە زۆرەی نۆڤلێتی "کەس نییە نامە بۆ کۆلۆنێل بنووسێت" لە ئەمریکای لاتیندا هەیەتی، دەگەڕێتەوە بۆ بایەخدانی ئیستاتیکیانەی مارکیز بە واقیعی هەستپێکراو و بینراو، ئەمە لە داڕشتنی زمانەوانی و گێڕانەوەییشدا ڕەنگدەداتەوە.

## چیرۆکی مەرگێکی راگەیەنراو

ئەم ڕۆمانە لە ساڵی 1981دا دەرچووە. مارکیز لە ساڵی 1973دا لە پاش کودەتا سەربازییەکەی چیلی، وەك ناڕەزاییەك بەرامبەر بەو کودەتایە، رایگەیاند کە چیتر هیچ کارێکی ئەدەبی چاپ ناکات تا جەنەراڵ بینوشیە لە حوکمدا بێت. بەڵام مارکیز دواتر بەڕێگەیەکی جوان و سەرنجڕاکێش کۆتایی بەو پرۆتێستۆیە هێناو ئەم رۆمانەی دەرکرد کە یەك ملیۆن دانەی لێ چاپکراو هەر هەمووویشی فرۆشرا.

"ئەو رۆژەی هەردوو برا، پیدرۆ و پابلۆ فیکاریۆ، ویستیان سانتیاگۆ نازار بکوژن، سانتیاگۆ بەیانی زوو کاتژمێر پێنج و نیو لە خەو هەستا تا چاوەڕێی ئەو کەشتییە بکات کە قەشەکەی تێدایە". بەم چەند وشەیە ئەو رۆمانە کورت و وروژێنەرە دەست پێدەکات. شانۆی ڕووداوی تاوانی "مەرگێکی راگەیەنراو" یەکێکە لە گوندەکانی سەر دەریای ناوچەی کاریبی، ئەمە هەر هەمان ئەو گوندەیە کە پێشتر لە رۆمانەکانی مارکیزدا باسکراوە. زەمەنی رۆمانەکە سەعات ونیوێکە، واتە لە کاتژمێر پێنج و نیوی بەیانییەوە تا چرکەساتی تاوانەکە لە حەوتی بەیانیدا، سەرانسەری گوندەکە دەیانزانی پلانێك بۆ کوشتنی سانتیاگۆ دانراوە. مارکیز لە ڕێگەی گێڕانەوەی تەفاسیلەکان سەرەتاو پاڵنەرەکانی تاوانەکە دەهێنێتە نێو رۆمانەکە.

یەك رۆژ بەر لە تاوانەکە و بەر لەو "دووشەممە شوومە"، ئاهەنگی ژن گواستنەوەی بایاردۆ سان رومان و ئەنجێلا فیکاریو لەلایەن خەڵکی گوندەکەوە بەڕێوەدەچێت. کاتێك بایاردۆی زاوا لە شەوی زاوابووندا بۆی دەردەکەوێت بووکەکە کچ نییە بەڵکو پەردەی کچێنی لەدەست داوە، دەیباتەوە بۆ ماڵی باوکی، دەبوایە ئەنجێلا لە ماڵی باوکیدا دانی بەو مەسەلەیەدا بنایەو ناوی عەشیقەکەی بدرکاندایە، کەچی سانتیاگۆ نازار تاوانبار دەکات بەوەی ئەو کردوویەتی بە ژن، پاشان هەردوو براکە پیدرۆ و پابلۆ دەست دەدەنە خەنجەرەکانیان بۆ کوشتنی سانتیاگۆ تا شەرەفی خوشکەکەیان لەو شورەییە بشۆنەوە. ئەگەرچی خەڵکی گوندەکە کە خۆیان بۆ سەردانی قەشەکە ئامادەکردبوو، لە چواری بەیانییەوە دەیانزانی ئەو دوو برایە چ نیازێکیان هەیە، بەڵام تاوانەکە لەبەردەرگای ماڵی دایکی سانتیاگۆدا تەواو دەبێت، کەسانێکی زۆر





کەم هەوڵیانداوە ئەو تاوانە روونەدات، بەڵام لەبەرچەندین هۆی جیاواز، هەوڵەکانیان مایە پوچ بووە.

چیرۆکبێژ یان گێڕەرەوە بەراناوی کەسی یەکەمی تاك قسە دەکات و یەکێکە لە دانیشتوانی گوندەکە، لە دوای ئەو رووداوە تراژیدییەی لە خەونیدا روودەدات، رۆڵی مێژوونووسی رووداوەکان لەخۆ دەگرێت و پاش تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر رووداوەکەدا قسەی شایەدحاڵەکان کۆدەکاتەوە.

لەگەڵ بوونی هەندێ سیمای رۆمانی پۆلیسی لە "چیرۆکی مەرگێکی راگەیەنراو"دا، بەڵام ئەم رۆمانە بەمانا تەقلیدییەکەی رۆمانێکی پۆلیسی نییە. مێژوونووسی رووداوەکان لەو لێکۆڵەرەوە دەچێت کە بەدوای هێڵەکانی تاوانێکدا دەگەڕێت و تەمومژیی رووداوی تاوانەکەش لەگەڕان بەدوای ئەنجامدەرانی یاخود پاڵنەرەکانیدا نییە، بەڵکو لەو خاڵە گرنگەدایە کە تاوانەکە بە بەشداریی سەرجەم دانیشتوانی گوندەکە ئەنجام دەدرێت. واقیعی "چیرۆکی مەرگێکی راگەیەنراو" پەیوەست نییە بە تراژیدیای کوشتنێك، بەڵکو پەیوەستە بە تراژیدیای کلاسیکیی شەرەف، چونکە لە دادگادا بە جۆرێك مامەڵە لەگەڵ تاوانی کوشتنی سانتیاگۆدا دەکرێت وەك ئەوەی "تاوانی کوشتنێکی بە ئەنقەستە بۆ داکۆکیکردنێکی شەرعی لە شەرەف"، هەردوو براکەش پیدرۆ و پابلۆ ئەرکی سەرشانی خۆیان جێبەجێ دەکەن، بەڵام ئەوەی لای ئەم دوو برایە جێی داخە کەسێك هەوڵی نەداوە رێ لەو تاوانە بگرێت ئەگەرچی سانتیاگۆ خەتابارێشە. لەولاتر وادەردەکەوێ (بیاردۆ سان رۆمان)ی زاوا تەنها قوربانییەکی نێو ئەو تراژیدیایەیە چونکە فریودراوە.

بۆ پاراستنی دابونەریتێکی رزیو و ئەخلاقێکی ساختە، سەرانسەری گوندەکە بەرپرسیاریی ئەو تاوانە هەڵدەگرن، لێرەدا فاکتەری باوکسالاری یاخود دەسەڵاتی نێرینە لەناو سیستمی کۆمەڵایەتیی لادێدا بەشێوەیەکی ترسناك دەردەکەوێت، هەروەها ئەو توندوتیژییەی دەشێت دیوێکی تری هەمان ئەو سیستمە بێت و مارکیز ئەم دۆخەی لە رۆمانەکانی پێشووتریشیدا خستۆتە روو، ئەگەرچی کۆتایی ئەم رۆمانە لە رستەی یەکەمیەوە دەزانرێت چییە، بەڵام نووسەر سەرکەوتووبووە لە پێشکەشکردنی چیرۆکێکی ورووژێنەر گەرچی هەندێ سیمای خەیاڵئامێز و پێکەنینهێنەری بۆ زیاد کردووە. مارکیز لەم رۆمانەدا لە شێوازی نووسینی رۆژنامەوانی نزیك دەبێتەوە بێئەوەی سنوورێك بۆ ئازادیی خەیاڵ دابنێت. رۆمانی "چیرۆکی مەرگێکی راگەیەنراو" وەك نووسەر خۆی دانی پیادا دەنێت، چیرۆکێکە بەشێوەیەکی دۆکیومێنتاری و لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانی نووسراوەتەوە بۆ تاوانی کوشتنێکی راستەقینە.

## پرسەی دایە گەورە

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە ساڵی 1962دا چاپکراوە.

لەو کاتەوەی شاکاری "سەد ساڵ لە تەنیاییدا"ی مارکیز دەرچووە، زوربەی رەخنەگران بۆ ئەوە دەچن کە بەرهەمەکانی پێشووی مارکیز هەوڵێکە یان خۆ ئامادەکردنێکە بۆ نووسینی ئەو شاکارە مەزنە، واتە رۆمانی سەد ساڵ لە تەنیاییدا، کە بە یەکێك لە کارە مەزنەکانی ئەمریکای لاتینی دادەنرێت. ئەم هەشت چیرۆکەی مارکیز بەشێکن لە کارە زووەکانی ئەو کە پێشکەوتنێك لە رەوتی نووسینیدا پیشان دەدات، هەر یەك لەم چیرۆکانە (جگە لە چیرۆکی پرسەی دایە گەورە) درێژەپێدانی هەمان وەسفی داستانی ماکۆندۆ و هێزە نادیارەکانی کەناری کۆلۆمبیایە، وەسفی شوێن و

ڕووداوەکان بە زمانێکی کورت و چڕ و سەرنجڕاکێش ئەنجام دراوە کە پتر لە شێوازی نووسینی ڕۆژنامەوانی نزیك دەبێتەوە. چیرۆکبێژ یان گێڕەرەوە بەشێوەیەکی تەقلیدی، کەسێکە هەموو شتێك دەزانێت.

چیرۆکی یەکەم "نیوەڕۆی سێشەممە" کە دەشێت باشترین چیرۆکی ئەو کۆمەڵە چیرۆکە بێت، باسی ژنێك و کچەکەی دەکات کە بە شەمەندەفەر گەشتێك دەکەن، جلوبەرگی ڕەشی ماتەمبارییان پۆشیوە، دوای ئەوەی دەگەنە گوندەکە، بە نێو ڕێگە پێچاوپێچەکانیدا دەڕۆن و ئەم گوندە لە نیوەڕۆدا لە گوندێکی مردوو دەچێت، داوا لە قەشەکە دەکەن کلیلی گۆڕستانەکەیان بداتێ تا دایکەکە چەپکە گوڵێك لەسەر گۆڕی کوڕەکەی دابنێت کە بەر لە هەفتەیەك لە کاتی پەلاماردانی یەکێ لە ماڵەکانی گوندەکە کوژراوە. جوانیی ئەم چیرۆکە لە ڕوونییەکەیدایە بێئەوەی شتەکان بە تەواوی ڕوون بکاتەوە و زانیارییەکان بە درێژی بخاتەڕوو، ئەگەرچی بە کورتی ڕاستییەکانی ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە، بەڵام وەسفە دورو درێژەکانی دەریدەخات دانیشتوانی ئەو گوندە لە چ ژینگەیەکی ناشیرین و دواکەوتوودا دەژین و چ فزولێکی دوژمنکارانەیان هەیە.

لە چیرۆکی "لە ڕۆژێکی ئەم چەند ڕۆژەدا" هەڵکێشانی ددانێك دەبێت بە هەوڵێك بۆ تۆڵەسەندنەوە، پزیشکی ددانی گوندەکە بە قینێکی زۆرەوە ددانێکی کلۆربووی موختارەکە هەڵدەکێشێت کە دەبوو نرخی کوشتنی بیست کەس لە خەڵکی گوندەکە بدات کە لە ژێر ئازاردانیدا گیانیان لە دەستدا.

چیرۆکی "لەم شارەدا دز نییە" بریتییە لە حیکایەتێکی تراژیکۆمیدی و هەروەها چیرۆکێکی زۆر ئاساییشە، دزێك هەڵدەکوتێتە سەر یانەیەکی یاریکردن و دەستکەوتیشی تەنها سێ تۆپی بلیاردە، کەسێکی بیانی کە گومانی ئەو کارەی لێدەکرێت، دەگیرێت و ئیدی دزەکەش هەوڵدەدات هەرسێ تۆپەکە بگەڕێنێتەوە بۆ یانەکە چونکە پەشیمان دەبێتەوە و پێی وایە کارێکی گەمژانەی کردووە، لەو کاتەدا ئەویش دەگیرێت. لە چیرۆکی بالتازاردا، بالتازاری دارتاش جوانترین قەفەسی باڵندە دروست دەکات بۆ کوڕی دوشیب مۆنتێل، بەڵام مۆنتێل ئارەزووی کڕینی ئەو قەفەسەی نییە، دواتر بالتازار بەدیاری قەفەسەکە دەبەخشێت بە کوڕەکەی، سەرانسەری خەڵکی گوندەکەش ئاهەنگێکی بۆ ساز دەکەن چونکە پێیان وایە بالتازار شەست بیزوی لەلایەن مونتێلی دەوڵەمەندەوە دەست کەوتووە. لە چیرۆکی "بێوەژنی مۆنتێل"دا دوشیب دەمرێت و میراتێکی زۆر بۆ ژنەکەی دەمێنێتەوە، ئەو بێوەژنەش هیچ کارلێکێکی لەگەڵ دەرەوەدا نەبووە و تا ئەو ساتەوەختە هیچی نەدەزانی، پاش ئەوەی لە هەموو کارە بازرگانییەکانی مێردەکەیدا مایە پوچ دەبێت و ئیفلاس دەکات، بە هێمنی خۆی بۆ مەرگ ئامادە دەکات.

لە چیرۆکی "ڕۆژێك لە دوای شەممە" ژمارەیەکی زۆری باڵندەی مردوو لە ئاسمانەوە دەکەونە خوارەوە، ڕاهیبە پیرەکە پێی وایە ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت، ئەوسا دەتوانێت ئیمان لەلای خەڵکیدا بە گەشی دابگیرسێنێت و مەوعیزەکانی ژیانی دەست پێبکاتەوە. شوێنی ڕوودانی ئەم چیرۆکە ماکۆندۆیە، ئەو گوندە ئەفسانەییەی لە ڕۆمانی "سەد ساڵ لە تەنیاییدا" شوێنێکی گرنگ داگیردەکات. لە چیرۆکی "گوڵە دەستکردەکان"دا لە پێشبینییەکانی داپیرەی کوێردا ڕووداوەکان بەشێوەیەکی ناڕۆشن نمایش دەکرێن، پوختەی ڕووداوەکەش لە پەیوەندیی ناسەرکەوتووی نێوان ژنێکی گەنج و پیاوێکی تەمومژاویدا تەواو دەبێت.



چیرۆکی "پرسەی دایە گەورە" چیرۆکێکی نائاساییە و پڕیەتی لە ڕووداوی سەیر و سەمەرە و نائاسایی و خەیاڵی. چیرۆکبێژ بەشێوەی ئەو فرۆشیارانەی لە بازاڕدا هاوار دەکەن، بەم شێوەیە چیرۆکەکە دەکاتەوە: "ئەی هەموو ئەو کەسانەی باوەڕ ناکەن، ئەمە حیکایەتی ڕاستەقینەی دایکی گەورەیە، حاکم و دەسەڵاتداری ڕەهای مەملەکەتی ماکۆندۆ، لە پێناوی دەسەڵاتەکەیدا نەوەد و دوو ساڵ ژیا، لە یەکێ لە ڕۆژەکانی سێ شەممەی ئەیلولی رابردوودا، لەوپەڕی پاکیزەییدا گیانی سپارد و پاپاش لە پرسەکەیدا ئامادەبوو". لەوە دەچێ ئەم پاکیزە دیکتاتۆر و خاوەن دەسەڵات و خورافییە ئەلتەرناتیڤی پەتریارکی مارکیز بێت لە ڕۆمانی "پاییزی پاتریارك" 1975.

هەردوو کارەکەش بەوە جیادەکرێنەوە کە بەزیادەڕۆیی خەیاڵی و ڕووداوی سەیر و نائاسایی پڕکراون. دەشێت ئەم شێوازە لە هەردوو شاکارە گەورەکەیدا ببینین: سەد ساڵ لە تەنیایی و پاییزی پاتریارك یان پاییزی باوکسالار. ئەگەرچی لە چیرۆکی "چیرۆکی مەرگێکی ڕاگەیەنراو" 1971 و هەندێ لە چیرۆکەکانی دواتریدا ڕوونییەکی زیاتر بەدی دەکرێت. مارکیز لە دواییدا چیرۆکەکانی پاش (مەرگێکی ڕاگەیەنراو)ی لە دوو بەشدا کۆکردەوە، یەکەمیان بەناوی "چیرۆکی خورافی و خەمهێنەری ئەریندێرای دڵپاك و داپیرە دڵڕەقەکەی" 1971 و دووەمیشیان بەناوی "چاوەکانی سەگێکی بۆر" 1973.

## پاییزی پاتریارك

ئەم ڕۆمانە لە ساڵی 1975دا چاپکراوە و لە دوای ڕۆمانی سەد ساڵ لە تەنیاییدا بە دووەمین گرنگترینی ڕۆمانەکانی مارکیز دادەنرێت، هەروەکو مارکیز خۆیشی دانی بەوەدا ناوە، خوێنەرانی ئەمریکای لاتین ئەم ڕۆمانە بە نموونەیەکی هەرە باشی کارەکانی مارکیز بە زمانی ئیسپانی دەژمێرن. ڕۆمانی پایزی پەتریارك یاخود "پاییزی باوکسالار" سەر بە ژانری ڕۆمانی پیاوە زۆردارەکانە، واتە ئەو ڕۆمانانەی باسی دیکتاتۆر و سەرکردە و پیاوە زۆردارەکان دەکات، گرنگترین نووسەرانی ئەم ژانرەی ڕۆمان لە ئەمریکای لاتینییدا بریتین لە: میگڵ ئەنخل ئەستۆریاس خاوەنی ڕۆمانی "سەرۆکی فەرمانده" – 1964، ئە. کاربینیر خاوەنی ڕۆمانی "هونەری دەسەڵات" – 1974، ئە. ڕواباستۆس لە ڕۆمانی "من توانادارم" 1974.

ئەم بابەتە کۆنە لەلای مارکیز وێنەیەکی هونەریی تایبەتی لەخۆ دەگرێت کە بە شێوەیەکی ناوپۆشکاریی جیاواز دیمەنەکان دادەڕێژێت. لە ڕووی بنیاتی ڕۆمانیشەوە شێوازی بەکارهێنانی "ڕستەی درێژ" بەرجەستە دەکات کە ئەم شێوازە لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ جێمس جۆیس و مارسیل پرۆست. هەر فەسڵێك لە فەسڵەکانی ئەم ڕۆمانە، لە ڕاستیدا، تەنها لەیەك ڕستەی درێژ پێك دێت، بۆیە وا دەردەکەوێت ئەم چیرۆکە یاخود گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە بەشێوەیەکی چڕ و خێرا دەڕوات و خوێنەر دەخاتە هەناسە بڕکێوە. بەڵام لەلایەنی شێوازی ڕۆماندا ژمارەیەکی زۆری دەنگ و بۆچوون و گۆشەنیگا بەکاردەهێنێت کە دەبێتە بەرهەمهێنانی ڕۆمانی فرەدەنگی "پۆلیفۆنی"، ئەو فرە دەنگییە لەیەك دەنگدا کۆ دەبێتەوە کە دەنگی چیرۆکبێژێکی زانراو یاخود ناسراوە و چەندین شایەتی نادیاریش هەن.

هەربەشێك لەو شەش بەشەی ڕۆمانەکە بەکاتی ئێستا دەست پێدەکات، واتە دەسپێکی هەر فەسڵێکی ڕۆمانەکە زەمەنی ئێستایە. "خەڵکی ڕەسەن و سەرەتای یەکێ لە دەوڵەتانی کاریبی کە بۆ ساڵانێکی درێژ لە ژێر سایەی کۆشکێکی ڕوخاوی سەرۆکایەتیدا دەژین، لە پڕ بڕیار دەدەن و



سەرکێشیی چوونە ناو ئەو کۆشکە دەکەن، کۆشکێکی داڕماو و ڕزیو کە ماوەیەکی درێژە بازەکان لەسەری دەنیشنەوە، لەناو کۆشکەکەدا لاشەی رزیوی دیکتاتۆر دەبینن و دوچاری حەپەسان و سەرسووڕمان دەبن و باوەڕناکەن کە دەبینن لاشەکەی بە کەڕوو و بونەوەری قوولآیی دەریاکان داپۆشراوە".

لە ڕێگەی هێنانەوەی رابردوو، ژیانی ئەم دیکتاتۆرە زۆردارە دەگێڕێتەوە کە چۆن لە سەرەتادا گەیشتۆتە دەسەلآت پاش ئەوەی لە تەمەنێکی خورافیدا لە نێوان 107 ساڵی و 232 ساڵیدا مەرگێکی ئاسایی دەمرێت. ئەم دیکتاتۆرە لەلایەن هێزەکانی داگیرکەری بیانی دەکرێت بە سەرۆك، لەو ساوە ئیتر ئەو پیاوە نەخوێندەوارەی لە خێزانێکی هەژاردا پەروەردە بووە، دەسەلآتەکانی خۆی پتەوتر دەکات، لە ڕێگەی کەسێکی ترەوە کە کتومت لە خۆی دەچێت، دەسەلآتی خۆی بەسەر هەموو شتێکدا دەسەپێنێت، کاتێکیش شەبیهەکەی لەلایەن یاخیبوانەوە دەکوژرێت، دیکتاتۆرەکە — کە جارێکی تر دێتەوە ناو ژیان — فەرمان دەدات بە دڕندانەترین شێوە شۆڕشگێڕەکان بکوژن، دواجار بە تەنها و بەبێ پەرلەمان و بەبێ وەزیرەکان حوکم دەگێڕێت، ئەم حوکمە تاك و تەنهایە تا گەڕانەوەی یەکێ لە کلکدارەکان درێژە دەکێشێت، ئەم کلکدارەی ئاسمان پابەندێکی گەورە و راستەوخۆی بە ژیانی دیکتاتۆرەوە هەیە. ئەو کاتەی دەسەلآتێکی ڕەها پەیدا دەکات، پەتریارك کەسانی نەخۆش و گەڕوویی و کوێر و ئیفلیج چاك دەکاتەوە و بە توانایەکی خوداییەوە وا لە درەختەکان دەکات بەربگرن و بە ئاماژەیەکی پەنجەکانی باران دەبارێنێت. ئەگەرچی میللەت قینی لە دەسەلآتی زۆردارانەی پەتریارك دەبێتەوە، بەلآم هاوکات ڕێزیشی لێدەگرێت چونکە کەسایەتییەکی پڕ لە هەیبەتەو ترس و تۆقینی لێدەتکێ.

بەلآم پەتریارك لە پایزی زۆر درێژی تەمەنیدا هێزی دەسەلآتەکەی کۆتایی پێدێت و دواجار خۆی دەبێت بە "دیلی ئەو دەسەلآتە". بۆی دەردەکەوێت دەوڵەت بە تەواوی ئیفلاسی کردووە، ئیدی لە زەلیلیی تەمەنیدا دەست دەکات بە فرۆشتنی هەموو سامانێکی نیشتمانی بە دەرەوەی ولآت، لە کۆتاییشدا کۆمپانیای گرین هۆرنسی دەریای کاریبی دەکات بە چەند بەشێکەوە و هەر بەشێکیش ژمارەیەکی بۆ دادەنێ. دیکتاتۆر لە کۆتاییەکانی ژیانیدا بودجەیەکی مایەپوچ دەژمێرێت و پاشان ئەو ساڵە ئێجگار دوورو درێژانەی بیرناکەوێتەوە کە تیایدا لە لوتکەی دەسەلآت و سەروەریدا بوو. لە کۆتایدا مانویلا سانشیز کە رۆژێ لە رۆژان ئەم دیکتاتۆرە چەپەڵە عاشقی ببوو، ون دەبێت و ژنەکەی و کوڕەکەیشی لەلایەن سەگە دڕەکانەوە، کە لەسەر مرۆڤ کوشتن راهێنراون، پارچە پارچە دەکرێن، ئیدی پەتریارك هیچی بۆ نامێنێتەوە تەنها سوپایەك نەبێت کە لە پێنج هەزار منالی حەوت مانگان پێکهاتووە و هیچ یەکێکیش لەو مندالآنە ناوی ئەمیان هەڵنەگرتووە.

پەتریارکی مارکیز، کە وەکو پێکهاتەیەکی هەموو دیکتاتۆرەکانی ئەمریکای لاتینی تەماشا دەکرێت، لە بنەڕەتدا بریتییە لە کەسایەتییەکی خەمبار کە سۆزی ئەوانی دی دەوروژێنێت، دەشێت مرۆ هیوای ئەوە بخوازێت کە وێنەیەکی قێزەونتر و ناشیرینتری بە دیکتاتۆر ڕەوا ببینیایە، بەلآم تاکە چەکی نووسەر کە بە ڕووی ستەمکاری ناو رۆمانەکەیدا بەرزی دەکاتەوە، بریتییە لە گەمەو گاڵتەجاڕی، هەروەها خەیاڵی زیادەڕۆیی و نامۆگەرایی سەیر و سەمەرەی کەسایەتیی دیکتاتۆر کە دەیکات بە کەسایەتییەکی کاریکاتۆری و زۆردارێکی زەلیل و دیکتاتۆرێکی ناشارەزا.

لە میانی کەسایەتییەکانی دیکتاتۆرەوە مارکیز هەوڵدەدات جەوهەری دەسەلآت بناسێت و

لە کرۆکی دەسەڵات تێبگات کە لەم تێگەیشتنەدا دەسەڵات بریتییە لە بەدیهێنانێکی بڵند و فرە ئاستی کەینونەی مرۆڤایەتی، ئەم چەشنە دەسەڵاتە مەزنێتی دیکتاتۆر یاخود نهێنیی مەینەتییەکانی دەردەخات. رۆمانی "پاییزی پەتریارک" یاخود "پاییزی باوکسالار" بەشداریکردنێکی ترە لەو بابەتە گەورەیەدا کە فۆرمی زۆربەی هەرە زۆری کارەکانی ئەم نووسەرە کۆلۆمبییە دەتەنێت، ئەو بابەتە گەورەیەش بریتییە لە: بابەتی تەنهایی، کە لێرەدا "تەنهایی دەسەڵات"ە.

**سەرچاوە**

گۆڤاری (فکر و نقد) ژمارە (60).

# خوێندنەوەیەک بۆ ڕۆمانە نوێیەکەی مارکیز

## (یادەوەری سۆزانییە خەمبارەکانم)

لە عەرەبییەوە: شیرین .ك



(لەنەوەد ساڵیمدا حەزمکرد شەوێك لەخۆشەویستی شێتانە لەگەڵ کچە هەرزەکارێکدا بکەمە دیاری بۆ خۆم) ئەمە دەبێتە خولیای پاڵەوانی ڕۆمانە نوێیەکەی مارکیز (یادەوەری سۆزانییە خەمبارەکانم) کە بەم دواییانە لەلایەن خانەی (المدى)وە لەدیمەشق دەرچووەو صالح علمانی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەر ئەو خولیا سەیرە دەسنیشانی ڕێڕەوی ئەو ڕۆمانە قەوارە بچووکە دەکات کە هەمووی (104) لاپەڕەیەو ئیشتیهای راوی دەکاتەوە تا دەفتەرەکانی یادەوەری خۆی هەڵبداتەوەو ئەو لاپەڕانە بەسەر بکاتەوە کە چیرۆکی خۆی و سۆزانییەکان دەگێڕێتەوە لەسەردەمی هەرزەکاری و لاوێتییەوە تا دەگاتە ئەو کاتەی تەمەنی دەبێت بەنەوەد ساڵ، واتە سەردەمی گێڕانەوەی ڕۆمانەکە. کە ئەو ئارەزووەش جێبەجێ دەبێت، ئەمە راوی–پاڵەوان لەبەرزایی سەدەیەکی تەواوەوە بەرەو کەوتنە ناو تۆڕی خۆشەویستییەك پەلکێش دەکات کە زۆر درەنگ هاتووە، ئەو پیرەمێردە نەوەد ساڵەیە کە تازە بەتازە عاشق بووە هەمیشە لەو باوەڕەدا بوو

کە گوزارەی (لەخۆشەویستیا مردن) هیچ نییە جگە (لەزەرورەتێکی شیعریی) نەبێ و لەواقیعدا هیچ ناگەیەنێ، ئەو کە هەموو ژیانی بەتەنیا بردۆتە سەرو هەموو چێژێکی ژیانی تاقی کردۆتەوە، بەپارە لەگەڵ چەندان سۆزانیدا سێکسی کردووە (تا تەمەنی پەنجا ساڵیم ژمارەیان گەیشتە پێنج سەدو چواردە ژن)، بەڵام هیچیان بەگەرموگوڕی و خۆشەویستییەوە لەگەڵیدا نەچووەتە پێخەفی هاوسەرێتییەوە (سۆزانییەکان بواریان نەدام ژن بهێنم) بەمجۆرە بیانوو دەهێنێتەوە، تا دواجار دەگاتە قەناعەتێکی درەنگوەخت کە یەکێك لەسۆزانییە خەمگینەکانی پێی رادەگەیەنێت (هیچ مەینەتییەك لەوە خراپتر نییە کە پیاو بەتەنیا بمرێ).

سەرەڕای قورسی جێبەجێکردنی ئەو داواکارییە بۆ رۆسا کارباکاس کە بەناوبانگترین (قوادە)بووە، خاوەنی ئەو ماڵە نهێنییەش بووە کە لەو جۆرە هەوەسانە بۆ مشتەرییە بەناوبانگەکانی دەستەبەر دەکات، رەخنە لەو بیرۆکەیەی کابرای نەوەد ساڵە دەگرێ و گلەیی لەو داواکارییە کتوپڕو بەپەلەیەی دەکات، کەچی کابرا لەوەڵامدا دەڵێ: (ئیلهام پێشوەخت ئاگادارکردنەوە نادا). کارباکاس چەندین پەیوەندی دەکات و ئەو شارەزاییە زۆرەی هەیەتی دەیخاتەگەڕ تا کچێك بدۆزێتەوە تەمەنی لەچواردە ساڵ تێنەپەڕی بێ، بۆ ئەو پیرەمێردەی کە بەپەشۆکاوی دەگاتە ئەوێ و دەچێتە ئەو ژوورەی کچەکەی تیا خەوتووەو دوای ماندوێتی زۆری رۆژانەو بێهۆشیشکراوە، پیرەمێردەکە بست بەبست کچە رووتە خەوتووەکە دەپشکنێ، گۆرانی خۆشی بۆ دەڵێ و بە (دیلگادینا) لەگەڵی ئەدوێ، شەوێکی جیاواز دەژی و تیایدا چێژێکی باوەڕپێنەکراو ئەدۆزێتەوە لەئەنجامی تێڕامان لەجەستەی مێینەیەکی خەوتوو بێئەوەی شەهوەت یا شەرم رێگر بێ، دوای ئەو ئەزموونە بۆی دەرئەکەوێ کە (سێکس ئەو دڵدانەوەیەیە کە مرۆ پەنای دەباتە بەر ئەو کاتەی خۆشەویستی دەست ناکەوێت).

کەواتە ئەو ئارەزووەی بەتەنیا هەوەسێك نییە، بەڵکو خولیاو تاسەیەکی نادیارە بۆ هەستکردن بەشتێك کە قەت بەخۆیەوە نەدیوە، ئەو پیاوەی نەوەد ساڵی لەکۆڵ ناوەو نایەوێ ئەو جوانییە خەوتووە بەخەبەر بهێنێت، بەڵکو لەبەرزی و نزمییەکانی ئەو جەستە گەش و پاراوە ورد دەبێتەوە بەنیگا ترساوە پڕ ئارەزووەکانی لەئەدگارەکانی رادەمێنێ، راڤەی ئەو جەستە رووتە دەکات، راڤەیەکی رۆحی کە ئارامی و شادی و خۆشەویستی بەتەنیا لەڕێی بینینەوە پێدەبەخشێ، هەنووکە بەپێچەوانەی ئەو ژیانە پڕ ژاوەژاوەی کە تێپەڕی قەناعەت بەوە دەهێنێ گوێ بۆ ناڵەکانی دڵ و ئاماژەکانی رۆح بگرێ، لەشەپۆلەکانی جەستەدا قوڵبێتەوە، ئەمە دەمانباتەوە سەر رۆمانەکەی رۆماننووسی ژاپۆنی (یاسۆ ناری کاوباتا) (ماڵی کچە جوانە خەوتووەکان) کە مارکیز بەجوانترین رۆمانی دادەنێ و ئاواتەخوازە خۆی بینووسیایە، سەدای ئەو خۆزگەیەی مارکیز لەم رۆمانەدا دەبینین کاتێ کە ئیلهام لەکەش و هەوای ئەو رۆمانە وەردەگرێ، ئەو رۆمانە ژاپۆنییە باسی چیرۆکی ماڵێکی سەیر دەکات لەکەنارەکانی شاری تۆکیۆ، بۆرژواکان هامشۆی دەکەن و پارەیەکی زۆر ئەدەن تا چێژ لەپاکترین شێوەی دوایین خۆشەویستی وەرگرن، واتە بەسەربردنی شەوێکی تەواو لەتێڕامان لەو کچە لاوانە کە جوانترین کچانی شارن و لەتەنیشتیانەوە بەڕووتی و بەنج کراوی لەسەر پێخەفەکەیان راکشاون، ئەو پیاوانە ماڤی ئەوەیان نیە نەدەستیان تێوەبدەن، نەخەبەریان بکەنەوە، بەهەرحاڵ ئەوانە هەوڵنادەن شتی وا بکەن ئەوەندەیان بەسە (کە لەتەنیشتیانەوە خەو ببینن). کاتێ ئەو پیرەمێردانە دەچنە ماڵی کچە خەوتووەکان ئەم مەرجانەیان بۆ دەخوێننەوە: نابێ



هیچ کارێ بکەن کە دژی زەوقە، ژنەی خاوەنی ئوتێلەکە وا بە (ئیگۆشی) پیرەمێرد دەڵێ: نابێ پەنجەت بخەیتە دەمی کچە خەوتووەکەوە یان هەوڵبدەی هەر شتێك بکەی لەو بابەتە.

مارکیز هەمان ئەزموونی ئەو رۆمانە، بەڵام بەشێوەیەکی تر ژیاوە، لەگەشتێکیدا بۆ نیویۆرك بەفڕۆکە بەسەر زەریادا کچێکی ژاپۆنی لەتەنیشتییەوە دەبێ (جوانترین ئافرەت بووە لەژیانمدا بیبینم) وەکو مارکیز دەڵێ، لەو گەشتەدا لەلایەك چێژی لەجوانی کچەکەو لەلایەکی تریشەوە لەخوێندنەوەی رۆمانەکە وەرگرتووە، کاتێ لەفڕۆکەکە دادەبەزێ و تازە بەتازە لەخوێندنەوەی رۆمانەکە بۆتەوە بەبۆن و بەرامەی کچە خەوتووەکەو رۆمانەکە نیمچە بەنج کراو دەبێ، بەهێمنی و بەکورتی وەڵامی پرسیارەکانی لێپرسراوانی فڕۆکەخانەکە دەداتەوە کاتێ لێی دەپرسن چ کارەیت دەڵێ (رۆماننووسێکی ژاپۆنی) هەر وەکو ئەوەی ورێنە بەخۆزگەیەکەوە بکات کە بەدواخراوی دەمێنێتەوە تا لەم دوایین رۆمانەیدا بەرجەستە دەبێ.

پاڵەوانی رۆمانەکەی مارکیز پیاوێکی نەوەد ساڵە، ناوی نییە بەڕەچەڵەك ئەچێتەوە سەر خێزانێکی ئوروستوکراتی، هیچ کارێکی نەکردووە جگە لەنووسین نەبێ، لەگۆشەگیرییەکی تەواودا دەژی لەخانوویەکدا لەسەر تەرزی کۆڵۆنیاڵی دروستکراوە لەنێو کتێب و مۆسیقادا، هەموو پەیوەندییەکانی بەو دنیایەوە لەو وتارە هەفتانەیەدا خۆی دەبینێتەوە کە بۆ رۆژنامەی شارەکەی دەنووسێ، هەروەها (دامیانا)ی کارەکەری کە هەوەسەکانی لاوێتی پاڵەوانی تەحەمووڵ کردووەو لەخەونی خۆشەویستییەکی بێدەنگدا بۆ سەروەرە کەمتەرخەمەکەی ژیاوە، بەم مانایە رۆمانەکە لاواندنەوەیەکە بۆ تەمەنێکی دووروودرێژو نوقووم بوو لەگەشاوەیی لاوێتییەکی سەرکێشداو پیرێتیەك بەنادیاری چاوەڕوانی مەرگ دەکات، رۆمانەکە پیرێتی ئەو پیاوە دەلاوێنێ کە لەهەموو شتێك زیاتر لەگۆڕەوە نزیکە تا لەژیانەوە، بەڵام رۆمانەکە ئەو پیاوە دەخاتە نێو ئەزموونێکەوە کە زۆر کەم پیرێك لەو تەمەنەدا تێی دەکەوێ ئەویش بەئاگا هێنانەوەیەتی بۆ ئەوەی کە پاڵنەری خۆشەویستی بەهێزترە لەوەی کە مەرگ شتێکی بەڵگەنەویستە، ئەمەش هێمایە بۆئەوەی کە جەستە پیر دەبێ، دەپوکێتەوە، دادەکەوێ، بەڵام ئەو نەفسەی کە هەموو بەیانیەکی نوێ بەچێژێکی زیاترەوە ئارەزوو دەکا دەست لەملی ژیان بکات، پیر نابێت، مەسەلەکە لای پاڵەوانەکەی مارکیز پەیوەندی بەو گوتەیەوە نییە (خۆزگە رۆژێ لەڕۆژان لاوێتی دەگەڕایەوە) بەقەد ئەوەی پەیوەندی بەڕووداني موعجیزەی خۆشەویستییەوە هەیە لەوپەڕی پیرێتیدا کە بەهێمنی چاوەڕوانی مەرگ دەکات و چاوی لەگیانکێشانێکی شادە پاش ئەوەی ئەزموونی (لەخۆشەویستیا مردن) ژیا.

مارکیز لەم رۆمانە نوێیەدا رەخنە لەکۆمەڵگای نێرایەتی دەگرێ لەمیانەی تیشك خستنە سەر ئەو ژنانەی لەخانەی خوارەوەی کۆمەڵگەدا دەژین وەکو سۆزانییەکان و کارەکەرەکان، بەڵام مارکیز لەپەراوێزی ژیانەوە هەڵیاندەگرێ و دەیانخاتە ناو مەتنی گێڕانەوەکەوە هەروەکو ئەوەی لەو کۆت و پێوەندە جۆراوجۆرانە رزگاریان بکات بەرەو فەزای ئازادی لەسەر لاپەڕەکانی رۆمانەکە، مارکیز کاتێ گوزارشت لەو هەڵوێستە لایەنگرانەیەی خۆی دەکات بۆ سۆزانییە خەمبارەکانی، مەودای دەسەڵات و زاڵبوونی ئەدەبەکەی خۆی دەزانێ بەسەر خوێنەردا لەڕۆژهەڵات و رۆژئاوادا سۆزانیەکانی بەو شێوەیە وەردەگیرێ کە مارکیز دەیەوێ و هەموو قەدەغەکان دەبەزێنێ، ئەو قەدەغانەی بەچاوی گومان و رقەوە سەیری ئەو توێژە لەژنان دەکەن.

لەڕۆمانەکــــەدا ئـــەو ژنانـــە دەناســـین کـــە کاریگـەرییان لەسـەر ژیانی پاڵەوانەکە جێهێشـتووە لەوانـە: دایکـی، فلۆرنیـای جـوان کـە بـەوە ناسـراوە حـەزی لەمۆسـیقایە، دامیانـا، ئـەو کارەکـەرەی رازی نـەبوو لەبەرامبـەر چاکەکانی خۆیـدا بـۆ پاڵەوانەکـە هـیچ کرێیـەك وەرگـریٚ لێـی، کسـیمینا ئـەو ژنـەی هـۆگری بـوو و بڕیاریـدا بیهێنێ کەچی لەدواسـاتدا رووزەردی کردو وازی لێهێناو نەیهێنا، کاسیلدا ئەو سـ‌ـۆزانییە پـــیرەی زۆری لـــیٚ قبـــووڵ دەکـــرد لەبەرئـەوەی مشـتەریەکی دڵسـۆزو بـەردەوام بـوو، هـەروەها رۆسـا کارباکـاس خـاوەنی مەیخانەکـە کـە لەگەڵیدا رێککەوتووە لەسەر ئەوەی هـەموو هـەوەس و ئارەزووەکـانی بـــۆ جێبـــەجیٚ بکـــات لـــەپێش هەمووشـیانەوە (دیلیگادینـا)ی جـوان و پـاکیزەو خەوتوو کە هەموو چەمکەکانی پاڵەوانەکە دەگۆڕیٚ و دەیخاتـــــە نێـــــو داوە فریودەرەکـــــانی خۆشەویستییەوە دوای ئەوەی سەری سپی بووە.

ئەو لایەنگیریـەی مارکیز بۆ ژنە چەوساوەکان هەیـەتی رەگەکـەی بـۆ سـالآنی دووری سـەردەمی منـاڵی خـۆی دەگەڕێتـەوە لەیادەوەرییەکانیـدا (بـۆ ئـــەوەی بگێڕمـــەوە ژیـــام) دان بـــەوەدا دەنـــیٚ کـــە لەجەوهـــەری شـــێوازی ژیـــان و بیرکردنەوەیـــدا قـــەرزاربارى ژنـــانی خێزانەکـــەی و ئـــەو ژنـــە کارەکەرانەیـــە کـــە لەمناڵیـــدا خزمـــەتیان کـــردووە لەشارۆچـکەکەی خۆیـدا (ئاراکاتاکـا لـەباکووری کۆلۆمبیـا کـە سـاڵی 1927 لـەدایکبووە) مـارکیز دەڵـیٚ: ئـەو ژنانـە کەسـێتیەکی بـەهێزو دڵێکـی میهرەبانیـان هـەبوو و بەشـێوەیەکی خۆڕسـکانەی بەهەشتێکی سەر زەوی رەفتاریان لەگەڵدا دەکردم، لەبەرئـەوە هەنووکـە مـارکیز چـاکەیان دەداتـەوە، سۆزانییەکانی لەدۆزەخی سەر زەمینـەوە دەهێنێتـە نێـو بەهەشـتی نووسـینەوە، هەرچـەندە مـارکیز لەگێڕانەوەدا زیادەڕۆیی دەکات وەکو بۆ ئەوە (ژیا بـیٚ تـا بیگێڕێتـەوە) هـەرواش یادەوەرییـەکانی نـاونووس کـردووە، بـەڵام لێـرەدا سـوورە لەسـەر کورتکردنـەوە هـەروەکو ئـەوەی بترسـیٚ گەنجینـەی زەمانەکـەی وشك بکات، خـۆی لـەزۆر بڵێیـی بـەدوور دەگریٚ و زۆر بەچڕی و بەلاغەتـەوە دەنووسـیٚ ئـیتر وەکـو وەسـف بـیٚ یـان گێڕانـەوەی رووداوەکـان هـەروەها دیالۆگـەکان کـورتن هـەروەکو تیشـکێکی خێـــرا و بـــەئاماژەن و بـــەڕاناوی کەســـی یەکـــەم حیکایەتەکـە دەگێڕێتـەوە، بـەڵام وەکـو راوییـەکی رووناکبیر قسـەکانی دەباتـەوە سـەر باسـی کتێـب و دیوانە شیعرو فەرهـەنگ کە هـەموو ئەمانـە خۆراکی ژیانی بوون.

ئـەم کـارە نوێیـەی هەرچییەکی تیـا بێـت دەبـیٚ ئامـــاژە بـــۆ ئـــەوە بکـــەین کـــە مـــارکیز ناوێکـــەو زرنگانەوەیـــەکی تایبـــەت بـــەخۆی هەیـــە، هـــەروا بەئاسانی بەسەر خوێنەری وریادا تێناپەڕیٚ و بووە بەدیاردەیـــەك لـــەنێوان بەئەســـتێرە بـــوون و بڵاوبوونـــەوەی جـــەماوەریی و رێـــزی رەخنـــەگران لەناوەنـدەکانی رەخنەگرتنـدا، مارکیز ئامادەییـەکی زاڵـی هەیـە بەڕادەیـەك نـاتوانریٚ پشـتگویٚ بخـریٚ و زۆر کـــەس هەوڵیانـــداوە لەتـــەکنیکی گێڕانـــەوەدا لاسایی بکەنەوەو لەشێوازی گێڕانەوەدا شوێن پێی هـــەڵگرن تـــا بـــزانن چـــۆن ئـــەو واقیعـــە ئاشـــنایەی گەیاندۆتە پلەکانی سەرسامبوون، مارکیز بەیەکێك لەو کەسانە دەژمێردریٚ کە لـەژیانی خۆیـدا ناوبانگ و سـەروەری بەدەسـتهێناوە، ئەمـەش دوای چەندین رۆمان کە بەناوبانگترینیان (سەد ساڵ تەنیا)ییـە کە ساڵی 1982 نۆبڵی ئەدەبی پێوەرگرت.

لـــەنێو نووســـەرانی ئەمـــەریکای لاتینـــداو قوتابخانە ناسراوەکەی (واقعیەتی سیحری) مارکیز تـوانی جیهـانێکی سـیحر ئـامێزو سەرسـوڕهێنەر دروست بکات کە لەفەزاکانیدا خەیاڵ و واقیع بەیەك ئاشـــنا دەبـــن لەوێنەیەکـــدا کـــە لـــەوە دەچـــێت هەردووکیان بەدزییەوە لەسـەر ئەوە رێککەوتبن کە جیهـانێکی دی بدۆزنـەوە تێکەڵەیـەك بێـت لەمـەو



لەئەوە، مارکیز تانوپۆکەی دەچنیّ، بەمە توانی ملیۆنان خوێنەر بەجۆرەها زمانی زیندوو بەلای خۆیدا رابکێشیّ کە بەرهەمەکانی مارکیز وەرگێڕدراوەتە سەر ئەو زمانانەو بەردەوامیش چاوەڕێی بەرهەمی نوێی ترن و هەمووشیان وەکو سەرۆکی کووبی فیدلّ کاسترۆ وتەنی دەڵێن: ناتوانین سوپاسی نەکەین لەبەرئەوەی ئەو ژیانە ژیاوە تا بیگێڕێتەوە.

مارکیز کاتێك بەدوای پاشماوە دوورەکانی یادەوەریی خۆیدا دەگەڕیّ ئاشنایەتییەك لەنێوان حەقیقەتی ئەو ژیانەدا کە ژیاوە دروست دەکا لەگەلّ ئەوەی بەشێوەی ژیانێکی نویّ هەیە کە بڕبڕەکەی وشەیە، لەنەریتی مارکیزدا (ژیان ئەوە نییە کە یەکێکمان تیا دەژین، بەڵکو ئەوەیە کە لەبیرمانەو چۆن بیرمان دەکەوێتەوە تا بیگێڕینەوە) بەم حیکمەتە خۆی پڕ چەك دەکات و دەرگاکانی گێڕانەوە دەخاتە سەر گازەرای پشت و رۆمانێك پێشکەش دەکات کە بڕبڕەکەی وشەی سیحرئامێزو شەیدابوونێکی جوانە بەچاکەکانی گێڕانەوەیەکی پیرۆز کە گەلیّ درۆو دەلەسەش دەکات لەڕێی ئەو حیکایەتە بچووکانەوە کە لەبەرگی راستگۆیی داهێناندان تا ئێمە بەخۆشییەوە پەڕەکانی ئەو رۆمانە هەڵبدەینەوە، ئەو رۆمانەی سەرەڕای ناونیشانە خەمبارەکەی پڕە لەشادی، رۆمانەکە حیکمەتێك بەئێمەو بەپاڵەوانی رۆمانەکەش دەڵێت کە پێشتر یەکێك لەپاڵەوانەکانی پاولۆ کۆیلۆ وتویەتی (هەستکردن بەوەی کە ئێمە بۆ هیچ کەسێکی سەر رووی ئەم زەوییەوە هیچ ناگەیەنین، هەستێکی رووخێنەرە).

## سەرچاوە

ابراهيم شمدين– السفير

# پاتریارک و چیرۆکی ستەم

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن




"پایزی پاتریارك" دووەم ڕۆمانی گابریل گارسیا مارکیزەو لە نێوان سێ شاکاری دیکەیدا تا ڕۆژی ئەمڕۆکە هەر لە سەر متمانە خەڵکی پەرۆشە بیخوێنێتەوە، هەندێکیش پێیان قورسە و فەرامۆشی دەکەن. کەچی مارکیز بە رۆمانی "سەد ساڵ تەنیایی" زۆرتر ناسراوە کە لە ساڵی 1967دا نووسیویەتی، کەسانێکی زۆر سەرسامن پێی، لاسایی دەکەنەوە. "خۆشەویستی لەسەروەختی کۆلێرا"دا 1985 یەکێکە لە ڕۆمانە هەرە خۆشەویستەکانی کە بە یەکێك لە ڕۆمانەکانی ئەڤین حیسابی بۆ دەکرێت، زۆر بەرچاوو مەزن، لە دونیای ئەدەبیاتدا. لە نێوان ئەو سێ ڕۆمانەداو زۆربەی رۆمان و چیرۆکەکانی مارکیزدا تەنها "پایزی پاتریارك – 1975" بە ڕۆمانێکی زەحمەت دادەنرێت بۆ خوێندنەوە، تێگەیشتن لێی قورسە و لای خوێندەوارانی ئەدەبی مارکیز بە رۆمانێکی بێزەوەر و ناخۆش حیسابی بۆ کراوە.

هەڵبەتە ڕۆمانی "پایزی پاتریارك" شایستەی ئەو هەموو گومان و هێرشە نییە، هەرچەندە خوێنەرانی مارکیز خۆیان لەم ڕۆمانە بە دوور

دەگرن و بە بەراورد لەگەڵ دوو ڕۆمانەکەی دیکەدا فرۆشی کەمتر بوو، دیارە ئەوەشیان لە قۆناغێکدا، دواتر فرۆشی ئەم ڕۆمانەش گەیشتە ئاستی شاکارەکانی دیکەی، تەنها لەبەر ئەوەی ستەمی دکتاتۆرەکان وای کرد کە خوێندەواران ڕوو لەم ڕۆمانە بکەن کە لە دونیای ئەدەبدا حەکایەتی ژیانی ئاشکرا و پەنهانی هەموو دکتاتۆرەکانە، دەکرێ وەك ڕۆمانەکەی "ماریو ڤارگاس" – ئاهەنگی تەگە – کە پاڵەوانەکەی ئەویش هەر دکتاتۆرە، کە دەکرێ نموونەی سەدام حسەین بێت، ئۆکستۆ پنۆشێت، خوان ڤینست گۆمیز، ڕەفائیل تروخیلۆ.. یان هەر یەکێك لە دکتاتۆرەکانی ئەمریکای لاتین کە هەردوو نووسەرەکە کردوویانە بە پاڵەوان و نموونەی ستەمکاری، بێگومان بەدەر نییە لە ئاکار و رۆحی ستالین و فرانکۆ و کاسترۆ، هەڵبەتە نموونەی مارکیز و ڤارگاس بۆ کەسیەتیی دکتاتۆر لێکدی جیاوازن. گابریل گارسیا مارکیز وەك پیاوێکی چەپ دوو نموونەی فەرامۆش کردووە: خوان پیرۆن و فیدل کاسترۆ، هەڵبەتە لەوەدا زۆر لە خوێندەوارانی ئەدەب مارکیز بە نووسەرێکی ڕیاکار لە قەڵەم دەدەن، بە تایبەتی کە هەموومان دەزانین (مارکیز و کاسترۆ) دوو دۆستی گیانی بە گیانین. ساڵێك لەمەوبەر بوو کە رۆژنامەنووسێك بە ناوی "خۆرگە رامۆس" لە "میامی هیرالد" نووسی "زۆر زەحمەتە بڕوا بەوە بکرێت کە نموونەی ئەو دکتاتۆرەی (پایزی پاتریارك) پینۆشێت بێ پتر لە کاسترۆ" هەرچەندە هەمان رۆژنامەنووس ڕایگەیاند کە تاوەکو ناوەڕاستی حەفتاکانیش کاسترۆ توانی هەر هەموو نووسەران و ڕۆشنبیران فریو بداو خۆڵ بکاتە چاوی هەر هەموویان لەسەرتاسەری ئەمریکای لاتین. هەڵبەتە زۆربەی ئەو سکاڵاو گلەییانە کە ئاراستەی مارکیز دەکرێن، لە خەڵکی (کوبا)ەوەیە کە لە ناو وڵاتدان و کەچی هەست دەکەن وان لە زیندان، ئەوان دەڵێن دکتاتۆر ستەمکارە، جا بیر و بڕواکانی هەرچییەك بێت، دیارە مارکیز بۆ ماوەیەکی درێژ لە کاسترۆ نزیك بووەو ڕاوێژکاریشی بووە، هەرچەندە بەشێوەیەکی رەسمی ئەوکارەی نەکردووە، بەڵام خەڵکی (کوبا) گومانیان لەوە هەبووە کە کاسترۆ هیچ شتێك کاری تێ ناکات و کەڵکی نابێت.

بەڵام ئەو سکاڵاو گلەییە سەبارەت بە سیاسەت ڕاستە، نەك خودی ئەدەب. (پایزی پاتریارك) ڕۆمانێکی فانتازییە و پڕە لە سیحر و ئەندێشە، لە هەمان کاتیشدا ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕێتەوە ناو خودی واقیع.

ئەوەش ڕاستە کە گارسیا مارکیز بڕوای وایە خودی ژیان، بە هەموو لایەن و بارەکانییەوە پڕە لە سیحر و فانتازیا، بە تایبەتی لە ئەمریکای لاتین، بە واتا دیوارێکی ئەوەندە ئەستوور فانتازیا لە واقیع جیا ناکاتەوە. مارکیز سەرەتا یاسای خوێند، بەڵام هەر زووبەزوو کەوتە ناو دونیای ڕۆژنامەگەری، ئەم پیشەیەش کاریگەری زۆری هەبوو ئەو کاتەی مارکیز بیری لە نووسینی چیرۆك و رۆمان کردەوە، بە تایبەتی لە سەرەتای پەنجاکانەوە. هەرچەندە هەر لە سەرەتاوە کاری ئەدەبی مارکیز پڕ بوو لە هونەر، بەڵام هێشتا سنووردار بوو. تاوەکو ساڵی 1965 کە چیرۆك بوو بەشێکی سەرەکی لە ئەفسانەی مارکیز – جیهانی شارۆچکە خەیاڵییەکەی (ماکۆندۆ) لە مێشکی ئەودا درەوشایەوە، ئەو کاتە بوو کە (مەکسیکۆ) دەژیا، لە سەفەرێکی بۆ (ئاکاپولکۆ)، گەڕایەوە و یەکسەر چووەماڵەوە و ساڵێك و نیو لە پشت مێزی نووسین دانیشت، لە کۆتاییدا توانی دەستنووسی یەکەمی (سەد ساڵ تەنیایی) تەواو بکات. ئەو ڕۆمانەی کە بەوپەڕی خۆشی و سەرسامییەوە لە ئەمریکای لاتین پێشوازی لێ کراو ساڵی 1967 بڵاوکرایەوە، هەروەها بە زمانی ئینگلیزیش لە ساڵی 1970دا و لە 1982دا خەڵاتی نۆبڵی

پێبەخشرا، دیارە بوو بە یەکێك لە رۆمانە پڕ فرۆشەکانی دونیا.

سەبارەت بە رۆمانی "پایزی پاتریارك" ئالن. بی. روچ قەناعەتی وایە کە ئەم ڕۆمانە چڕوپڕ و ناجێگیرە، هەر بۆیە ئاسان نییە و خۆی نادات بە دەستەوە، لەو بڕوایەشدایە کە لەوانەیە کاریگەری (جێمس جۆیس) لە رۆمانی "یولیسیس" بەسەر مارکیزەوە هەبێت هەڵبەت ئەوەیان ڕاستە، بەڵام ناکرێت کاریگەری (ولیەم فۆکنەر) فەرامۆش بکرێت. ئەو شێوازەی کە بە (تیار الوعي – تەوژمی یان شەپۆلی هۆش – *Stream of consciousness*) ناسراوە مارکیز وەك نووسەرانی دیکە بەکاریهێناوە، بەڵام ئەوە تەوژمی هۆشی تاکە کەسێك نەبووە کە لە "پایزی پاتریارك"دا بەکارهاتووە، بەڵکو هی نەتەوەیەك بووە، مارکیز بەشێوەیەکی زۆر نائاسایی لە ناو مێشکی پاڵەوانەکانیدا دێت و دەچێت، پاڵەوانە سەرەکییەکەشی پاتریارکی ستەمکارە کە لە تەمەنێکی نادیاردا کۆتایی پێهاتووە، لە نێوان (107) تا (232) ساڵ، لە هەمان کاتدا سەبارەت بەو ستەمکارە گوێمان لە هەموو ئەو کەسانە دەبێت کە خزمەتیان کردووە، ئەوانەی لێی ترساون، ئازاریان چەشتووە یان بە فەرمانی ئەو لەناوچوون، یان ئەوانەی ملکەچی هەوەسی شێتانەی بوون و ئەوانەشی کە بە هەزارەها منالی بێ ناویان لەم بووە.

شێوازی پەخشانەکە زۆر نەخشین و ڕازاوە و پڕ لە وردەکارییە، بە رۆح و ڕەهەندێکی تەعبیری نووسراوە، کاریگەری لەسەر خوێنەر وەك ئەو مۆسیقایە وایە کە مۆسیقاژەنێکی مینیمالیست – فیلیپ گلاس داینواە، کە چەشنە ئیقاعێکی تیایە خۆی لە دووبارە بوونەوەی هەمان بیرۆکە (*theme*) بەرجەستە دەکات. هەتا گەر نەزانیت ئەو مێشکەی چوویتە ناوی هی کێیە، گوێی مەدەرێ، چونکە پۆرتریتە گشتیەکە هی دکتاتۆرەکەیە و هی خەڵکی هەرێمی (کاریبیان)ە کە لە ژێر ستەمی ئەودا دەناڵن، کە دیارە ئەوەشیان گرنگترە لە بیر و بۆچوون و ئەندێشە و یادەوەری و دەنگەکانی تاکە کەسێك. یادەوەری دکتاتۆر وەك تاکەکەس و کۆی یادەوەری نەتەوە یەکانگیر نین لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا، بەڵکو بۆ هەمیشە و هەتا هەتایە لەوێدان، لەناو زەمەن، دەکرێ بڵێین دکتاتۆر بەرجەستەی زەمەن و لە هەمان کاتدا سەر بە نازەمەنیشە، بوونەوەرێکە نە تاعوون و بەڵاو نە ڕەشەبا پێی دەوێرن، نە زەمەن، دکتاتۆرێکە لە بری هەمووان بیر دەکاتەوە، بە هەموو شتێکی ئەوانی دیکە دەزانێت. ئەم بۆ خۆی خودانی چارەنووسی هەمووانە. مارکیز باس لەو پەیوەندییە ئاڵۆزەی دەستەڵات دەکات، کەسێك بە هێزەوە دەستەڵاتدارە و فەرمان دەردەکات و بەهەزارەها ملکەچی بە هەقێکی خواهانەی ئەو دەستەڵاتدارە دەزانن، نەك هەر ئەوە بەڵکو ئامادەن ملکەچ بن. دکتاتۆر پێی خۆشە بە خۆی بڵێت – "ئەو خەڵکانە منیان خۆش دەوێت." گەرچی ئەوەیان درۆ و خۆهەڵخەڵەتاندنە، ئەوان جگە لەو دکتاتۆرە هیچ کەسێکی دیکە ناناسن، جگە لە پیاوەکانی کە بوونەتە چاوی دکتاتۆر، جگە لە جیهانێکی پڕ لە کوشتن و بڕین و تۆقاندن، جگە لە ماکینەی ترس و مەرگ، هەر بۆیە بێ خەیاڵن و ئامادەن کە ملکەچ بن.

هەڵبەتە مارکیز ئەوەشی لە بیر نەچووە کە دکتاتۆر وەك ئادەمیزادێك بخاتە ڕوو، ئاخر دوا جار ئەویش مرۆڤە و بێ هەست و نەست و مێژوو نییە، دکتاتۆر منالییەکی پڕ لە هەژاری بەسەر بردووە، دەکرێ بەزەیی بەو منالانەشدا بێتەوە کە وەك ئەم دەژین و ژیاون. دکتاتۆر لای مارکیز، گەرچی هەموو بوونی دڵڕەقی و زەبر و زەنگە و سەپاندنی هێز و دەستەڵاتە، کەچی بەدەر نییە لەوەی کە لێرەو لەوێ، لە ڕۆمانەکەدا، بە رۆحێکی زۆر کۆمیدی و

قۆشمەبازییەوە دەربکەوێت، هەمیشە کۆمیدیاو توندوتیژی لای نووسەر جۆرێک لە تێکەڵبوون و هاوسەنگیان هەیە. دەکرێت بوترێت "پایزی پاتریارک" چیرۆکی یان پۆرترێتی (تەنیاترین پیاوە لەسەر زەوی)، پیاوێک کەلەسەر عەرشێك دانیشتووە کە هەموو پایەکانی وەهمن، تەختێك لە درۆ، دەستەڵات و هێزێکە لە خۆی دەخوات و دواجاریش دەبێت بە خۆڵەمێش، لەوە دەچێت ئەمەیان چیرۆکی هەموو دکتاتۆرەکان بێت.

**سەرچاوە**

***2003 The Washington Post Company***

# ڕۆمانی... هەواڵی ڕفاندنێک

لە عەرەبییەوە: ڕێبوار



بە پێچەوانەی زۆربەی ڕۆمانەکانی تری (گابریل گارسیا مارکیز)ەوە، کە لەسەر زەمینەی خەیاڵ و فانتازیا بنیات نراون و، ریالیزمی ئەفسوناوی – بە مانا فۆرمیەکەی مارکیز – پاوانی سەرجەم ڕووداوو بزاوتی کەسەکانی دەکات، ڕۆمانی (هەواڵی ڕفاندنێك) بنەمایەکی واقیعی و ئاسایی هەیە، ڕووداوی نێو ئەم ڕۆمانە لەو کێشە کۆمەلآیەتی و سیاسیانەوە سەرچاوەی گرتوە کە لە کۆڵۆمبیا بە تایبەتی و ئەمریکای لاتیندا بە گشتی زەمینەیەکی شیاویان بۆ ڕەخساوە و ڕژێمەکان تەنیا دەستی بێ توانابیان لە بەرانبەردا هەڵدەبڕن. ئەمەیش وەك ئەنجام هەر بەشێکە لەو بابەتانەی کە بەردەوام مارکیز کاریان لەسەر دەکات، کە ئەویش ڕووت کردنەوەی رووی ڕاستەقینەی ئەو ڕژێمانەیە لە سایەی سەرەکیترین فاکتەری بزۆزەوە کە دیکتاتۆرەکانی ئەو ناوچەیەن، بێگومان هەریەك بە شێوازی خۆی، کە باشترین نموونەی ئەمیان لە ڕۆمانەکانی سەد ساڵ تەنیایی و پاییزی باوك سالاردا دەردەکەون. پوختەی ڕووداوەکانی نێو ڕۆمانی (هەواڵی ڕفاندنێك) بەم جۆرەیە:

**شوێن: کۆماری کۆلۆمبیای وڵاتی خودی مارکیزە.**

**کات: سەرەتای ساڵەکانی نەوەدی سەدەی رابوردوە.**

**قاچاخچییەکانی تلیاك و مادە سڕکەرەکانی دی لەوپەڕی چالاکیدان، بنکە و بارەگایان دیارە و سەرۆکیان ناسراوی هەموو لایەکە. هەر تەواو وەك دەوڵەت کار ئەنجام دەدەن و بە هەندێك کارگوزاری بەسوود رووی دانیشتوانیان لە خۆ کردوە، تەنانەت بە پارێزەری خۆیانیان دەزانن و لە رژێمە سیاسیەکەیان لاباشترە. سەرۆکی قاچاخچیەکان (پابلو ئیسکوبار)ە کە شاری (میدلین)ی کردۆتە بارەگای خۆی و بنکەی دەستووردان و بە ئەنجام گەیاندنی چالاکیەکانیان. دەوڵەتیش بە سەرۆکایەتی سەرکۆمار (گابریا) بڕیاری ئەوەی داوە ئەو رێکخراوە ترسناکە پاکۆبدات و ئەندامەکانی بداتە دەست وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکا بۆ لێپێچانەوە و دادگایی کردنیان. بەرانبەر بەم هەنگاوەی دەوڵەت بزاوتی قاچاخچیەکان زیاددەکات و مەرج و بەڵێن و دانوستان لەگەڵ رژێمدا دەهێننە گۆڕێ. (ئیسکوبار) هەموو رێگایەکی ترساندن و کوشتن و فڕاندن لە دژی ئەوانە دەکات کە سەربە دەوڵەتن، یان لە دەزگا گرنگەکانیاندا کاردەکەن، لەسەرو ئەو داواکاریانەوە کە هەیانە پەشیمان بوونەوەی دەوڵەتە لە بڕیاری بەدەستەوەدانیان بە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و نەهێشتنی چالاکیەکانی پۆلیسە کە ئەوان بەبێ یاسایی و زۆرداری لە قەڵەمی دەدەن. یەکێك لەو شێوازی فشارەی کە دەیانەوێت لە دەوڵەتی بکەن فڕاندنی چەند کەسێکی ناوداری دەزگاکانی راگەیاندنە، لە ژن و پیاو، لەوانە: ماروخا باتشونی ژنی ببیامیساری ناودارە. ماروخا ژنێکی رۆژنامەنووسە، یەکێکە لە هەرە چالاکەکانی کەناڵی تەلەفزیۆن و رادیۆ، لە خێزانێکی بەناوبانگە، بەڕێوەبەری دەزگایەکی بەرهەمهێنەری سینەمای دەوڵەتیە. (مارینا مونتیا) کچی یەکێکە لە کۆنە سەرکۆمارەکان و دوای ماوەیەك لە گرتنی و بۆ هەڕەشەکردن لە دەوڵەت و بەدەنگەوە نەهاتنی مەرجەکانیان دەیکوژن. (باتشوسانتوس) رۆژنامەنووسێکی رووناکبیرە.**

**(بیاتریس) دشی ماروخایە.**

**(دیان تەریبە) ئەمیش لەو رفێنراوانەیە کە قاچاخچیەکان دەیکوژن.**

**لەو سەردەمەدا گرتنی پۆلێك لە رۆژنامەنووس و ئەندامی دەزگاکانی راگەیاندنی دەوڵەتی زەبرێك بوو لە دەستەلاتی فەرمانڕەواکان و لە دەرەوەیش کارێکی بەناووسەنگ بوو، بۆیە هەر لەو سەردەمەدا گەلێك لەو ژورنالیستانە بوونەتە قوربانی توندوتیژی و ئەو کێشە هەراشانەی لە نێوان رێکخراوە ترسناکەکان و رژێمەکاندا بەرپابووە.**

**بارەگای نهێنی قاچاخچیەکان و، ئەو خانوانەی کردوویانەتە زیندان بۆ گیراوەکانیان جەنگەی هەڵگیرسانی هەموو رووداوو بزاوتی ناو ڕۆمانەکەن. مارکیز زۆر بە وردی وێنەی ئەو شوێنانەی کێشاوە و کەسەکانی بەرجەستە کردوون، پەیوەندی نێوان خودی پاسەوانەکان، یان پەیوەندی پاسەوان و گیراوەکان، هەروەها ئەو حاڵەتە دەرونیە هەڵچوەی کە بەردەوام کاری لەسەر ژنە گیراوەکان بووە و کاردانەوەیەکی نائاسایی خوڵقاندوە. دیارە مارکیز چەند رەگەزێکی تری بەکارهێناوە بۆ وروژاندنی ئەو حاڵەتە دەرونیانە و دەوڵەمەندکردنی فەزای کارەکەی و بەزیندو هێشتنەوەی کاراکتەرەکانی. لەو رەگەزە گرنگانە تەلەفزیۆنی ناو ژوری گیراوەکانە کە هەمیشە و بە حوکمی ئەوەیش کە خودی گیراوەکان ئەندامی چالاکی بەڕێوەبردنی ئەو کاناڵەن فاکتەری سەرەکی ئەو هەڵچوون و داچوونە دەرونیانەیە و، دەیانەوێت لەو ڕێگایەوە، پەرلەیەك یان رازێکی نهێنیان بۆ بڕەخسێت یان دەنگی ئەمانیان بگاتێ.**



هەر لە ڕێگای وردەکاریەکانی مارکیزەوە – چ لە وێنەگرتنی جێگا و ساختومان و گەڕەك و، چ لە خودی کەسەکانەوە – خوێنەر دەتوانێت باری ژیانی کۆمەڵایەتی کۆڵۆمبیا و رژێمەکەی و ئەو پەیوەندیە پارێزکارانەی لەناو خێزانەکانیاندا پیادە دەکرێن بەرجەستە بکات.

کۆتایی رۆمانەکە خۆ بەدەستەوەدانی سەرۆکی قاچاخچیەکان (پابلوئیسکوبار) و بەردانی گیراوەکانە کە سەرەکیترینیان ماروخا باتشونە.

مارکیز لە بارەی چۆنیەتی نووسینی رۆمانەکەوە دەڵێت:

"لە تشرینی یەکەمی 1993دا ماروخا باتشون و ئەلبیرتو پیامیسای مێردی پێشنیازی ئەوەیان بۆ کردم کتێبێك لە بارەی فڕاندنی ماروخاوە بنووسم کە شەش مانگ دەستگیرکرابوو. باس لەو ئەزموونە بکەم کە لەو ماوەی شەش مانگەدا پیایدا تێپەڕیبوون و، ئەو هەوڵ و رەنجە سەختەی ئەلبیرتو دابووی تا رزگاری کردبوو. من هەنگاوێکی باشم لە ڕەشنووسی بەراییدا نابوو کاتێك لەوە بەئاگا هاتم کە ئەم کاری فڕاندنە ئەڵقەیەکە لە زنجیرەی نۆکاری فڕاندنی تر کە بۆیەك مەبەست و لەیەك کاتدا لە ولاتدا ئەنجام دراون، هەرگیز ئەوەیش نەدەکرا کە ئەم کارانە لە یەکدی جیا بکرێنەوە، لە راستیدا پرۆسەی هەر دەفڕاندنەکە لەیەکتر جیاواز نەبوون – وەك لە سەرەتادا ئێمە وایتێگەیشتبووین – بەڵکو فڕاندنی دەستەیەکی دە کەسی بوو کە بەوردی دەستنیشان کرابوون، کاتێك هەستمان بەم پەیدۆزەکرد من ناچار بووم بە هەناسەیەکی ترەوە دەست بە بینای رۆمانەکە بکەمەوە. لەبەرئەوەی کەسایەتیەکان شوناسنامەی تەواو دیار و دۆخی تایبەتی خۆیان هەبێت. ئەوەی کردمان چارەسەرێکی هونەری (تەکنیکی) رۆمانێکی تێکچرژاو بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بەو شێوەیە دەبوو کارەکە لە ساڵێکدا تەواو بێت کەچی نزیکەی سێ ساڵی خایاند، ماروخا و ئەلبیرتو هەمیشە لە هاوکاریەکی ورد و شیاوی منداببوون، تا ئەنجامەکە وا شکایەوە کە بەسەرهاتی شەخسی ئەو دوانە بوو بە تەوەری سەرەکی و هێڵی پێکەوە گرێدراوی کارەکە"

بۆ نووسینی رۆمانەکە مارکیز پەیوەندی بە هەموو ئەو کەسانەوە کردوە کە بەشداری تراژیدیاکە بوون و تا ڕادەیەکی زۆر ئازاریان تیا چەشتوە، تاقە مەبەستی مارکیزیش لە نووسینی – وەك خۆی دەڵێت– لەبیرنەکردنی ئەم کارەساتە درندانەیەیە کە ئەڵقەیەکە لە هولوکوستی تەوراتی و ماوەی بیست ساڵ زیاترە بەردەوام لە کۆڵۆمبیادا دووبارە دەبێتەوە.

دەمەوێت لێرەدا ئاماژە بەوە بکەم کە کارکردنی مارکیز لەسەر رووبەری ژورنالیستی و دەزگای راگەیاندن و گوزارشت لێکردنیان بەکاری داهێنانی وەك رۆمانەوە، لەوەوە سەرچاوەی گرتوە کە خودی مارکیز بە رۆژنامەنووسی دەستی پێ کردوە و هاتۆتە ناودنیای ئەدەبەوە، لە نووسین و تۆماری یاداشتەکانیدا زۆر ئاماژە بۆ ئەم لایەنەی ژیانی روناکبیری خۆی دەکات. هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێك لە کەرەسەی سەرەکی رۆمانی مارکیز لە رۆژنامە و گوزارشتەکانیەوە سەرچاوەیان گرتوە. لەوانە هەواڵی فڕاندن، خۆشەویستی و شەیتانەکانی تر. کارەساتی ناو رۆمانی "چیرۆکی مەرگێکی راگەیانراو"یش هەر لە هەواڵێکی رۆژنامەی ئالدیا بوگوتاوە وەرگرتوەو بەکارێکی داهێنانی گەیاندوە.

### سەرچاوە

رۆمانی (هەواڵی ڕفاندنێك) ساڵی 1993 مارکیز دەستی بە نووسینی کردوە و دوای سێ ساڵ تەواو بووە. رۆمانەکە 333 لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندیە، صالح عیلمانی لە ئیسپانیەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، ساڵی 1997 لە دار المدی چاپکراوە.

# لەگەڵ گابریل گارسیا مارکیزدا

## دیمانەی (کریستینا باربن) کە لە بەشە ئیسپانیەکەی گۆڤاری (مقالات الیونسکو)دا نووسەرە.

**لە عەرەبییەوە: سەردەم**




**باربن: تۆ لە ناودارترین نووسەری ئێستای دنیایت، لەو باوەڕەدایت ناوبانگ بۆ هونەرمەندی داهێنەر گرنگیی هەبێت؟**

**مارکیز: ناوبانگ گرنگە بۆ توانای بەردەوامبوون لەسەر نووسین، ئەمە پێزانینێکە دەبەخشرێتە هونەرمەندی داهێنەر. لەوە ناخۆشترنیە کە کار بکەیت و چ کاردانەوەی نەبێت، من ئەمە لە ئەزموونە تایبەتیەکانی خۆمەوە دەزانم، لە سەرەتاوە چوار ڕۆمانم نووسی، بێجگە لە هاوڕێکانم کەس قسەی لەسەر نەکردن تا ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) کە سەرنجی جەماوەری ڕاکێشا. مرۆڤ کە بزانێت کاریگەریی بەرهەمەکەی لەسەر خەڵکی نییە ورەی نامێنێت، ئەوەی پێی دەوترێت سەرکەوتن و ناوبانگ، ریگایەکی کراوەیە بۆ زانینی ئەو ڕاستیە. بەڵام من وای نابینم کە شتێکی زۆر پێویست بێت، بە پێچەوانەوە، من وا ئەزانم ناوبانگ بارێکی گرانە و گەلێك جار لە کاری تایبەتیت دەکات و پاساوی وات پێ دەهێنێتەوە کە لە توانای نووسەردا نییە، زۆر جاریش خۆی لە خۆیدا دەبێتە پیشە، واتا ئەگەر لە شێوەیەکی تردا**

دایبنێین، نووسەر بۆیە بوەتە نووسەر چونکە زانیویەتی، تەنانەت ئەگەر بەردەوامیش نەبێت لەسەر نووسین، بەڵام پیشەی راستەقینەی نووسەر ئەوەیە بنووسێت، ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە لەناوبانگ بڕوانین، من پێم خۆشە بەرهەمەکانم دوای مردنم بڵاوببنەوە.

*کارەکانت بەتایبەتی (سەد ساڵ تەنیایی) تا ڕادەیەك بۆ زۆربەی زمانە زیندوەکانی دنیا وەرگێڕاوە. تۆ چۆن ئەوە لێك دەیەیتەوە کە ڕۆمانێکی تەواو نموونەی ئەمریکای باشوور لای گەلێك خوێنەر تا ئەم ڕادە زۆرە ببێتە ئەدەبێکی میللی جیهانی؟

—وا دەزانم هۆکەی ئەوەیە کە لەسەر ئاستی جیهان تێیدەگەیت، ژاپۆنییەك کە بە زمانە رەسەنەکەی خوێندبوویەوە بۆیگێڕامەوە ئەوەی لە ڕۆمانەکەدا کاری لێکردبوو، ئەو هەستە بوو کە وایزانیبوو چیرۆکی خێزانەکەی دەخوێنێتەوە لە گوندێکی بچووکی ژاپۆندا. هەروەها نامەی کچێکی ئەڵمانیم پێگەیشت هەر هەمان شتی وتبوو بەڵام بەجۆرێکی کەمێك لەو قایلتر وتبووی: ئەو بڕوای وایە کە من بە دزیەوە چیرۆکی خێزانەکەی و گوندە ئەڵمانیەکەیم بە دەستهێناوە، پاشان، بە ئاسانی لەگەڵ وڵاتەکەی خۆمدا گونجاندوومە.

من بڕوام وایە ڕووداوی نێو (سەد ساڵ تەنیایی) بەڕاستیی بەسەرهاتی ژیانی خوێنەرە، هەر ئەوەیشە وا پەرۆشی کردوون. چونکە ئەگەر نووسەر بتوانێت سۆز و خۆشەویستی و نەهامەتی و ئازار سنووری هەموو زمانەکانی بڕیوە. هەروەها جیاوازیە مێژوویی و ڕەگەزیەکان. ئەگەر نووسەر بتوانێت بەسەرهاتی ژیانی مرۆڤ بە ئەمانەتەوە تۆمار بکات، بێگومان و بەشێوەیەکی حەتمی هاوڕێی مرۆڤی خۆی پەیدا دەکات.

*گەلێك شتی سەیر لە کاراکتەرەکانتا روو دەدەن، ئەوان چەند سەدەیەك دەژین، یان جارێکی تر بەرجەستە دەبنەوە. وا گوزارشت لە کارەکانت دەکرێت کە سەر بە ریالیزمی جادویی بێت، ئایا بەم پۆلینکردنە قایلیت؟

—ئەوەی بەڕاستیی ئەمەوێت بیڵێم ئەوەیە کە تاقە ڕووداوو دێڕێك لە کاری مندا نیە سەرچاوەکەی واقیع نەبێت، بابڵێم: بەرهەمی من لە چاودێرییکردنی واقیعدایە، پاشان ڕۆنانیەتی لە چوارچێوەیەکی شیعریی لێرکیدا لەگەڵ هەندێك لە زێدەنانە سەر و هەموو فێڵ و تاشینە ستراکتۆریەکان، وەلێ هەرگیز نامۆنین بە واقیع. بێجگە لەمە، من بڕوام وایە ئەو نووسەرەی هەر لە دەستپێکردنەوە هەقیقەتی پێ نەبێت هەرگیز ناتوانێت بڕوا بە خوێنەر بکات. ڕەنگە نووسەر هەموو شتێك بۆ خۆی بەڕەوا بزانێت بێجگە لەوەی کەنەتوانێت لە قەناعەت پێکردنی خوێنەردا سەرکەوتوو بێت. کە خوێنەر بڕوای بە قسەی نووسەر نەکرد، ئەو کاتە نووسەر نە بوونی هەیە نەڕاستگۆیی ئەدەبیی. ئەوەیش کە پەیوەندیی بە (ریالیزمی جادویی)ەوە هەبێت، من بۆم نییە هیچ بڵێم، چونکە ئەوە کێشەی ڕەخنەگرە نەك نووسەر. ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کە من لە ڕۆماننووسیدا هەمان شێوازی باسکردن بەکاردێنم کە ڕاپۆرتەکانمی پێدەنووسم. من هەقیقەتەکان دەدۆزمەوە، بە نیسبەت منەوە (سەد ساڵ تەنیایی) —کە ڕاپۆرتێکە لەسەر دنیای گوندەکەم و دەوروبەری— بریتییە لە ڕاپۆرتێك بە شێوازێکی شیعری نەك ڕۆژنامەنووسی. بەڵام سەرچاوەی زانیاریەکان هەر یەکێکن.

*شێوازی (سەد ساڵ تەنیایی) لە پاشماوەی گوزارشتە کۆنەکانی ئەسپانیایە لە ئەمریکای باشووردا، هەروەها کتێبەکانت ڕیشەیەکی مێژوویی کۆکیان هەیە. پرسیارەکە ئەمەیە لای تۆ لە چ نوختەیەکدا مێژوو دەوەستێت تا ببێت بە تاقیکردنەوەیەك بۆ خەیاڵ؟

–ئەوەی من تەواو پێویستمە خەیاڵە، بەڵام بە شێوازی جیاواز من هەمان هەڵوێستی گوزارشتە کۆنەکان لەبەرئەگرم. پێشتر خەڵکیی هیچیان لەبارەی ئەو زەویەوە نەدەزانی کە دەیاندۆزیەوە، بۆیە هەموو شتێك سەرنجی ڕادەکێشان، بۆ نموونە، زۆریان بەلاوە سەیر بوو کە بینیان هەندێك میوە بۆ مرۆڤ ژەهراویە کەچی بۆ باڵندە وا نییە. (کریستۆڤەر کوڵمبس) زۆر بە وردی باس لە زیندەوەرە هەرە جوانەکان دەکات. هەروەها (بیکافیتا)ی هاوەڵی (ماجەلان) لەیەکەم گەشتی بە دەوری زەویدا، باس لە گیاندارەماڵیەکانی ئێستا دەکات. بەڵام وایزانیوە (بەبەراورد لەگەڵ ئەو گیاندارانەی ئەوروپا کە ناسیونی) کە ئەمانە دڕندەیەکی سەیرن، ئەگەر شتێکی هاوبەش لە نێوان من و ئەم گوزارشتانەدا هەبێت ئەوە سادەیی و بڕوابوونە بە هەموو شتێك، کە هەموو شتێك دەشێت و هەموو شتێکیش ڕاستە. من (کوڵومبس) لەمە دەردەکەم، بەلای منەوە کۆڵومبس دوور بووە لەو سادەییەوە، بەڵکوو درۆی کردوە تا کارەکەی تێپەڕێنێت.. دوای ئەوەیش وا بیر دەکەمەوە کە (کوڵومبس) یەکێکە لە کەسە بچووك و نابوودەکانی مێژوو. بۆیە لەم بارەیەوە نابێت تۆ زۆرداوای جیدیم لیّ بکەیت.

*(کوڵومبس) لە نامەکانیدا کە بۆ پاشاکانی خۆی ناردوە زیادەڕۆیی دەکات وەك ئەوەی دەڵێت (دانیشتوانی ئێرە گەلێك کەشخەن، وڵاتەکە زۆر سەوزە، میوەکان زۆر بەلەزەتن) تۆیش زیادەڕۆیی دەکەیت.

–تەنانەت ئەگەر (کوڵومبس) بەهەر شێوەیەك ئەمەی منی کردبێت، ئەو بە مەبەستێکی جیاواز کردوویەتی. مەبەستی من مەبەستێکی شیعریە، من دەمەوێت زۆر بە روونی وێنای واقیع بکەم. ئەمە لەوە دەچێت کە لە ڕێگای زەرەبینەوە تەماشای واقیع بکەیت و شتە بچووکەکانت وەك هەموو دنیا بێتە بەرچاو. (کوڵومبس) ئەمەی تەنیا لەبەرئەوە کردوە کە پاشاکانی بخاتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەو شایانی یارمەتی ماڵیە.

*دەشێت کتێبەکانت بە ئاسانی بخوێنرێنەوە و چێژ لە چیرۆکەکانی ناوی وەربگیرێت، بەڵام کە بە وردی بیخوێنیتەوە دەزانیت ئەمە پێکهاتوە لە کۆمەڵێك سەرچاوە و ئەدەب و شتی دی. تۆ چۆنت پیّ باشە خەڵکی بەرهەمەکانت بخوێنێتەوە؟

–بەکارهێنانی سەرچاوە ئاماژەیە بۆ هاوڕیّ، نووسەر و خەڵکیی تریش، کە دەیەوێت بەسەرهاتێك بگێڕێتەوە کە بە ئاشکرا لە کەسێك و دوان روویداوە، ڕەنگە رووداوەکە ئەوەندە نووسەر بەرەو قووڵی چیرۆکەکە بەرێت کە نەتوانێت بەری لێبگرێت. بەدەگمەن ئەمە لە سەرەتای کتێبدا روودەدات، بەڵام لە هەندێك حاڵەتدا کاتێکیش مرۆ دڵخۆش بێت کە دەبینێت شتەکان بە چاکی بەڕێوە دەچن و وا هەست دەکات کە یاری بە دراوی بچووك دەکات. لە ڕاستیدا، من وا نازانم نووسەرێکی ئەدەبیی باش بم، هەوڵیش دەدەم بەهەر نرخێك بێت خۆم لە سەرچاوە رووناکبیریەکان دوور ڕاگرم، لە کتێبەکانمدا وەرگرتن (ئیقتیباس) نییە. خۆم سەرم سوور دەمێنێت کە ڕەخنەگران باسی کاریگەری هەندێك نووسەر دەکەن لەسەر کارەکانم کە من هەرگیز هیچم نەخوێندونەتەوە.

ئەو تەقەلایەی بۆ دەربڕین لە واقیعێك دەدرێت وەك هەستی خۆم – کە من زۆر بە گران و ناخۆشی دەزانم – پێدەچێت لەو زنجیرە ئاستانەوە سەرچاوەی گرتبێت کە من هەستیان پێناکەم. تا ئەو ڕادەیە بە روونی دەردەکەوێت کە ئەم کارانە بەر پلاری شی کردنەوە دەکەون. هەندێك کەس تەنیا لەبەر خاتری چیرۆکەکەی دەیخوێننەوە، هەیە لەبەر هەندێك برگە دەیخوێنێتەوە کە ورووژێنەرێکی تیژ تێپەڕن. هەندێك خوێنەریش بەرهەمەکانم بە شۆڕشگێڕیی دەدەنە قەڵەم، کەچی هەیە دەڵێت

روانینێکی کۆنەپەرستانەن بۆ دنیا. هەموو کەسێك دەیەوێت ئەوە لە کتێبەکەدا ببینێت کە خۆی دەیەوێت. ئەمە بەلای منەوە زۆر گرنگە، ئەمە بەو مانایەیە کە من ئامانجم پێکاوە. چونکە توانیومە وێنەی واقیع بە هەموو ململانێ و کێشەکانیەوە بکێشمەوە.

*لە رۆمانە هەرە دیارەکانتدا (سەد ساڵ تەنیایی) و (پایزی باوك سالار) بەشێوەی زۆر جیاواز مامەڵەت لەگەڵ کاراکتەری ژندا کردووە. لە یەکەمیاندا. جیهانی مێینە زۆر بەهێزە. ژنان لەوێدا بە ئاشکرا تایبەتمەندی زیاتریان لە پیاوەکانی هەیە، هەموویشیان بەیەك ناو ناودەبرێن: خوزیە ئەرکادیو بویفیدیا. بەڵام لە لایەکی ترەوە لە (پایزی باوك سالار)دا ژنان تەنیا لە ڕێی پەیوەندیان بە پیاوەوە بوونیان هەیە. ئەمە چۆن لێك دەدەیتەوە؟

-ژن تا رادەیەکی زۆر جێ بایەخی منن، کاراکتەری ناونیشان لە (پایزی باوك سالاردا) رەهایە و نایەوێت پشت بە کەس ببەستێت، بەڵکوو داوا لە هەموان دەکات کە خودایشیان لەگەڵدا بێت پشت بەو ببەستن. لەگەڵ ئەمەیشدا. لە پەترپارکدا دوو نوختەی لاوازی گەورە هەیە، هەردووکیشیان پەیوەندیان بە ژنەوەیە. ژنان وایان لێکردبوو خەریك بوو سەری خۆی لە دەست بدات. بۆیە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئەو وای دەزانی نوێنەری بەرجەستەی هێزێکی رەهایە، بەڵام گومان لەوەدا نییە ئەو دوو ژنەی لە رۆمانەکەدا کەسایەتی سەرەکین، وایان لێکردبوو هاوسەنگیی نەهێڵن. بەلای منەوە ژن هێزی ڕاستەقینەی سروشتە، بۆ مێژووییش، من هەوڵ دەدەم ئەمە لە رۆمان و چیرۆکەکانمدا بەرجەستە بکەم، لە بەرهەمەکانمدا ژن وا دەردەکەوێت کە دنیایان لە ناودەستایە، بەڵام پیاو گەمژانە رەفتار دەکات. ئەمە بڕوای راستەقینەی منە.

## سەرچاوە

کۆمەڵە چیرۆکی: مأتم الأم الکبیرة - گابریل گارسیا مارکیز.

# خنکاوێک لەسەر خاکێکی رەق

گابرێل گارسیا مارکیز

لە عەرەبییەوە: شیرین .ك



ئایا هەموو کورتە چیرۆکێك چیرۆکێکی وەڕسکەرە؟

بەڕێز گابرێل گارسیا مارکیز

حەزدەکەم سەبارەت بەکورتە چیرۆك پرسیارت لێبکەم و بەلای تۆوە چییە؟ هەندێجار مرۆڤ وا بیردەکاتەوە کە کورتە چیرۆك بەلای تۆوە وەکو پشوویەك وابێت لەنێوان رۆمانێك و رۆمانێکی دوای ئەودا، یان وەکو لای هەندێك نووسەر کە کورتە چیرۆك بەمەشقێك دادەنێن لەسەر ژانرێکی ئەدەبی مەزنتر کە رۆمانە؟ پرسیارە راستەقینەکەم لەمە زیاتر ناشارمەوە: ئایا دەکرێ خوێنەرانت چاوەڕوانی کتێبێکی ترت بکەن لەکورتە چیرۆك؟

ئەدلبەرتۆ بالدس

سان خوان-بۆرتۆریکۆ

-نووسینی رۆمان وەکو دانانی خشت وایە، بەڵام نوسینی چیرۆك وەکو چیمەنتۆ تێکردن وایە، بەتەواویی نازانم ئەم گوزارە رێك و رەوانە هی کێیە، دەمێکە گوێم لێبووەو زۆرم دووبارە کردۆتەوەو کەسیش خۆی نەکردووە بەساحێبی، بۆیە دواجار گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە دروستکراوی خۆم بێ،

لێکچواندنێکی تریش هەیە بۆ ئەمە، هەرچەندە وەکو ئەوەی پێشوو جوان نییە: چیرۆك تیرێکە لەدڵی هەدەفەکەدا، بەڵام رۆمان وەکو راوە کەروێشك وایە. بەهەرحاڵ.. ئەو پرسیارەی لەلایەن ئەو خوێنەرەوە لێم کراوە فرسەتێکی باشە بۆئەوەی جارێکی دی سەبارەت بەدوو رەگەزی ئەدەبیی جیاواز قسە بکەین، بەڵام سەرەڕای ئەوە هەردووکیان بەیەکداچوون، رەنگە یەکێك لەهۆکارەکانی ئەو تێڕوانینە هەڵەیە ئەوە بێ کە جیاوازییەکە بەپێی درێژی دەقەکە دەپێون، هەرچەندە دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ کە چیرۆکی کورت و چیرۆکی درێژیش هەیە. ئەو جیاوازییەی کە دەبێ سەیری بکرێ ئەو جیاوازیەیە کە لەنێوان چیرۆك و چیرۆکێکی تردا هەیە، نەك ئەوەی لەنێوان چیرۆك و رۆمانێکدا هەیە.

کورتترین چیرۆك لەژیانمدا بیستبێتم لەنووسینی نووسەری گواتیمالایی (ئۆگەستۆ مۆنتیرۆسۆ)یە، کە دەڵێ: (کە لەخەو هەستام هێشتا دیناسۆرەکە لەوێدا بوو)، چیرۆکێکی تریش هەیە کە زۆر پێی سەرسام بووم تا ئەو رادەیەی جۆرێ لەئیرەیی لەناخما هەڵگیرسان، ئەویش یەکێکە لەچیرۆکەکانی (هەزارو یەك شەوە) ئێستا لەبەردەستما نییەو چیرۆکەکە باس لەو ماسیگرە دەکات کە داوا لەژنی ماسیگرێکی دی دەکا کە قوروقوشمی تۆڕەکەی بداتێ و پەیمان بەژنەکە دەدا یەکەمین ماسی راوی کرد بیدا بەو، هەربۆیە یەکەم ماسی کە راوی دەکات دەیداتە ژنەکە، کاتێ ژنەکە ماسییەکە هەڵدەدڕێ تا بیبرژێنێ، لەناو گەدەی ماسییەکەدا پارچە ئەڵماسێك دەدۆزێتەوە بەقەوارەی گوێزێك، سەرەڕای ئەوەی بەچیرۆکەکە سەرسام بووم، چونکە لەگەڵ ئەوەی هێجگار ساکارە چێژ بەخشیشە، بەڵام ئەوەی لێرەدا بەلامەوە گرنگە یەکێك لەمەتەڵەکانی ئەو رەگەزە ئەدەبییەمان بۆ دەخاتەڕوو: ئەو کەسەی تۆڕەکە بەقەرز دەداتە ماسیگرەکە ژن نەبوایە پیاو بووایە، چیرۆکەکە بەتەواوی سیحرەکەی خۆی لەدەستدەدا، بەڵکو ئەو چیرۆکە هەر لەبنەڕەتدا نەدەبوو، بۆ؟ کێ دەزانێ؟ ئەمە یەکێکە لەنهێنییەکانی رەگەزێکی ئەدەبی کە لەبەر نایابییەکەی تەمومژاوییە، بەڵام رۆمانەکانی سێرڤانتس نموونەیەکی راستەقینەی ئەم حاڵەتەیە، هەرچەندە زۆربەیان رۆمان نین، بەڵکو چیرۆکن بەپێچەوانەشەوە بۆ نموونە جۆزیف کۆنراد (المبارزون)ی نووسیوە کە چیرۆکێکی نموونەییەیەو سەدوبیست لاپەڕەیە، کەچی هەمیشە بەڕۆمانی حیساب دەکەن لەبەر درێژییەکەی، هەروەها (ریدلی سکۆت)ی دەرهێنەر کردوویەتی بەفلیمێکی سینەمایی بێئەوەی شووناسی خۆی وەکو چیرۆکێك لەدەست بدا، لێرەشدا دەبەنگییە گەر بپرسین ئاخوا کۆنراد زۆر گوێ بەو تێکەڵ و پێکەڵییە دەدا کە کارەکەی تێیکەوتووە؟

چڕکردنەوەو یەکێتی ناواخن دوو گرنگترین شتی ناو چیرۆکن، بەڵام ئەمە لەڕۆماندا ئەو بایەخەی نییە، بەڵکو بۆ خۆشبەختی رۆمان وەسیلەی تری هەیە بۆ قەناعەت پێهێنان و کارتێکردن، لەبەرئەوە کە مرۆڤ کورتە چیرۆکێك دەخوێنێتەوە دەتوانێ خەیاڵ لەوە بکاتەوە کە پێشتر روویداوەو دواتریش روودەدا هەموو ئەمەش بەشێکە لەکەرەسەو سیحری ئەوەی خوێندویەتییەوە، بەڵام رۆمان بەپێچەوانەی ئەمەوەیە، هەموو شتێکی لەناخیا هەڵگرتووە. لەبەرئەوە لێرەدا دەتوانین بڵێین کە جیاوازییەکە هەر لەبنەڕەتدا پەیوەندی بەڕای تاکە کەس خۆیەوە هەیە وەکو هەر مەسەلەیەکی ئیستاتیکی تر لەژیاندا.

لەو نموونانەی کە لەسەر بنەمای چڕکردنەوەی گێڕانەوە بنیاتنراوە دوو چیرۆك هەیە کە بەگەوهەری ئەو رەگەزە ئەدەبییە دەناسرێ (قدم

قــرد)ی ولــیم ویمــارك جــاكۆبیس و (الرجــل فی الشارع)ی جۆرج سیمۆنن.

رۆمــانی پۆلیســی لــەو جیهانــە جیــاوازە تایبەتــەی خۆیــدا بۆخــۆی و لەخۆیــەوە دەژی و بەردەوام دەبیٚ، چونكە زۆربەی ئەوانەی ئالوودەی ئەو جۆرە چیرۆكەن زیاتر بایەخ بەچنینی چیرۆكەكە دەدەن نەك مەتەڵەكە، بەتەنیا ئەو شاكارە دێرینە بیٚ وێنەیــەی (ســۆفۆكلیس) نــەبیٚ (ئۆدیبــی شــا) كــە پشكنەرەكە بۆی دەردەكەویٚ كە خۆی باوكی خۆی كوشتووە.

بــەلای منــەوە چــیرۆك ئــەو رەگــەزە ئەدەبییــە سروشــتییەیە كــە لەگــەڵ مرۆڤایەتیــدا رێكدەكــەویٚ، چــونكە خۆرِســكانە تێكــەڵی ژیــانی رۆژانــە دەبــیٚ، رەنگــە یەكــەم كــەس كــە چــیرۆكی داهێنابێــت بــەبیٚ ئەوەی بەخۆی بزانیٚ پیاوی ناو ئەشكەوت بووبیٚ، ئــــەوەی رۆژیٚ لــــەرۆژان چــــووە بــــۆ راوو ئــــیتر نەگەرِاوەتــەوە تــا رۆژی دوایــی بــەبیانووی ئــەوەی لەشــەرِێكدا بــووە تــا رادەی مــردن لەگــەڵ ئــاژەڵێكی درِندەدا كە لەبرساندا شێتگیر بوو بوو، بەڵام دوای ئــەوەی كــە ژنەكــەی دەزانــیٚ ئــەو پاڵەوانێتییــەی مێردەكــەی هــیچ نــەبووە جگــە لەچــیرۆكێك كــە مێردەكــەی خــەیاڵی خــۆی دروســتی كــردووە، ئــیتر دەكــریٚ ئــەوە بەیەكــەم و درێــژترین رۆمــان دابنــریٚ لەچــاخی بەردینــدا. نــازانم چــی ســەبارەت بــەو گریمانەیــەت بڵــێم كــە دەڵێــی: چــیرۆك پشــوویەكە لــەنێوان دوو رۆمانــدا، رەنگــە ئــەوە تیۆرێــك بێــت و شــــایانی لێكۆڵینــــەوە بێــــت، بــــەڵام ئــــەوە هــــیچ پەیوەندییــەكی بەئەزموونــەكانی منــەوە نییــە وەكــو نووســەرێك. مــن لەتاریكیــدا رێــی خــۆم ئەدۆزمــەوەو ئەوێرم بیر لەوە بكەمەوە كە گەلیٚ نووســەر هــەوڵیان داوە لەهــــەمان كاتــــدا هــــەردوو ژانــــرە ئەدەبییەكــــە بنووسن، بەڵام زۆربەی جار نەیانتوانیووە لەهەردوو بوارەكــەدا وەكــو یــەك ســەركەوتوو بــن، لەوانــە بــۆ نموونــە: ویلیــام سومەرســت مــۆم كــە زۆربــەی كارەكــانی وەكــو هەمــەنگوای گوێزراونەتــەوە بــۆ ســینەما، لــەنێو چیرۆكەكانیدا چیرۆكێكی هەیــە كــە بیرم ناچێتەوە بەناوی (پی ئەند ئۆ) كە چیرۆكێكی درامــــی دڵرِەقانەیــــە ســــەبارەت بــــەو ئینگلیــــزە دەوڵەمەندەی بەنزگەرە لەنێوەندی زەریای هیندیدا دەكریٚ.

ئەرنست هەمەنگوایش حاڵەتەكەی لەو دەچیٚ و لەســــینەماداو بەكتێبــــەكانی ناســــراوە، بــــەڵام لەمێــژووی ئەدەبــدا لەمیانــەی چــەند چــیرۆكێكی پێشــەنگییەوە نــەمر دەبــیٚ. ئەگــەر لەژیانیشــی بكۆڵیتــەوە دەبــینی بــەهرەی راســتەقینەی لەكورتــە چیرۆكدا بووە. بەلای منیشــەوە باشــترین بەرهــەمی، لەنێو بەرهەمە درێژەكانیدا نییە، بەڵكو دوو چیرۆكن كـە كورتترینیـانن (عصـفور كنـاري للاهـداء) و (قـط تحـت المطـر) سێیەمیشـیان كـارێكی درێـژە بـەناوی (الحیاة السعیدة القصیرة لفرانسیس ماكوبر).

***

سەبارەت بەگریمانەكەی ترت كە كورتە چیرۆك جۆرێكــە لەمەشــقكردن بــۆ خــۆ ئامــادەكردن بــۆ رۆمانێك، دانی پێدا دەنێم كە من بەرِاستی ئەمەم كردووە، ئەوەش خراپ نەبوو تا فێربم و بزانم چۆن رۆمانی (پایزی پەتریارك) بنووسم. هزرم هێشتا بەو شــێوازە تەقلیدییــەی (ســەد ســاڵ تــەنیایی)ــەوە بەسترابووەوە كە دوو ساڵی تەواو بیٚ وەستان كارم تیــاكرد، ئــیتر دوای ئــەوە هەرچــییەكم دەنووســی هــــەروەكو ئــــەو دەرئەچــــوو، هــــیچ پێشــــكەوتنێكم بەدەســتنەدەهێنا بــۆ نووســینی كــارێكی جیــاواز. هەرچییەكیش سەبارەت بەدنیا نەمرەكەی دیكتـاتۆر نووسـرابوو بـەو شـێوازە تەقلیدییـەی لەكتێبـەكانی پێشـــوودا هەیـــە لەدووســـەد پـــەرە زیـــاتر نـــەبوو، دووســــەد پــــەرەی وەرِســــكەرو بــــیٚ كــــەڵك كــــە مــــرۆڤ تووشی بەدهەرسی دەكا. بەمجۆرە برِیارم دا بەدوای سەركێشــییەكدا بگــەرِێم لــەم داوی ئەكادیمیانەیــە

دەرمبهـــێنیْ و بـــانگی خوێنـــەر بکـــەم بـــۆ سەرکێشییەکی نویْ.

ئەوەی بۆی دەگەڕام لەکۆمەڵیْ بیرۆکەی چەند کورتـە چـیرۆکێکمدا دۆزیمـەوە کـە نووسـینیانم دواخسـتبوو، بـەبیْ هـیچ شـەرم کردنێـك خـۆم لەکۆمـەڵێك ئەزموونـدا نقـووم کـرد تـا ئـەوەی دەمویست بۆ کتێبە نوێیەکەم بیدۆزمەوە، کۆمەڵیْ چیرۆکی ئەزموونی بوو کە زیاتر لەساڵێك کارم تیادا کردو دواتر لـەکتێبێکی سـەربەخۆدا بڵاوم کـردەوە بـەناوی (ارنـدیرا الطیبـة، بلاکمـان بـائع المعجـزات الطیـب، الرحلـة الاخـیرة للمرکـب الخفـي). ناونیشـانەکە هـەمووی یـەك رسـتەیە بـیْ خاڵبەنـدی جگە لەو فاسیلانەی کە پێویستن بۆ هەناسـەدان، ئا بـەمجۆرە نـاوکی پـایزی پـەرتریارکم دۆزییـەوە کـە لەزەڵاتەی سەوزەی رووسی دەچوو، کتێبەکە بریتی بـوو لەکۆمـەڵیْ شـت کـە لەئـەزموونی چـەندین نووسـەری خـراپ و بـاش-ی سـەدەکانی رابـردوو وەرگیرابوو، ئەو گوزارانەی کە پێویستی بەچەندین لاپـەڕە بـوو ئـیتر لـەدوو تـا سـیْ لاپـەڕە زیـاتری نەدەویست تا هەمان مەبەست بپێکیْ لەگەڵ هەندیْ ئـاژاوەو سیسـتم بەزانـدنی بـەردەوام و لادان لەرێزمانی ئەکادیمی.

ئەو کتێبی رزگارکردنە بەراستی کارەساتێکی بازرگانی بوو، چونکە زۆر لەخوێنەرە دڵسۆزەکانی (سـەد سـاڵ تـەنیایی) هەسـتیان کردبـوو فێڵیـان لێکراوە، داوایان لەفرۆشیارەکان کردبوو پارەکانیان بدەنەوە، ئەوەی قوڕەکەی خەستتر کردەوە ئەوە بوو کە چاپە ئیسپانییەکەی هەڵەیەکی تەکنیکی تیا بوو کـە کتێبەکـە هـەر ئەوەنـدەی بەدەسـتەوە دەگـیرا، هەڵدەوەشـا تـا هەنـدیْ لـەهاوڕێکانم بەسـوعبەتەوە پێیان دەوتم رۆمانەکەتم پەڕە پەڕە خوێندەوە.

هەنـدێك خـۆڕاگر بـوون و خوێندنەوەکـەیان تەواوکرد، بەڵام هەندێکی تر نەیانتوانیبوو لەنیوەی زیاتری بخوێننـەوە، بـەڵام دواجار ژمارەیـەکی باش دیلـم لـەلا مایـەوە کـە یارمەتیـدام لەسـەر پیشـەکەم بـــەردەوام بم. ئـــەمڕۆ ئـــەو رۆمانـــەم لەهـــەموو رۆمانەکانی تـرم لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوەی لەسـەر دەکـریْ لـەزانکۆ جیاوازەکانـدا لەوانەیـەو نـەوە نوێیـەکان کـە دەیخوێننـەوە وەکـو گەڕانـەوەی تـەرەزانێکی دووسـەد سـاڵە بیخوێننـەوە، ئەگـەر یـەکێکیش بـەدڵی نـەبوو لەپەنجەرەکـەوە هەڵیدایـە خوارەوە ئەوە لەبەرئـەوە نییـە پێـی سەرسـام نییـە، بەڵکو لەبەرئەوەیـە کـە تێـی ناگـا، هەنـدێجاریش بـۆ خۆشـبەختی یـەکێك دەبـیْ لەسـەر زەوییەکـە هەڵیگرێتەوە.

تێبـــینی: ســـەبارەت بەپرســـیارە راستەقینەکەشت-وەکو وتم- نازانم داخۆ خوێنەران دەتـوانن چـاوەڕوان بـن، بـەڵام بەڕاسـتی بـیر لەبڵاوکردنـەوەی کۆمـەڵێکی تـر لەکورتـە چـیرۆك دەکەمەوە، واش بڕیارە سیْ چیرۆك لەخۆبگریْ کە هەریەکـەیان پـەنجا لاپـەڕە بـیْ. هێشـتا چـیرۆکی سـێیەمم تـەواو نـەکردووە ئینجـا دوای ئـەوە دەبـیْ بەسەریاندا بچمەوە تا ئێستاش هیچ ناونیشانێکم بـۆ دانـەناوە بەتـەماش نـیم بـڵاوی بکەمـەوە، پـێش بڵاوبوونـەوەی بەشـی یەکـەمی یادەوەرییـەکانم، بەدڵنیاییشەوە ناتوانم ئەمڕۆ تەواوی بکەم، چونکە سەرقاڵی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەم، چ ئەرکێکی قورسە، وا نییە؟

**سەرچاوە**

بەشێك لە کتێبی (غريق علي أرض الصلبة)

مجموعة مقالات

ت/ مها عبدالرؤف

دار میریت

# ئەو شێوازەی کە نەنکم ڕاهاتبوو چیرۆکان بگێڕێتەوە

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن



ڕیالیزمی جادووگەری: وەك زۆربەی نووسەرانی ئەمریکای لاتین، گابریل گارسیا مارکیز پەیوەست بووە بەستایلێك لە ئەدەب کە بە "ریالیزمی جادووگەری— سیحراوی" ناسراوە. ئەم ئەدەبە هەڵگری کۆمەڵە خەسڵەتێکە کە هەر هەموو ڕەگەزەکانی لەناو تانوپۆو چنینێکی فانتازیادا خۆیان دەنوێنن کەپشت ئەستووره بە زێدەڕۆیی خەیاڵ. هەڵبەت ئەو زاراوەیە بێ مشتومڕ و بەرپەرچدانەوە تێنەپەڕیوە، لەبەر چەندەها هۆی جیاواز هێرشی کراوەتە سەر.

هەندێك بڕوایان وایە کە ئەو ناوە شتێکە لە پاشماوەکانی (پاش کۆلۆنیالیزم)، ئەو خانەبەندییە دەستکردی (سپی پێستەکان)ە تاوەکو رۆمان و چیرۆکی میللەتانی دیکە بخەنە پەراوێزەوە. هەندێکی دیکە وای بۆ دەچن کە ئەوەش مەیلێکی ئەدەبییە و تێدەپەڕێت، یان شتێکی کۆن و بەسەرچووە، یان تەنها هەڵلایەکە و ئەمریکای لاتین کەڵکی لێ بینیوە. هێشتا هەندێك کەس هەست دەکەن کە زاراوەی "ریالیزمی جادووگەری" مانایەکی سنووردار و بەرتەسکی هەیە، هەوڵێکە کە



ئەدەبی ڕۆمان و چیرۆك كە جێی مشتومڕ و پرسیارە و جیهانێكە تۆكمەو دامەزراوو خاوەن مێژووە، ڕێبازی "ڕیالیزمی جادووگەری" خۆی جیا دەكاتەوە و ئامادەنییە بكەوێتە ژێر پرسیارەوە.

لە ڕاستیشدا زاراوەكە سنووردارە. زاراوەی "ڕیالیزمی جادووگەری" لە بنەڕەتدا پەیوەست بووە بە قوتابخانەیەكی تایبەت بە وێنەكێشەكان، لە ساڵی (1920)دا، پاشان بۆ وەسفكردنی ئەدەبی پەخشانی (خورخە لویی بۆرخس) بەكاریان هێنا لە ئەرجەنتین. سەرەڕای وەسفی ئەدەبی كەسانی وەك گابریل گارسیا ماركیز لە كۆلۆمبیا، گونتەرگراس لە ئەلمانیا و جۆن فاولز لە ئینگلتەرە. ئەم نووسەرانە یەكانگیر دەبن لەوەی بەشێوەی جیاجیا دەكەونە ناو ئەم بازنەیە، بەڵام شێوازێكە كە بەردەوام دەگۆڕێت، جۆرێكە لە ڕیالیزم كە كەڵك لە ڕووداوی ئاسایی وەردەگرێت و لە پاڵ كۆمەڵێك شت و وردەكاری ژیانی ڕۆژانە، بەڵام لەناو قالبێكی فانتازیدا خۆیان دەنوێنن كە سەرچاوەكەی دەگەڕێتەوە ناو كۆمەڵێك ڕەگەزی خەون ئامێز و خەیاڵ بڵاوی، سەرەڕای قەرزكردن لە ئەفسانە و داستان و حەكایەتی پەرییەكان. (ڕۆبێرت شۆلز) بە جۆرێك پێناسەی (میتافیكشن – ئەودیوی ڕۆمان) دەكا وەك ئەوەی زاراوەیەكی هەمەلایەن بێت بۆ كۆمەڵە ڕۆمانێكی زۆر و گەشەسەندوو كە بەتەواوی جیا دەبێتەوە لەو جۆرە ڕۆمانە تەقلیدییانەی كە سەر بە قوتابخانەی ڕیالیزمین یان (ڕۆمانس – ڕۆمانی ئەڤینداری)، یان جۆرە داهێنانێكی ئازاد سەبارەت بە جۆری گێڕانەوە. ئەم جۆرە ڕۆمانانە بە شێوەی جیاجیا كاریگەری وایان هەیە كە دژ و پێچەوانەی ڕۆمانی تەقلیدی و ستاندارد خۆ دەناسێنن، جیاواز لە هەڵبژاردنی بابەت، فۆرم یان ستایلی نووسین، هەڵڕژان و بەدوایەكدیدا چوونی كات (زەمەن)، تێكەڵكردنی ژیانی ڕۆژانە و فانتازیا، ئەفسانە و مۆتەكە، بە شێوەیەك كە جیاوازی و سنوورێكی تەقلیدی ڕەسم ناكات لە نێوان ئەوەی كە زۆر گرنگ و بە بایەخە و ئەوەشی كە پڕوپووچە، ترسناك یان پێكەنیناوی، مەرگەسات یان گاڵتەبازی.

با گوێ لە ماركیز بگرین چۆن باس لە شێوازی نووسینی خۆی دەكات – "ئەو تۆونەی –نەغمە– یەی من لە ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی یان دوورەپەرێزی) بەكارم هێناوە پەیڕەوكردنی هەمان ئەو شێوازەیە كە نەنكم حەكایەتەكانی پێ دەگێڕایەوە. باسی لەو شتانە دەكرد كە لەوە دەچوون لە سەرەوەی یان دەرەوەی سروشت بن، پڕ فانتازیا، كەچی بەشێوەیەكی زۆر ئاسایی و واقیعی دەیگێڕایەوە.. لەهەمووی گرنگتر ئەو هەست و سۆز و تەعبیرە بوو كە لەسەر ڕووخساری دەمخوێندەوە، هەست و سۆزێك كە هەر هەموومانی سەرسام دەكرد. زوو لە هەوڵەكانی پێشینمدا بۆ نووسین، هەوڵمدەدا كە چیرۆكان بگێڕمەوە بێئەوەی بڕوام پێیان هەبێت، واتا بڕوا بەو بابەتەی كە دەمنووسی. پاشان هەستم كرد كە ئەوەی پێویستە بیكەم سەبارەت بە نووسینەكانم و خۆم بتوانم بڕوایان پێ بكەم، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی كە مەرجە من هەمان ئەو هەست و سۆز و دەربڕینەم هەبێت كە نەنكم هەیبوو: بەڵام لەسەر دەم و چاوێك كە وەك نیگارێك كە لەسەر ڕووخسارێكی بەردین داتاشرابێت."

سەرچاوە

*2003 The Washington Post Company*

# بۆنی گەواڤە

گابریل گارسیا ماركیز
پیاچوونەوە و ئامادەكردنی: ڕەووف بێگەرد




(بۆنی گەواڤە) بەرهەمێكی هاوڕێی دێرینی ماركیز – مندوزا–یە كە بەتێر و تەسەلی قسەی لەگەڵدا كردووە و خۆیشی چی لە ژیانی تایبەتی و گشتی ئەو نووسەرە داهێنەرە زانیوە نووسیویەتی. ئێمە هەموویمان وەرنەگێڕاوە، بەڵكو چەمكی سەرەكی و لایەنە هەرە دیارەكانی ژیانی ئەدەبی و تایبەتی ئەومان لێهەڵبژاردووە، ئەم پیاچوونەوە و ئامادەكردنە ساڵی 1993 لە كتێبۆڵكەیەكدا بەناوی (بەفر و هەڵەكۆك) كە چەند بەرهەمێكی تریشی لەخۆ گرتبوو، لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی كوردستان وەك كتێبی گۆڤاری (كاروان) چاپكرا. لەبەر گرنگی بابەتەكە و دەوڵەمەندكردنی فایلەكەی ماركیز و، ئەو ماوە زۆرەیش كە بەسەر بڵاوكرانەوەیدا تێپەڕیوە و گەلێك لە خوێنەرانی ماركیز نەیاندیوە، بەچاكمان زانی جارێكی تر لێرەدا بڵاوی بكەینەوە.

سەردەم

"بیلینیو بولیو مندوزا" لە نووسەرە ناودارەكانی كۆلۆمبیایە، بێجگە لەوەی هەر لە

کۆلۆمبیادا سەرنووسەریی چەند گۆڤارێکی کردوە، لە ساڵەکانی شەستیشا بۆتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی -لیبر- کە لە پاریس دەرچوە و گەورە نووسەرانی نەوەی نوێی ئەدەبی ئەمەریکای لاتین کە بە پێشڕەو ناو دەبرێن هاوبەشیان تێدا کردوە. "مندوزا" لە ڕۆماننووسە گەورە ودیارەکانی کۆلۆمبیایشە کە ساڵی 1979 لەسەر ڕۆمانی "ساڵانی هەڵاتن" خەڵاتی بلازا جانیزی وەرگرتووە. "مندوزا" لە هاوڕێ هەرە نزیکەکانی ڕۆماننووسی مەزنی کۆلۆمبی (گابریل مارکیز)ە، بەیەکەوە لە هەندێك لە ڕۆژنامە و گۆڤاردا کاریان کردوە، بێجگە لەوەی کە ژیانی تایبەتی و گەلێك ئاشکراو نهێنیان پێکەوە بەسەر بردوە. مارکیز لای خوێنەری کورد ناوێکی هەرە دیارە و خاوەنی ڕۆمانی "سەد ساڵ تەنیایی"یە کە ساڵی 1982 خەڵاتی نۆبڵی جیهانی لەسەر وەرگرت، "مندوزا"ی نووسەر و هاوڕێ لەبەر خۆشەویستی مارکیز و بۆ ئەوەیش کە چاکتر خوێنەر بەو گەورە نووسەرە بناسێنێ و لە دەمی خۆیەوە باس لە ڕۆمانەکانی و ئەدەبی ئەمەریکای لاتینی بە گشتی و ژیانی تایبەتی خۆی و پەیوەندیەکانی (ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی) بکات، کتێبێکی نووسیوە، کە گفتوگۆی نێوان خۆی و مارکیزە، ئەم کتێبە کە ناوە عەرەبیەکەی (رائحة الجوافة)یەو 139 لاپەڕەی مامناوەندیە زوربەی لە شێوەی پرسیار و وەڵامی ڕۆژنامەگەری نێوان هەردووکیاندایە، چەند فەسڵێکی کەمیشی خودی مندوزا بە زمانێکی چڕوپڕی پەخشانی شیعر ئامێز نووسیوە. ئەوانەیش هەر زانیاری تازەن دەربارەی لایەنە شاراوەکانی ژیانی مارکیز، بۆ ئەوەی خوێنەری کورد زیاتر لە ئەدەبی ئەم سەردەمەی ئەمریکای لاتین و بەتایبەت لە مارکیز و تایبەتمەندیەکەی شارەزابێت، بە ئەرکی خۆم زانی گوڵبژێری هەندێك لەو گوڵە بەڕەنگ و بۆیانەی بۆ بکەم و پوختەیەك لەو گفتوگۆ دەوڵەمەندەی بخەمە بەر دەست، ئەم کتێبە لەلایەن (فکری بکر محمود)ەوە لە ئینگلیزییەوە کراوەتە عەرەبی و لە ئەردەن چاپکراوە. کتێبەکە چواردە فەسڵە لەگەڵ پێشەکیەکی وەرگێڕدا. مندوزا چواردە فەسڵەکەی وا ڕیزکردووە:

(1-ڕەچەڵەك 2-خێزانی مارکیز 3-پیشە 4-پەروەردەی ئەدەبی 5-خوێندنەوەی 6-کارەکانی 7-چاوەڕوانی 8-سەد ساڵ لە تەنیاییدا 9-پاییزی پەتریارك 10-ئێستا 11-مەیلی سیاسی 12-ئافرەت 13-پڕوپوچ و دڵە راوکێ 14-ناوبانگ)

پێشەکی وەرگێڕە عەرەبیەکە پێناسەیە بە ئەدەبی ئەمریکای لاتین و ئەو گۆڕانە بنەڕەتییەی کە لە سەرەتای سییەکانی ئەم سەدەیەدا بە سەریا هات، کە وەك دەنگێکی هەرە دیار و ناوازە خۆی لە چاولێکەری و پەیرەوکردنی ئەوروپا و ئەمریکا ڕزگار کرد، لە سەرەتای ساڵەکانی پەنجایشەوە ڕۆمانی ئەمریکای لاتینی بووە جێگای باس و خواسی سەرەکی، چ وەك بەکاربردنی زمانی تازەی نووسین کە زۆر لە زمانی لەوەوبەری ئەمریکا و ئەوروپا جیاوازەو، چ وەك هێنانە کایەی ناوەڕۆکی نوێ کە بە قووڵایی گیانی واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی و داب و نەریتی هەرە تایبەتی و خولیا و ئاواتەکانی ئەو وڵاتانەدا ڕەگی داکوتاوە، لە پێشەنگەکانی ئەم ڕێبازە ئەدەبیە (ئەلیخو کاربنتیەو کارلوس فونتیس و گارسیا مارکیز)ن.

مارکیز، لە ڕۆماننووسە سەر ئامادەکانی ئەم سەردەمەیە و خاوەنی شێوازی ڕیالیزمی جادویی (واقیعی سیحری)یە ئەم شێوازە وەك خۆی ئەڵێت: پڕبەپڕی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتی و سیاسیەیە کە ئەمریکای لاتینی تیا ئەژی، لەوێ هەموو دیاردەو ڕووداوەکان ئەمەندە سەیر و سەمەرەن کە هەر لە ئەفسانەو حیکایەتی پڕوپووچا ڕوو ئەدەن، بۆیە ئەبینین لە ئەدەبی مارکیزدا ڕووداوەکان کوت و پڕو بەردەوام شتی نا ماقووڵ و باوەڕپێنەکراو دێنە



گۆڕێ، کە زیاتر لە جیهانێکی دروستکراو ئەچێت نەك واقیع، کە لە ڕاستیا هەموویشی واقیعن، چونکە وەك خۆی ئەڵێت (لەم جیهانی سێهەمەدا ناماقووڵ بۆتە ماقووڵ و بە پێچەوانەیشەوە). کەواتە ئەدەبەکەی ئەدەبێکی واقیعیە و پەیوەستە بە هەموو پەیوەندیەکانی دەسەلآت و خەڵکی ئەو وولآتانەوە. هەر خۆی لەم بارەیەوە ئەڵێت: (لە ڕۆمانەکانما تەنیا دێڕێك نیە بنەمایەکی واقیعی نەبێت، ژیان لە ئەمریکای لاتیندا پڕە لە شتی نائاسایی). "ماکندو" ئەو شارەی خەیاڵی مارکیز نەخشەی کێشاوە شارێکە هەیە و جێگایەکی لەسەر ئەم ئەستێرەیە گرتووە، نەك تەنیا لە کۆلۆمبیای ئەمەریکای لاتیندا بێت بەڵکوو هەموو جێگایەکی ئەم سەرزەویە "ماکندو"یەکە بۆ خۆی.

لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا کە بەناوی ڕەچەڵەکەوەیە "مندوزا" باسی ئەو ژینگەیە ئەکات کە مارکیزی تیا پەروەردە بووە. لە سروشت و دانیشتوان و ماڵ و موڵکی تایبەتییەوە تا ئەگاتە سەر یەکە یەکەی خێزانی مارکیز (نەنکی، باپیری، دایکی، پوورەکانی) بە تایبەتی ئەوانەیان کە کاری سەرومڕیان کردۆتە سەر پەروەردە و گەشەسەندنی گیانی خەیاڵ و شارەزابوون لە ئەفسانە و خورافات و کارەساتەکانی ناو وولآتەکەی مارکیز، کە بە پلەی یەکەم باپیری (کولۆنێل ریکاردو مارکیز هیجیا) و نەنکی (دوناترا تکیلینا)یە. هەر بە منداڵی ئالوودەی باپیری بووە و ئەویش هەمیشە لەگەڵ خۆیدا گێراویەو گوێی بۆ پرسیارەکانی ڕاگرتووە، کە نەیتوانیبێت وەڵامی بداتەوە پێی وتووە (لێگەڕێ با سەیری فەرهەنگی بۆ بکەین) هەر جارێکیش تیپی سێرك خەیمە و خەرگای لە شارۆچکەکەدا هەڵئەدا، ئیتر باپیرەی دەستی کچەزاکەی ئەگرت و لەگەڵ خۆیدا بۆ تەماشاکردنی ئەبرد، لەوێ ژیانی قەرەج و هونەرمەندانی ترابیز و حوشتری عەرەبی ئەبینی.

لەیەکەم ڕۆمانیدا باپیری کەسی سەرەکیە، تەمەنی حەفتا ساڵە و لە شەڕی ناوخۆی ساڵی 1889–1902 بەشداری کردوە، لەم شەڕەدا نزیکەی سەد هەزار کەسی کوژراوە، باسی مەترسی ئەو شەرە، گەمارۆدان، تۆپ باران، بریندار و کوژراو باپیری بۆ منداڵێکی تەمەن پێنج ساڵانی گێراوەتەوە، ئەمانە بوونە شەپۆلی پڕ لە هەڵچوون و لە گەورەییدا خۆیان بە کەناری یادگارەکانی مارکیزا کێشا و بەرهەمی مەزنیان لێ ڕسکا. نەنکیشی (وەك زۆر لە نەنك و دایکە چاوکراوەکانی کوردەواری زووی خۆمان –و) چاوی مارکیزی بە چیرۆك و حیکایەتی دێو و درنج و ئەفسانە کردۆتەوە، هەر ئەمەیش بۆتە فراوانکردنی ئاسۆی خەیاڵی مارکیز و تۆوی ڕۆماننووسینی، یان با بڵێین (شێوازی ڕیالیزمی جادویی) تیاڕواندوە.

(کە شەوە تاریك و سامناکەکانی ئیستوایی چۆکی دائەدایە سەر ماڵەکەیان ئیتر نەنە "دوناترا تکیلینا" دەستی بە گێرانەوەی چیرۆکی ترسناکی پڕ لە تارمایی و مەرگ ئەکرد، ئەوسا مارکیز کە تەمەنی لە پێنج ساڵیا بوو، وای هەست ئەکرد هەموو لایەکی ماڵەکەیان بە مەرگ تەنراوە، ئیتر وەك بە بزمار بە کورسیەکەی ژێریەوە داکوترابێت کرومت ئەبوو، ئێستایش.. دوای نزیکەی پەنجا ساڵ، کە مارکیز لە نیوەی شەوی ئوتێلەکانی ڕۆما و بانکۆك بەخەبەر دێت، ئەو ترسە کۆنەی منداڵی لەبەرچاویا بەرجەستە ئەبێت، مردووە نزیکەکانی لەناو تاریکیا بە دەوریا دێن و دەچن).

مارکیز تاقە کوڕی نێو کۆمەڵێك ئافرەتە، خێزانەکەی خۆ پارێزو دەربەستی دابونەرێتی کۆمەلآیەتین و زۆریش بە گرنگ گرتوویانە، هەموو ئافرەتەکان بڕوایان بە خورافاتە و شتە نا سروشتیەکانیان لا سروشتیە و لەسەر یادگاری کۆنینە ئەژین. بۆ نموونە پوورە (فرانسیسا سیمونیسا) کە ئافرەتێکی بە توانا و وورە بەرزە



ڕۆژێك دەستی کردە کفن دوورین بۆ خۆی، گابریل لێی پرسی پوریٚ ئەم کفنە بۆ دروست ئەکەیت؟ وەڵامی دایەوە: (کوڕەکەم من ئەمرم) لە ڕاستیا هەر کە لە دوورینی کفنەکە بووەوە لەسەر جێگاکەی ڕاکشاو مرد. باوکی مارکیز کار بەدەستی دەزگای بروسکە بوو، لە ناوچەی (بولیڤار)ەوە هاتبووە شاری (ئەراکاتاکا) کە لویزای کچە کۆلۆنیل و هەرە جوانی ئەو شارەی بینی حەزی لیٚ کرد و ناردیە خوازبێنی. بەڵام خێزانی لویزا بەوە قایل نەبوون کچ بدەن بە مووچەخۆرێکی تەلگراف، بە تایبەتی کە خەڵکی ناوچەی (بولیڤار) بێت و ئەو ناوچەیەش لە چەقۆکێشی و بەد ڕەوشتیا بە نامێن. بۆ ئەوەی لویزا لەم کوڕە دوور بخەنەوە بە سەفەرێکی دووروودرێژ لەگەڵ دایکیا ناردیان بۆ شارێکی کەنار دەریا، بەڵام هەوڵێکی بیٚ سوود بوو، چونکە لە هەموو ئەو شارانەدا نووسینگەی تەلگراف هەبوو کە موچە خۆرەکانی لەگەڵ هاوڕێکەی (ئەراکاتاکا)یاندا هاوکاربوون و نامەی خۆشەویستی ئەویان بە کچەکە ئەگەیاند. پەیوەندی ئەوینی ئەم کوڕ و کچە (کە دەبنە باوك و دایکی مارکیز) خێزانی کچەکەی ناچار کرد سەر بۆ واقیعەکە دابنەوێنن و لویزا بدەن بە گابریل الیجو، (لە ڕۆمانی "خۆشەویستی لە تاقی ڕشانەوەدا" تەواوی ئەم پەیوەندی ئەوینە لە نێوان، (فلورینتواریسا) موچەخۆری تەلگراف و (فیرمیناداسا)دا هەیە، بە هەموو کارەساتی قایل نەبوونی خێزانی کچە و خۆونکردن و نامە نهێنیەکانەوە، زۆر لە سیفەت و بەهرەی تایبەتی "فلورینتو" لە باوکی مارکیزیشدا هەیە، وەك لاوازی و گەنم ڕەنگی و جلوبەرگ و کەمانچەژەندن و حەزی خوێندنەوەی شیعر، بەڵام لە ڕۆمانەکەدا پەیوەندیە خۆشەویستیەکە ناگاتە قۆناغی ژن و مێردی، تا لە نزیکەی تەمەنی حەفتاساڵیدا ئارەزووەکەی گەنجیان بە ناشەرعی بەدی دێنن -/ب).

بەشی دووەمی کتێبەکە گفتوگۆی نێوان مارکیز و مندوزایە دەربارەی خێزانی مارکیز. مندوزا پرسیاری دەربارەی (باپیری، دایکی، باوکی، ژنەکەی، منداڵەکانی، هاوڕێکانی) لیٚ دەکات، مارکیز جارێکی تر ئەوە دووپات دەکاتەوە کە باپیری زۆر کاری لێکردووە و لەوەوە لە ژیان گەیشتووە، بەڵام دوای تەمەنی پەنجا ساڵی هەستی بەوە کردوە کە باپیریشی چاك لە ژیان نەگەیشتووە.

دەربارەی ئەوەیش کە ئایا هیچ پاڵەوانێکی ڕۆمانەکانی لە باپیری ئەچن مارکیز ئەڵێت: تاقە کەسێك کە لە باپیرم بچێت کۆلۆنێلە بیٚ ناوەکەی ڕۆمانی (گەڵاڕێزان)ە کە لای خۆمەوە وام داناوە و مەرج نیە لای خوێنەر وا بکەونەوە، چونکە لە ڕۆمانەکەدا وەسفی کۆلۆنێلەکە نەکراوە، بەڵام سەبارەت بە کۆلۆنیل "ئوریلیانو بویندیا" کە لە ڕۆمانی "سەد ساڵ تەنیایی"دایە و مندوزا باوەڕی وایە نموونەی باپیری مارکیزە. مارکیز ئەڵێت: تەواو بە پێچەوانەی باپیرمەوەیە.

پەیوەندی مارکیز لەگەڵ دایکیا هەر لە منداڵیەوە بناغەیەکی پتەوو لەسەر ڕاگۆڕینەوە و لە یەك حاڵی بوون بنیات نراوە. بە جووتە لە دەرگای هەموو باسێکیان داوە و چەند و چوونیان لەسەر کردوە، کە زیاتر شێوەی ڕەسمی وەرگرتووە نەك خۆشەویستی و ئالوودەیی. مارکیز لایوایە کە ڕەنگە هۆی ئەم ووشکایەتی پەیوەندیە لەوەوە بێت کە دوای مردنی باپیری و پاش فامکردنەوەی تەواوی مارکیز و چوونەوە لای دایك و باوکی، دوای ئەوەیش جیابوونەوەیەکی تری دوای تەمەنی دوانزە ساڵی بەهۆی خوێندنەوە و کەم بینینیانەوە ئەمە هاتبێتە دی. بەڵام ئێستا هەموو ڕۆژانێکی یەکشەموان، مارکیز لە هەر جێگایەك بێت بە تەلەفون قسە لەگەڵ دایکیا ئەکات، وەك خۆی ئەڵیٚ: ئەمە لەبەرئەوە نییە - وەك خەڵکی ئەڵێن من کوڕێکی چاك بم، بەڵکو وای بۆ ئەچم ئەم

قسەکردنەی یەك شەموانم و بەو ڕێکوپێکیە بەشێکە لەو جیدیاتەی پەیوەندی هەردووکمانی پێکەوە بەستووە.

مندوزا لە مارکیز ئەپرسێت: ڕاستە دایکت بە ئاسانی کلیلی ڕۆمانەکانت ئەدۆزێتەوە؟ مارکیز ئەڵێ: بەڵێ. لە هەموو خوێنەرەکانم زیاتر ئەم غەریزەیە لە دایکما هەیە، چەندە پاڵەوانەکانم بگۆڕم و وێنەی تریان بۆ بکێشم ئەو هەستیان پێ ئەکات. ئەگەرچی پاڵەوانەکانی من بەگریّ و گۆڵن و مەتەڵۆکەیەکن بۆ خۆیان، کەچی بەهرەی دایکم بەهرەی زانایەکی شوێنەوارناسە کە هەموو پارچەکانی لەشی حەیوانێکی پێش مێژوو لێك ئەبەستیّ و دروستی ئەکاتەوە، دایکم ئاوا پەی بە کەسە ڕاستەقینەکان ئەبات کە لە پشت کەسە دروستکراوەکانی منەوەن. کە کتێبەکانم ئەخوێنێتەوە شتە زیاد و لاوەکیەکان لا ئەدات و تەنیا بڕبڕە سەرەکیەکان ئەهێڵێتەوە، ئەوەی کە جەوهەری و تەوەری کەسەکانە، لەوانەیە لە کاتی خوێندنەوەیدا گوێت لیّ بیّ کە بڵێت: (ئای.. خۆ ئەو کەسە لێرەدا بۆتە گوڵە وەنەوشەیەکی ڕاستەقینە) من پێی ئەڵێم ئەمە ڕاست نیە، بەڵام ئەمە تەنیا بە قسە ئەیڵێم و لە ڕاستیا ئەویش ئەزانێت کە من ئەزانم ئەو ڕاست ئەکات.

ئەی ئەشیّ دایکی مارکیز لە هیچ لەو ئافرەتانە نەچێت کە لە ڕۆمانەکانیدا هەن؟ مارکیز ڕای وایە کە (ئورسولا) لە ڕۆمانی سەدساڵ تەنیایدا هەندیّ سیمای لە دایکی ئەچێت و هەندێکی تری لە ئافرەتی تر. چونکە (ئورسولا) لای مارکیز ئافرەتێکی نموونەییە، بەو مانایەی نمونەی هەموو شتێکە کە تەمسیلی ئافرەت بکات.

لە ڕۆمانی (چیرۆکی مەرگێکی ڕاگەیەنراو)دا ئافرەتەکە نموونەی ڕاستەقینەی دایکی مارکیزە، تەنانەت ناوەکەیشی هەڵگرتووە. بۆیە کە دایکی ڕۆمانەکە ئەخوێنێتەوە و ناوی دووەمی خۆی – سانتیاگۆ– ئەبینێت بەسەرسووڕماویەوە ئەڵیّ: (خوا هاوار.. من هەموو ژیانم هەوڵی ئەوەم بوو ئەو ناوە ناشیرینە بشارمەوە، کەچی وا ئێستا لە هەموو دنیاداو بە هەموو زمانێك بڵاوئەبێتەوە).

مارکیز هەرگیز باسی باوکی ناکات، ئەی ئەبیّ چ یادگارێکی لەگەڵیا هەبێت و ئێستا چۆن بێت؟.

مارکیز ئەڵێت: باوکم نموونەی پیاوێکی کاریبی ساڵانی سیەکانە، ئەگەر چی ئێستا تەمەنی هەشتا ساڵە[2] بەڵام تەواو لەشی ساغە، کەسایەتی باوکم زۆر لە باپیرم جیاوازە، جیاوازی بیروباوەڕ دەربارەی دەسەڵات و ڕوانین بۆ دنیاو پەیوەندی بە منداڵەکانیەوە، بۆیە تا تەمەنی مێردمناڵیش من ڕام وابوو کە پەیوەندی من بە باوکمەوە گران و نەگونجاوە، بۆیە باوکم بە نیسبەت دایکمەوە بۆ من نەناس بووە، هەر بۆیە نەمانتوانیوە لەیەکبگەین، نەیشم زانیوە بە چ ڕێگایەك بگەمە لای و قایلی بکەم، کەچی لەگەڵ ئەم دوورە پەیوەندیەشدا هەرگیز لەگەڵ یەکترا تووشی گاشە نەهاتوین و بەیەکدا هەڵنەپژاوین. جارێك باوکم بە هاوڕێیەکی خۆی وتبوو ئەو لەو بڕوایەدایە کە من یەکێکم لەو مریشکانەی بیّ یارمەتی کەڵەشێر هاتوومەتە دنیاوە. ئەگەر چی ئەمەی بۆ گاڵتە وتبوو بەڵام ناواخنەکەی سەر کۆنەکردنێکی هێورە بۆ من، چونکە من هەمیشە باسی دایکم ئەکەم و بەدەگمەن ناوی ئەو ئەهێنم.

لە تەمەنی منداڵیا نەنکی و باپیری کاریان کردە سەر پەروەردە و دەوڵەمەندکردنی بیر و خەیاڵی مارکیز. ئەی ئەبیّ (مەرسیدس)ی هاوسەری کە تەمەنی ژن و مێردیان وا ئەگاتە (25) بیست و پێنج ساڵ[3] چ دەورێکی لە ژیاندا هەبێت؟ مارکیز ئەڵێت تا ئێستا ناکۆکیەك کە مەترسی لیّ بکرێت نەکەوتۆتە نێوانمانەوە، هۆیەکەیشی ئەوەیە کە پێش هاوسەریەتیمان چۆنمان لە شتەکان ڕوانیوە ئێستایش هەروایین، لە ڕۆمانی (سەد ساڵ



تەنیایی)دا دوو جار ئافرەتێکی وەك ئەو بە ناوو پێناسە کیمیاویەکەیەوە دەرئەکەوێت، هەروەها لە رۆمانی (مەرگێکی راگەیەنراو)دا، من ناتوانم لە رۆمانەکانماندا زیاد لەوە بەرجەستەی (مەرسیدس). بکەم ڕەنگە ئەمە سەیر بێت، بەڵام وا نییە، چونکە ئەوەندەی ئەناسم هیچ بیرۆکەیەکم لە بارەیەوە نەماوە.

لەگەڵ ئەوەدا کە مارکیز بووە ناودارترین نووسەری دنیاو پەیوەندیەکانی تەشەنەیان کرد و بە ئاسانی دەستی لێگیرنابێت، کەچی هێشتا پەیوەندی لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەیدا کە تێیئەگەن و لە حەقیقەتی شارەزان و باری ئێستای ئەزانن پەیوەندییەکی توندوتۆڵەو گەلێك جار بۆ بینینیان سەفەر ئەکات، وەك خۆیشی ئەڵێت: کاتێ هەست بە خۆم ئەکەم کە لەگەڵ ئەواندام، ئەو هاوڕێیەیش کە لە حاڵ و بارم نەگات ئەوە هاورێی دڵسۆزم نییە کە من بڕوام پێکردووە، من لە هاوڕێیەتیا جیاوازی لە نێوان ئافرەت و پیاودا ناکەم بەڵام لەگەڵ ئافرەتا بەختیارترم.

دەربارەی دوو کوڕەکەیشی ئەڵێ: من بڕواموایە کە کوڕەکانم نەك کتێبەکانم گەورەترین دەسکەوتن کە بەدیمهێنابێتن، ئەوان وەك هاوڕێم وان، کە تووشی گیروگرفتی گەورەببم هەوڵ ئەدەم لەگەڵ دایکیاندا بەشداریم بکەن، ئەگەر گرفتەکە لەوە گەورەتر بوو ڕای هاوڕێیەکم وەرئەگرم، خۆ ئەگەر زۆر گەورە بوو ئەوە ئەیشارمەوە و نامەوێت باری گران بخەمە سەر شانیان، بۆیە خۆم بە تەنیا مامەڵەی لەگەڵدا ئەکەم، ئەنجامی ئەمەیش بڕینی ڕیخۆڵەی دوانزە گرێیە کە زەنگی پڕ مەترسیم بۆ لێ ئەدات، بەڵام وەك عاشقێك ڕاهاتووم کە پێی بژیم.

بەشی سێیەمی گفتوگۆکە لە بارەی پیشەی مارکیزەوەیە، مارکیز ئەڵێت: من تەواو بەڕێکەوت دەستم دایە نووسین، ڕەنگە هەر لەبەرئەوە بووبێت کە بۆ هاوڕێیەکمی بسەلمێنم کە ئەم نەوەیە توانای ئەوەی هەیە نووسەر دروست بکات. پاشان بۆ چێژ لێوەرگرتن کەوتمە داوی نووسینەوە، دواییش داوەکە بووە عەشقێك کە لە هەموو ئەوینێکی دنیام لا خۆشەویستره. لە سەرەتادا بە ڕەهایی ئەمنووسی، چونکە هەستم بە لێپرسینەوە نەئەکرد.

لەو ڕۆژانەدا بە ئاسانی چوار پێنج تا دە لاپەڕەی کتێبێکم ئەنووسی، ئەمە دوای ئەوەی کە لە سەعات دوو یان سێی بەیانی لە کاری ڕۆژنامە ئەبوومەوە. جارێکیان بە دانیشتنێك چیرۆکێکی کورتم نووسی، بەڵام ئێستا بەختەوەرم، چونکە بە ڕۆژێك تەنیا پەرەگرافێکی چاکم بۆ نووسراوە، تا بەرەو پێش بڕۆیت کاری نووسین ئەبێتە مەسەلەیەکی گەلێك بە ئازار و بنێسە.

مندوزا لێی ئەپرسێت: ئەبوایە ئەمە بە پێچەوانەوە بوایە، چونکە تا شارەزا تر بیت نووسین ئاسانتر ئەبێت. مارکیز لە وەڵامدا ئەڵێت: بەڵام تا قاڵتربیت زیاتر هەست بە لێپرسینەوە ئەکەیت، چونکە ئەوە لە ناختا ئەچەسپێنیت کە هەر ووشەیەك ئێستا ئەینووسیت جێگای گەورەترەو کار لە زۆربەی خەڵکی دەکات.

مارکیز ناودەرکردن و تەلەفزیۆن و کۆبوونەوە و کۆنگرە و چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی خۆش ناوێت، جگەرە ناخوات و تەنیا بە ڕۆژئەنووسێت، ئەوەیش لە ژوورێکی بێ دەنگی دۆخ لە بارا، سەرماو ژاوەژاو شیرازەی بیری تێکئەدەن.

لە بارەی هەندێك لە نهێنی نووسینەوە ئەڵێت: من بیری چیرۆك و ڕۆمانەکانم لە وێنەوە دەست پێ ئەکەم، دیمەنێك کە بەچاو ئەیبینم، نەك وەك ئەو نووسەرانەی کە لە بیر و چمکەوە دەست پێئەکەن. بۆ نموونە چیرۆکی "حەسانەوەی دوانیوەڕۆی سێشەممە"م کە بە چاکترین کورتە چیرۆکی خۆمی ئەزانم لە بینینی ژن و کچۆڵەیەکی ڕەشپۆشا نووسی کە لەبەر خۆرێکی سوتێنەرا چەتریان



هەڵدابوو ئەرۆیشتن. لە رۆمانی "گەلاڕێزان"دا پیرەمێردێك کوڕەزاکەی بۆ سەر مردوویەك ئەبرد، لە رۆمانی "کۆڵۆنێل کەسی نیە نامەی لەگەلاّ بگۆڕێتەوە" پیاوێك نزیك بازاڕی بارنکیلا چاوەڕێی بەلەمێك بوو، پاش چەند ساڵێك لە پاریسدا خۆم بینیەوە کە چاوەڕێی نامە یان حەواڵەیەکی پارە بووم، بە هەمان دڵە ڕاوکێوە کە بەدەم وچاوی پیاوەکەوە بینیبووم. لە "سەد ساڵ تەنیایدا" پیرەمێردێك مناڵێکی بەدەستەوەیە و ئەیبات تا لە سێرکا شەختەیەکی پیشان بدات. (ئەو پیرەمێردە باپیری مارکیزەو منداڵەکەیش خۆیەتی و وێنەکەیش لەم ڕستەیەدایە "دوای چەند ساڵێکی دوورو درێژ و لەبەردەم تیپی سێ دارەدا، کۆڵۆنێل ئۆریلیانو بویندیا عەسری ئەو رۆژەی بیرکەوتەوە کە باوکی لەگەڵ خۆیدا بردی تا شەختەیەکی پیشان بدات).

لای مارکیز یەکەم ڕستەی نووسین زۆر گرنگە و بە تاقیگایەکی ئەزانێت کە ئوسلوب و ساختمان و درێژ و کورتی کتێبەکە دەستنیشان ئەکات، لە بارەی تەمەنی نوسینی رۆمانەکانیەوە مارکیز ئەڵێت: نزیکەی پانزە شانزە ساڵ بیرم لە رۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) کردەوە و نزیکەی دوو ساڵیش بە نووسینەوەیەوە خەریك بووم.

بە حەڤدە ساڵ (پاییزی پەتریارك)م نووسی و (چیرۆکی مەرگێکی راگەیەنراو)یش 30 ساڵی خایاند، چونکە لە سەرەتاوە ویستم بیکەمە مادەیەکی ووتاری ڕۆژانە، دوای چەند ساڵێك بیرم لەوە کردەوە بیکەمە پڕۆژەیەکی ئەدەبی، بەڵام ئەمزانی کە چەند هەڵوێستی دایکم بە تەنگمەوە دێت کاتێك کە ئەبینێ گەلێك لە هاوڕێ و خزمەکانمان ئەکەونە دوو توێی کتێبێکەوە کە کوڕەکەی دایناوە، بۆیە وازم لەوەیش هێناو چەند ساڵێکی تر بیرم لەوە کردەوە تا گەیشتمە ئەوە کە سۆنگەی هەرە سەرەکی و ڕاستیەکە لە تاوانەکەدا بدۆزمەوە، بەوەی کە –بکوژەکان نەیانئەویست تاوانەکە بکەن و هەموو توانایەکیان بەکاربرد بۆ ئەوەی یەکێك دەستیان بگرێت و کوشتنەکە ڕوونەدات–.

مارکیز بە پێچەوانەی زۆر نووسەرەوە هیچ سەرنجێك لای خۆی تۆمار ناکات تا بیکاتە کەرەسە بۆ کارەکەی، هەر شتێك ئەینووسێت هەر لەکاتی نووسیندا دێڕ بە دێڕ بەسەریانا دێتەوە و چاکیان ئەکات، تا لە کۆتایی ڕۆژەکەدا لاپەڕەیەکی پوختی دوور لە کوژاوەی ئامادە بۆ چاپی دەکەوێتە دەست، ئەمەندەیش پەڕە ئەدڕێنێ و فڕێی ئەدات وەك خۆی ئەڵێت: (عەقڵ قبووڵی ناکات) چونکە جاری وا هەیە بۆ نووسینی چیرۆکێکی دوانزە لاپەڕەیی پێنج سەد پەڕە لەکار ئەخات. باشترین جێگایش بۆ مارکیز کە تیا بنووسێت (بەیانیان دوورگەیەکی چوڵ و شەوانیش شارێکی گەورە)یە.

ئەگەرچی نەنکی بەو شێوازە هێور و وێنە دەوڵەمەندانەی چیرۆکەکانی بۆ گێڕاوەتەوە یەکەم کەس بووە تۆوی نووسینی تیا ڕواندبێت. بەلاّم "کافکا" لەو نووسەرە سەر ئامەدانەیە کە بە هەمان شێوە سەرنجی ڕاکێشاوە، مارکیز ئەڵێت: (کە ڕۆمانی مەسخی کافکام خوێندەوە تەمەنم حەڤدە ساڵان بوو، دەرکم بەوە کرد کە ئەبمە ڕۆماننووس، کاتێك بینیم چۆن بەیانیەکیان – گریگۆری سامسا – بوو بە قالۆنچەیەکی گەورە، بە خۆم ووت "نەمئەزانی تۆ ئەتوانیت ئەمە بکەیت، جا کە ئەمە لە تواناداد بێت بێگومانم بایەخ بە نووسین ئەدەم". چونکە ئەو ڕاستیەم بۆ دەرکەوت کە شێوازی ئەدەب شێوازی عەقلاّنی و ئەکادیمیەکانی پرۆگرامی قوتابخانە نییە. دوای کافکا هەمەنگوای و گراهام گرین لەو نووسەرانەن کە نهێنی نووسینیان فێر کردم.

مارکیز حەز لە فانتیازا ناکات. فانتیازا بە مانای هەڵبەستنی شتی بێ بنەمای دوور لە واقیع



کە هیچ یاسایەك نەیگرێتە خۆی، بەڵام بڕوای بەو خەیاڵە هەیە کە لە واقیعەوە سەر هەڵئەدات و واقیعیش سەرچاوەی داهێنانە.

بەشی چوارەم باس لە پەروەردەی ئەدەبی مارکیزە کە لە تەمەنی سیانزەساڵیدا مارکیز بۆ خوێندنی ئامادەیی ئەچێتە شاری (بۆگۆتا) گۆڕانێکی تری بەسەرا دێت، شارێکی هەمیشە باران و دەرنەکەوتنی ئافرەت و جموجووڵی خێرای پیاوان و هەمیشە مەیتی سەر شەقامەکان، بە کورتی دنیایەکی زۆر جیاواز لە جیهانی شارەکەی خۆی، بۆیە تووشی تەریکی و تەنیایی دێت و بەناچاری خوو ئەداتە خوێندنەوە و بۆ ئەوەی لەو واقیعە نامۆیە ڕابکات پەنا ئەباتە بەر کتێب، زۆربەی خوێندنەوەیشی بریتی بوو لە ڕۆمان و شیعر، پاشی تەواوکردنی ئامادەیی ئەچێتە زانستگای حقوق، بەڵام ئەمەندە سەر ئەکاتە سەر شیعر کە هەمیشە لەگەڵیا ئەژی، بۆیە واز لە خوێندنی زانکۆ دێنێ و ئەکەوێتە دنیای ڕۆمانیشەوە، بەتایبەتی دوای خوێندنەوەی مەسخەکەی کافکا، پاشان دیستوفسکی و تولستوی دیکنز و فلوبێر و ستاندال و بلزاك. بە هۆی هەندێ برادەرییەوە پەروەردە ئەدەبییەکەی زیاتر دەوڵەمەند ئەبێت بە خوێندنەوەی جۆییس و ڤرجینا وولف و ولیام فۆکنەر.

لە بەشی پێنجەما مارکیز دێتەوە سەر خوێندنەوەو باسی ئەو شاکارانە ئەکات کە خۆشی دەوێن، وەك گریێ ئۆدیبەکەی سۆفۆکلیسی و ئەمادیس لازار یاودی تورمس و ڕۆژانەی ساڵی پەتای دانیل دیفۆو یەکەم گەشت بەدەوری جیهانی بیجافیتا، ئەو نووسەرانەیشی کە ئەگەڕێتەوە سەر خوێندنەوەی کارەکانیان وەك جوزیف کۆنراد و سانت ئەکزبەری، چونکە شێوازیان شاعیرانە و نزیك کەوتنەوەیە لە واقیع، مارکیز ڕای وایە کە چاکترین ڕۆمان تا ئێستا (شەڕ و ئاشتی)یە، کە لێی دەپرسیت هیچ ڕەخنەگرێك شوێنەواری ئەوانی بە نووسینەکانتەوە نەبینیوە؟ مارکیز لە وەڵامدا ئەڵێت: من پەرۆشی ئەوەمە کە لەکەس نەکەم، لەو نووسەرانەیش ڕائەکەم کە خۆشم دەوێن تا نەکەومە داوی چاو لێکەریانەوە.

مندوزا: ئەی فۆکنەر؟

مارکیز: ڕاستە، ڕەخنەگرەکانیش ئەمەیان پێوتووم، بۆ ماوەیەکیش قەناعەتم کرد، لایشم گرنگ نییە، چونکە فۆکنەر یەکێکە لە ڕۆماننووسە مەزنەکان، لەگەڵ ئەوەیشدا نازانم کارتێکردنەکەی لە کوێدایە، ڕەنگە لێککردنەکە لە باری جوگرافییەوە بێت نەك ئەدەبی، چونکە باشووری وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە هەندێك ڕوویدا لەو وولاتانە دەکات کە من لە چیرۆکەکانمدا بەرجەستەم کردوون.

مارکیز دان بەوەدا ئەنێت کە کچە ڕۆماننووسی بەناوبانگی ئینگلیزی (ڤرجینیا وولف) کاری لێکردووەو، لە گراهام گرین و هەمەنگوایەوە فێری فێڵە هونەریەکان بووە. گەلێکیش سەرسام بووە بە شاعیری گەورە (نیرۆدا) و بە مەزنترین شاعیری سەدەی بیستەمی دائەنێت.

بەشی شەشەمی گفتوگۆکە دەربارەی کارەکانی مارکیزە. ئەو لەو باوەڕەدایە کە بەشێوەیەکی گشتی یەکێك لە بەرهەمەکانی نووسەر خۆی بەسەر ئەوانی تردا ئەسەپێنێ و گەلێك نووسەر هەن لەگەڵ ئەوەدا چەندان بەرهەمیان هەیە بەڵام بە یەکێکیانەوە ناوبانگی دەرکردوە کە لەوانی دی دیارترە، بۆ نموونە (سێرفانتس) چەندان چیرۆکی کورتی هەیە و کەس باسیان ناکات، یان نووسەری گواتیمالی (ئەنجیل ئەستوریاس) بە ڕۆمانی (سەرۆکی مەزن)ەوە ناوی دەرکردوە کەچی ئەگەرچی ڕۆمانێکی ناوازەیە – بەڵام ناگاتە ئاستی (ئەفسانەکانی گواتیمالا) کە هەر ئەو نوسیویەتی.

مارکیز لای وایە کە نووسەر تەنیا یەك کتێب ئەنوسێت، ئیتر ئەو کتێبە لە ژێر هەر ناوێك و بە چەند بەرگێکی جیاوازبێت، بە نیسبەت خۆیەوە (تەریکی تاقە بەرهەمیەتی کە لە هەموو بەرهەمەکانیا دووبارە ئەبێتەوە "تەریکی گرفتێکە هەموو تووشی بووین، هەرکەس بە ڕێگاو شێوازی تایبەتی خۆی تەعبیری لێ ئەکات، هەستێکی زاڵە بەسەر کاری گەلێك لە نووسەرانەوە، لەگەڵ ئەوەدا کە هەندێك نا ووشیارانە تەعبیری لێ ئەکات و منیش یەکێکم لەوانە، تاقە کتێبیی مارکیز کە لە هەموو بەرهەمێکیدایە مەسەلەی تەریکیە، لە ڕۆمانی گەلاڕێزاندا کەسە سەرەکیەکە لە تەنیاییا ئەژی و ئەمرێ، لە (کۆلۆنێل کەس نیە نامەی لەگەڵابگۆڕێتەوە) کۆلۆنێل چاوەڕوانە، لە تەنیاییەکی خودیا ئەژی و سپاردەکەی هەرپێ ناگات، لە (سەعاتی شوومدا) کوێخات لەو تەریکیەدا ئەژی کە خەڵکی شارۆچکەکە بڕوای پێ ناکەن، هەروەها لە ڕۆمانەکانی تریشیدا تەریکی و تەنیایی سیمای هەرە دیارن پێیانەوە.

مارکیز بڕوای بە ڕژێمی سۆشیالیستەو وەك خۆی ئەڵێت "پێم خۆشە هەموو دنیا بگاتە ئەم قۆناغە، بڕوایشم بەوەیە کە ئەم ئاواتەم دێتە دی، بەڵام درەنگ و زوو کەوتووە" لە باری ئیلتیزامی ئەدەبییەوە ئەڵێت: من بڕوام وایە کە ئیلتیزامی نووسەری شۆڕشگێڕ لەوەدایە چاك بنووسێت، ڕۆمانێك کە لەسەر خۆشەویستی نووسرابێت ئەگاتە ئاستی هەر ڕۆمانێکی دی، ئەرکی نووسەرەکەیە — ئەرکە شۆڕشگێڕیەکەی — کە ئەو ڕۆمانە بە شێوەیەکی باش بنووسێت، ئەوانەی بەناوی ئیلتزامەوە بەسەر نووسەرا ئەسەپێنن چی بنووسێ و چی نەنووسێ بیانەوێ یان نا هەڵوێستێکی کۆنەپەرستانەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە، چونکە کۆتی دیلیەتیی ئەکەنە ئەستۆی ئازادی داهێنانەوە.

مارکیز دەربارەی ڕۆمانەکانی ئەدوێ و ناوك و شێوەی هەموویان و یەکەم پزیسکی هەڵگیرسانی کارەسات و چۆنیەتی نووسین و چاپکردن و گرفتەکانی ڕێگای بڵاوبوونەوەیان باس ئەکات. ئەو هەموو ڕۆمانەکانی خۆی بە —واقیعی— دائەنێت و ڕای وایە واقیعەکە خۆی بێ سەرەو بەرەو نەگونجاوە، بۆیە خوێنەر ئەگەر بەو ڕاستیە بگات ئەوسا ئەزانێت بۆ ڕووداوی ناو ڕۆمانی مارکیز زۆر جار لۆژیك لائەدات و ئەکەوێتە خانەی ئەفسانەو خەیاڵەوە، کە لە ڕاستیا خۆیان واقیعن. مارکیز لە ڕوانگەی ئەدەبیەوە ڕۆمانی (پاییزی پەتریارك) بە چاکترین کتێبی خۆی ئەزانێت و هەر ئەویشە — وەك خۆی ئەڵێت — کە نەهێڵێ لە بیر بچمەوە.

دەربارەی (سەد ساڵ تەنیایی) کە نۆبڵی لەسەر وەرگرت ئەڵێت: (پاییزی پەتریارك) لەو چاکترە، چونکە لەمیاندا زمان جیاوازەو پەخشانە شیعرە، لەگەڵ نووسینیدا ئەوەندەم گوێ لە مۆسیقا ئەگرت کە هەرگیز بە خۆمەوە نەمدیوە، بێجگە لەوەی کە زمانی خەڵکی زۆر تیایە، دەربڕین و گۆرانی و ئەو ڕستانەی تایبەتی بە دانیشتوانی کاریبیەیە، بەڵام لە سەد ساڵ تەنیایدا شێوەکەی ساکارە. بۆیە ویستم دوای ئەو ڕۆمانێك بنووسم لەو چاکتر و کۆکتربێت و هەروایش دەرچوو. مندوزا لێی ئەپرسێت. ئەتەوێ بڵێیت نووسەر وەك چۆن ڕۆژانە کراسەکەی ئەگۆڕێ ئاوایش بۆی هەیە زمانەکەی لە کتێبێکەوە بۆ ئەوی تر بگۆڕێ. لەو بڕوایەدا نیت کە زمان بەشێکی دانەبڕاوە لە پێناسەی نووسەر؟

مارکیز: نەخێر. لەو باوەڕەدام کە ناوەڕۆکی کتێب شێواز و زمانی کتێبەکە دیاری ئەکات.

بەشی حەوتەمی گفتوگۆکە لە ژێر ناوی (چاوەڕوانی)دایە کە مندوزا خۆی نووسیویەتی، لەوە ئەدوێ کە مارکیز لە چ داروبارێکا ڕۆمانەکانی نوسیوە، چون بڵاوکەرەوەکان —ناشر— هەندێ جار

دەستیان بەڕوویەوە ناوەو ڕۆمانەکانیان بۆ چاپ نەکردووە، یەکەم ڕۆمانی (گەڵاڕێزان) شەوانە لەگەڵ ماشینی لینوتیپ و هەراو ژاوەژاوی لەچاپدانی ڕۆژنامەی (الهیرالدو) تا بەیانی ئەمایەوە، نزیك کازیوە کە ماشینەکان ئەنووستن بە ماندوویەتی ئەهاتە دەرێ و بەرەو ژوورە بچووکەکەی ئەبوەوە کە لە ئوتێلێکدا گرتبوی، ڕەشنووسی ڕۆمانەکەی هەر لە بن دەستیاو خولیاو وێنەکانی (ماکندۆ)یش هێنابوویە ژاروژەنگ. ئەگەر چی ئەم کتێبە نایابە ناوی مارکیزی بە ئەمەریکای لاتین ناساند، بەڵام دوای چەند ساڵێك و بەنووسینی ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) مارکیز بووە ناوێکی درەوشاوەی هەموو دنیا، لە نووسینی ڕۆمانی (ساتە شوومەکە)یشدا ئەمبینی شەو تا بەیانی بەرامبەر وێنەی (مەرسیدس)ی دەزگیرانی ئەینووسی، تا لەپڕا وازی لێهێنا، چونکە یەکێك لە کەسەکانی ناو ڕۆمانەکە کە کۆڵۆنێلێکی پیری ناو شەڕی ناوخۆ بوو سەری ڕێگای لێئەگرت و خۆی تێهەڵئەقورتاند، نەیئەویست کەسێکی لاوەکی بێت لەناو چەندانی تردا، بەڵکو ڕێ و شوێنێکی فراوانتری هەبێت و کتێبێك بێت بۆ خۆی، بۆیە مارکیز رۆمانی (کەس نیە نامە لەگەڵ کۆڵۆنێلدا بگۆڕێتەوە)ی نووسی، ئەم چاوەڕوانیەی کۆڵۆنێل چاوەڕوانیەکی ڕۆژانەی خۆیشی بوو، چونکە مارکیز خۆیشی هەمیشە چاوەڕێی نامە و پارەبوو. کە هەر نەیئەگەیشتێ. ئەم ڕۆمانەیش بۆ لە چاپدان پێشوازی لیٚ نەکراو داوای یارمەتیان لەهەرکەس ئەکرد ئەیدایە دواوە. مارکیز هەر لە چاوەڕوانیدا بوو، ماندوو، بیٚ پارە و پوول. کە لە مەکسیك بووە نووسەری گۆڤارێکی ئافرەتان پاژنەی قۆندەرەکانی خواربوون، کە بۆ چاوپێکەوتنی خاوەنی گۆڤارەکە شوێنێکیان دیاری کرد مارکیز یەکەم کەس بوو بگات و دوا کەسیش بوو بڕوات، تەنیا بۆ ئەوەی ئەو خەوشی پاژنەیەی بشارێتەوە. لەلایەك نەبوونی و لەلایەکی ترەوە کەم ڕەواجی بەرهەمەکانی مارکیزیان لە چاوەڕوانیەکی درێژی دڵتەزێنا هێشتەوە، یەکێك لە ڕەخنەگرانی ئیسپانی کە بڕوا پێکراوی بنکەیەکی بڵاوکردنەوە بوو بۆ پێداچوونەوەی بەرهەمەکان، کە مارکیز رۆمانی (گەڵاڕێزان)ی بۆ بڵاوکردنەوە دانیٚ، ڕەخنەگرەکە زۆر بە ڕەقی ڕۆمانەکەی ڕەتکردەوە و هەر بە ڕۆمانی دانەنا، ئامۆژگاری نووسەرەکەشی کرد کە واز لە نووسین بهێنێت و بکەوێتە دوای کارێکی تر، کە ڕۆمانی (ساتە شومەکە)شی بە زنجیرە لە ڕۆژنامەیەکی ئەدەبیدا بڵاوکردەوە نە سەرنووسەر قایل بوو نە هیچ پاداشتێکیشیان لەسەردایە، چونکە زۆر لە بڵاوکەرەوەکان بە بەرهەمێکی نابوتیان دابوە قەڵەم.

مندوزا ئەڵێت: کە مارکیز دەست نووسی (سەد ساڵ تەنیایی)ی دامیٚ بە پەلە بۆمنووسی بێگومانم ئەمە پێشکەوتنێکی گەورەیە، ئەویش لەوەڵامەکەیدا نووسیبووی کە ڕێز لە سەرنجەکەم ئەگرێ و ئیتر شەوانە بە دڵنیاییەوە ئەخەوێ. پاشان بە هەزاران دانەی لیٚ چاپکراو، ئەو چاوەڕوانیەی پانزە ساڵ بوو درێژەی کێشابوو، مارکیز شەوی بۆ دابووە دەم ڕۆژ کۆتایی هات.

بەشی هەشتەم باسی (سەد ساڵ تەنیایی)یە.

کە مارکیز خەڵاتی نۆبڵی جیهانی لەسەر وەرگرت و بووە کۆڵەکەیەکی پتەوی ئەدەبی ئەم سەردەمە. مارکیز لە وەڵامی مندوزادا ئەڵێت "من بڕوام وایە کە چیرۆکی خێزانی بویندیا مێژووی ئەمەریکای لاتینە، چونکە مێژووی ئەم کەرتە بریتیە لەسەرکێشیەکی بیٚ ئەنجام و زنجیرەیەك لە ڕووداوی گەورەی دڵتەزێن. هەروەها ویستوومە بە زمانێکی ئەدەبی تەعبیر لەو ئەزموونانە بکەم کە بەهەر شێوەیەك بووبێت بە منداڵی کاریان لێکردووم.

مارکیز هێشتا لە تەمەنی هەژدە ساڵیا بوو کە هەوڵی نووسینی ئەم ڕۆمانەی داوە و ناوی



(خانوو)ی لێ ناوە، چونکە تەواوی ڕووداوی ناو چیرۆکەکە لە ناو ماڵی خێزانەکەی (کۆلۆنیل ئورلیانو)دا بەرپابوون، هەرگیز هەیکەلی چیرۆکەکەی لا کامڵ نەبووە، چەند بەشێکی جیاجیای لەو ڕۆژنامانەدا بڵاوکردۆتەوە کە خۆی کاری تیا کردوون. بەڵام بۆ ماوەی پانزە ساڵ هەر خولیای بووەو بە دوای ئەوەدا گەڕاوە بە چ شێوەیەك و لەکام ڕێگاوە دەست پێ بکات، تا دوای ئەم هەموو ساڵانە و بە ڕێکەوت ئەوەی بە بیردا هات کە (نەنکی چۆن چیرۆکی بۆ گێڕاوەتەوە ئەویش هەمان ڕێگا بگرێت) ئیتر بەو سەرەتایە دەست پێ ئەکات کە چۆن باپیری کچەزاکەی بۆ سەهۆڵ بینین ئەبات.

ڕۆمانەکە بە ساڵ و نیوێك نووسراوەتەوە کە هەموو ڕۆژێك لە سەعات نۆی بەیانیەوە تا سەعات سێی دوای نیوەڕۆ مارکیز کاری تیا کردوە.

مندوزا لێی ئەپرسێت: تۆ لەو باوەڕەدابوویت کە سەد ساڵ تەنیایی ڕۆمانێکی سەرکەوتوو بێت؟

مارکیز لە وەڵامدا ئەڵێت: لەوە دڵنیا بووم کە ڕەخنەگرەکان بە دڵیان ئەبێت، بەڵام نەمئەزانی لای خوێنەرانیش هەروا ئەکەوێتەوە، وام دانابوو کە تەنیا پێنج هەزار دانەی لێ بفرۆشرێت، کەچی لە ماوەی دوو هەفتەدا چاپی یەکەمی کە هەشت هەزار بوو لە بازاڕی (بۆینس ئایرس)دا نەما.

مارکیز وایداناوە کە ئەگەر (مەرسیدس)ی خێزانی نەبوایە نەیئەتوانی ئەم ڕۆمانە بنووسێت، چونکە لە ماوەی ئەوساڵ و نیوەدا هەموو ئەرکی خێزانیی لەسەرشان بووە، بە قەرز نان و گۆشتی هێناوە و وای لە خاوەن خانوەکە کردووە تا شەش مانگ چاوەڕێی کرێ نەکات، هەمیشە کاغەزی نووسینی بۆ هێناوە و کە پارەیان نەماوە پێی نەوتووە، هەر کە لە پاکنووسەکەیشی بۆتەوە (مەرسیدس) خۆی بردوویەتیە پۆستە و بۆ بنکەی بڵاوکردنەوەی (ئەدیتوریال سود ئەمەریکانا)ی ناردوە.

ئەم ڕۆمانە گۆڕپراوەتە سەر حەڤدە زمان و باشترین گۆڕینیش لای مارکیز ئینگلیزیەکەیەتی.

لەبەشی نۆیەمدا مارکیز لە ڕۆمانی (پاییزی پەتریارك) ئەدوێت و ئەو مەبەستە دێنێتە گۆڕێ کە بابەتەکەی دەربارەی (هەموو دیکتاتۆرەکانی ناوچەی کاریبی)یە، وەك خۆی ئەڵێت: (ئەم ڕۆمانە چامەیەکە دەربارەی تەریکی دەسەڵات و ڕژێم، یەکێکە لەو کتێبانەم کە زۆری بایەخ ئەدەمێ، چونکە سەرکێشیەکی (مغامرة) شعرییە و زیاتر لەوانی دیم ئەزمونگەرییە، شیعر چۆن ئەنووسرێت منیش ئاوا وشە بە وشە ڕێکم خستوەو لە سەرەتادا چەند هەفتەیەکم بۆ نووسینی چەند دێڕێك بەسەر بردووە) مارکیز لەم ڕۆمانەدا گوێی نەداوەتە کات و شوێن و زۆر جار لە شێوە تەقلیدیەکەیان دەرچووەو خۆیشی ئەمەی مەبەست بووە.

دەربارەی دیکتاتۆرەکانی ئەمەریکای لاتینی کە ناوکی چیرۆکەکەیە ئەڵێت: (دیکتاتۆرەکان هەموو شێتن و ئەو کەسایەتیەی بەسەر ژیانیاندا زاڵە کەسایەتی دایکیانە، چونکە هەر لە سەرەتاوە بێ باوك بوون) جەنراڵ (عومەر توریخۆس)ی سەرۆکی پەنامایش، چل و هەشت سەعات پێش مردنی بە مارکیزی وتوە: (پاییزی پەتریارك چاکترین کتێبە، چونکە ئێمە هەموومان ڕێك ئەوەین کە تۆ باست کردووین).

بەشی دەیەمی گفتوگۆکە بە ناوی (ئێستا)وەیە، باس لە ژیانی تایبەتی مارکیزەو مندوزا خۆی نووسیویەتی، لە سەرەتاوە بەراوردێکی ئێستا و جارانی مارکیز ئەکات، کە گومان لەوەدا نییە گۆڕانێکی زۆری بەسەرا هاتوە، چ لە ڕووی ڕەفتار و پەیوەندی و ژیانی ڕۆژانەیەوە، چ دەربارەی نهێنیەکانی نووسین و ئەو ئارەزوانەی هەیەتی. جاران باریکەلەیەکی ڕاڕای جگەرەخۆر



بوو، شەوی ئەدایە دەم ڕۆژ و لە تاقە ژوورێکاو بە دیار کەرەسەیەکی چاپەوە ئەینووسی و ئەمایەوە، هەمیشە لات و نەدارا بوو، نامەی زۆری بۆ هاوڕێکانی ئەنووسی و سکالای دەردەدڵ و خولیا و شکستەکانی خۆی بۆ ئەکردن. بەڵام ئێستا هەموو شتەکان بەپێی نەخشەیەکی ڕێکوپێکە کە (مەرسیدسی ژنی و کارمن بالیسن)ی وەکیلی ئەدەبیی بۆی دائەنێن، چاوپێکەوتنەکانی بەپێی کات و شوێنی دیاریکراوەو لە دەفتەری ڕۆژانەیدا تۆمار ئەکرێت، ئێستا نامە بۆ هاوڕێکانی نانووسێت، هەر کە بیری کردن تەلەفۆنەکەی ئەبێتە — بەدالە — و لەگەڵیاندا ئەکەوێتە قسەوباس و حیکایەتی دووروودرێژ، هەر وەك جاران بە — گابو — یان — گابیتو — بانگی ئەکەن. ئێستا وەك جارانی هەژاری بەشەو نانووسێت، بەڵکوو لە سەعات نۆی بەیانیەوە تا سێی دوای نیوەڕۆ. پاشی نیوە ڕۆژەیش دائەنیشێ و گوێ لە مۆسیقا ئەگرێت، بە تایبەت مۆسیقا میللیەکانی ئەمەریکای لاتین، لە دوای نیوەڕۆوە حەزی لە بینینی خەڵکە، لە هەفتەیەکدا چەند جارێك شەوانە لە دەرەوە نان ئەخوات و خواردنەوەیشی ئاساییە، شەیدای دەنگوباسە و هەموو ڕۆژێك بە پۆستەدا هەموو ڕۆژنامەکانی وولاتەکەی پێ ئەگات، خوێنەرێکی ژەمبردەی گۆڤارە ئەمریکی و فەرەنسیەکانە. لەگەڵ — مەرسیدسی ژنیا زۆر ڕێك و گونجاون و پێوەندیشی لەگەڵ هەردوو کوڕەکەیدا (رودریجو و جونزالو) لەو پەڕی کۆکیدایە.

مارکیز زۆربەی وەرزی ساڵ لە — مەکسیکوسیتی— بەسەر ئەبات، کۆشکەکەی لە گەڕەکێکدایە کە سەرۆك دەوڵەتەکانی پێشوو، پیاوانی بانکی و ئەستێرە ناودارەکانی سینەما کە خاوەن سامانێکی فرەن لەوێ دەژین. پلەی گەرما لە ماڵەکەیدا بە درێژایی ساڵ یەك پلەیە. مارکیز زۆر سەفەر ئەکات، بێجگە لە ماڵەکەی لە مەکسیکوسیتی لە کیرنافاکاو بۆ گۆتادا جێگای هەیە و پاییزانیشی لە کۆشکەکەی پاریسیدا بەسەر ئەبات، لە ماڵەکانیدا هەموو شتێك هەیە، لە کتێبەوە تا جلوبەرگ، تەنانەت پێویستی بە جانتایش نییە، هەر کە بگاتە هەر کامیان تەنیا ئەوەندە ئەرك ئەکێشێت کە چەپکێك گوڵی زەرد بخاتە ناو گوڵدانێکەوە، چونکە بەپێی باوەڕی کۆن گوڵی زەرد بەختەوەری هێنە، بڕوای بە خورافات هەیە و ڕەمڵی ئایندەیشی لێ ئەدات، پێوەندی مارکیز لەگەڵ سەرۆکی فەڕەنسی (میتران) و (ڤیدڵ کاسترۆ) زۆر چاکە، بە تایبەتی لەگەڵ دووەمیاندا، لەو ڕوانگەیەوە کە وەك یەکتر بۆ ژیان ئەڕوانن و، یەك جۆری زمان و بیرکردنەوە کە زەمینە جوگرافیە هاوبەشیەکە دروستی کردووە.

بەشی یانزەهەم لە ژێر ناونیشانی (مەیلی سیاسی)دایە ئەگەرچی باوکی مارکیز لە پارتی پیاو ماقوڵاندا بووە و لە کۆڵۆمبیایشیدا وا باوە کە باوك سەر بە هەر لایەکی لیبرالی یان پیاو ماقوڵان بێت کوڕەکەیشی وا دەرئەچێت. کەچی مارکیز لەو تەقلیدە دەرچووەو زۆر زوو بەرەی چەپی بۆ خۆی هەڵبژاردوە. ئەشێ ئەم هەڵوێستە سیاسیەی کاردانەوەیەك بێت دژی خێزانەکەی؟

مارکیز هێشتا لە قوتابخانەی دواناوەندیا بووە کە لە سایەی "حکوومەتە چەپڕەوەکەی (ئەلفونسو لوبیز)دا لە مامۆستاکانیەوە سەرەتایەکی ئەم بیروباوەڕە فێر بووە، وەك خۆی ئەڵێ (مامۆستای جەبر وانەی دیالێکتی فێر ئەکردین، مامۆستای کیمیا کتێبەکانی لینینی ئەدایێ و مامۆستای مێژوویش چیرۆکی کێشەی چینایەتی بۆ ئەگێڕاینەوە. بەڵام مارکیز ڕاستەوخۆ پێوەندی بە — پارتی کۆمۆنیستەوە نەبوەو هەمیشە ڕاڕابوە لەو مەسەلەیەدا، بۆیە زۆر جار ناکۆکیان بووەو ڕۆژنامەکانیان دژی مارکیز شتیان نووسیوە. مارکیز بڕوای بە سوشیالستەو لەو بڕوایەدایە کە



ئەبێ مرۆڤایەتی بیگاتێ، بڕوایشی بە دیموکراتیەت هەیە کە مرۆڤ لە سایەیدا ئازادانە بیربکاتەوە و ماف نەخورێت، کە مندوزا لێی ئەپرسێت چ جۆرە فەرمانڕەواییەکی ئارەزووە لە وڵاتەکەیدا دەستبەکاربێت، وەڵامی ئەداتەوە (ئەو فەرمانڕەواییەی هەژارەکان لە ژێر سایەیدا هەست بە بەختیاری بکەن و تەنیا بیر لەوان بکاتەوە).

لەم بەشەدا مارکیز لە بارەی ڕژێمی کوباو پێوەندی لەگەڵ سۆڤیەت و هەڵوێستی کاسترۆ لە دەستخستنە کاروباری چیکۆسلۆڤاکیا لە لایەن سۆڤیەتەوە و، سەرۆك میتران و پلە و جێگای ئێستای فەرەنسا لە کۆمەڵگای دەوڵەتیاو، ئەو هەولأنەی مارکیز داویەتی بۆ ماف مرۆڤ و ئەنجامە چاکەکانی ئەدوێ. مندوزا لە پرسیارێکیا ئەوە دەرئەخات کە مارکیز لای خەڵکی وەك سەفیرێکی گەڕۆك وایە لە کاریبیداو هەمیشە دەوری چاکەخوازی و ئارامی و خاوکردنەوەی گیروگرفتەکان ئەبینێت. بە تایبەت لای هەندێك لە سەرۆك دەوڵەتەکانی ئەو هەرێمانە کە مارکیز پێوەندی تایبەتی و شەخسی لەگەڵیاندا بووە و هەیە، وەك کاسترۆ و عومەر توریخۆس لە پەنەماو کارلوس ئەندریس لە ڤنزویلا و ئەلفونسو لوبیز میشنلن لە کۆڵۆمبیا. لە بەشی دوانزەهەمدا کە بە ناوی (ئافرەت)ەوەیە مارکیز لەوە ئەدوێ کە هەر لە منداڵیەوە ئافرەت کاری گەورەی لەسەر ژیانی بووە و دەوری ئەوەی هەبووە کە لە گەورەترین تەنگوچەڵەمە ڕزگاری بکات، تا ئەوەی وەك بۆچوونێکی میسالیانە بڕوای بەوە بێت کە تا لەگەڵ ئافرەتا بێت گیروگرفت نەیەتە ڕێگای و هەست بە دڵنیایی بکات. ئەگەر ئەو دڵنیاییە نەبوایە نەیئەتوانی نیوەی ئەو کارە چاکانە بکات کە بەرهەمی هێناون، بە تایبەت لە بواری نووسیندا. مارکیز لە ڕۆمانەکانیدا و بە تایبەت لە (سەد ساڵ تەنیایی)دا بێ ئەوەی مەبەستی بووبێت یان دەستی ئەنقەستی تیا بێت هەمیشە دەوری پارێزگاریکردنی ڕژێمی کۆمەڵایەتی داوەتە دەست ئافرەت و پیاویشی لا ئاژاوەچی و هەرزەکار و سەرەڕۆ بووە. کە ڕەخنەگرەکان ئەم دیاردەیەیان دۆزیوەتەوە و مارکیز پێی قایل بووە وا پاساوی ئەدات کە (هەر لە منداڵیەوە و بەهۆی ئەو چیرۆکانەوە کە بۆیان گێڕاوەتەوە و باسی شەڕی ئەهلیان کردووە ئەم هەستەی لا دروست بووە، کە لە ئافرەتدا هێزێکی گەورە هەیە بەرامبەر ترس و کارەساتە گەورەکانی ڕائەگرێ، بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لەسەر نەوە خستنەوە و پاراستنی نەژادی مرۆڤ، لە کاتێکدا کە پیاوان ئەچوون بۆ جەنگ و چەکەکانیان بەشانەوە بوو و نەیانئەزانی بۆ کوێ ئەچن و چییان بەسەر دێ ژنەکانیان تەنیا ئەمان و نەوەی تازەیان بۆ جێگای ئەوان ئەخستەوە. وەك ئەو ئافرەتە یۆنانیانەی لە کاتی بەڕێ کردنی مێردەکانیاندا بۆ شەڕ پێیان ئەوتن "کە گەڕانەوە لە ژێر ڕەخت و مەتاڵی شەڕەکانتانا بن، یان بەسەریانەوە هەڵیگرابن، زیندو یا مردوو، بەڵام نەکەن بە بەزیوو شکست خوراوی بگەڕێنەوە".

بەشی سیانزەهەم دەربارەی خورافات و دڵەڕاوکێیە، مندوزا لێی ئەپرسێت: جارێکیان وتت "ئەگەر بڕوات بەخوا نیە بڕوات بە خورافات بێت" ئەشێ ئەمە ڕاست بێت؟

مارکیز: بەڵێ.

میندوزا: بۆ؟

مارکیز: من لەو باوەڕەدام کە خورافات، یان ئەوەی لای خەڵکی بەوە ناو ئەبرێت، بەرامبەر بەو هێزی سروشتیەیە کە بەرە عەقڵانیەکەی ڕۆژاوا ڕەتی ئەکاتەوە.

مندوزا: بابێینە سەر نموونە هەرە زیندوەکان. بەڕاست تۆ باوەڕت وایە کە ژمارەی سیانزە بەدبەختیە؟



مارکیز: هەر تەواو بە پێچەوانەوە، ئەوانەی ئەم قسە پڕوپووچەیان داهێناوە تەنیا خۆیان سوودیان لەو ژمارەیە وەرگرتووە، چونکە خەڵکی تریان دوورخستۆتەوە لە هەر شتێك کە پەیوەندی بەم ژمارەیەوە هەبێت. لای من ژمارەیەکی بەبەختە. هەروەها پشیلەی ڕەش و تێپەڕبوون بە ژێر پەیژەی داردا.

مارکیز بڕوای وایە گوڵی زەرد بەختەوەری و دڵنیاییهێنە. مەرسیدسی ژنی هەمیشە گوڵێك لەسەر کتێبخانەکەی دائەنێت، مارکیز لایوایە ئەگەر وانەکات ناتوانێ بەچاکی کارەکەی بەرهەم بێنێت و تاقی کردنەوەیشی لەم بوارەدا هەیە.

مارکیز رەنگی زەردی لا پەسەندە، نەزێڕ و نە ڕەنگەکەی خۆش ناوێت، هیچ شتێك کە لە ئاڵتوون دروست کرابێت لە ماڵەکەیدا نییە، هەروەها بڕوای وایە هەندێ شت هەن شوومن و بەختی ڕەشیان لەدوایە، وەك هێلکە شەیتانۆکەی پشت دەرگا، حەوزی ماسی ماڵان، گوڵی لە ئەسفەنج دروستکراو، تاووس، شاڵی چنراوی لە مانیلا دروستکراو تەنانەت هەندێ جلوبەرگ و جێگاو زەلامیش شوومن و خۆیانی لێ ئەپارێزێ. بێجگە لەوەی هەستی شەشەمی مارکیز زۆر جار کەوتۆتە کار و لەگەڵ دڵە ڕاوکێیشدا برادەرە. بۆ نموونە کە هەڵەیەك بکەوێتە نووسینیەوە هەموو لاپەڕەکە لا ئەدات و سەر لە نوێ دەست پێ ئەکاتەوە.

لای مارکیز باشترین کتێب (ئۆدیبی پاشا) و چاکترین ئاواز دانەری مۆسیقا (بیلابارتوك) و وێنەکێش (گۆیا) و دەرهێنەری سینەمایی (ئورسلن ویلز)ە لە فیلمی چیرۆکی نەمریدا و (کیروساو) لە ریشی سووردا. ئەو فیلمەی سەرسامی کردووە (جەنراڵ دی لارو فیر)ە و گەورەترین کەسی مێژوویی لە تێڕوانینی ئەدەبیەوە (یولیوس قەیسەر)ە ئەو کەسەیش کە خۆشیناوێت (کریستۆڤەر کولۆمبوس) و رۆژانی یەك شەموانیشی هەر خۆشناوێت. پەسەندترین باڵندەیش لای مارکیز کەناریی ڕەنگ پرتەقاڵیە.

بەشی چواردەهەم کە دوا بەشی گفتوگۆکەی نێوان مارکیز و بیلینیوا بولیو مندۆزایە لە بارەی ناوبانگەوەیە.

مندوزا ئەو پرسیارانەی لێ ئەکات کە ئاخۆ هاوڕێکانی چۆن جیائەکاتەوە، ئەوانەی هاوڕێی ڕاستەقینەن و ئەوانەی پاش ناوبانگ بە دەوریەوەن، ئایا ناوبانگ گۆڕانی بەسەر پێوەندیەکانی هاوڕێیەتیا هێناوە یان نا؟ مارکیز لەم ڕووەوە ڕای وایە کە هاوڕێکانی ئەبن بە دوو بەشەوە، بەشێکیان پێش ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی)ن و ئەوانی تر پاش ئەون، ئەوانەی پێش دەرچوونی ڕۆمانەکە کۆنە هاوڕێن و وەك یەکیەتیەکن کە جیا نابنەوە، یان کۆمەڵگایەکی نهێنین و خۆشەویستیەکی وا بە یەکەوەی جۆشی داون کە هەرگیز قابیلی تێکچوون نییە. لە هاوڕێ سیاسیەکانیشی کە زۆری خۆشدەوێت (ڤیدڵ کاسترۆ)ی سەرۆکی کۆبایە. مارکیز وایدائەنێ کە پێوەندی بە کاسترۆوە لە ئەدەبەوە دەستی پێکردووە و ئەویش بەرێکەوت، کاسترۆ خوێنەرێکی چاکی ئەدەبە و مارکیز سودی زۆری لە ڕا ئەدەبیەکانی وەرگرتووە. بۆ نموونە کە چیرۆکی (حیکایەتی دەریاوانێکی خنکاو)ی داوەتێ پاش خوێندنەوەی هاتۆتە ئوتێلەکەی مارکیز و سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە خێرایی بەلەمەکە ڕاست نیە و کاتی گەیشتنی ئەوە نییە کە مارکیز باسی کردووە، هەروەها پێش بڵاوکردنەوەی (چیرۆکی مەرگێکی ڕاگەیەنراو) کە دەستنووسەکەی داوەتە کاسترۆ سەرنجی ووردی بۆ دەربڕیوە. جارێکیش بە مارکیزی وتووە "ئەگەر جارێکی تر بژیمەوە حەز ئەکەم ببمە نووسەر". هاوڕێیەتی مارکیز لەگەڵ (میتران)یش هەر لە بواری ئەدەبەوەیە.





زمانی میتران زمانی گەورە نووسەرانە و هەموو کتێبەکانی مارکیزی خوێندۆتەوە، بەڵام جیاوازی لەگەڵ کاسترۆدا ئەوەیە کە هەمیشە لەگەڵ مارکیزا دەربارەی سیاسەت ئەدوێ و بە دەگمەن باسی ئەدەب ئەکات. لەگەڵ (جەنراڵ عومەر توریخوس)ی سەرۆکی پەنەمادا میانەی باشی بووە و خۆشیویستووە. ئەگەرچی توریخوس لەگەڵ خوێندنەوەی ئەدەبدا ڕانەهاتوە، تەنیا ئەوانەی خوێندۆتەوە کە فرۆختیان زۆر بووە.

(گراهام گرین)ی ڕۆماننووسی گەورەیش یەکێکە لە هاوڕێکانی مارکیز کە وەك خۆی ئەڵێ: هەر لە ڕۆژانی قوتابخانەوە کارەکانیم خوێندۆتەوە و یەکێکە لەوانەی لە نهێنی ناوچەی ئیستوایی گەیاندووم، یارمەتی ئەوەی داوم کە فێری واقعی ئەدەبی بم نەك واقعی فۆتۆگرافی.

لە کۆتایی ئەم چاوپێکەوتنەشدا ئەم گفتوگۆیە لە نێوان مندوزا و گارسیا مارکیزدا دەکرێت:

مندوزا: جارێکیان لە یەکێك لە چێشتخانەکانی پاریسدا لەگەڵ مارجو هەمەنگوایا نانت ئەخوارد، لەو قسانەی کە کردتان چیت لە یادماوە؟

مارکیز: ئەو زۆر باسی لە باپیری ئەکردو منیش حیکایەتی خۆمم بۆ ئەگێڕایەوە.

مندوزا: ئەو کەسە کێیە کە دیوتە و گەلێك زۆر سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشاویت؟

مارکیز: ژنەکەم، مەرسیدس.

## پەراوێز

1-گەواڤە *cuava* ناوی دارێکە لە ئەمەریکای مەداریدا، بەرهەمەکەی میوەیەکە لە شێوەی هەرمێدا، لە میوەکەی جەلی دروست ئەکرێت، لە وولاتە عەرەبیە ئیستواییەکانیشدا هەیە و هەر بە هەمان ناوەوە ناسراوە، بۆن و بەرامەی خۆشە و لای خۆمان نموونەی نییە. بۆیە هەر بە ناوە ڕەسەنەکەی خۆیەوە هێشتمەوە.

2-ئەم گفتوگۆیە ساڵی 1982 سازکراوە و ساڵی 1988 کراوەتە عەرەبی. منیش هەر لەو ساڵەوە و لە دەقە عەرەبیەکەیەوە ئەمەم لێ ڕەخساندوە.

3-واتا ئێستا دەکاتە چل و هەشت ساڵ.



چیرۆك

# چاوی سەگە شینەکە

گابریل گارسیا مارکیز

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد




ئەوسا سەیرێکی منی کرد، وامدەزانی یەکەمجارە ئەو ژنە تەماشای من بکات، دوای ئەوە، کە لە پشت مۆمەداگیرساوەکەوە ڕووی وەرگێڕاو من لە سەرشان و پشتمەوە هەستم بە نیگای ناسك و درەوشاوەی کرد، ئەوسا زانیم کە ئەوە منم بۆ یەکەمجار بیبینم، جگەرەیەکم داگیرساند و دووکەڵەکەیم توند هەڵمژی، کورسیەکەمم سووڕاند تا لەسەر قاچی دواوەی لەنگەر بگرێت، پاشان چاوم تێبڕی، وەك هەموو شەوانی دی کە لە پاڵ مۆمەکەدا دەوەستێت و لێم دەڕوانێت. تا چەند دەقیقەیەك هەروا ماینەوە، هەردووکمان تەماشای یەکترمان دەکرد، من لەسەر ئەو کورسیەوە کە لەسەر قاچی دواوەی وەستاندبووم. ئەویش وەستابوو، دەستە درێژەکەی بە هێوری ڕاهێڵ کردبووە سەر مۆمەداگیرساوەکە و تەماشای دەکردم.

لە پێڵوەکانیم دەڕوانی کە وەك هەموو شەوانی دی دەدرەوشایەوە، ئەوسا ئەو دەستەواژەیەم بیرکەوتەوە کە بەردەوام لەسەر زارە، پێم وت: "چاوی سەگە شینەکە" وتی: "هەرگیز لەبیری



ناکەم" شێوەی وەستانەکەی تێکچوو، وتی: "چاوی سەگە شینەکە، ئەم دەستەواژەیەم لە هەموو شوێنێکدا نووسیوە"

چاوم لێبوو بەرەو مێزی ئارایشتەکە چوو، لەناو ئاوێنە خڕەکەوە دەم و چاوی دەرکەوت، هەر تەماشای دەکردم و رووناکیەکە لەسەرخۆ هاتوچۆی بوو. بینیم بە چاوە گەورەکانی کە لە پشکۆ دەچوون هەر تەماشام دەکات. بە دەم کردنەوەی سندووقە بچووکەکەیەوە کە بە مرواری ڕازابووەوە هەر لێی دەڕوانیم، بینیم پۆدرەی دا لە لووتی، کە لێ بووەوە سندووقەکەی داخست و بەرەو لای مۆمەکە بووەوە. وتی: "ئەترسم یەکێك خەون بە ژوورەکەمەوە ببینێت و شتەکانم پرش و بڵاو بکاتەوە" دەستە درێژ و بەلەرزهاتووەکەی لەسەر گڕەکە ڕاگرت کە پێش خۆئارایشت دانەکە گەرمی کردبووەوە. وتی: "تۆ هەست بە سەرما ناکەیت" پێم وت: "هەندێك جار" پێی وتم: "دەبێت ئێستا هەستی پێ بکەیت" ئەوسا دەرکم بەوەکرد کە بۆچی ناتوانم بە تەنیا لەسەر کورسی بمێنمەوە، ئەوە سەرما بوو جەختی لەسەر هەقیقەتی تەنیایی من دەکرد. وتم: "ئێستا هەست بە سەرما دەکەم. ئەمەیش سەیرە، چونکە شەوەکەی هێورەو منیش بە باشی خۆم بەمەلافەیەکەوە پێچاوە" وەڵامی نەبوو، پاشان بەرەو لای ئاوێنەکە کەوتە جووڵە، منیش کورسیەکەم وەرچەرخاند و پشتم تێکرد. بێ ئەوەی ببینم دەمزانی چی دەکات، دەمزانی دیسان لای ئاوێنەکەوە دادەنیشێت، تەماشای پشتم دەکات کە وەختێکی زۆری هەیە پشتم بگاتە قووڵایی ئاوێنەکەوە و بەرچاوی بکەوێت. ژنەکەیش کاتی باشی بەدەستەوە بوو تا بگاتە قووڵایی ئاوێنەکە، جارێکی تریش بگەڕێتەوە پێش ئەوەی دەستی دەرفەتی ئەوەی هەبێت دیسان بگاتەوە بە لێوە تۆخ سووراوکراوەکەی، لەگەڵ یەکەمین سووری دەستەکە لە ئاوێنەکەدا، لەبەردەممدا ئەو دیوارە سفتەم دەبینی کە لە ئاوێنەکەی تر دەچێت بەڵام بە تاریکیی. من نەمدەبینی — کە لە پشت منەوە دانیشتبوو — بەڵام وێنای ئەوەم دەکرد کە ئاوێنەکەی لە جێگای دیوارەکە دانابێت، پێم وت: "دەت بینم" لە دیوارەکەوە بینیم، لەوە دەچوو سەری بەرزکردبێتەوە، لە قووڵایی ئاوێنەکەدا، پشت و سەری منی بەسەر کورسیەکەوە بینیبێت. پاشان بینیم جارێکی تر پێڵوی داخست و، بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت، چاوی بە بەرۆکیەوە دوورا، جارێکی تر پێم وت: "دەت بینم" ئەویش سەری هەڵبڕیەوە و وتی: "هەرگیز نابێت" لێم پرسی بۆ؟ چاوی هەرتێبڕیبووم، وتی: "چونکە تۆ رووت لە دیوارە" ئینجا کورسیەکەم وەرچەرخاندەوە، جگەرەکەم بە لێوەوە بوو، کە رووم لە ئاوێنەکە کردەوە، ئەو دیسان لە پشت مۆمەکەوە وەستا بوو. وا ئێستا هەردوو دەستی لە ئاگرەکە نزیك دەخاتەوە کە لە دوو باڵی مریشکی رووت کراو دەچن لە کاتی برژاندندا. دەم و چاویشی لە نێوانی پەنجەکانیەوە دەبینرا.

"لەو بڕوایەدام تووشی سەرمایەکی سەخت دەبم، بێگومان ئەمشەو دەیبەستێت" هەندێك رووی کەلاخست تا لایەکی بە دەرەوەما، وەلێ پێستە سوور داگەڕاوەکەی خەمێکی لە ناکاوی تێگەڕا، وتم: "کەواتە کارێك بکە" دەستی کرد بە داکەندنی جلەکانی، لە سەرەوە، پارچە دوای پارچە. پێم وت: "من روو دەکەمە دیوارەکە" وتی: "نا، چونکە تۆ هەر دەمبینیت وەك ئەو کاتەی کە پشتت لێم بوو" هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە نیوەڕوتێك ببووەوە، گڕەکەیش پێستە مسینەکەی دەلستەوە.

"هەمیشە پێم خۆشبووە بەم جۆرە بتبینم، بەو چرچ و لۆچانەی سکتەوە کە دەڵێی بەر ڕیزە فیشەك کەوتوون" پێش ئەوەی درك بەوە بکەم کە بەرانبەر بە لەشە رووتەکەی زمانم دەیگرێت، بە بێدەنگیی کەوتە خۆ گەرم کردنەوە لەبەر گڕی مۆمەکەدا،



وتی: "هەندێك جار وا هەست دەکەم لە کانزا دروست کراوم" کەمێك بێ دەنگبوو، باری دەستی بەسەر گرەکەوە هەندێك گۆڕا، وتم: "بڕێك جار لە خەونەکانمدا وام هەست کردوە تۆ تەنیا پەیکەرێکی بچووکی لە برونز و لە گۆشەی مۆزەخانەیەکدا دانراویت، رەنگە لەبەر ئەمە بێت کە هەست بەسەرما دەکەیت" وتی: "کاتێك لەسەر لای چەپم کە دڵی تیایە رادەکشێم هەندێك جار وا هەست دەکەم جەستەم خاڵیە و پێستم بریتییە لە فافۆنێك، پاشان کە خوێن لە لەشمدا توند لێ دەدات، وەك ئەوە وایە یەکێك بە سکمدا دەکێشێت بۆ ئەوەی بانگم لێ بکات. ئەوسا من هەست بە هەناسە مسینەکەی خۆم لەناو جێگادا دەکەم، وەك ئەوەی کە وتم "لە فافۆن بم" لە مۆمەکە زیاتر نزیك کەوتەوە و من پێم وت: "چەندم پێ خۆشە گوێم لێت بێت" وتی: "ئەگەر رۆژێك پێکگەیشتین گوێ بنێ بە پەراسوەکانمەوە کاتێك لەسەر لای چەپ دەنووم، ئەوسا گوێت لێ دەبێت، مادامەکی حەز دەکەیت جارێك ئەوە بکەیت" گوێم لێبوو لە کاتی قسەکردنیدا هەناسەبڕکێی بوو، وتی بۆ ماوەی چەند ساڵێك هەر ئەوەی کردووە، ئەو ویستوویەتی لە ژیانی واقیعدا و بە هۆی ئەو دەستەواژەیەوە کە لەسەری رێك کەوتووین "چاوی سەگە شینەکە" هەوڵبدات پێم بگات، بە شەقامەکاندا تێپەڕیوە و بە دەنگی بەرز ئەوەی وتوەتەوە. ئەمە رێگایەك بووە بۆ قسەکردن لەگەڵ ئەو تەنیا کەسەدا کە لێیتێگەیشتوە "من ئەو کەسەم کە هەموو شەوێك دێمە خەونت و پێت دەڵێم: چاوی سەگە شینەکە" وتی چووەتە ریستورانەکان و پێش ئەوەی داوای خواردن بکات بە پێش خزمەتەکانی ئەوێی وتوە: "چاوی سەگە شینەکە" بەڵام لاوەکان بێ ئەوەی لە بیریان بێت ئەگەر بۆ تاقە جارێکیش بوو بێت لە خەوندا شتی وایان پێ وتبێت سەریان بۆ دادەنەواند و رێزیان لێ دەگرت.

ئەوسا لەسەر دەستەسڕە کاغەزیەکان یان بە چەقۆ لەسەر بۆیەی چەوری سەرمێزەکان دەینووسی "چاوی سەگە شینەکە" هەروەها لەسەر شووشەی هەڵمگرتوی وێزگەکان و بینا گشتیەکان، بە پەنجەی شایەتی دەینووسی "چاوی سەگە شینەکە" وتی جارێکیان چوەتە فرۆشگایەکی تەندروستی و بۆنی خۆشەوە، درکی بەو بۆنەکردوە کە شەوێك لە شەوان لە ژوورەکەی خۆیدا هەستی پێکردووە دوای ئەوەی خەونی بەوەوە دیوە کە لەگەڵمدایە و بە خۆی وتووە "بێگومان لەم ناوەیە"، بەدەم تەماشاکردنی کاشی رێژە پاك و تازەکەی فرۆشگاکەوە لە خاوەنەکەی نزیك بوەتەوە و پێی وتوە: هەمیشە خەون بە پیاوێکەوە دەبینم کە پێم دەڵێت: "چاوی سەگە شینەکە" وتی فرۆشیارەکە تەماشای چاوی کردوە و پێی وتوە: "بە ڕاستی، خانم، چاوت لێی دەچێت" ژنەکە وتوویەتی: "دەبێت ئەو پیاوە بدۆزمەوە کە لە خەودا ئەم قسەیەی پێ وتووم" فرۆشیارەکە داویەتە قاقای پێکەنین و بەرەو ئەوسەری پێشخوانەکە جووڵاوە، بەڵام ژنەکە چاوی لە زەویە کاشی رێژە پاك و تازەکە بڕیوە و هەستی بە ئاسوودەیی کردوە. پاشان جانتاکەی کردۆتەوە و دانیشتوە، بە قەڵەمی سووراوەکەی لێوی، کە سوورێکی تۆخە لەسەر کاشیەکە بە گەورەیی نووسیویەتی: "چاوی سەگە شینەکە" فرۆشیارەکە گەڕاوەتەوە لای و پێی وتوە: "خانم، کاشیەکانت پیس کرد" پارچە پەڕۆیەکی تەڕی داوەتێ و پێی وتوە "دەبێت پاکی بکەیتەوە" ژنەکە کە هێشتا لە پاڵ مۆمەکەدا بوو وتی هەموو عەسری ئەو رۆژەی بە چیچکانەوە بۆ پاککردنەوەی کاشیەکان تەرخان کردوەو بەردەوامیش وتوویەتی "چاوی سەگە شینەکە" تا لەبەر دەرگا هەموو لێی کۆبوونەتەوە و پێیان وتوە شێتە.

کە لە قسەکانی بوەوە من هەر بەسەر کورسیەوە خۆم لە سوچێك خزاندبوو. پێم وت: "من



هەموو رۆژێك هەوڵی بیر خستنەوەی ئەو دەستەواژەیە بۆ خۆم دەدەم کە تۆی تیا دەبینمەوە، لەو باوەڕەیشدا نیم کە بەیانی لەبیرم بچێتەوە، کەچی لەگەڵ وتنەوەیشیدا، کە بەئاگا دێمەوە، ئەو دەستەواژەیەی تۆی تیا دەبینمەوە لەبیرم دەچێتەوە، ژنەکە وتی: "لە هەوەڵ رۆژەوە تۆ داتهێناوە" وتم: "راستە من دامهێناوە، چونکە من چاوتم وەك دوو پشکۆ بینی، بەڵام لە رۆژیی دواییدا هەرگیز بیرم نەکەوتەوە" وەلیٚ ئەو هەر لە پاڵ مۆمەکەدا وەستا بوو، مشتی نووقابوو هەناسەی قووڵی دەدا، وتی: "خۆزگا ناوی ئەو شارەم بیر بکەوتایەتەوە کە ئەو دەستەواژەیەم تیانووسی"

لەبەر تیشکی ئاگرەکەدا ددانە لەسەر لێك نراوەکانی دەبریسکانەوە، وتم: "پێم خۆشە دەستێکت تێوەدەم" چاوی لە تیشکی ئاگرەکە بڕیبوو، کە گوێی لێبوو سەریهەڵبڕی، نیگا ئاگرینەکەی کە وەك خۆی و دەستی داگیرسابوو تێبڕیم، من هەستم کرد لە سووچەکەداو بەسەر کورسیە ناجێگیرەکەوە بینیمی، وتی: "هەرگیز قسەی وات پێنەوتووم" وتم: "ئێستا دەیڵێم و هەقیقەتیشە" داوای جگەرەی لێکردم و لە پاڵ مۆمەکەدا دانیشت. پاشماوەی جگەرەکە لە نێو پەنجەکانمدا نەماو ئەوەیشم لە بیر چووبوو کە جگەرە دەکێشم. وتی: "نازانم بۆ ئەو شوێنەم بیرناکەوێتەوە کە ئەو دەستەواژەیەم تیا نووسی" پێم وت: "هەر ئەو هۆیەیە کە بۆ ڕۆژی دوایی وشەکان لەبیر منیش دەباتەوە" بە دەنگێکی غەمگینەوە وتی: "نا، هەندێك جار وا دەزانم کە ئەوەیشم لە خەوندا دیوە" لەسەر کورسیەکە هەستام و بەرەو مۆمەکە رۆیشتم، ئەو کەمێك لەولاترەوە بوو، بەڵام من هەر دەرۆیشتم و جگەرەو شقارتەکەم بە دەستەوە بوو، لە مۆمەکە تێنەپەڕیم، دەستم درێژکرد و جگەرەکەم بۆ ڕاگرت، بە لێوی گرتی و پێش ئەوەی شقارتەکەی بۆ لێبدەم دانەویەوە تا بە گڕەکە دایبگیرسێنێت. وتم: (بێگومان ئەو دەستەواژەیە لە شارێك لە شارەکانی ئەم جیهانەدا نووسراوە: "چاوی سەگە شینەکە" ئەگەر بەیانی بیرم کەوتەوە لەو شارەدا بەدوا تا دەگەڕێم) دیسان سەری بەرزکردەوە و جگەرە داگیرساوەکەی بە لێوەوە بوو، "چاوی سەگە شینەکە" بە دەم هەناسە هەڵکێشان و یادکردنەوە و جگەرە داکەوتوەکەی لای چەنەیەوە وتیەوە و چاوێکی کەمێك نووقاند، پاشان دووکەڵەکەی هەڵمژی و جگەرەکەی لە نێو پەنجەیدا ڕاگرت، هاواری کرد: "ئێستا هەموو شتەکان گۆڕان، من هەست بە گەرمیی دەکەم" نەبرەی دەنگەکەی گەرمی و خێرایی پێوەبوو، وەك ئەوەی بە ڕاستیی ئەوەی نەوتبێت و قسەکەی لەسەر پەڕەکاغەزێك نوسیبێت و پاشان لە گڕەکەی نزیك خستبێتەوە و منیش دەمخوێندەوە "من وا هەست دەکەم.." وەك ئەوەی پاشماوەی پەڕە کاغەزەکە بە گڕگرتوویی لە نێوان پەنجە کەڵە و پەنجەی شایەتیدا مابێتەوە و کە من کەوتمە خوێندنەوەی ".. گەرم دەبمەوە" هەموو پەڕەکە سوتابوو بێجگە لە خۆڵەمێشە بیٚ نرخەکەی سەر زەوی هیچی لیٚ نەمابوەوە. وتم: "هەندێك جار کە تۆ لە پاڵ مۆمەکەدا بە هەڵلەرزینەوە دەبینم ترسم لیٚ دەنیشێت"

سالآنێك بوو یەکترمان دەبینی، ئەو کاتانەی پێکەوە دەبووین، یەکێك لە دەرەوە کەوچکێکی بچووکی لە دەست بەردەبوەوە و لە دەنگەکەی بە ئاگا دەهاتینەوە، وردەوردە هەستمان بەوە کرد کە هاوڕێیەتی ئێمە بە شت گەل و رووداوی بچووکەوە بەستراوەتەوە. هەمیشە دیدارەکانمان بەو شێوەیە کۆتایی دەهات، واتا بە کەوتنی کەوچکێکی بچووك لە بەرە بەیاندا.

کە گەیشتمە پاڵ مۆمەداگیرساوەکە لێی ڕوانیم، بیرم کەوتەوە کە پێشتریش هەروا لێی دەڕوانیم، لەو خەونە دوورانەدا کە کورسیەکەم





وەردەچەرخاند و لەسەر قاچەکانی دواوەی لەنگەرم پێ دەگرت و لەبەردەم ژنێکی نەناسی چاو خۆڵەمێشیدا دادەنیشتم. هەر لەو خەونەدا بوو کە بۆ یەکەمجار لێم پرسی: "تۆ کێیت؟" پێی وتم "لە بیرم نییە" وتم: "بەڵام وا دەزانم من و تۆ پێش ئێستا یەکتریمان دیبێت" بێ دەربەستانە وتی: "وا ئەزانم جارێك هەر لە هەمان ژووردا خەونم پێوە دیویت" پێم وت: "وایە، ئێستا بیرم کەوتەوە" وتی: "بەڕاستیی شتێکی سەیرە، من وتۆ لە خەونی تریشدا یەکترمان دیوە"

دوو مژی لە جگەرەکەیدا، وەلێ من هەروا بە بێدەنگیی لە بەردەم مۆمەکەدا مامەوە و لە پڕا چاوم تێبڕی. لەسەریەوە تا پێیم تەماشا کرد، هێشتا هەر ڕەنگی مس دەچوو، بەڵام نەك کانزایەکی ڕەق و سارد، بەڵکوو مسێکی زەرد و نەرم کە قابیلی چەکوشکاری بێت، دیسان ڕستەکەی خۆمم وتەوە "حەز ئەکەم دەستت تێوەدەم" وتی "تۆ دەتەوێت هەموو شتێکت لە دەست بچێت" وتم "گرنگ نییە، ئەوەندە بەسە سەرینەکە هەڵبگێڕینەوە و پێکبگەین" دەستم بەسەر مۆمەکەدا درێژ کرد، ئەو نەجوولاَ و پێش ئەوەی دەستم بیگاتێ وتیەوە "تۆ دەتەوێت هەموو شتێکت لە دەست بچێت ڕەنگە ئەگەر لە پشت مۆمەکەوە بسوڕێیت لە خەو رابین و ترس هەموو گیانی داگیرکردبین، کەسیش نازانێت ئەمە لە کوێی ئەم دنیایەدا روو دەدات" بەڵام من جەختم کردەوە "گرنگ نییە" ئەو وتی "ئەگەر سەرینەکە هەڵبگێڕینەوە دووبارە یەکدی دەبینینەوە، بەڵام کە لە خەوەکە هەڵدەستیت لە بیرت نامێنێت"

ورده ورده گەڕامەوە سووچی ژوورەکە، ئەو هەر لە دواوە مایەوە و دەستی گەرم دەکردەوە. هێشتا نەگەیشتبوومە سەر کورسیەکە گوێم لێ بوو وتی: "کە نیوە شەو بە ئاگادێم لەناو جێگاکەمدا خەوم دەزڕێ، وەك قوماشی سەرینەکە دەرزی بێت و بە چۆکمدا بچێت، تا بەیانی هەروا دەمێنمەوە و دەڵێم: "چاوی سەگە شینەکە"

کە رووم لە دیوارەکە کرد بێ ئەوەی تەماشای بکەم وتم "ئێستا کازیوەیە" کە سەعاتی دووی بەیانی لێیدا لە خەو هەستام و بۆ ماوەیەکی زۆر هەروا مامەوە. بەرەو لای دەرگاکە چووم، کە دەستگیرەکەیم گرت دیسان گوێم لە دەنگی بوەوە، ئەو دەنگەی وەك خۆی وابوو، دەیوت: " دەرگاکە مەکەرەوە، ڕارەوەکە پڕ لە خەونی ئاڵۆزە" پێم وت: "چۆن دەزانیت؟" پێی وتم "چونکە کەمێك پێش ئێستا لەوێ بووم، کەزانیم لەسەر لای چەپم نوستووم ناچاربووم بگەڕێمەوە" بەڵام من درزێکم خستبوە دەرگاکە، کەمێك جووڵاندم و شەماڵێکی هێور هەوایەکی فێنك و بۆنێکی تازەی زەویە کێڵراوەکانی بەسەرمدا هێنا. جارێکی دی کەوتەوە قسە. گەڕامەوە و بێ ئەوەی بهێڵم دەنگی لێوە بێت دەرگاکەم جووڵاندەوە. وتم: "بڕواناکەم دەرەوە ڕارەوی هەبێت، من هەست بە بۆنی کێڵگە دەکەم" وەلێ ژنەکە کەمێك لە من دوور کەوتبوەوە وتی " لە تۆ باشتر ئەوە دەزانم، مەسەلەکە ئەوەیە کە لەوێ ژنێك خەون بە کێڵگەکانەوە دەبینێت" دەستی بەسەر گڕەکەوە هەڵپێکاو لەسەر قسەکانی ڕۆشت "ئەوە ئەو ژنەیە کە هەمیشە حەزی بەوە بووە ماڵێکی لەناو کێڵگەدا هەبێت، بەڵام نەیتوانیوە شار بەجێبێڵێت" بیرم کەوتەوە کە من ئەو ژنەم لە هەندێك لە خەونەکانی پێشوودا بینیوە، بەڵام دەمزانی، ئێستا کە دەرگا نیوە کراوەیە، پێویستە لە ماوەی نیو ساعاتدا نانی بەیانی بخۆم، وتم " بەهەر حاڵ بۆ ئەوەی لە خەو هەستم دەبێت لێرە دەربچم"

لە دەرەوە بۆ چرکەساتێك با هەڵیکرد و زووش خستی، پاشان پرخە پرخی نووستووەیەك هات کە لەناو جێگاکەیدا دەتلایەوە، با لە کێڵگەکاندا خستی، هیچ دەنگی با نەما، وتم "سبەینێ لێرەوە

تۆ دەناسم، دەتناسم کاتێک ژنێک دەبینم لەسەر شەقامەکان دەنووسێت "چاوی سەگە شینەکە" ژنەکە زەردەخەنەیەکی غەمگینی هاتێ — زەردەخەنەیەك بە مانای خۆ بەدەستەوەدان بەرانبەر بە شتێکی مەحاڵ کە هەرگیز قابیلی بەدی هاتن نەبێت. ژنەکە وتی "لەگەڵ ئەمانەیشدا، لە ڕۆژدا هیچت بیرناکەوێتەوە" پاشان دەستی نایەوە سەر مۆمەکە و تەمێکی خەستیش بە جەستەیەوە ئالاّ بوو: "تۆ ئەو تاقە پیاوەیت کاتێک کە لە خەو هەڵدەستیت هیچ خەونێکت لە یاد نامێنێت".

**سەرچاوە**

مختارات قصصیه 1947-1992: غابریل غارسیا ماركیز



# وەسیەتنامەی مارکیز

لە فارسییەوە: سەردەم



لە ڕۆژی هەژدەی تەموزی ساڵی 2000دا گابریل گارسیا مارکیز نووسەری تەمەن 73 ساڵەی کولومبیایی لە ڕێگای رادیوی ناوخۆی بۆگۆتاوە کۆڕێکی نیمچە شیعریی بەناوی ماڵئاوایی لەگەڵ هاوڕێ و خوێنەری بەرهەمەکانیدا سازدا. پاشان، دەقی وتەکەی مارکیز لە هەموو ڕۆژنامەکانی دنیادا بڵاوبوەوە کەمایەی سەرسووڕمان و داخ و دوو دڵیی هاوڕێ و دۆستەکانی ئەم نووسەرە بوو.

ئەم نامەی ماڵئاواییە، لە وڵاتانی ئەمریکای لاتیندا بوە ویردی سەر زمانی هەموو منداڵ و گەنج و تەواوی چینەکان. گەلێك کەس لە ئەمریکای لاتیندا، ئەو وتە شیعریەی لەبەرکرد و وەك گۆرانیی ڕۆژانە دەیان وتەوە.

بە وتەی یەکێك لە هاوڕێکانی:

–دوای ئەوەی پزیشکەکان گابو یان لە زیادکردنی نەخۆشی سەرەتانەکەی ئاگادار کرد، گابو وای بەچاك زانی کە وەك سووریپێستەکانی گوافیرایی بۆ مردنەکەی بگەڕێتەوە سەرزەمینەکەی خۆی ئێستا ئەو –دوای ساڵێك– گەڕاوەتەوە وڵاتی خۆی و وەك چۆن بە سەد ساڵ تەنیاییەکەی



دنیای ورووژاند. وەك خاڵی كۆتاییش وتە شیعریە جوانەكەی پێشكەش بە خۆشەویستانی كرد. لێرەدا دەقی ئەو وتە شیعریە بڵاودەكەینەوە.

ئەگەر خوداوەند، بۆ چركەساتێك لە بیری بچێت و من بە بووكەڵەیەك دابنێت و ئەگەر بۆ ماوەیەكی كورت تەمەنم درێژ بكاتەوە. بێگومان لە بارەی ئەو شتانەوە نادوێم كە بەبیرمدا دێن.

بەڵكوو بیر لەو قسانە دەكەمەوە كە دەمەوێت بیانڵێم.

شتەكان هەڵدەسەنگێنم، نەك لەبەر بەهای مادیان، بەڵكوو لەبەرماناكانیان.

كەم دەخەوم، بەڵام خەونی زۆر دەبینم، دەزانم ئەو دەقیقەیەی چاولێك دەنێم، شەست چركە رووناكی لە دەست دەدەم.

ئەو كاتەی خەڵكانی دی دەپەیڤن من گوێ دەگرم و چێژ لە وتەكانیان دەكەم، ئەو كاتانەی خەڵكی دەنوون من ڕادەبم. چێژ لەو ئایسكریمە خۆشە دەكەم كە تامی شوكولاتە دەدات.

ئەگەر خوداوەند جارێكی دی تەمەنم پێ ببەخشێت، جلوبەرگی سادە دەپۆشم و لەبەرهەتاودا ڕادەكشێم، نەك تەنیا جەستەم لەبەر خۆردا هەڵخەم، بەڵكوو ڕۆحیشم هەر دەخەمە بەر هەتاو.

خوداكەم، ئەگەر دڵم هەبوایە ڕق و كینەكانم لەسەر سەهۆڵ دەنووسیەوە و چاوەڕێی هەڵهاتنی خۆرم دەكرد. لەسەر ئەستێرەكان بە خەونی (ڤان كۆخ) گۆرانیەكانی "بنەدیتی"م دەنەخشاند و ئاوازەكانی "سرات"، دەبوونە گورانیی شەوان و عاشقانەی من لەگەڵ مانگدا.

بە فرمێسكەكانم ئاوی گوڵی سوورم دەدا، تا هەست بە ئازاری دڕكەكانی.. و ماچی پەڕە سوورەكانی بكەم. خوداكەم، ئەگەر بۆ چركەساتێك ژیانم پێ ببەخشیتەوە، ڕۆژێكی تەمەنم بە خەسارنادەم كە بەخەڵكیی نەڵێم "خۆشم دەوێن" كە من ئەوانم خۆش دەوێت. دەبێت هەموو پیاوو ژنەكان بەوە بزانن كە من خۆشم دەوێن و، من عاشقانە لەگەڵ خۆشەویستیدا دەژیم.

بە هەموو خەڵكیی دەسەلمێنم چەندە هەڵەن ئەگەر وا بزانن كە پیربن ناتوانن عاشق بن، ئەوان بەو ڕاستیە نازانن تەنیا ئەو كاتە پیردەبن كە واز لە خۆشەویستی دێنن.

باڵی فڕین دەدەمە منداڵان، پێیان دەڵێم خۆیان فێری فڕین بن، بە بەساڵاچووەكان دەڵێم كە مردن لە پیربوونەوە نییە، بەڵكو و لە فەرامۆشیەوەیە. خەڵكینە، من زۆرشت لە ئێوەوە فێربووم. فێری ئەوەبووم كە هەموو خەڵكیی پێیان خۆشە لە ترۆپكی چیادا بژین، بێ ئەوەی بەوە بزانن كە خۆشبەختی ڕاستەقینە لەو نشێویەوە دەست پێ دەكات كە بەرەو لووتكە دەمانبات.

لەوە گەیشتووم.. كە منداڵێك بۆیەكەمجار پەنجەكانی باوكی بە دەستە بچووكەكانی دەگرێت و دەیگوشێت، ئیتر تاهەتاهەتایە ئەو دەستە بەرنادات.

لەوە تێگەیشتووم تەنیا ئەو كاتە مرۆڤێك هەقی ئەوەی هەیە مرۆڤێكی تر لە خوار خۆیەوە ببینێت كە ئەم بەپێوە وەستابێت و بیەوێت یارمەتی بدات. خەڵكینە.. من هەموو ئەم شتانە لە ئێوەوە فێر بووم، بەڵام بەداخەوە سوودم لە زۆریان نەدی بوو. چونكە كاتێك فێریان بووم كە لە سەرەمەرگدا بووم.

ماركیز

## سەرچاوە

یاداشت های روزهای تنهایی گابریل گارسیا ماركیز.

# بۆ خوێنەرانی

# "گۆڤاری سەردەم"

ئاگاداری خوێنەرانی گۆڤارەکەمان دەکەین کە لە ژمارەی داهاتوواماندا فایلێکی تایبەت بە میشێل فۆکۆ

دەکەینەوە.

چاوەڕێی هاوکاری و بابەتەکانی ئێوین

# وێستگەکانی سەردەم

- **ڕاسیزم**

له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- **دێوانە گەرمەکان**

فرانسوا لیلۆر

له فەرەنسییەوە: جەلال

- **هەزار و یەك نامەی خۆشەویستی بۆ ڤیکتۆر هیگۆ**

له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

- **فەیلەسوف کێیە؟**

عەلی حەرب

له عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵڵا

# ڕاسیزم

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد




کتێب: ڕاسیزم
نووسینی: جۆرج. م. فریدریکسۆن
بڵاوکراوەی: چاپەمەنیەکانی زانکۆی کالیفۆرنیا
چاپی یەکەم – 2004
قەوارە: 224 لاپەڕەی مام ناوەند

نوسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆری ئەمریکایی "جۆرج. م. فریدریکسۆن"ە، کە پسپۆڕە لە بواری لێکۆڵینەوە ئەنترۆپۆلۆژیو زانستە مرۆڤایەتییەکان بەشێوەیەکی گشتی. لەم کتێبەیدا کورتەیەکی مێژوویمان دەربارەی ڕاسیزم لە خۆرئاوادا بەردەست دەخات، هەر لە سەردەمە دێرینەکانەوە تا ئەمڕۆ.

پێویستە ئەوە بزانین کە پارتە ڕەگەزپەرستەکان لە خۆرئاوادا، بە نەمانی فاشیزم و نازیزم و شکست هێنانیان لە جەنگی دووەمی جیهانیدا کۆتاییان نەهات. ڕاستە ئەو پارتانە بەسەرکەوتنی دیموکراسی گورزێکی کوشندەیان بەرکەوت و ئاستی جەماوەریەتیشیان دای لە کزی بە تایبەتی لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەك: فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئینگلستان و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو.. هتد، بەڵام تا هەنوکەش ئامادەگیان هەیە و کەمینەیەکی بچوك پێك دێنن لەناو کایەی سیاسی ئەو وڵاتانەدا. پارتی ڕاستڕەوی توندڕەو لە ئەڵمانیا لە میانەی هەڵبژاردنە گشتیەکاندا لە 5٪ ی دەنگەکان زیاتر بە دەست ناهێنێت، بەڵام لە فەرەنسا بەڕابەرایەتی "ژان ماری لۆپن" ڕێژەی 15٪ بەدەست دێنێت. گرنگی ئەم پارتانە لە فەرەنسا و سەرتاسەری ئەوروپادا لە زیادبوندایە، بە تایبەت پاش ئەوەی ژمارەی کۆچبەران لەم وڵاتانەدا زیادی کرد، ئیتر ئەو کۆچبەرانە بە ڕەگەز عەرەبی یان ئیسلامی یاخود ئەفریقی پێست ڕەش بن.

"جۆرج. م. فریدریکسۆن" لەم کتێبەدا دەنوسێت: (پارتە ڕاستڕەوە توندڕەوەکان لە فەزای قەیران و بێکاری و هەژاریدا دەبوژێنەوە، تا ڕێژەی کرێکارانی کۆچبەریش لە زیادبووندا بن، ڕاسیزمیش لە هەڵکشاندا دەبێت. کەواتە پێویستە چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتیەکانی وەك هەژاری و بێکاری و پەراوێز خستن بکەین، بۆ ئەوەی لە هەستی ڕەگەزپەرستی لە دژی بیانیەکان کەم کەینەوە).

هەڵوێستی ڕەگەزپەرستی لەوانی دی هێندەی کۆنی مێژوو کۆنە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەمکی ڕاسیزم بۆ یەکەمجار لە ساڵی 1932 هاتە ئارا، ئەوەش لە فەرهەنگی (لارۆس)ی فەرەنسیدا بوو. دەکرێت هەمان شت دەرهەق بە چەمکی ڕاسیزم لە زمانی ئینگلیزیشدا بڵێین. ڕاسیزم ئەو کەسەیە بڕوای بە ڕەگەزی بەرز و باڵا و ڕەگەزی نزم و دواکەوتوو هەیە. لێرەوە ئاگاداری دەداتە ڕەگەزی بەرز و باڵا تا ژن و ژنخوازی لەگەڵ ڕەگەزی دووەمدا نەکات، بۆ ئەوەی خوێن پاکی و باڵا دەستی خۆی بپارێزێت.

لەسەردەم و زەمانی "ئەدۆڵف هتلەر"دا دەستکرا بە پۆلێنکردنی ڕەگەزی مرۆڤایەتی بەپێی گرنگیان، لەمەشدا ڕەگەزی ئاری ئەوروپایی لە ڕیزی پێشەوەدا بوو. بەشێوەیەکی گشتی ڕاسیزمەکانی ئەوروپا

پێیان وایە قەشەنگترین و بالاترین و بلیمەتترین ڕەگەز، مرۆڤی سپی پێستە، بەلام ڕەگەزی ڕەش پێست بە نەفرەت دەکرێت، لەبەرئەوەی ڕەگەزی میللەتە دڕندە و ناشارستانیەکانە.

بەمجۆرە ڕاسیزمەکان لە ڕێگەی ڕەنگی قژ و پێستەوە بڕیار لەسەر مرۆڤ دەدەن و ئەوەیان بیر دەچێت کە سپی پێستی زۆر هەن گەمژەن و ڕەش پێستی زۆریش هەن کە زیرەك و وریان.

سەرەنجام زانستی بایۆلۆژیا تیۆریای ڕەگەزپەرستی بەدرۆخستەوە و لەم بارەیە دەڵێت: (ڕەگەزێکی ئینسانی نییە کە بەشێوەیەکی خۆڕسك و پێشوەخت لەسەروی ڕەگەزەکانی دیکەوە بێت، بەلام لە ساتەوەختێکدا هەلومەرجی لەبار دێتە پێشێ بۆ دروستکردنی شارستانیەت و میللەتیش بەو ئەرکە هەڵدەستێت، ئیتر ئەو میللەتە سپی پێست بێت یاخود ڕەش پێست. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە شارستانیەت لە جێگایەکەوە دەچێت بۆ جێگایەکی دیکە و لە ڕەگەزێکی ئینسانیەوە دەگوازرێتەوە بۆ ڕەگەزێکی دی).

بۆ ماوەیەکی زۆر عەرەبەکان خاوەنی شارستانیەت بوون، پاشان ئەوروپییەکان بوون بە خاوەنی، ئەویش لەبەر چەند هۆکارێکی مێژوویی نەك لەبەر هۆکاری ڕەگەزیی. هەروەها بەر لە هەزاران ساڵ شارستانیەت لای ڕەگەزی زەرد پێستەکان بوو لە ولاتی چین، هەنووکەش لەوەدایە ئەو شارستانیەتەیان بۆ بگەڕێتەوە. کەواتە تیۆریای ڕەگەزپەرستی لە ڕووی زانستی و مێژووییەوە شکستی هێنا، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا ڕەگەزپەرستێکی زۆر لە ئارەدان.

لە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبەدا "جۆرج. م. فریدریکسۆن"، ئایدیای دیارترین ئەو تیۆرسینانە دەخاتە ڕوو کە تیۆریزەی ڕەگەزپەرستیان لە خۆرئاوادا کردووە، لە ڕیزی پێشەوەشیاندا "گۆبینۆ"ی فەرەنسی و "شامبرلین"ی بەریتانی و.. هتد. دەربارەی "گۆبینۆ" دەڵێت: (ساڵی 1816 لە گوندێکی فەرەنسادا هاتۆتە دنیاو، لە تافی لاوێتیدا دەچێتە پاریس بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن. لەوێدا چاوی بە زانا و ئۆرینتالیستی بەناوبانگ سیلڤستەر دوسا سی دەکەوێت، پاشان چاوی بە فەیلەسوف ناودار تۆکڤێل دەکەوێت. ئەم یەکتربینینە کاریگەریەکی مەزنی لەسەر ژیان و چارەنووسی داهاتووی دەبێت، لەبەرئەوەی تۆکڤێل توانی یارمەتی بدات و ئەگەری باشترکردنی پلەو پایەی کۆمەلایەتی بەردەست خست. سەر وەختێك تۆکڤێل ساڵی 1849 بوو بە وەزیری کاروباری دەرەوە، گۆبینۆی کرد بە بەڕێوەبەری ئۆفیسی خۆی لە ناو وەزارەتدا. پاش ئەوەش وەکو باڵیۆزی فەرەنسا لە بیرن لە ولاتی سویسرا دەست بەکاربوو. بەمجۆرە گۆبینۆ بوو بە خاوەن پۆستێکی بەرز و پێگەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی وا کە ئیرەیی پێ دەبرا. ئەم پۆستە توانستێکی مادی وای بۆ مسۆگەر کرد تا بتوانێت خۆی بۆ باس و لێکۆڵینەوەکانی تەرخان بکات و هەروەها بۆ ئەوەی کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی دەربارەی — نایەکسانی نێوان ڕەگەزی مرۆڤایەتی — لە نێوان سالانی 1853-1855دا بلاو بکاتەوە. دواتر ئەم کتێبە دەبێتە ئینجیلی تەواوی ڕاسیست و فاشیستەکانی ئەوروپا. گۆبینۆ مرۆڤایەتی بەسەر سێ ڕەگەزدا بەشدەکات: ڕەگەزی سپی و ڕەگەزی ڕەش و ڕەگەزی زەرد. لەو پۆلبەندیەدا ڕەگەزی ڕەش پێست لە خواری خوارەوە دێت و دەڵێت: ئەوانە زیرەکی و توانستی ئەقڵیان سنوردارە، لێرەوە هەرچی بکەن ناتوانن لەو

دۆخی دواکەوتوویە قوتارین.. هەرچی ڕەگەزی زەرد پێستە ئەوا خەسڵەتی خەڵکانی لاواز و زۆر ئاساییە، ڕاستە دەتوانن هەندێك دەسکەوت بەدەست بێنن، ئەویش بەهۆی حەزی زۆریان بۆ پەیڕەوکردنی یاسا و پابەندبوون بە ڕێسا کۆمەڵایەتیەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن ئاستێکی دیاریکراوی شارستانیەت تێپەڕێنن. بەڵام ڕەگەزی سپی پێست ئەوا باشترین و جوانترین و بەرزترین ڕەگەزە و بێ هیچ چەند و چونێکیش سەرداری جیهانن، تەواوی دۆزینەوە و داهێنانە زانستیەکانیش بەرهەمی دەستی ئەوانە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە ئەورووپای سپی پێست کۆنترۆڵی دنیای کردووە).

نوسەر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (پێویستە ئەوەمان لە بیرنەچێت کە گۆبینۆ ئەم بۆچونانەی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا نووسیووە، واتە سەروەختێك کە کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی کۆنترۆڵی جیهانی کردبوو. لێرەوە ئەم دۆخە هانی گۆبینۆی دا کە بڕوا بهێنێت بەوەی ڕەگەزی سپی پێستی ئەورووپی چاکترین ڕەگەز و لە هەمووشیان زیاتر دانا و بلیمەتترە، گەرواش نەبوایە نەیدەتوانی ئەو ئامێر و تەکنۆلۆژیا مۆدێرنانە دابهێنێت و دەست بەسەر جیهاندا بگرێت).

پێویستە بزانین کە "گۆبینۆ" شەڕانگێز نەبووە و لە ڕەگەزە نا ئەورووپیەکانیش داخ لەدڵ نەبووە. هەروەها بانگەشەی چەوساندنەوەو پاکتاوکردنیانی نەکردووە، وەك ئەوەی دواتر فاشیزم و نازیزم ئەنجامی دەدەن. بەڵام جەخار بەهۆی ستایشکردنی زۆری ڕەگەزی جێرمانیەوە و باسکردنی زۆری خەسڵەت و بلیمەتیەکانی ئەوانەوە، ڕەگەزپەرستەکانی ئەڵەمانیا و لەسەروو هەمووشیانەوە "ئەدۆلف هتلەر" تەبەنی بیروبۆچوونەکانی "گۆبنۆ" یان کردو و پاش شێواندنی لەسەر زەمینەی واقیع پراکتیزەیان کرد.

پراکتیزەکردنی بیروبۆچوونی ڕەگەزپەرستی بەشێوەیەکی عەمەلی، تەنها لەو کاتەدا ڕوویدا کە نازیستەکان گەیشتنە دەسەڵات. ئەو کات بوونە خاوەنی سەرجەم ئەو ئامراز و توانستانەی ڕێگای دەدان بۆ پراکتیزەکردنی ئەو تیۆریایەی "هتلەر" لە کتێبی (خەباتم)دا جەختی لەسەر کردبووەوە.. ئەم کتێبە بە فیعلی کتێبی خەبات و تێکۆشان بوو، بەڵام ئەڵبەتە لە پێناو شەڕ و خراپەکاریدا، نەك کتێبێکی تیۆری بێت بە شێوەی کتێبەکەی "گۆبینۆ"ی بێچارە. یەکەمین شتێك "هتلەر" دوای باڵادەستی ڕەگەزی ئاری نەژاد تەئکیدی لێ کردبێتەوە، ڕێگەگرتن بوو لەوەی ڕەگەزە جیاجیاکان تێکەڵی یەکتربن.

بەبۆچونی ئەو تێکەڵبوون کارێکی خراپە، بە تایبەت ئەگەر لە نێوان ڕەگەزێکی بەرز و ڕەگەزێکی نزمدا بوو، لەبەر ئەوەی نەوەیەکی شێواو و ناشیرین دەخاتەوە و لە سیفەتە دەگمەنەکانی ڕەگەزی باڵا کەمدەکاتەوە و لە ئاستی دادەبەزێنێت.

لە ڕاستیدا ئەم هەڵوێستە ڕەگەزپەرستیە لە ژینگەی ڕاستڕەوە توندڕەوەکانی خۆرئاوادا باڵا دەستە و، خانەوادە ڕاستڕەوەکان هەرگیز ڕێگەنادەن کچەکانیان شوو بە کۆچبەرەکان بکەن، چونکە پێیان وایە ئەوانە ڕەگەزێکی کەمتر و لە خوارترن لە خۆیان. هاوکات ناهێڵن کوڕەکانیشیان ژن لە ڕەگەزێکی دیکە بێنن، لەبەرئەوەی منداڵەکانیان لە ڕەگەزێکی تێکەڵ و دۆنی دەبن.

بەڵام ئەوەی مایەی دڵخۆشیە ئەوەیە کە لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوودا، زۆربەی زۆری گەلانی ئەورووپا ئەم هەڵوێستە ڕەگەزپەرستانەیان تێپەڕاندووە،

کەمینەیەك نەبێت لە ڕاستی توندڕەو کەس قەناعەتی بەو مەسەلەیە نەماوە. هەر بۆیە زۆر جاران لە سەر شەقامەکاندا دەبینین کە پیاوێکی ئەوروپی سپی پێست لەگەڵ ژنێکی ڕەش پێستدایە، یان بە پێچەوانەوە. وەك دەزانرێت "هتلەر" ئامۆژگاری ئەوەی ئەڵەمانەکانی دەکرد کە ڕێگە بە ڕەگەزە دۆنیەکان نەدەن، ژن و ژنخوازیان لەگەڵدا بکەن. ئەو مەسەلەیە لای ئەو خەتی سور بوو کە نەدەبوو ببەزێنرێت، گەرنا ئەوا شارستانیەت لەناو دەچێت و هەرەس دێنێ.

"هتلەر" مۆجیاری ئەڵەمانەکانی دەکرد خۆیان بە دوور بگرن لە ڕەگەزی جولەکە و ڕەش پێست و عەرەب. لەم بارەیەوە دەڵێت: (ئەگەر تێکەڵ بوون لەگەڵ ئەم ڕەگەزە دزێو و ڕیسوایانەدا ڕووبدات، ئەوا مانای سەرەتای کۆتایی هاتنی ژیاری ئەوروپییە).

ڕاستە ئەم مۆجیارییە کتومت و وەکو خۆی لە کتێبەکەی "هتلەر"دا نییە، بەڵام لە هەندێك لەو بڵاوکراوانەدا هەیە کە لە فەرەنسادا بە دەرکەوت، لە سەردەمی هەڵکشانی فاشیزم و نازیزمدا. سەرچاوەی ئەو بۆچوونانەش بیروبۆچوون و تیورەکانی "ئەدۆلف هتلەر" بوو.

ڕەگەزپەرستی "هتلەر" تەنها دژی ڕەگەزەکانی دیکە نەبوو، بەڵکو لە دژی توێژە لاواز و نەخۆشەکەی ناو گەلی ئەڵەمانیش بوو. لێرەوە فەرمانیدا بە کوتانی ئەوانەی دوچاری نەخۆشی بۆماوەیی بوون تا نەهێڵێت زاوزێ بکەن و وەچە بخەنەوە، ئەم پرۆسەیەش بە ناچاری و لە دژی خواست و ویستی ئەو کەسانەبوو.

وەك دەزانرێت "هتلەر" بە چاوێکی سوك سەیری کەسانی نەخۆشی دەکرد و ڕقی لە لاواز و نوقسانەکان بوو، هەر بۆیە داوای ئەوەی دەکرد کە هەر چۆنێك بووە دەبێت خۆمانیان لێ ڕزگار بکەین، لەبەرئەوەی ئەوانە بارن بەسەر گەلی ئەڵەمانیاوە. ئەڵەمانی ڕاستەقینە لە بۆچونی ئەودا گەنجێکی باڵا بەرزی چوارشانەی تێکسمراوی قژ زەردە، کە لێوان لێوە لە بڕوا بە خۆبوون و تەندروستی جەستەیی و هێزداری. ئەمە ئەو ئەڵەمانیە میسالیەیەکە پێویستە بژی، هەرچی ئەوانی ترە ئەوا دەبێت لەناوبچن.

نوسەر چەندین لاپەڕەی کتێبەکەی تەرخاندەکات بۆ قسەکردن لەسەر ڕاسیزم لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وەکو ئاشکرایە ڕەش پێستەکانی ئەوێ دوای خەباتێکی دوورودرێژ و جەنگێکی بێوادە مافە مەدەنیەکانی خۆیان بەدەست هێنا. هەروەها "مارتن لوتەر کینگ"ی سەرکردەیان بوو بە قوربانی کەسێکی ڕاسیزم یان لەلایەن کەسانێکی ڕەگەزپەرستی سپی پێستەوە بەو کارە ڕاسپێردرابوو.

سیاسەتی ئاپارتاید لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بواری نەدەدا کە سپی پێستەکان لە خوێندنگە و تەنانەت لەناو پاس و میترۆکاندا تێکەڵ بە ڕەش پێستەکان بن. هاوکات ڕەش پێستەکانیان لە گەڕەکە هەژارنشین و تایبەتەکاندا گیر دەدا، بەڵام خۆشبەختانە هەنوکە ئەم سیاسەتە ڕەگەزپەرستە بێزراوە چۆتە زبڵدانی مێژووەوە و کەسانێکی کەم نەبێت کە سەربە باڵی ڕاستڕەوی توندڕەوی ئەمریکایین، کەسی کە پەیڕەوی ناکات.

بەمجۆرە دەبینین بزاوتی مێژوو بە ئاڕاستەی ڕزگاری و کرانەوە دەچێت لەسەرتاسەری دنیاداو، دیموکراسی و هیومانیزمیش لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بەسەر ڕاسیزمدا سەرکەوت.

**سەرچاوە**

بیان الکتب – 2005/1/29.

# دیوانە گەرمەکان

**فرانسوا لیلۆر**

لە فەرەنسییەوە: جەلال حەمید



بۆ پیشاندانی ناوچەیەکی زۆر بەرفراوان گەلێ جار هەڵبژاردن لەسەر دیمەنگەلێك دەگیرسێتەوە کە نموونەیترین و کاریگەرترین ڕەگەز دەگرێتەخۆ هەر لە پێچی گردۆڵکە ئاڵتوونییەکانی تۆسکان و ڕووەکی دڕکاوی قوولایی بیابانەکانی ئەریزۆنا تاکو چیمەنی سەوزی هەڵڕژاوی نێو ڕووباری کەفچڕی ئیرلەندە. هەندێ کەس بە گلەییەوە ئەم دیمەنانە بە وێنەی کلێشەدار لە قەڵەم دەدەن بەڵام پرۆست وا دەڕوانێ کە کەسایەتییەکانی دۆستۆیفسکی تەواو لەگەڵ کارەکتەری ڕووسی دەگونجێن و بۆ هەمووانیش ئەوە دەردەخات کە زۆر جار کلێشەکان ڕووی ڕاستەقینە دەنوێنن. ئەم دوو کتێبەی باسیان لێوە دەکەین زۆر بە چاکی دوو ناوچەی تەواو جیاواز لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە بەرجەستە دەکەن و کەمێك لەو کتێبە چاکانە دەکەن کە توانای ئارەزووی پەیبردنی وڵاتێکت پێدەبەخشن یان بە پێچەوانەوە جەخت لەسەر ونبوونی ئەو خۆشەویستیە دەکەن کە خۆت بۆیانی دەبەیت. باسەرەتا ڕێچکەی هەنگاوەکانمان بەرەو – دەروونشیکاری *psychanalyse* هەڵنێین. ئەو بابەتەی کە لە میانیەوە پەرتووکی مسیۆ ژاك ئەندریێ جێگەی خۆی لە یەکێك لەم یاداشتنامە گەشتیانە دەکاتەوە کە بەهۆی سەرگوزەشتەگەلێکی نێو چەند چاوپێکەوتنێك لەگەڵ دانیشتوانگەلێکی وڵاتێك وات لێدەکەن بە چاکی لە مێژوو و دابونەریتی توێژینەوەیەکی درێژخایەنی بواری فێرکردن تێبگەیت. هەر پەرەیەك لە کتێبی – کتوپڕی دانشتنێك، *limprevne en séance* – ئەوی ڕاستی بێت بە ڕستەیەکی چاوەڕواننەکراو دەست پێدەکات کە گەلێ جار شیعر ئامێز و بەردەوام هەست ورووژێنە و لە ڕێگەی یەکێ لە کەسایەتیەکان ئەنجام دەدرێ کە لەسەر دیوانەکە ڕادەکشێ و ئەم قسانە بۆ نووسەر دەدرکێنێ: "من دڵنیانیم ببمە خاوەن منالی خۆم". "هەر کاتێ دەس بە قسە دەکەم لە خۆم دوور دەکەومەوە". "من هەمیشە لە پێشەوەم یاخود لە دواوەم، من بە دەگمەن لەوێ دەبم".. نووسەر یەکسەر ئەم ووشە دەربڕاوانە بە شێوەیەکی تەواو نەستیانە بەکاردەهێنێ لە پێناو دووبارە سەردانەوەی وێناگەلێکی میان دەروونشیکاری و ئاڵوگۆڕی نامە دەنگیە ووردەکانی نێوان ووتەی شیکەرەوە و دەقە دروستکەرەکان دیسیپلین دەپشکنێ. هاوکات دەربڕینی ووتەی – پێویستم پێتە – لە یەکەم بینین ئاساییە کاتێکە ڕێگەی دەداتێ کە جیاوازییە میکانیزمیەکانی خۆشەویستی دایکانەی بێتەوە بیر یاخود چاکترە بووترێ لاوازییەکەی وەبیر دەهێنێ چوونکە فرۆید و وینیکۆت دایك لە بواری دەروونشیکاری وەك گومانلێکراو لە قەڵەم دەدەن. هەروەها فەیلەسوف و ڕۆماننوسانیش بە سەرنجەوە بایەخ بە نووسەر دەدەن کە بەسەرکەوتوییەوە شانبەشان فۆلکنەر و دیدێرۆ بەراوردی دەکەن. بەهۆی پەسەندێ دێرگەلی بەرزی وەك ئەبسالۆن، ئەبسالۆن! و شکۆمەندی میتۆدی دەروونشیکاری ووتەکانی شیکارکەرەوە مل بۆ ڕۆشنایی

دەقە دامەزرێنەرەکان کەچ دەکەن کە هاوکات تیایاندا ڕێگە دەدات پەی بە خوێندنەوەیەکی نوێ ببرێت و تەنانەت بەڵگەنامە دیارەکانی تێڕامانێکی نوێ دەوڵەمەند بکات. ناسینی لایەنی دەروونی وا گریمان دەکرێ کە لەو تیشك هاویشتنە سەرە هاوبەش و ڕەنگدانەوە نەمرە هەڵقولاَ بێ کە لەلایەن هەموو نەوەیەکی نوێی دەروونشیکار و نەخۆشیەکانیەوە دێتە پاراستن.

کەسانێکی زۆر پێشەکیە ڕۆشنکەرەکانی مسیۆ ژاك ئەندرێ کە لە بارەی نووسراوە مەزنەکانی فرۆید نووسیونی بە هەند وەردەگرن گەرچی خاوەن بیرۆکەیەکی ئاڵۆزە بەڵام هەڵگری زمانێکی سادە و ئاشکرایە و پێچەوانەی ئەو نەریتە باوە هەڵەیەیە کە هەمیشە دەخوازێ نووسینی دەروونشیکاری لە بۆتەی تێگەیشتنی قورسدا بمێنێتەوە. کتێبەکەی مسیۆ ژاك کۆتغۆ - پەیبەرانی خود، *Les visiteurs du soi* - دەخوازێ بمانباتە شوێنێکی جیاواز ئەویش ناوچەی پزیشکی دامەزراوە لەسەر بنەمای بەڵگەکان کە پرنسیپەکانی لەسەر چارەسەر یاخود پزیشکی دەروونی - *psychotherapie* - جێبەجێ دەکرێن. لێرەدا بەرزبوونەوەی ڕادەی زانیارییەکان لە ڕووی بەرەنگاربوونەوەی نێوان چاودێریکردن و دەقە مێژووییەکان چاوەڕێ ناکرێ بەڵکو دەکەوێتە نێو بەرەنگاربوونەوەی گریمانەکان و ئەم جۆرە چارەسەرکردنە دەتوانێ دڵە ڕاوکێ هێور بکاتەوە و لە سۆنگەیەوە کارەکان ئەزموندەکرێن و خەمۆکێتی و دڵە ڕاوکێی نەخۆشەکە چارەسەر دەکات و دۆخی ماوەی بەرودوای وەرگرتنی ئەم چارەسەرکردنە دەنرخێنێ. بەر لە گەیشتن بەو لاپەڕەیەی کە تەواو هەڵگری ناونیشانی - قورسایی سەلماندن -ە مسیۆ کۆترۆ بە پێنوسێکی وریاکەرەوە مێژووی ڕەوتە مەزنەکانی بواری پزیشکی دەروونی شانبەشان بەر تەمایی و میتۆد و نشوستیەکانیان دەخاتە ڕوو. ئەو هەڵسوکەوتەی کە لەم جۆرە نووسینەدا دەیسەلمێنێ چاوەڕواننەکراوە و لەوە چاکەکارە کە لووتبەرزی تیادا گەلێ جار تووند و تیژانە هەڵسووکەوت دەکات. ئاشکرایە کە بەهۆی پاڵپشتکردنی دەرخستنی ئەنجامی توێژینەوە گەورەکانی هەڵسەنگاندن نووسەر لە میان نزیکخستنەوەی دەروونشیکاری و نەخۆشیە ئاوەزییەکان ئەنجامێکی پۆزیتیڤانە بە دەست نادات کە زۆر چاك دەزانێ ئەوە بەشداری لە یومانیزەکردنی دەروونشیکاری دەکات و دیوانیش دەتوانێ کۆمەڵێك نەخۆشی چارەسەر بکات. بەڵام لە ڕوانگەیەوە "ژیان گەر ماوەیەکی گەلێ درێژخایەن بخرێتە ژێر دەست پزیشکێکی دەروونیەوە ئەوا گەلێ مەترسیدار دەبێت". مسیۆ کوترۆ کە لایەنگری پزیشکی دەروونیە مەبەستەکانی لەمیان ماوە و ئەنجامەکان جێگیر کرد کە پێویستە کاریگەرییان بە شێوەیەکی زانستیانە بنرخێنرێ و مەرجەکان ببنە وەڵامدەرەوەی چارەسەری ئیدراکی و ڕەفتاری کە ئەمڕۆ دەستی بەسەر جیهانی ئەنگلۆ سەکسۆن گرتووە و هەروەها دەسکراوە بە بایەخدان بە کۆمەڵێك چارەسەری دەروونی سروش وەرگر لە دەروونشیکاری ناوچەکانی ئەودیو ئەتلەنتیك.

کتێبەکە تەواو دوور لە زبری و دڵڕەقی ناوبانگی بە توێژینکارییەکانی دۆخ - دەرکردووە و بوارەکانی ئەدەب و سینەما سوودیان لێوەرگرتووە و هەروەها ئەو کلێشەیە بە دوور دەخاتەوە کە دەخوازێ پزیشکێکی دەروونی و سلوکی تەنها ببێتە پزیشکێکی جادوگەری نەزان. لایەنگرانی تایبەتمەند بەم دوو دۆستە

هــاودژەی دەروونشــیکاری و سلوکی - هەڵسووکەوتکاری - لە یەکێ لەم کتێبانەدا پەی بە وێنەی قەشەنگی پێگەی خۆیان دەبەن. سەبارەت خوێنەری سکۆلار دەتوانێ بیروڕایەکی تایبەت بە خۆی هەڵبژێرێ بەر لەوەی بڕیار لەوە بدات بە تەمای دەسپێکردنی چی جۆرە گەشتێکە.

سەرچاوە

*Le Figaro Litteraire*

*Jeudi 12 Fevrier 2004.*

## هەزار و یەک نامەی خۆشەویستی بۆ ڤیکتۆر هیگۆ

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع




ناوی کتێب: ئەی پیاوە چکۆلە مەزنەکەم

نوسینی: جولییت درۆیە

لەبڵاوکراوەکانی گالیمار- پاریس 2004

ژمارەی لاپەڕە: 827 لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندی

دانەری ئەم کتێبە خاتوو "جولییت درۆیە" کە دۆستی ڤیکتۆر هیگۆ بووە. ئەم خانمە بە درێژایی پەنجا ساڵ نزیکەی هەژدە هەزار نامەی خۆشەویستی بۆ ڤیکتۆر هیگۆ نوسیوە! پێدەچێ لە ڕۆژێکدا دوو نامەی بۆ نوسیبێ، بەیانیان نامەی یەکەم و ئێواران نامەی دووەم، ئەمەش پەیوەندیەکی ناوازەیە لە مێژودا. ئەم چیرۆکی خۆشەویستیە وەك چۆن لە ئەدەبی عەرەبیدا چیرۆکی (لەیلێ و مەجنون و جەمیل و بوسینە) بەناوبانگە، ئاواش ئەم چیرۆکە بەناوبانگە. لەبەر ئەم هۆیەشە ڕەخنەگری فەرەنسی هاوچەرخ "پۆل سۆشۆن" بایەخی بەم نامانە داوە و بۆ یەکەمجار کۆیکردونەتەوە و پێشەکی بۆ نوسیوە و لێکدانەوەی بۆ بارودۆخ و پایەی ئەم نامانە کردووە. هەمو ئەمانەشی لە کتێبێکی نایاب و زۆر کاریگەردا بەچاپ گەیاندووە. گەر ئەو نەبوایە ئەوا ئەم نامانە وندەبون کە گەواهیدەری ژیانی پیاوێکی گەورەن لە پیاوە گەورەکانی فەرەنسا کە ڤیکتۆر هیگۆیە. ئاشکرایە ناوبانگی ڤیکتۆر هیگۆ بەئەندازەیەك بڵاوببوەوە لەسەروی ناوبانگی کەسایەتیە گەورەکان یاخود بچوکەکانی سەدەی نۆزدەوە بوو، ڤیکتۆر هیگۆ لە نێوان ساڵانی 1802-1885دا ژیاوە.

داخۆ ئەو ئافرەتە کێیە کە هەموو ژیانی یاخود خۆشەویستی خۆی بۆ ڤیکتۆر هیگۆ تەرخان کردبوو؟ ئەو ساڵی 1806 لەدایکبووە، واتە چوار ساڵ دوای لە دایکبونی ڤیکتۆر هیگۆ. جولییت هەتیو بووە، بۆیە مامی بەخێوی کردووە تا گەورە بووە، دواتر بووە بە ئەکتەری شانۆ و "برادییە"ی پەیکەرسازی ناسیوە و ماوەیەك لەگەڵیدا ژیاوە. برادییە پەیکەرێکی بۆ دروستکردووە کە تاکو ئێستاش لە گۆڕەپانی (کۆنکۆرد) لە پاریس ماوتەوە.

ساڵی 1833کاتێ لە یەکێك لە شانۆکاندا خەریکی کاری نواندن بووە، بەرێکەوت ڤیکتۆر هیگۆ دەناسێت، ئەودەم ڤیکتۆر هیگۆ لە هەڕەتی لاویی و لەسەرەتای تەمەنیدا دەبێت و لەسەر شانۆی ئەدەبی فەرەنسیش تادەهات ناوبانگی پەیدادەکرد. جولییت دەمودەست

حەزی لێدەکات، پاشان دەبێتە ئیلهام بەخش و خۆشەویستی هیگۆ و، جولییت لەپێناویدا واز لە شانۆ و نواندن دەهێنێت، دواتر ساڵی 1852 لەگەڵیدا بەرەو تاراوگە و بۆ دورگەی (گێرنسی) لە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی هەڵدێت و ساڵی 1883 کۆچی دوایی دەکات، واتە دووساڵ پێش مردنی ڤیکتۆر هیگۆ. ئەم ئافرەتە پەنجا ساڵ لە تەمەنی خۆی بۆ ڤیکتۆر هیگۆ تەرخان کردووە.

"پۆل سۆشۆن"ی رەخنەگر لە پێشەکی گشتی ئەم کتێبە ناوازەیەدا دەڵێ: لە ساڵی 1833 بۆ ساڵی 1883 جولییت درۆیە بەیانیان و ئێواران خۆشەویستی خۆی بۆ ڤیکتۆر هیگۆ دەربریوە و ژیانی رۆژانەی خۆی بۆ گێڕاوەتەوە و، چیرۆکی خۆشەویستییەکەی بۆ ڤیکتۆر هیگۆ بووەتە ئەفسانە. ئایا ئەو ئافرەتە کێیە کە هەژدە هەزار نامەی تەرخان کردووە بۆ ئەو پیاوەی خۆشیویستووە؟ ئێمە نامە باشەکانمان هەڵبژاردووە: واتە تەنها هەزار و یەك نامە، لەسەر شێوەی هەزار و یەك شەوە.

دواتر "پۆل سۆشۆن"ی رەخنەگر بەردەوام دەبێت و دەڵێت ئەم نامانە تەنها گوزارشتکردنی هەست و سۆزی ئافرەتێك نییە لەسەدەی نۆزدەهەمدا بۆ پیاوێك کە خۆشیویستووە، بەڵکو چەندین فیکری گرنگیشی لەخۆگرتووە بۆ هەرکەسێ بیەوێت کەسێتی ڤیکتۆر هیگۆ بناسێ و شارەزای ئەو ماوە شپرزەیەی مێژوی فەرەنسا ببێت. لێرەوە نامەکان تێروانین و رووداوەکانی سەردەمێك دەخەنەروو. تەوەری نامەکان دەربارەی گەورەترین شاعیر و بیرمەندە کە فەرەنسا لەو سەدەیەدا بەرهەمی هێناوە. ئاشکرایە ڤیکتۆر هیگۆ بووە بە کەسێتیەکی نیشتیمانی کە گەورە و بچوك سەری بۆ دادەنەوێنن.

لێرەوە بایەخی ئەم نامانە تەنها ناگەڕێتەوە بۆ نوسەرەکەی، بەڵکو بۆ ئەو کەسەش کە نامەکانی بۆ نوسراوە. پێدەچێ ڤیکتۆر هیگۆ دوای ئەوەی لەسەر ئەم نامانە راهاتووە، بەوپەڕی تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی کردوون، نامەکان وەك پاڵنەرێکی مەعنەوی و هەروەها وەك پاڵنەرێکی سۆزداری و مرۆڤانە بووە بۆی. بەڵێ "جولییت درۆیە" ڤیکتۆر هیگۆی زۆر هانداوە بۆ داهێنان و ئەفراندن، رەنگە گەر ئەو نەبوایە ڤیکتۆر هیگۆ نەیتوانیبایە کارە نایابەکانی پێشکەش بە ئەدەبی فەرەنسی بکات وەك: تێرامانەکان، الشرقیات، گەڵاکانی پایز، گۆرانی زەردەپەڕ، داستانی نەوەکان، ئەمە جگە لە رۆمانە جوانەکەی: بێسەرپەرشتان.

بەڵێ ئەم ژنە بووەتە ئیلهام بەخش و بەدرێژایی تەمەنی ڤیکتۆر هیگۆی هانداوە بۆ داهێنان. زۆر بە دەگمەن رویداوە پەیوەندی نێوان شاعیرێکی گەورە و ئافرەتێك ئەو هەموو ساڵە بەردەوام بێت. بەتایبەتی بۆیە ئەمە دەڵێین چونکە لە ژیانی ڤیکتۆر هیگۆدا جگە لە جولییت چەندین ئافرەتی دیکە هەبون، بەڵام راگوزەر بوون، تەنها ئەو تا کۆتایی ماوەتەوە. جارێکیان بۆی دەنوسێ و دەڵێ: جولییت نامەکانت سەروەت و سامان و گەوهەری منن، ژیانی هەردوکمان لەم وشانە پێکهاتوە کە رۆژ دوای رۆژ و بیرۆکە دوای بیرۆکە دەیاننوسی، سەرجەم ئەو شتانەی خەونم پێوە دەبینین لەسەر روپەڕی ئەم نامانەدایە کە بەلامەوە نرخێکی هێجگار گەورەیان هەیە و چی ئازار و خەم و خەفەتێکیشت هەیە هەموویانت خستوتە دووتوێیانەوە. ئەم نامانە بریتین لە ئاوێنە بچوکەکانی خۆشەویستی کە رەنگدانەوەن بۆ دەرخستنی چەند لایەنێکی رۆحت.

بەڵام ئایا دەزانین کاتێ ڤیکتۆر هیگۆ بۆیەکەمجار ئەم ئافرەتەی بینی، ژنی هێنابوو هەروەها منداڵیشی هەبوو؟ بەڵێ. بەڵام ژنەکەی لە ڤیکتۆر هیگۆ دورکەوتبوەوە و کەسێکی تری خۆشدەویست، ئەویش گەورەترین رەخنەگری ئەو سەردەمە (سانت بێفی) بوو. ئەمەش ڤیکتۆر هیگۆی زۆر خەفەتبار کرد و هەستی بەتاڵاویی تەنهایی کرد. ئەو توانای ژیان و نوسینی نەبوو بیێ خۆشەویستی ژنێك. هەر بۆیە کاتێ ئەم جولییتەی ناسی وەك ئەوە وابوو ژوانی لەگەڵ قەدەردا هەبێت، واتە لەگەڵ جولییتدا. جولییت لە کات و ساتی خۆیدا هاتوو بەئاسانی رۆچووە نێو جیهانی ڤیکتۆر هیگۆوە. ژیان لەگەڵ هاوسەرەکەیدا هەرگیز نەدەکرا، بۆیە لەو ساتەوە ژنە راستەقینەکەی عەشیقەکەی "جولییت" بوو، نەك ژنە شەرعیەکەی و دایکی منداڵەکانی.

جارێکیان بۆی نوسیوە و دەڵێ: لەو رۆژەوەی چاوم بە چاوت کەوت، تیشکێك لە دڵتەوە خزایە نێو دڵم، وەك چۆن روناکی سپێدە دەخزێتە نێو داروپەردووەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە ڤیکتۆر هیگۆ لەروی دەرونیەوە وەرس و تێکشکاو بووە، ئەو هات و بوژانییەوە، یاخود گەرانیەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ژیانی خۆشبوێت.

لە 28 تشرینی دووەمی ساڵی 1844دا جولییت بۆ ڤیکتۆر هیگۆ دەنوسیێ و دەڵێ: هیوادارم رێگایەکی تازەتر بدۆزمەوە تاکو لێیەوە خۆشەویستی خۆمت بۆ دەربرم، بەڵام رێگای تر نازانم، هەر بۆیە هیچم نییە تەنها دوبارەکردنەوەی هەمان ئەو وشانە نەبێت کە پێش دوازدە ساڵ لەمەوبەر گوێت لیێ بووە.

ڤیکتۆر هیگۆ ساڵی 1841 بە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسی هەڵبژێردرا، پێشتر چوار جار لە وەرگرتنی لە ئەکادیمیە شکستی هێنا. وتارێکی گەورەی ئامادە کردبوو تاکو لەبەردەم نوخبەی فەرەنسی کە لە کەسێتیەکان و وەزیر و نوسەر و ئەدیبەکان پێکهاتبوو بخوێنێتەوە. جولییت درۆیە لە ریزی پێشەوە دانیشتبوو، هێندەی دڵخۆشی ڤیکتۆر هیگۆ دڵخۆش بوو، کاتێ شاعیری گەورە رۆشت وتارەکەی بخوێنێتەوە، تەماشایەکی جولییتی کرد و بزەیەکی بۆ کرد، جولییت لە خۆشیدا خەریك بوو باڵ بگریێ و بفریێ.

بەیانی رۆژی دوایی جولییت بۆ ڤیکتۆر هیگۆ دەنوسێت و دەڵێ: "من دڵخۆشم بەوەی بویتە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسی، من وەك یەکەم رۆژ خۆشمدەوێیت، بەڵام لە رۆژێکدا تەنها یەك کاتژمێر دەتوانم بتبینم، ئەمەش کەمە، بیر لەمن بکەرەوە و کاتێ ئەم نامەیەت دەگاتە دەست وەرە بۆلام، من چاوەرێتم".

پاشان "بۆل سۆشۆن"ی رەخنەگر دەڵێ: ساڵی 1851 پەشێوییەکی ترسناك فەرەنسای گرتەوە و ڤیکتۆر هیگۆ لەلایەن پۆلیسەوە هەرەشەی لێکرا. هاورێکانی دەترسان ڤیکتۆر هیگۆ شتێکی لێبێت، چونکە دەیانزانی چەند رقی لە رژێم و شەخسی لویس بۆناپارتە کە کوری برای ناپلیۆنی ئیمپراتۆر بوو. ئا لەو کات و ساتە دژوارەدا جولییت درۆیە وەفاداری خۆی بۆ ڤیکتۆر هیگۆ سەلماند و پاسەوانی و چاودێری هەڵسوکەوتەکانی ئەکرد تاکو کەس زەفەری پێنەبات. هەموو بەیانیەك پەناگایەکی ئارامی بۆ ئەدۆزیەوە تاکو نەیگرن و رەوانەی گرتوخانەی نەکەن. دواتر پەساپۆرتێکی ساختەی بۆ هێناو یارمەتیدا بەرەو برۆکسل رابکات. دوای ئەوە جولییت بە دەسنوس و کتێبەکانی ڤیکتۆر هیگۆوە خۆی گەیاندەوە ڤیکتۆر هیگۆ. لەو بارودۆخە ئاوارتەیەدا جولییت زیاد لەجاریێ ژیانی

خۆی خستۆتە مەترسییەوە. هەربۆیە ڤیکتۆر هیگۆ نامەیەکی بۆ دەنوسێت و دەڵێ: جولییت دڵخۆشبە و لەبیرت نەچێ تۆ ئافرەتێکی باشیت، ئازایت، میهرەبانیت، نایابی، من گەر تائێستا لە ژیاندا ماوم، ئەوا فەزڵەکەی بۆ تۆ دەگەڕێتەوە، تۆ ژیانی خۆت لە پێناو مندا تەرخانکردووە، لەبەرئەوە خۆشمدەوێیت، من دەست و پێت ماچدەکەم و لە پێناو تۆدا دەژیم.

لە تاراوگە بۆ یەکەمجار جولییت بە تەنها لەگەڵ ڤیکتۆر هیگۆ پێکەوە بوون. ئەندامانی خێزانەکەی ڤیکتۆر هیگۆیان بەجێهێشت و بە باشیان زانی لە پاریس یاخود لە برۆکسل بمێننەوە، ئەوان نەیاندەتوانی بەرگەی ئەو دورخستنەوەیە لە دورەگەیەکی دوورە دەست بگرن، تەنها خۆشەویستی دڵەکەی نەبێت کە چەند ساڵێك لەگەڵیدا مایەوە و دڵخۆشی دەدایە و بایەخی پێدەدا. جولییت چەندین ساڵی بەخۆشی لە تەنیشت ڤیکتۆر هیگۆوە بەسەر برد، بەبێ ئەوەی کەسێ هەبێ کێبڕکێی ئەو هاودەمییەی لەگەڵدا بکات کە بەپارە ناکڕێت.

شاعیری گەورە گەر جولییتی لەگەڵ نەبوایە، ئەوا نەیدەتوانی بەرگەی بارگرانی غوربەت و تاراوگە بگرێ. بگرە لەبەر خۆشەویستیە زۆرەکەی جولییت و دڵدانەوەی بۆ ڕەواندنەوەی خەم و خەفەتەکانی و بەشداریکردنی لە هەموو گەشتەکانی نێو سروشتی دڵڕفێن، ڤیکتۆر هیگۆ وایلێهات تاراوگەی خۆشبوێت. لە ساتێك لە ساتەکاندا خەفەتی بۆ ئەوە ئەخوارد ڕژێم زوتر نەفی نەکردووە! ئاخۆ ڤیکتۆر هیگۆ لە تاراوگە چی کردووە؟ ڕۆژەکانی لە دورگەیەکی دورەپەرێز چۆن بەسەر بردووە کە بە دەریا دەورە دراوە و ڕەشەباشی هەبووە؟ ڤیکتۆر هیگۆ ڕۆژانە دووجار لە ئاوەکەدا مەلەی کردووە و لەسەر بەردەکانیش خۆی داوتە بەر خۆر. لەگەڵ ئەم ئافرەتەشدا کە وەك سێبەرەکەی بووە و بۆ هەرکوێیەك بڕۆشتایە لەگەڵیدا بوو، چەندین گەشتی بە پێ ئەنجامداوە و دواتر دەستی کردووە بە نوسین.

بەڵێ شاعیری گەورەی فەرەنسا لەو ماوەیەدا زۆری نوسی، لەبەر ئەوە بەداخەوە بوو کە پێش ئەو مێژووە نەفیان نەکردووە! دیوانی (تێڕامانەکان)ی لەو ماوەیەدا نوسیوە، هەروەها ڕۆمانی (کرێکارانی دەریا) و ڕۆمانە بە ناوبانگەکەی (بێسەرپەرشتان) لەو ماوەیەدا نوسیویەتی. بەڵێ تاراوگە حەزی ڤیکتۆر هیگۆی بۆ نوسین کردەوە، ڕەنگە گەر لە پاریس بمایەتەوە و خەریکی کۆبونەوە سیاسیەکان و بینینی هاوڕێیانی بوایە، نەیدەتوانی ئەم هەموو کتێبانە لە دیوانی شیعر و ڕۆمان و تێڕامانە فیکری و فەلسەفیەکان بنوسێ.

کاتێکیش دوای بیست ساڵ لە دورکەوتنەوە گەڕایەوە نیشتیمان، هەموو پاریس هەستایە سەرپێ تاکو پێشوازی لێبکات، "جولییت درۆیە"شی لەگەڵدا بوو، جولییت هەستی بە شانازی ئەکرد، چونکە پیاوەکەی و خۆشەویستی دڵەکەی بووەتە کەسێتییەکی نیشتیمانی کە هیچ کەسێتیەکی دیکە شان لەشانی نادات. لە ڕاستیدا ڤیکتۆر هیگۆ ئەودەم گەشتبووە لوتکەی نەمری. ئەو تەنها بەناوبانگترین کەسێتییەکی شیعری یاخود ئەدەبی نەبوو لە فەرەنسادا، بەڵکو لەگەڵیدا بە ناوبانگترین کەسێتی سیاسی و پێشکەوتوخوازیش بوو.

ڤیکتۆر هیگۆ بە هەڵوێستەکانی لەبەرگریکرن لە کەرامەتی گەل و بەرگریکردنی لە ماف پەروەردە و فێرکردن و تەندروستی و چارەسەرکردن و هەموو دەستکەوتەکانی دیکەی پێشکەوتن بەناوبانگ بوو. هەروەها ناوبانگی بەوە دەرکرد کە تێدەکۆشا لە پێناو ئەوەی

گەل مافی دەنگدانی گشتی هەبێت و ڕاستەوخۆ نوێنەرەکانی خۆی هەڵبژێرێ و سەروەری باڵای خۆیان بەدەستبهێنن، چونکە دیموکراتیەت بریتیە لە فەرمانڕەوای گەل بۆ گەل و لەپێناو گەلدا.

پاشان "بۆل سوشۆن"ی ڕەخنەگر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: هاوکات ڤیکتۆر هیگۆ ڕوبەڕوی چینی بۆرجوازی و دەوڵەمەندەکان و کاسەلێسەکان بووەوە، ئەوانەی دەیانویست بەهەر شێوەیەك بووە بەرگری لە بەرژەوەندییەکانیان بکەن. ئەو ڕقی لێیان بوو چونکە ئەوان سوکایەتیان بە میللەتی دڵساف و هەژار دەکرد. ڤیکتۆر هیگۆ لەو باوەڕەدا بوو ئەوان لە ڕێگەی ئیشکردنی کرێکارانەوە لە کارگەکاندا بۆ ماوەی دە سەعات یاخود زیاتر لە ڕۆژێکدا خوێنی میللەتیان دەمژی. چارەنوسی کرێکارانی کانەکان لە باکوری فەرەنسا سەرنجی ڕاکێشا و خاوەنکار و سەرۆکی کۆمپانیاکانی بە بێویژدان و نەبونی بەزەیی مرۆڤانە تۆمەتبار دەکرد. هەروەها ڤیکتۆر هیگۆ ڕوبەڕوی چینی قەشە مەسیحیەکانیش دەبوەوە و بە تاریکبین و دژە ڕۆشنگەری و فیکری عەقلانی ئازاد تۆمەتباری دەکردن، هەروەها بەوە تۆمەتباری ئەکردن کە میللەت دەچەوسێننەوە و ئیش بۆ ئەوە دەکەن میللەت بە نەخوێندەواری بمێنێتەوە و هەمیشە ملکەچییان بن.

**سەرچاوە**

بیان الكتب 2005/3/8

# فەیلەسوف کێیە؟

**عەلی حەرب**

**لە عەرەبییە: عەدالەت عەبدوڵڵا**



دێریدا

هەریەکێ کە بیری کردەوە و نیگای گرتە مەسەلەیەك لە مەسەلەکان یان لە بابەتێك لە بابەتەکاندا بەڵگەی هێنایەوە، بە زەرورەت بە فەیلەسوف لەقەڵەم نادرێت، چونکە مرۆڤ بەو پێیەی بوونەوەرێکی ئاقڵە، لەوەتی هەیە ڕانەوەستاوە لە بەکارهێنانی عەقڵی خۆیدا. لەم ڕووەوە ڕوانینگەلێکی ڕەسەنی داهێناوە و لەسەر کۆمەڵە مانایەکی چاك و پاك ڕاوەستاوە و چەند بیروباوەڕێکی بە پێزی فۆرموڵە کردووە و زانستگەلێکی ڕاست و دروستی دامەزراندووە. کەسیش دواجار لە ئەقڵ و نیگای خۆی ڕووت ناکرێتەوە. بەڵام فەیلەسوف ئەوەیە کە لە بەڵگەهێنانەوەدا نیگای خۆی لە بوارێك لە بوارەکاندا کورت ناکاتەوە یان زانستێك لە زانستەکان دانامەزرێنێت یان یاساکانی ڕووداوەکان ئاشکرا ناکات، بەڵکو ئەو، واتە کەسی فەیلەسوف، بۆ گەڕان بەدوای ئەودیوی زانینی دیاردەکان، ئەوە تێدەپەڕێنێت. لەم ڕووەوە فەیلەسوف دەڕوانێتە بنەڕەتی زانین و سەرلەنوێ ئەقڵ پێناسە دەکاتەوە و چەمکەکان و وێناکردنەکان دەپشکنێ و لە هۆکاری شتەکان دەپێچێتەوە و بەدوای پێکهاتەکانی بوون-دا دەگەڕێت و دۆزینەوەکانی زانست ڕاڤە دەکات. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەش دەڵێین: ئەوەی کە هەندێ یاسای زانستی لە بواری سروشتدا یان لە بواری مرۆڤدا یان لە فیزیا یان لە کۆمەڵناسیدا لە کایەی ئەتۆمدا یان لە مەسەلەی دەوڵەتدا دەدۆزێتەوە، ئەوە، بەو ڕاستییانەی کە دەیسەلمێنێت،

به زانا له قه‌ڵه‌م ده‌درێت. ده‌شێتیش که زانا ئیش له فه‌لسه‌فه‌دا بکات و بواری په‌تیی زانستی تێپه‌ڕ بکات بۆ ئه‌وه‌ی بڕوانێته ئه‌و ده‌ره‌نجامانه‌ی به ده‌ستی هێناون و ڕابمێنێت له‌و ڕاستییانه‌ی که سه‌لماندوونی و ئه‌و میتۆده به‌ده‌ست بخاته‌وه که له توێژینه‌وه‌یدا گرتوویێتییه به‌ر. ده‌شێت له‌وه‌شدا ته‌واو بێت بۆ ئه‌وه‌ی بڕوانێته ئه‌وه‌ی ئه‌قڵ چییه و شت چییه، زانین و زانست چییه، مرۆڤ و سروشت و جیهان چییه؟ ده‌شێت پرسیاره‌کانیشی بیباته باری پرسیاری بنه‌ڕه‌تی له هه‌قیقه‌تی بوون و مانای بوون.

که‌واته ئه‌وه به‌س نییه که دیارده‌کان لێك بده‌ینه‌وه و یاساکان له کایه جیاجیاکانی زانستدا بدۆزینه‌وه تاکو ببینه فه‌یله‌سوف، به‌ڵکو پێویسته بیربکه‌ینه‌وه له‌وه‌ی که زانیومانه: چۆنمان زانیوه و به‌چی زانیومانه و بنچینه و ڕووی باوه‌ڕ ڕه‌هایی (الیقین) تیادا چییه، واته بگه‌ڕێین به دوای چییه‌تیی ئه‌قڵ و سنوور و بوار و تواناکانی ئه‌قڵدار، ڕه‌نگه ئه‌م ڕووه‌ی مه‌سه‌له‌که‌ش بۆ ئێمه ڕووه گرنگتره‌که بێت، مه‌به‌ستمان لێی پانتایی ئه‌قڵ و سنووره‌کانێتی.

گومانی تیادا نییه که ئه‌قڵ ده‌ڕوانێت و به‌ڵگه ده‌هێنێته‌وه و ده‌پشکنێ و چاوده‌گێڕێته‌وه و به‌ڵکو ڕه‌خنه‌ش ده‌گرێ و ره‌تی ده‌کاته‌وه، ئه‌مه‌ش له ناخی چالاکیی فه‌لسه‌فیدایه، به‌ڵام که ئه‌قڵ ئه‌م کاره ده‌کات، پشکنین و ڕه‌خنه نایگه‌یه‌ننه ئه‌وه‌ی (واز له ڕوانین بهێنێت) واته نایگه‌یه‌ننه ئه‌وه‌ی خۆی بدا به‌ده‌سته‌وه و له شتێك له شته‌کان یان مه‌سه‌له‌یه‌ك له مه‌سه‌له‌کان یان بوارێك له بواره‌کان بێده‌نگ بێت، له‌م ڕووه‌وه هیچ وێناکردنێك نییه مشتومڕ قبوڵ نه‌کات و نه‌یه‌ته ژێر باری پشکنینه‌وه. خه‌سڵه‌تێکی ئه‌قڵی فه‌لسه‌فیش ئه‌وه‌یه که گومانکردنه له شته ئاساییه‌کان و پشکنینی سه‌لمێنه‌کان و ڕزگاربوونه له وه‌همی بیروبۆچوونه‌کان. ئه‌و، واته فه‌یله‌سوف، هه‌وڵده‌دات ئه‌وه‌ی به مێشکا نایه‌ت به مێشکا بێت و ئه‌وه‌ی نابێ لێی بڕوانرێت لێی بڕوانێت، به جۆرێك که‌تێڕوانینی رۆچێته ناو هه‌موو زانینێك و کرده‌وه‌یه‌ك و وته‌یه‌ك. له‌م ڕووه‌وه هیچ ڕایه‌ك یان پلانێك له بازنه‌یدا ده‌رناچێت و هیچ داوه‌رییه‌ك ناکه‌وێته سه‌روو داوه‌ریکردنه‌که‌ی، ئیدی ئه‌وه تێکستێك بێت یان باوه‌ڕێك بێت یان مه‌به‌ستێك. به‌ڵێ، ئه‌قڵ ده‌شێت دان به‌و گرفت و سه‌ختییانه‌دا بنێت که دێنه ڕێگه‌ی و پێ له سنوورداریێتیی خۆی بنێت، به‌ڵام ئه‌وه مانای ئه‌وه نییه باوه‌ڕ به‌وه بهێنێت که یه‌قینێك هه‌یه له ده‌ره‌وه‌ی خۆیه‌وه دێت. ده‌شێت ئه‌قڵ بچێته باری میتاییه‌وه (ئه‌ودیوی شته‌کان/ الماوراء) به‌ڵکو عه‌قڵی فه‌لسه‌فی خۆی شتێکی دیکه‌ی دروست نه‌کردووه ته‌نها قه‌واره میتاییه‌کان نه‌بێت، به‌ڵام میتا له فه‌لسه‌فه‌دا مانایه‌کی جیاوازی هه‌یه له‌وه‌ی له بواره نافه‌لسه‌فییه‌کانی تردا هه‌یه، واته له ئاینه‌کان و بیروباوه‌ڕه‌کان. له‌م ڕووه‌وه به‌رئه‌نجام میتا به‌رهه‌می ئه‌قڵ و گوتاری ئه‌قڵه. هه‌روه‌ها، ئه‌قڵی فه‌لسه‌فی-یش چاو به به‌ڵگه‌نه‌ویسته‌کانی خۆیدا ده‌گێڕێته‌وه و وته‌کانی خۆی ره‌ت ده‌کاته‌وه و بگره دادگایی خۆیشی ده‌کات، به‌ڵام ئه‌وه به ناوی ده‌سه‌ڵاتێکی تره‌وه ناکات یان له پێناوی باوه‌ڕهێنان به‌وه‌ی که شتێك هه‌یه نابێ مشتومڕی تیادا بکرێت، به‌ڵکو له پێناوی ئه‌وه‌دا ده‌یکات خۆی بناسێت. ئه‌و، واته ئه‌قڵی فه‌لسه‌فی، ڕه‌خنه‌ده‌گرێ و پشکنین ده‌کات به مه‌رامی گه‌ڕان به‌دوای توانستی نوێدا و له پێناوی نه‌هێشتنی سه‌ختییه‌کان و چاره‌سه‌رکردنی گرفته‌کان، زۆرجاریش پێویسته ڕه‌خنه، داهێنانی ئاسۆی ئه‌قڵیی نوێ و چه‌کی فیکریی کارامه‌ترو

کاریگەرتر بە دەستەوە بگرێت. واتە ڕەخنە ڕێگایەك نییە بۆ پاشەکشەکردنی ئەقڵ یان تەسککردنەوە و ڕەتکردنەوە سنووری کارەکانی یان نەهێشتنی بەڵکو فراوانکردنی کایەی ڕوانین و جۆراوجۆرکردنی ڕێگاکانی توێژینەوەیە. گرنگترین ئەو بوارانەش کە پێویستە ئەقڵ لەروویدا بکرێتەوە و تێیبڕوانێت، بواری ناماقوڵە (اللامعقول)، واتە بواری ئەفسانەیی و غەیبییە، یان حەرامکراو و پیرۆزکراوە، ئەمانە چەند پانتاییەکن ئەقڵی عەرەبی بڕیاریداوە ئاوڕیان لێنەداتەوەو تەنیا بە پێچەوپەنا و فروفێڵ نەبێت یان بڕیاریداوە لێیان بێدەنگ بێت. لەم ڕووەوە داوای ئەوە ناکرێت غەیب ڕەت بکرێتەوە وەك ئەوەی خاوەن ئەقڵە داخراوەکان دەیکەن، داوای وازهێنانیش لە ڕوانین نەکراوە کە ئەوە هەڵوێستی توندڕەوەکانی ئەهلی ئەقڵە، بەڵکو داوای کرانەوە بەرووی‌داو هەوڵی ئەقڵکردنی، کراوە.

بە کورتی، فەیلەسوف ئەو کەسەیە کە داوای بنەماکان دەکات و " گۆشەنیگایەکی نوێ بۆ تێڕوانین دیاری دەکات". فەیلەسوف، ئەو کەسەیە کە پرەنسیپەکانی زانین هەڵدەهێنجێ وکردار و یەکانگیری لە شار و دەوڵەتدا دادەمەزرێنێت. کەواتە فەیلەسوف ئەوەیە کە قسەیەکی داهێنەرانە لە بوون دەکات. لە سەرو هەموو ئەوانەشەوە ئەو کەسەیە کە (بە پرسیارەکان تووشی دڵەراوکێ دەبێت) واتە ئەوەیە کە گومان دەکا و نارەزایی دەردەبڕێت و وەڵامێکی ئامادە بۆ (پرسیاری جەوهەری) هەیە، واتە پرسیار لەبارەی هەقیقەتی بوونەوە بنەڕەت و ماهیەت و سنوور و مانا و ئاکامەکەی.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش کە پێی دەوترێت "فەلسەفە" دەشێت لە ئێستادا بوونی نەبێت، ڕەنگە لە داهاتووشدا نەبێت وبوونیشی شتێکی پێویست نەبێت، دەشێت، وەك هەندێ لە عەرەب و خەڵکانی تریش تیایدا بینیویانەتەوە، زیانی هەبێت بۆ سەر بیروباوەڕەکان بەو جیاوازییانەشەوە کە لە نێوانیاندا هەیە ئیدی بیروباوەڕی نووسراوبن یا نەنووسراو، کۆن بن یان نوێ... کەواتە دەشێت فەلسەفە لە دیدگای ئەقلانیەتی ئیمانیەوە و نموونە ئایدیۆلۆژییەکاندا، ئیدی بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆژیای ئاینی بن یان عەلمانی، زانستی بن یان نازانستی، ئاسمانی بن یان سەرزەمینی، شێتێتی بێت یان زەندەقێتی یان فریودان و ناڕاستی بێت، بەڵام ئەمانە هیچ لە هەقیقەت ناگۆڕن.

## سەرچاوە

کتێبی "أسئلة الحقیقة و رهانات الفكر" بابەتی (من هو الفیلسوف) لا 40-42.

